# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

مامۆستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی پێنجەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت - لبنان

# تەفسیری قورئانی پیرۆز

لێکدانەوەی

ماموٚستا مەلا عثمان عبد العزیز

بەرگی پێنجەم

چاپی دووەم

٢٠١٠

بیروت – لبنان

ئەم جزئی(١٣) یەمە پێکهاتووە لەم ئایەتەی داهاتووی ئەم سورەتە کە لە سەرەتاوە ناسیمان و ناساندمان بە خەڵکی، پێکهاتووە لە سورەتی(ئیبراهیم) یش کە بە یارمەتی خوا لە سەرتای خۆیاندا ئەیان ناسین و ئەیان ناسێنین.

ئەم جزئە دەست پێ ئەکات بە تایبەتی(٥٣) کە تەاو کەری دواترین ئایەتی جزئی(١٢) یە، دەست ئەدات کە فەرمودەی یوسف بێت،هەرچۆنێ دەست ئەدات و هەڵ ئەگرێ وتەی ژنەکەی عەزیز بێت. ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ﴾ لەسەر ڕای یەکەم ئەڵێین: یوسف لە ئایەتی پێشوودا مەدحی خۆی کرد و خۆی بە پاك و خاوێن نیشاندا، ئەوەش شایستەی ئەو نیە، بەڵکو ئەبێ شەرم بکات لە خوا و شتی وا نەڵێ، وەك قورئان دەست نیشان ئەکات بەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ﴾ نەفسی خۆتان بە پاك و بە بێ لەکە دامەنێن، جا لەبەر ئەوە لەم فەرمودەیەدا ئەگەڕێتەوە سەر خۆی و ئەم وتە شایستەی فەرموو، کە من نەفسی خۆم پاك و بەری ناکەم لە هەر خراپە و لەکەیەك، هۆی ئەوەش ئەمەیە ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ کە نەفس زۆر فەرماندەر و پاڵدەرە بە خراپە و مەیل و ئارەزوی بەتینە بۆی، یان ئەڵێین: مەبەستی لە فەرموودەی پێشوودا ئەوە نەبووە، بەڵکو هەر ئەوەی مەبەست بوو کە هەواڵ بدات بەوەی کە ناپاکی نەکردووە، ئەوەش هەڵ ئەگرێ کە ئەو ناپاکی نەکردنە لەبەر ئارەزوو نەکردنەکەی لەبەر ترسی خوا بووە لەسەر باری یەکەم بەو جۆرە ئەڵێین، لەسەر باری دووەم ئەڵێین: مەبەستی ئەو ئافرەتە ئەمە بوو کە ڕاستی و پاکی یوسف دەربخات کە گوتی: ئەو کەوتە هەوڵ و تەقەلاَ بۆ کاری بەد و من بێ تاوان بووم، واتە یوسف ڕاستی کرد و من خۆم بە بەری نیشان نادەم.... هتد.

یان ئەڵێین: مەبەستی ئەو ئافرەتە عوزر و بەهانە هێنانەوە لەوەی کە کردی دەربارەی یوسف(علیە السلام) ئەو وتەیە هی هەرکام بوو بێ ئەمەشی لەگەڵدا بووە، ﴿إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ﴾ واتە هەموو نەفسێ زۆر فەرماندەرە بە خراپە، بێجگە لە نەفسێك کە پەروەردگارم میهرەبانی پێکردبێ، یان هەرکاتێکدا بێجگە لە کاتێ کە پەروەردگارم میهرەبانی کردبێ، یان هەموو نەفسێ پاڵدەر و فەرماندەرە بە خراپە، بەلاَم هەر میهرەبانی پەروەردگارم ئەو بەدی و خراپە لا ئەبات و بەرگری ئەکات،

إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِي بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ
﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا
حَيْثُ يَشَآءُ ۚ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾

---

﴿إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارم لێبوردەی میهرەبانە. بەم فەرموودەیە کۆتایی هێنا بە ڕابردووی ژیانی سەخت و تاڵی یوسف, ئینجا نۆبەی هاتنی نۆبەی ژیانی خۆشی و بەرزی و دەسەڵاتە کە ئەفەرمویٚ ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ﴾ پاشا بۆی دەرکەوت پاکێتی یوسف, بۆی دەرکەوت کە لەگەڵ ئەوەدا زانینی خەو و پەرژین و لێزانی و کار دروستی یەکەی, لەبەر ئەوە گوتی بە خزمەت کار و ژێر دەستەکانی: ﴿ٱئْتُونِي بِهِۦٓ﴾ یوسفم بۆ بهێنن ﴿أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي﴾ ئەیگێرم بە کەسێکی تایبەتی بۆ خۆم و بە خۆمەوە, ئەیگێرم بە جێگەی پرس و ڕا و قسە و باسەوە,ئەوانیش چوون بە دوایدا و هێنایان, ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ﴾ کاتیٚ کە پاشا قسەی لەگەڵ کرد و بۆی دەرکەوت کە چۆن گومانی بردووە پێی بەو جۆرەیە و شایانی ڕێز و پلە و پایەی بەرزە, لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ ئیتر تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلە و پایەیت و بیٚ باك و پاك و جێی باوەڕیت لامانەوە, ئینجا لەوێدا کە یوسف زانی ئەو وڵاتە پێویستی هەیە بە چاودێری و پارێزگاری و بەڕێوەبردنی کاروبار, خۆیشی لێزان و دەسەڵاتدارە بەسەر ئەو کارە گرنگانەدا, لەبەر بەرژەوەندی گشتی و پارێزگاری ژیانی دانیشتوانی وڵات, لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی بە پاشا ﴿ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ﴾ بمگێڕە بە کاربەدەست بەسەر خەزنە و سامان و ڕۆزی و دارایی خاکی میسردا ﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی من پارێزەرێکی زانام, بێجگە لەوە کە گوتمان ئەو داواکردنی یوسفە و ئەو خۆبەپاك و شیاو نیشان دانە لە ناو گەل و کۆمەڵێکی نەفامیدا بووە, ئەگەر ئەوەی نەکردایە ئەو کارە گەورەیە هەر بەدەستی بەد و نەفامانەوە ئەبوو وە ئەمایەوە, بێجگە لەوەش گرتنە دەستی ئەو کارە بوو بەهۆی ئەوەی یوسف بتوانیٚ ئایینی ڕاست بڵاو کاتەوە تا لەکاتی گونجاودا بە تەواوی وڵاتەکە بکات بە وڵاتی ئیسلام, کەواتە ئەو ڕەخنەی خۆپەسەند کردنە و داوای کاربەدەستی یە بەهیچ جۆر ڕوو ناکاتە یوسف(ع) بەڵکو ئەوە کاتیٚ ڕەخنەیە و جڵەوگیری لیٚ ئەکریٚ کە گەلی مسوڵمان هەبیٚ چەند شیاو و شایستەیەکی تێدا هەبیٚ, بە

نەگیرانی هەرکام لەوانەیە یەك نەكەویّ, لەو كاتەدا هیچكەس نابیّ داوا بكات و خۆی پەسەند بكات, بەڵكو گەل بە ئارەزوی خۆی یەكیّ لە شیاوەكان هەڵبژێری, ئەمەی كە گوتمان باشترین وەڵامە بۆ ئەوانەی كە ئەوداواو خۆپەسەند كردنی یوسفە ئەكەن بە گریّ و رەخنە.

ئینجا هەرچەند ئایەتەكە باسی ئەوە ناكات كە ئایا پاشا داواكەی یوسفی بە جێهێنا یان نا؟ بەڵام ئەم فەرمودەیە دەست نیشانی تێدایە بە موافەقە و بەجێهێنان كە ئەفەرمویّ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾ بەو جۆرە نایاب و گرنگە جێی و شوێن و دەسەڵاتماندا بە یوسف لە خاكی میسر دا, كاروبارمان دایە دەستی و دامەزراومان كرد تیایدا, ﴿يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ لە كاتێكدا نیشتەجیّ ئەبیّ لە بەش و پارچەكانیدا لە هەر شوێنێك بیەویّ و پێی خۆش بێت, ئەوەی پیّ بەخشی لە پاداشتی بیرە سامناك و پڕ لە ترسەكە, لە پاداشتی بەندیخانە و سزا و زەحمەتەكانی, ﴿نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَاءُ﴾ مەیلی هەر كەس بكەوین و بمانەویّ بەری میهرەبانی و نیعمەت و چاكەی خۆمانی ئەخەین لە دنیادا ﴿وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەجر و پاداشتی چاكەكاران زایە ناكەین, بەڵكو بە تەواوی پێی ئەبەخشین لە دنیادا, ﴿وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ بەڕاستی ئەجر و پاداشتی ڕۆژی دوایی چاكترە بۆ ئەو كەسانەی كە بڕوایان هێناوە بە هەمیشەیی پارێزەرن لە هاوبەش و ڕەوادان و تاوان و خراپەكاری, تا ئا بەو جۆرە خوا پاداشتی یوسفی دایەوە لەسەر بڕواو خۆگری و چاكە كاری و خۆپارێزی.

ئینجا وەك دەركەوت لە خەو پەرژینەكەی یوسفەوە قات و قڕی و گرانی سەخت دێت بەسەر خاكی میسردا بەهۆی ئەوەوە لە خاكی كەنعانیشدا پەیدا بوو بە هۆی ئەوەوە براكانی یوسف هاتن بۆ میسر, وەك ئەفەرمویّ: ﴿وَجَاءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ﴾ براكانی یوسف – بێجگە لە بنیامین وەك لەمە و پاش دەر ئەكەویّ – هاتن ﴿فَدَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ چوونە لای ﴿عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ دەست بەجیّ یوسف ئەوانی ناسی لەبەر ژیری و زیادە زیرەكییەك كە خوا پێیدابوو, ئەوانیش گۆڕانێكی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتبوو, لە كاتێكدا كە ئەوان یوسفیان نە ئەناسییەوە, ئایا چۆن بناسنەوە؟ ئایا چۆن بەخەیاڵیاندا بێت ئەم پادشایە بە دەسەڵات و پایە بەرزە ئەو یوسفە بێت كە كاتی خۆی فرۆشرا و كەس نازانیّ كە چی بەسەر هات؟ بەڵام وادەرئەكەویّ كە ڕێزی گرتبن و قسەی خۆشی لەگەڵ كردوون, تاهەواڵ و دەنگ و باسی خۆیانیان بۆنەكردبیّ, تائەوڕادەی كە برایەكی تریشیان هەیە كە لە دایكی ئەمان نییە.

﴿٥٨﴾ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ
﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾
وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ
﴿٦٢﴾ فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ

---

**وەك دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ﴾ كاتێ كە رێك و پێكی خستن و ئەوەی كە بۆی هاتبوون پێیدان، ﴿قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ﴾ پێی گوتن: برایەك كە هەتانە و لە باوكتانە بۆم بێنن ﴿أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾ ئایا نابینن كە من بە رێكی و بێ كەم و كوڕی پێوانەتان بۆ ئەكەم و بارتان بۆ بار ئەكەم، من باشترینی میوان پەزیرانم بۆتان؟یان نابینن ئایا كە پێوانەی رێك و تەواو ئەكەم بۆ كڕیارەكان، من باشترین میوان پەزیر و رێزگری میوانم، لەسەر هەر بار واتە بە هاتنی براكەتان بەشی ئێوە كەم نابێ، هیچ مەترسی یەك نییە لە هاتنی بەڵكو رێز ئەگیرێ ﴿فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ﴾ ئەگەر ئەو برایەتانم بۆ نەهێنن ئەوا هیچ پێوانە و بار و باركردنێك نییە بۆتان لای من و نزیكم مەكەونەوە ﴿قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ﴾ گوتیان هەوڵ و تەقەلا ئەدەین لەگەڵ باوكی و دڵی دائەهێنن لەسەر ناردنی، ﴿وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ﴾ بەراستی ئەوە ئەكەین و سست و قسوری ناكەین لەوەدا، ﴿وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ﴾ یوسف فەرموی بە غولام و كارەكەرەكانی ﴿ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ﴾ ئەو شتانەی كە هێناویانە بۆ كڕینی خەلە و خۆراكەكەیانن بیخەنە ناو بارەكانیان ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ﴾ بەڵكو بیناسنەوە كاتێ كە گەڕانەوە بۆ لای كەس و كاریان، واتە ماڵی ئەوەیات لە بەرچاو بێت. ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە بگەڕێنەوە و بێنەوە، واتە لەگەڵ برا باوكی یە كەیان كە مەبەستی سەرەكی یە بۆ یوسف.**

**﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ﴾ كاتێ گەڕانەوە بۆ لای باوكیان ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ﴾ گوتیان: ئەی باوكی خۆمان بەرگری كرا و قەدەغە كرا لێمان شتمان پێ بفرۆشن، واتە تا براكەمان لەگەڵ خۆمان نەبەین بۆ لای عەزیزی میسر ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ﴾ كەواتە براكەمان لەگەڵ بنێرە تا بە هۆی ئەوەوە خۆراك بكڕین و باری بكەین بۆ خۆمان،**

وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ۖ فَٱللَّهُ خَيْرٌ
حَٰفِظًا ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ۖ قَالُوا۟
يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى ۖ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا ۖ وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ۖ ذَٰلِكَ
كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ ۖ
فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾

---

﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ بێگومان ئێمە پارێزەر ئەبین و ناهێڵین دوچاری هیچ شتێك بێ، ئەم بەڵێنەیاندا تا باوكیان مەترسی نەكات و دڵ ئارامی بكەن، بەڵام باوكیان بەوە دڵخۆش نابێ، چونكە لەپێشەوە سوێند و پەیمانیاندا لە بارەی یوسفەوە، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمون: ﴿هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ﴾ ئایا ئەمین بم لێتان لەسەری و بە ئەمیندارتان دابنێم مەگەر هەر چۆن بێ بە وێنەی ئەوەی كە ئەمین بووم لێتان و بە ئەمین دارم دانان لەسەر براكەی لەمەو پێش – واتە یوسف– كە لە پاش ئەو سوێند و پەیمانەی كە داتان لە پاشان ئەوەتان كرد كە كردتان، كەواتە داوای پارێزگاری هەر لە خوا ئەكەم كە لە هەموو كەس میهرەبانترە ﴿فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ كەواتە خوا چاكە و چاكترە لە بارەی پارێزگاری یەوە، ئەو بەزەیی دار ترینی هەموو بەزەیی دارانە، ئینجا ئایا هیچ گەنم و خۆراكێكی پێ نەدابن ئەم جارە، بەڵكو هەر شت و مەكەكانی خۆیانی كردبێ بە بار بۆیان تا بە هۆی ئەوەوە ناچار بن بۆ گەڕانەوە بۆ میسر، یان مەبەست لە بەرگری كردنی پێ فرۆشتنی بۆ داهاتوو بێت؟ هەر دوو بارەكە هەڵ ئەگرێ وەك بە هەردوو تەفسیر كراوەتەوە، لەسەر هەر بار: ﴿وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَٰعَهُمْ﴾ كاتێ كە بارەكەی خۆیان كردەوە

﴿مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ﴾ بۆیان دەرکەوت و زانیان ئەو شتانەی کە بردبوویان بۆ کڕین دراوەتەوە و گەڕێنراوەتەوە بۆیان. ئینجا با بزانین لەوێدا چییان گووت؟ ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان بە باوکیان: ﴿يَـٰٓأَبَانَا﴾ ئەی باوکی خۆمان ﴿مَا نَبْغِى﴾ ئایا ئێمە چیمان دەوێ؟ ﴿هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ ئەمە کەل و پەلەکانمانە گەڕێنراوەتەوە بۆ لامان ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ توێشوو و خۆراکیش ئەهێنین بۆ کەس و کارەکەمان ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا﴾ براکەشمان ئەپارێزین ﴿وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ﴾ باری حوشترێکیش زیاد ئەکەین ﴿ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ ئەوەی لەوە و بەر بار و بەشێکی کەم بوو پێویستمان دەرناکات, کەواتە با براکەمان بێت تا بارێکی تریش زیاد بکەین چونکە باوی یوسف وابوو هەر یەکێ بارێکی بۆ بار ئەکرد, یان مەبەست ئەوەیە: ئەو بارەی کە گوتمان زیادی ئەکەین شتێکی ئاسانە و بەبێ هەوڵ و زەحمەت پێمان ئەدەن, بە پێی باوی خۆیان, ئەمانەی کە باسیانکرد بۆ باوکیان هەر کام هۆیەکە بۆ ئیزن دانی باوکیان بۆ چوونی براکەیان لەگەڵیان, بەڵام لەبەر ئەوەی کە دڵنیا نەبوو لێیان و مەترسی هەر بوو لێیان، ﴿قَالَ﴾ فەرموی پێیان: ﴿لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ﴾ هەرگیز ناینێرم لەگەڵتان ﴿حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ هەتا سوێند و پەیمانێکم پێ نەدەن لە لایەن خواوە, واتە تا سوێندم بۆ نەخۆن بە خوا ﴿لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ﴾ کە ئەیهێننەوە بۆ لام ﴿إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ﴾ مەگەر دەور بدرێن و هیچ چارەتان نەمێنێ یان مەگەر لەناو ببرێن و هەموو تێدا بچن, باوکیان ئەو مەرجەی بۆ دانان و ئەوانیش قبوڵیان کرد و ئەو سوێندەیان بۆ خوارد ﴿فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ﴾ کاتێ پەیمان و سوێندەکەیان پێدا ﴿قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ گوتی خوا ئاگادار و چاودێرە بەسەر ئەوەی کە ئەیلێین, ئەمەشی فەرمو بۆ زیادە پێرخستنەوە و بەهێزکردنی سوێند و پەیمانەکەیان.

وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ
إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ
بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٦٩﴾

---

ئینجا له پاش ئەوه ئامۆژگاری و وەسیەتی بۆ کردن بەمەی کە فەرموی: ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ﴾ فەرموی ئەی کوڕەکانم ﴿لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ﴾ هەمووتان لە یەك قاپی وە مەچنە میسر ﴿وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖ﴾ لە چەند قاپی یەکی جیاجیاوە بچنە ژوورەوە, ئیتر ئایا مەبەستی خۆپارێزی بوو بێ لە چاوی بەد کە بە جارێ یازدە کوڕی شیرینی هەڵکەوتوو ببینرێ و و جێگەی سەرسوڕمان و حەسادەت پێ بردنە, یان مەبەستی کردبێ کە پیاو خراپ بەو جۆرە نەیان بینن و بەجارێ دەستیان لێ بوەشێنن یان هەر مەبەستێکی تری بووبێ کە هیچ پێویست نییە ئێمە بە دوایدا بگەڕێین و دیاری بکەین لە کاتێکدا کە قورئان بێدەنگە لێی, هەر چۆن بێ فەرمووی ﴿وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ﴾ من بەرگری هیچ شتێکتان لێناکەم لە لایەن خواوە, واتە خوا هەرچۆنێکی بڕیار دابێ هەر ئەوە ئەبێ, وەك ئەفەرموێ ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ هیچ حوکم و بڕیارێك نییە مەگەر بۆ خوایە و هیچ کەس هیچکەس هاوبەشی نییە و هیچ شتێ بەرگری و بەبەرەکانێی پێناکرێ لەگەڵ هیچ بڕیارێکی خوادا و هەموو شت هەر بەدەست ئەوە, بەندە هەر ئەوەی بەدەستە هەر بە پێی مەیلی خۆی بارێك هەڵبژێرێ و ئەو شتانەی کە خوا کردوونی بەهۆی پێکهاتن و فەراهەم هێنان بەکاریان بێنێ, ئیتر خوا بڕیاری دابێ ئەوا ئەو کارە و ئەوشتە ئەبێ, ئەگینا هیچ کەواتە هەموو کار و هەموو شتێ هەر ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و ئەبێ پشت هەر بەو ببەسترێ, وەك فەرمووی ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ هەر بەو پشت ئەبەستم و هەموو کار و بارم هەر بۆ لای ئەو ئەگێڕمەوە, و حەواڵەی ئەکەم ﴿وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ مەواتە هەر با پشت بەو ببەستن و هەموو پشت بەستراوان و ئەوانەی نیازی پشت بەستنیان هەیە, پشت بەستن بە خوایش ئەبێ لە پاش بەکارهێنانی هۆ و کەرەستەکانەوە بێت, وەك لە چەند شوێنێکدا باسمانکرد بە درێژی. ئینجا با بزانرێت کە حوکم و بڕیاری خوا دوو جۆرە: جۆرێکیان ئەمە بوو کە باسی کرد لە سەر زمانی

یەعقوب(ع) کە ئەمە حوکم و بڕیاری قەزا و قەدەریە و هیچکەس دەسەڵاتی نییە تێدا نییە و بە بێ مەیل و هەڵبژاردنی بەندە دێت و کاری خۆی ئەکات, ئەو جۆرەکەی تریان حوکم و بڕیارێکە کە پێویستە بەندە بەجێی بێنێ بە ڕەزامەندی و هەڵبژاردنی خۆی کە ئەمەیان پێی ئەوترێ حوکم و بڕیاری شەرعی, هەر کام لەم دوو جۆرە تایبەتیە بە خواوە و نابێ هیچکەس بڕوای ببێ بە هیچ بڕیارێك بێجگە لە بڕیاری ئەو و لە بەرنامە و شەریعەتی ئەو, کوڕەکان بە پێی ئامۆژگاریەکەی باوکیان ڕەفتاریان کرد, بەڵام وەك خۆی فەرموی ئەوە سوودی پێ نەگەیاندن و بەرگری نەکرد لە بڕیاری خوا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم﴾ کاتێ کە چونە میسر لەو شوێنەی کە باوکیان فەرمانی پێدان, واتە چوون لە چەند قاپیەکی جیاجیاوە, ﴿مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾ ئەو چوونە بەو جۆرە سوودی پێ نەگەیاندن و بەرگری هیچ شتێکی لێ نەکردن, لە لایەن خواوە وەك بۆمان دەرئەکەوێ ﴿إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا﴾ بەڵام ئەوە پێویستی یەك بوو کە لە دەرونی یعقوب دا بوو, واتە سۆز و بەزەیی نیازی خێر و خۆشی بۆ کوڕەکانی لە دەرونیدا بوو بەجێی هێنا و دەری بڕی ﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَـٰهُ﴾ بەڕاستی یعقوب خاوەنی زانین بوو بۆ ئەوەی کە ئێمە فێرمان کرد و زانامان کرد پێی, یان بەڕاستی خاوەنی زانینێك بوو لەبەر ئەوەی فێرمان کردبوو ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن و زانا نین بە نهێنیەکانی قەزا و قەدەر. ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ کاتێ کە چوونە لای یوسف ﴿ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ﴾ براکەی گرتیە لای خۆی و ڕێزی گرت و لای خۆی و لە جێی شوێنی خۆی داینا, ئەگێڕنەوە کە میوان داری کرد بۆ براکانی و دوو دوو داینان و بنیامین بە تەنها مایەوە و ئینجا گوتی: ئەمە تەنهایە و با لای من بێت و نانی لەگەڵ خوارد و لە هۆدەکەی خۆیدا خەواندی و ئەویش هەر داخ و خەمی دەر ئەبڕی لەمەی کە برایەکی بووە و تێدا چووە, ئینجا ئەمیش پێی فەرموو حەز ئەکەیت من لە جێی ئەو برایە بم, ئەویش گوتی: ئایا کێ برای وەك تۆی دەست ئەکەوێت؟ بەڵام تۆلە یعقوب و دایکم پەیدا نەبووی, ئینجا یوسف گریاودەستی کردە ملی و﴿قَالَ﴾ فەرموی پێی ﴿إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ﴾ بەڕاستی من براکەی تۆم. ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ کەواتە هیچ غەمبار مەبە بەوەی کە ئەوان کردیان لەگەڵمان, ئەوا خواچاکەی لەگەڵ کردین وکۆی کردینەوە, دیارە پێی فەرمووە کەئەوهەواڵەنەدا بەبراکانی,

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾
قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ
وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾

---

**چونکە تەگبیرێکی وای بەدەستەوە بوو بۆ هێشتنەوەی براکەی لای خۆی وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ ﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ﴾ کاتێك کە ڕێکی خستن و کارو باری بۆ تەواو کردن ﴿جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ ئەو شتەی کە پاشا ناوی تێدا ئەخواردەوە و پێوانەیان پێ ئەکرد, ئەو شتەی خستە ناو باری براکەی ﴿أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ﴾ ئینجا جاڕچی یەك جاڕی دا بەمەی ئەی کاروانەکە بەڕاستی ئێوە دزن – واتە ئەی خاوەن کاروان – ئەگەر ئەمە قسەی جاڕچی یەکە بووبێ ئەوا بە پێی ڕاو و گومانی خۆی ئەوەی گوتووە و هیچ جێگەی قسەو باسی نییە, ئەگەر بە فەرمانی یوسف(ع) بووبێت ئەوا ئەبێ بە جۆرێ مەبەست بێ کە ئەبێتە درۆ و بەم ڕەنگە مەبەست دزینی یوسف بێت لە باوکی کە کاتێ خۆی دایان شارد لە باوکی وەك دزین, ئەبێ یوسف(ع) براکەی حاڵی کردبێ لەو تەگبیرە و مەبەست هێشتنەوەیەتی لای خۆی, کەواتە هیچ ئازاردانی دڵی ئەوی تێدا نییە و کارەکە گوناه نەبوو لەو بارەیشەوە بێگومان هەرچۆن بووبێ براکانی یوسف(ع) لەو جاڕدانە داچڵەکاون و ئەبێ خۆیان پاك بکەنەوە لەو گومانە, لەبەر ئەوە ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان: ﴿وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم﴾ لە کاتێکدا ڕوویانکردە داواکارەکان, واتە بە داچڵەکان و بە ناڕەحەتی یەوە گوتیان ﴿مَّاذَا تَفْقِدُونَ﴾ ئایا چیتان ون کردووە؟ ﴿قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ﴾ گوتیان ئاو پێ خۆرەکەی پاشامان دیار نییە, ﴿وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ﴾ باری حوشترێك خۆراکیش هەیە بۆ کەسێك بهێنێتەوە ﴿وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ﴾ من کە فیلم پێی و بە پێدانی ئەو بارە, ﴿قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ﴾ گوتیان سوێند بە خوا ئێوە زانیوتانە کە ئێمە نەهاتووین بۆ ئەوەی کە خراپە بکەین لە وڵاتدا, ئیتر بە دزی یا بە هەرچی, ئێمە هەرگیز دز نەبووین و پیشەمان دزی کردن نەبووە, ئەو برایانە لە هاتن و هاتو چۆ کردنیاندا دەرکەوتووە کە خراپەکار نین, بە تایبەتی کە زانراوە لەو بنەماڵە بەرز و پیرۆزەن لەبەر ئەوە زانین و شارەزایی ئەوانیان کرد بە شایەت و بەڵگە لەسەر پاکێتی خۆیان.**

قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥۚ كَذَٰلِكَ
نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوۡعِيَتِهِمۡ قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِۚ
كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَۖ مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن
نَّشَآءُۗ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ﴿٧٦﴾

---

**﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ﴾ دەی ئایا تۆڵەی ئەوە چییە، واتە تۆڵەی دزینی ئەو ئاو پێوە خۆرە؟ ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان: ﴿جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾ تۆڵەی ئەوەیە هەر کەسێك ئەوە لەبارەکەیدا دۆزرایەوە ئەو کەسە تۆڵەکەیەتی، واتە گیرانی ئەو کەسە بە بەندە تۆڵەی ئەو تاوانەیە، ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئێمە بەو جۆرە تۆڵە لە ستەمکاران دەسێنین، واتە لە دز. ﴿فَبَدَأَ بِأَوۡعِيَتِهِمۡ قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ ئینجا یوسف یا جارچیەکە دەستی کرد بە پشکنینی کیسەو جەواڵەکانی براکان لە پێش پشکنینی کیسەو جەواڵی براکەی یوسف واتە بنیامین کە برای دایك و باوکی یوسف بوو، ﴿ثُمَّ ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ لە پاشدا دەری هێنا لە کیسەو جەواڵی براکەی، ﴿كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَ﴾ بەو جۆرە نایابەکار و کردەوەمان کرد بۆ یوسف لەبەر پێکهێنانی مەبەستەمەی کە مانەوە و هێشتنەوەی براکەیەتی لای خۆی، بە جۆرێ نە براکانی و نە خەڵکی تر ئاگادار بوون لەو کار و کردەوەیە کە باسکرا بوو بەهۆی پێکهاتنی مەبەستەکەی یوسف، بە جۆرێ کە هیچ رێگەیەك نەما بۆ براکانی، هیچ رەخنەیەك بگرن لەو بریارە کە بە پێی قسەی خۆیان بوو و رواڵەتیش بە پێی بریاری شەریعەتی یعقوب بوو کە دز ئەگیرا و ئەدرا بە خاوەن ماڵەکە، نەك بە پێی یاسای پاشا کە تۆڵەی دز بە جۆرێکی تر بوو وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ﴾ نەیکات بەهۆی ئەو تەگبیرە، واتە بەو جۆر و شێوەیە ئەو تەگبیرەمان کرد بۆ یوسف کە**

براکەی وەرگرێ بە پێی شەریعەتی یعقوب,چونکە یوسف ئەوە نەبوو کە براکەی وەرگرێ لە ئایینی پاشا و بەپێی ئایینەکەی ئەو، براکەی وەرنەگرت لە تۆڵەی ئەو دزی یەدا بەهیچ رەنگ و لەهیچ کاتێکدا، ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ مەگەر کاتێ کە خوا بیەوێ و بیویستایە ئەوەش بەو تەگبیرە کە فەراهەمی هێنا. هێندێ ئەفەرمون: مەگەر خوا بیویستایە بەم رەنگە ئەو بریارەی بگێڕایە بە بڕیاری پاشا بەم رەنگە پاشا بڕوا بهێنێ بە شەریعەتی یعقوب و بەوە رەفتار بکات. زۆر پێویستە بیر بکەینەوە لەدەست نیشانەکانی قورئان کە لەم ئایەتەدا فەرموی: ﴿دِينِ ٱلْمَلِكِ﴾ بێگومان مەبەست لێرەدا عەقیدە و بڕوا و بەجێهێنانی دروشم و نیشانەکانی خواپەرستی نییە کە پێیان ئەگوترێ ﴿شعائر﴾ بەڵکو ئاشکرایە کە مەبەست بەو وتەیە یاسا و بەرنامەیە، کەواتە ئەم وتەیە بە تەنها ئەو کەسانە ئەخاتەوە بە درۆوە کە ئەیانەوێ ئایین ببڕن هەر بەسەر باوەڕ و دروشمی خواپەرستیدا، ئەو نیازو وتەی ئەوانە بە تەواوی پووچەڵ و بێ نرخ ئەکات. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ رێزو پلەی بەرزی یوسف کە خوا ئەو تەگبیرەی نیشاندا و فێری کرد، ئەفەرموێ: ﴿نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ﴾ هەرکەسێکمان بوێ و مەیلمان ببێ بەرزی ئەکەینەوە چەند رادەو پلەیەك، ئینجا هەرکەس رادەو پلەی بەرزبکرێتەوە با بزانێ لە ژووری ئەوەوە زاناتر هەیە تا ئەگاتە خوا کە لەوێدا هەموو رادەو پلەیەك کۆتایی پێدێت و دوایی دێت وەك ئەفەرموێ: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ لەسەرووی هەموو خاوەن زانینێکەوە زانای تەواو هەیە کە بێ هاوتا و بێ وێنەیە و بەخشندەی هەموو زانینێکە، ئەوەش کە خوای پەروەردگارە، کەواتە با هەموو کەس سەری بەندەیی هەر بۆ ئەو دابخات و هەر ئەو بپەرستێ، ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆلای براکانی یوسف کە چییان کرد بەرامبەر ئەو بەسەرهات و رووداوە لە یەکەم جارەوە دەری ئەخات کە ئەو برایانە قین و رقیان لە یوسف هەبوو،

﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ يُبۡدِهَا
لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا
شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ
إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾

بەردەوام وەك ئەفەرمویٚ: ﴿قَالُوٓاْ﴾ گوتیان: ﴿إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ﴾ ئەگەر ئەم دزیبیٚتی ئەوا برایەکی دزی کرد لەپیٚش ئەمەوە، واتە جیٚگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە برایەکی لەپیٚش ئەمەوە دزی کرد، کەواتە ئەمیش وەك ئەو ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ﴾ ئینجا یوسف دڵگرانی ئەو قسە بەدەی ئەوانی لە دەروونی خۆیدا شاردەوە﴿وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ﴾ دەری نەبڕی و ئاشکرای نەکرد لیٚیان لە کاتیٚکدا ئەیزانی خۆی و براکەی بەرین لیٚی، بەڵکو﴿قَالَ﴾ هەر ئەوەی گوت: ﴿أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ﴾ ئیٚوە بەدو خراپترن لەبارەی ئەوەی کە ئیٚوە ئەیڵیٚن(چونکە ئیٚوە براکەتان دزی لە باوکی) ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ خوا زاناترە بەوەی کە ئیٚوە ئەیڵیٚن دەربارەی ئیٚمە، خوا بە ئەوپەڕی رادە زانایە بەوەی کە ئیٚمە دوورین لە دزی یەوە، ویستی بەوە دەمە قاڵیٚکە بڕیٚتەوە. ئینجا ویستیان دڵی وەزیر نەرم بکەن، بەڵکو براکەیان بەرەڵا بکات، ﴿قَالُواْ﴾ گوتیان﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ﴾ ئەی عەزیز﴿إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا﴾ بەڕاستی ئەو باوکیٚکی پیری هەیە کە چووە بەساڵەوە و ناتوانیٚ و ناژی بەبیٚ ئەو، ﴿فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ﴾ کەواتە یەکیٚ لە ئیٚمە لە شوێنی دابنیٚ لەباتی ئەو ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی ئیٚمە تۆ ئەبینین کە لە چاکە کارانی - لەگەڵ ئیٚمە - ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ﴾ ئەویش گوتی پەنا بەخوا لەوەی هیچ کەسیٚك بگرین بیٚجگە لەوەی کە شتەکەی خۆمانمان دەستکەوت لای ﴿إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ﴾ بیٚگومان ئەگەر وا نەکەین لە ستەمکاران ئەبین، بەڕاستی فەرمودەکەی زۆر ورد و راست و بەجیٚ بوو، نافەرمویٚ: بیٚجگە لەوەی دزە، چونکە لەڕاستیدا ئەو بەهیچ جۆریٚك دز نەبوو، گرتنی هەرکام لەوانە ستەم و ناهەقی ئەبوو، بەڵام گرتنی براکەی خیٚری تیٚدا بوو بۆ خۆیشی و بۆ ئەویش ! بۆیان دەرکەوت کە تکاو لاڵەیان هیچ سوودی نابیٚت و ئەو کوڕە نەگیری،

فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُواْ مِنْهُ خَلَصُواْ نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ

---

﴿لەبەر ئەوە بیریان لەوە کردەوە کەچی بکەن و بەچی ئەم کارە پینەو پەڕۆ بکەن لای باوکیان وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُواْ مِنْهُ خَلَصُواْ نَجِيًّا﴾ ئینجا کاتێ کە نائومێد بوون لەوە وەیز بەرەڵای بکات جیا بوونەوە لە خەڵکی بە تەگبیر و راوێژ کردن بە نهێنی کە چۆن بکەن و هەڵوێستیان چۆن بێت لەگەڵ باوکیان، ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ﴾ گەورەکەیان گوتی پێیان: ﴿أَلَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئایا نازانن کە باوکتان سوێند و پەیمانێکی لەلایەن خواوە لەسەر دانان و لێی وەرگرتن ﴿وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ﴾ لەکاتێکدا لە پێش ئەمە قسورتان لە یوسف دا کرد، پارێزگاری سوێند و پەیمانەکەی باوکتان نەکرد ﴿فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى﴾ کەواتە من ناڕۆم و لەم خاکە جوێ نابمەوە هەتا باوکم ئیزنم بدات بەدەرچوون، یان خوا بڕیارێکم بۆ بدات بە جۆرێ سوێند و پەیمانەکەم نەشکێ، یان بە رزگار بوونی براکەم، واتە دەرچوونم لەم خاك و وڵاتە نییە بە یەکێ لەم دوو بارە نەبێ: ئیزنی باوکم یان پارێزگاری خوا، هەرچەندە ئیزنی باوکیش ئەگەر ببێ هەر بڕیاری خوایە، بەڵام بەجیا باسی کرد و لەبەر ئەوەی بەلاوە خۆشترە، یان مەبەستی ئەوەبوو لە پێشەوە هەر ئەوەی ئەویست لەپاشان لەوە گەڕایەوە لەبەر شەرم کردن لەخواو کارەکەی هەر حەواڵەی خوا کرد ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ خوا باشترینی هەموو بڕیار دەرانە، گەورەکەیان بۆ خۆی ئەو بڕیارەی داو بۆ ئەوانی تر گوتی: ﴿ٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ﴾ بگەڕێنەوە بۆلای باوکتان ﴿فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ﴾ پێی بڵێن ئەی باوکی خۆمان ﴿إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ﴾ بەڕاستی کوڕەکەت دزی کرد،

وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا
وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ
عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ

---

**﴿وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا﴾ ئێمە شایەتیمان نەداوە لەسەری و شایەتی نادەین مەگەر بەوەی کە زانیومانە، ئەوەی کە زانیومانە ئەمەبوو کە دزی کرد ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ﴾ ئێمە پارێزەرو ئاگا نەبووین بە غەیب و نهێنی، ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان نەکردووە لەو کوڕە ﴿وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا﴾ پرسیار بکە لە دانیشتوانی ئەو شارەی کە ئێمەی تێدا بووین، ﴿وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا﴾ پرسیار بکە لەو کاروانەی کە ڕوومان تێکردوون و لەگەڵیان بووین، واتە ئەگەر بڕوامان پێناکەیت ئەوا ئەو پرسیارانە بکە تا بۆتدەرکەوێت کە شتەکە ڕاستەو بووە ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ بێگومان ئێمە ڕاستمان کردووە ڕاستگۆین لەوەدا، بەڵێ ئەو برایانە گەڕانەوە بەو هەواڵ و قسەو باسەی کە گوترا، ئینجا با بزانین باوکیان چی فەرمو پێیان ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ واتە یەعقوب فەرموی: نەخێر ئێوە بێ خەتا نین لەو بەسەرهاتەدا، بەڵکو خۆتان و نەفسی خۆتان کارێکی بۆ سووک و ئاسان کردن و لەپێش چاوتان شیرینی کرد، کارەکەش ئەوەبوو ئەو تۆڵە و بڕیارەتان پەسەند کرد لەبارەی دزەوە کە ئەوە لە ئایینی پاشادا نەبوو، ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ ئینجا کاری من ئارام و خۆگرتنێکی جوانە، بەم ڕەنگە دادی خۆم بدەمە دەست خواو لای کەس باسی ناکەم، لەجاری پێشوویشدا لەبارەی یوسفەوە ئەمەی فەرمو: بەڵام لەم جارەدا ئومێد و چاوەڕوانی خۆشی نیشان داو فەرموی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا﴾ بە ئومێد و چاوەڕوانم کەخوا هەموویانم بۆ بهێنێتەوە، واتە یوسف و بنیامین و برا گەورەکەیان و هۆی ئومێدەکەشی ئەمەبوو کە فەرموی: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾ بەڕاستی خوا تەنها ئەو زانای تەواو و لێزان و کاردروستی تەواوەو هەموو شتێ لەکاتی خۆیدا بەجێ ئەهێنێ، هەموو دەردو دەرمانێك هەر لای ئەوەو بەدەستی ئەوە، بەندەی خواناس کە دڵی پەیوەست بێت بەخوای خۆیەوە هەرگیز نائومێد نابێ با بگاتە ڕادەی ئەوپەڕی سەختی و تەنگانە، ئەو ئومێدە لەپێش چاوی ئەبێتە شتێکی ڕاستی بەدی هاتوو، وەك بە چاوەوە بێت ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ﴾ ڕووی لێ وەرگێڕان و پشتی تێکردن لەبەر ناخۆشی ئەو هەواڵەی کە هێنایانەوە بۆی،**

وَقَالَ يَٰأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُاْ
تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ
بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَٰبَنِيَّ ٱذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ
وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ
عَلَيْهِ قَالُواْ يَٰأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَٰعَةٍ مُّزْجَىٰةٍ فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ
عَلَيْنَآ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِي ٱلْمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾

---

**﴿وَقَالَ يَٰأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ فەرمووی: ئای داخ و خەمی زۆر سەخت و بەتینم وەرە پێشەوە ئەمە كات و شوێنی تۆیە، هەرچەندە داخ و مەراقی كوڕەكانی تریشی بەسەردا هات، بەڵام هەر باسی یوسفی كرد، چونكە ئەو سەرچاوەی هەموو داخ و مەراقەكان بوو، داخ و مەراقەكەی ئەو هەر لە یەكەم جارەوە دڵی داگیر كردبوو، ئەو داخ و خەمەی خوارد بوو و تاكاری كردبوو لە دەمارەكانی و بەهۆی ئەوەوە ڕەشێنی چاوەكانی سپی بوونەوە وەك ئەفەرمویْ: ﴿وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ﴾ هەردووچاوی سپی بوونەوە لە داخ و غەمدا ﴿فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ چونكە ئەو رقی خۆی خواردبووەو پێچابوویە دڵی و دەری نەئەبڕی، قین و ڕقی ئەو كوڕانە لە رادەیەكدا بوو بەزەیی یان بەو باوكە جگەر سووتاوەدا نەئەهاتەوە، بەڵكو لەباتی دڵخۆشی دانەوە بە بێزاری یەوە ﴿قَالُواْ﴾ پێیان گوت: ﴿تَٱللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ﴾ سوێند بەخوا واز ناهێنی هەر باسی یوسف ئەكەی هەتا ئەبێت بە نەخۆشی یەكی بەرەو نەمان یان لەداخدا لەڕو لاواز و ڕەق و وشك ئەبیتەوە یان هەر ئەمریت و ئەچیتە ریزی لەناوچووان. باوكی دڵ زامدار بەرپەرچی دانەوە بەمەی ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ گوتی: دادی ناڕەحەتی و پەرتی دڵم و بەسەرهاتی سەخت و غەم و پەژارەم هەر بۆلای خوا ئەكەم و نەك بۆلای هیچ كەسێكی تر، ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ من لەلایەن خواوە شتێك ئەزانم كە ئێوە نایزانن، ئەو نائومێدی یە لە مانی**

یوسف و ئەو نەمانی هیچ هەواڵ و دەنگ و باسی لەو ماوە دوورو درێژەدا ئەو دڵە بڕوا دارەی ئەو باوکەی نەگۆڕی و نائومێدی نەکرد لەخوای خۆی، چونکە هەر دڵی خوای خۆی ناسی و بڕوای راستەقینە تێیدا جێگیر بوو، ئەو دڵە هەرگیز ناگۆڕێ و دامەزراوە بەرامبەر خوای خۆی لە هەموو کات و بەسەرهاتێکدا، خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات و نائومێدمان نەکات لە فەرو بەهرەیدا. ئینجا ئەو باوکە خواناسە تەمێی ئەو کوڕانەی کرد کە نائومێد نەبن لە بەزەیی و میهرەبانی خواو بگەڕێن بەدوای یوسف و براکەیدا و فەرموی: ﴿يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ﴾ ئەی کوڕەکانم بڕۆن و بگەڕێن و هەوڵ بدەن و چاوو گوێ هەڵخەن تا بەهۆی ئەوەوە هەواڵێکی یوسف و براکەی بزانن و لەبارەیانەوە دەنگ و باسێك وەرگرن، ﴿وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ﴾ نائومێد مەبن لە دەروو لێکردنەوە و هەناسەیەکی خۆشی لەلایەن خواوە بێت و تەنگی ناخۆشی لابات ﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ بەڕاستی کار بەم جۆرەیە: نائومێد نابێ لە دەروو لێکردنەوەی خوا هاتنی خۆشی لای خوا بێجگە لەوانەی کە بێ باوەڕن، ئەوانەی کە بڕوایان هەیە و دڵیان لای خوایە و پەیوەستە بە خواوە، ئەوانە هەرگیز ئەو نائومێدی یە روویان تێناکات هەرچەند لە تەنگی و سەختی و ناخۆشی دا بن.

ئینجا بۆ جاری سێ یەم براکانی یوسف هاتنەوە بۆ میسر لە کاتێکدا برسێتی زۆری بۆ هێناون پول و پارەیان نەماوەو شتی بێ نرخیان پێیە بۆ کڕینی خۆراك، بە دڵێکی شکستەوە داوا ئەکەن لە یوسف وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ﴾ کاتێ کە چوونە لای گوتیان: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ﴾ ئەی عەزیز – مەبەست سەرەك وەزیرە – ﴿مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ﴾ زیان و لاوازی و برسێتی داویەتی لە خۆمان و ماڵ و منداڵ و کەس و کارمان. ﴿وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ﴾ شت و مەکێکمان هێناوە بۆ کڕینی خۆراك کە نەویستەیە و بێ نرخە ﴿فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ﴾ کەواتە فرۆشتن و پێوانەمان بۆ تەواو بکە، واتە گوێ مەدە لە کەم و کوڕی و بێ نرخی شتەکانی ئێمە ﴿وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ﴾ خێرو سەدەقەمان پێبکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ﴾ بێگومان خوا پاداشتی کەسانێك ئەداتەوە کە خێرو سەدەقە ئەکەن، تا ئەوکاتە یوسف(علیه السلام) خۆی دەرنەخست، بەڵام کاتێ کە کار گەیشتە ئەوە سۆزو بەزەیی هاتە کایە،

قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ
قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ
أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾

**لەبەرئەوە خۆی دەرخست بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ﴾ ئایا زانیوتانە و ئەزانن ئەوەی کە کردتان بە یوسف و براکەی لەو کاتەدا کە ئێوە نەفام و نەزان بوون؟ واتە ئەزانن بەدی و خراپی ئەو کردەوەتانە، شتێکی پێ گوتن کە هیچ گومانیان نەهێلێ و تێ بگەن کە ئەمە یوسفە، چونکە تا ئەو کاتە ئەو پیاوەیان بە عەزیزی میسر دانا بوو، زۆر دوور بوو ئەو شەوکەت و جەلالەی کەسێکی تر بێت چ جای یوسف کە ئەمان و تیاچوونی بەلایانەوە جێگەی گومان نەبوو، بەڵام ناونیشانەکە ئەوەندە راست بوو، ئەو بارو حاڵ و بۆچوونەی لەوە و پێشتی نەمێشتن لەبەرئەوە، ﴿قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ﴾ گوتیان راست و بێگومان یوسفیت؟ ﴿قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ﴾ فەرموی پێیان من یوسفم و ئەمەش براکەمە ﴿قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ﴾ بەڕاستی خوا منەتی نا بەسەرماندا، هۆی ئەو منەت نانەشی بۆ باسکردن بەم فەرمودەیە ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ بەڕاستی کار بەم جۆرەیە، هەرکەس خۆی بپارێزێ لەهۆی ناڕەزایی خواو خۆی بگرێ لەسەر سزاو ناخۆشی لەبەر خوا، بێگومان ئەجرو پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، یوسف(علیه السلام) بەو جۆرەسوپاسی خوای کردووە براکانیشی کارو کردەوە بەدەکانی خۆیان بیر کەوتەوە لەبەر ئەوە ریسوایی و خەجاڵەتی گرتنی و دانیان نا بە بەهرەی یوسف و گوناهو بەدی ی خۆیان بەم جۆرە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ﴾ گوتیان بە یوسف سوێند بەخوا، بەڕاستی خوا تۆی باودا و هەڵیبژاردی بەسەر ئێمەدا، بەڕاستی ئێمە گوناهبار و تاوانبارین، بەرامبەر دان نانی ئەوان بە گوناهی تاوانی خۆیان،**

قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذْهَبُوا۟
بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾

---

**﴿قَالَ﴾ یوسف پێی فەرموون: ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ﴾ ئیمڕۆ هیچ جۆرە تەریق کردنەوەو تەشەرێکتان لەسەر نییە، واتە لەلایەن منەوە هیچ شتێك نییە و هیچ شتێکم لەدڵدا نییە لەلایەن خوایشەوە ﴿يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ خوا لێتان خۆش ئەبێ، واتە لە جێیە من لێتان بوردم خوا باشتر لێتان ئەبووری، چونکە ئەو لە هەموو کەس میهرەبان ترە، یان مەبەستی نزا کردنە بۆیان، لەسەر هەر بار ئەوەندە دڵنیایە بە میهرەبانی خوا بە شێوەی هەواڵ پێدان مەبەستەکەی ئاراستە کردن(علیه السلام). ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بە قسە کردن لەو بارەیە و باسی شتی گرنگ تر ئەکات، باسی باوکی ئەهێنێتە پێشەوە کە لە داخ و مەراقدا چاوەکانی بینایی یان نەماوە، ئەیەوێ بە زوویی چارەسەری ئەوە بکرێ، ئەیەوێ بە زویی مزگێنی بۆ بڕوا و دڵە غەمبارەکەی ئارام پێبدات، ئەیەوێ بە زوویی بگات بە خزمەتی، ئەیەوێ ئەو کەس و کارە یەك بگرن و کۆ ببنەوە و بە خۆشی بژین تا خوا مەیلی ببێ، فەرمووی پێیان، ﴿ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا﴾ بڕۆن و ئەم کراسی منە ببەن ﴿فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا﴾ ئینجا دەست بەجێ بیخەن و بیدەن بەسەر دەم و چاو و رووی باوکمدا تا چاوی چاك ببێتەوە، یان تا چاوێکی بیناوە بێت، ﴿وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾هەموو خێزان و منداڵ و کەس و کارەکانتانم بۆ بێنن، بێگومان خوا ئاگادار و زانای کردووە بەوەی ئەو کراسە هۆی چاك بوونەوەی چاوی ئەبێ. ئەمەی کە چۆن ئەوە بێت بە هۆی چاك بوونەوە هەر خوا خۆی باش ئەزانێ، هەرچۆن بێت ئەوەش رێزێکی تایبەتی تێدایە بۆ یوسف(علیه السلام).**

وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾

---

**بەپێی فەرمودەکەی یوسف کراسەکەیان نارد ﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ﴾ کاتێ کاروانەکە جوێ بووەوە واتە لە میسرەوە بەرەو وڵاتی کەنعان یان جوێ بوویەوە لە خاکی کەنعان دا بەرەو جێ و شوێنی یەعقوب(عليه السلام)، بە هەرکام هەڵئەگرێ و هەر شتەکە موعجیزەیە کە چەند ساڵە یوسف نەماو خەیاڵی مانی نەئەکراو کەچی لە دوورەوە باوکی دڵی زامداری بۆنی ئەو کراسە بکات و وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالَ أَبُوهُمۡ﴾ باوکیان گوتی: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ﴾ بەڕاستی من هەست ئەکەم بە بۆنی یوسف﴿لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ ئەگەر من بە خەرەفاو و تێکچوو دانەنێن بەهۆی پیریمەوە ئەوە ئەڵێم، یان باوەڕم پێ ئەکەن، بەڵام ئەوانەی کە لە دەوروبەری بوون بەشدار نەبوون لەو هەست و هۆشەی کە خوا دابووی بەو باوکە بەڕێزە، کە لەبەر ئەوە، ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ﴾ سوێند بەخوا تۆ هەر لەسەر هەڵەی کۆنی خۆت دای کە بەو جۆرە خۆش ویستنی یوسف دڵی داگیر کردووی و هەر باسی ئەکەیت و هەر مەراقی ئەو ئەخۆیت، ئەوانە بێ ئاگا بوون لەوەی کە شتەکە ڕاستە و گومانی تێدا نییە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ﴾ ئینجا کاتێ مزگێنی دەرەکە هات و گەیشتە بەرەوە کراسەکەیدا بەسەر روو و چاویدا بەهۆی ئەوەوە یەعقوب گەڕا بە بینا لەپاش ئەوەی کە نابینا بوو، ئینجا ئەو قسەو ئامۆژگارییەی کە لە پێشەوە ئاراستەی کردن، لێرەدا دووبارەی کردەوەو بیری خستنەوەبەم جۆرە: ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمون: ﴿أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئایا پێم نەگوتن: بەڕاستی لەلایەن خواوە من شتێ ئەزانم کە ئێوە نایزانن،**

قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾
وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَـٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَـٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا

---

**ئینجا براکان هیچیان بۆ نەمایەوە بێجگە لەوەی دان بنێن بە تاوان و گوناهی خۆیاندا و داوای لێبوردن بکەن وەك ئەفەرموێ: ﴿قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ﴾ گوتیان ئەی باوکی خۆمان داوای لێبوردنی گوناهەکانمان بکە، بەڕاستی ئێمە گوناهبار بووین، ﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ﴾ یەعقوب فەرمووی لەمەو پاش و لە داهاتوودا داوای لێبوردنتان بۆ ئەکەم لە پەروەردگارم، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو لێبوردەی میهرەبانە، وا دەرئەکەوێ کە هێشتا لەوکاتە دڵی ئاشت نەبووبێتەوە لەگەڵیان، هەرچەندە بەڵێنی پێدان بە لێبوردنی خوا لێیان.**

**بەپێی فەرمان و داواکەی یوسف کەس و کار هاتن لە خزمەت باوکیاندا ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ کاتێ کە چوونە لای یوسف ﴿ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ﴾ باوك و دایکی گرتەلای خۆی و دەستی کردە ملیان ﴿وَقَالَ ٱدْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ﴾ فەرمووی پێیان: وەرنە میسر ئەگەر خوا بیەوێ بە ئارامی و بێ باکی﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ باوك و دایکی بەرز کردەوە سەر تەختەکەی خۆی و لای خۆی داینان بۆ زیادە رێز پێدان﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾ هەموو کەوتن بە رووودا بۆی بە سوژدە بردنەوە ﴿وَقَالَ يَـٰٓأَبَتِ هَـٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَـٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾ گوتی ئەی باوکی خۆشەویستم: ئەمە خەوپەرژینی خەوەکەم بوو کە لەمەوپێش بینیم ئەوا پەروەردگارم بەڕاستی بەدی هێنا و بەڕاستی گێڕا، لەبارەی سوژدە بردنەوە چەند قسەو باس و لێکۆڵینەوە کراوە، بەڵام ئەوەی پێ ناوێ چونکە شتێکی ئاشکرایە سوژدەی پەرستن نەبووە، بەڵکو سوژدەی رێز گرتن بووە، دەی چی تیایە لەو چەرخەدا باو بووە ئەو جۆرە سوژدە براوە بۆ پاشان و لە لایەن شەرعەوە بەرگری نەکراوە، ماتوڵ قورئان باسی ئەکات بەبێ رەخنە و لە پێشەوە لە خەودا بینراوە لەپاشان بە راست گەڕا ئیتر ئەوە بەڵگەیەکی روونە لەسەر دروستی و رەوا دانی، هیچ لادان و پینە و پەڕۆی ناوێ و بەپێی رواڵەت و رووکەشی ئایەتەکە وەرگیرێ بێ سەر لێکردنەوە،**

وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ
إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ
وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ
تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ
أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴿١٠٢﴾

---

**ئینجا یوسف باسی چاکەی خوا ئەکات بەسەری یەوە و ئەفەرموێ: ﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ﴾ خوا چاکەی لەگەڵ کردم ﴿إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ﴾ لەکاتێکدا دەری هێنام لە بەندو بەندیخانە ﴿وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ﴾ ئێوەی لە دەشت و لادێوە هێنا بۆ ناو شارو ئاوەدانی، ئەمانەشی بۆ کردم ﴿مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ﴾ لەپاش ئەوەیشەیتان تێکدان و ناخۆشی خستە نێوان من و براکانم ﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم زانایە بە هەموو کارە نهێنی یەکان و تەگبیریان ئەکاو بە ئاسانی ئەوەی کە مەیلی بکات و بیەوێ بەجێی ئەهێنێ و بە وردی و بەجۆرێ کەس هەستی پێناکات ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو زانای کار دروستە، هەر ئەوە مەسڵەحەت و بەرژەوەندی یەکان ئەزانێ و هەموو کار و کردەوەی بەجێیە و دەست نادا بۆ ئاڵ و گۆڕ و دەستکاریی.**

**ئینجا لەو کاتە کەس نەدیوەدا، کاتی خۆشی و شادمانی بەو هەموو نازو ڕێز و دەسەڵات و شاد بوون بە هەرشتێك کە دڵ بۆی بڕوا و ئارەزووی بکات و بەدی هاتنی هەموو ئاوات و ئامانج، لەو کاتەدا دڵە خواناسەکەی یوسف(علیە السلام) داوای ئەوە ئەکات کە خوا بە موسڵمانێتی بیمرێنێ و بیگەیەنێ بە بەندە ساڵحەکانی خوا ! ئەوەتا لەو کاتەدا رووی کردە قاپی خوا و گوتی: ﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ﴾ ئەی پەروەردگارم بە راستی پێت بەخشیم لە موڵك و دەسەڵات و پاشایەتی کە ئەوە چاکە و بەهرەی دنیایە، ﴿وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ﴾ فێرت کردم و زانات کردم بە خەو پەرژین و سەرەنجام و دوا رۆژی خەوەکان و هێندێ لەو شتە نهێنی یانە کە ئەوەش هێندێکە لە بەهرەی علیم و زانین ﴿فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەی کەسێ کە داهێنەر و دروستکاری ئاسمانەکان و زەویت﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ تۆ کاربەدەست و کۆمەك و یارمەتی دەری منی لە دنیا و لەرۆژی دواییدا ﴿تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي**

﴿بِالصَّـٰلِحِينَ﴾ بە موسڵمانێتی بم مرێنە و بمگەیەنە بە بەندە چاکەکان، واتە باوك و باپیرم، یان هەموو بەندە چاکەکان، وتەی(صالح) زۆرتر لە ئایەت و حەدیسدا مەبەست پێغەمبەرانە، واتە ئەی خوایە ئەو هەموو چاکە و بەهرەیەت رژاند بەسەرمدا کە دەست نیشانم بۆ کردووە من داوای هیچ شتێکی ئەم دنیایەت لێناکەم، بەڵکو داوای شتێك ئەکەم کە هەر ئەمێنێتەوە و هەموو چاکە و بەهرەیەکی تێدایە، یا الله بە میهرەبانی خۆت بە موسڵمانێتی لە دنیادا بمژێنە و بە موسڵمانێتی بم مرێنە لەگەڵ پیاو چاکاندا حەشرم بکە. ئەی خوایە ئەمەش داوای منە بە تایبەتی کە خەریکیم بەم تەفسیرەوە، ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکە و لێم وەگرە و سوود بەخشی بکە بە برا موسڵمانەکانم ئامین.

داستان و سەر گوزەشتەی یوسف دواییهات، ئەو داستانەی کە ناسراو نەبوو لەناو ئەو گەلە نەخوێندەواری کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەوان بوو، لەناو ئەوان دا پێ گەیشت بە نەخوێندەواری و بێ ئاگایی و لەپاش چل ساڵ رەوانە کرا بە پێغەمبەرێتی و وێنەی ئەم داستانە و وێنەکانی بۆ هێنان کە بێگومان ئەوە بەڵگە و نیشانەو موعجیزەیەکی ئاشکرایە، لەبەر ئەوە ئەوا سەرنج رائەکێشێ بۆ ئەوەو ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ﴾ ئەوەی کە بۆمان باسکردی لەم داستانەدا لە هەواڵەکانی غەیبە و تۆ ئەی پێغەمبەر بێ ئاگا بووی لێی ﴿نُوحِيهِ إِلَيْكَ﴾ سروش و وەحی ئەکەین بۆ لات و بە نهێنی رای ئەگەیەنین پێت، ئەگەر بە وەحی نەبوایە تۆ ئەمەت لە کوێ ئەزانی؟ ئەگەر بە وەحی و راگەیاندن نەبووایە تۆ چووزانیت بەو پیلانانەی کە دەربارەی یوسف کرا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓاْ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾ تۆلای ئەوانە نەبوویت کە هەموو بڕیاری کارو مەبەستەکەی خۆیانیاندا لە کاتێکدا کە بە نهێنی و لەناو خۆیاندا پیلانیانکرد و تەگبیری خراپیانکرد دەربارەی یوسف، لە یەکەم جارەوە تەگبیر و پیلانی براکان کە بەناوی خۆشی و سەیرانەوە دووریان خستەوە لە باوکی کە ئەوە پیلان بوو لەگەڵ باوکیشیان، ئینجا لەپاش دوورخستنەوەی لەباوکی تەگبیر و پیلانیان لە چۆنی یەتی لەناوبردن و دووچار کردنی تا بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە بیخەنە ناو بیرو خستیان، ئینجا تەگبیر و پیلانیان دەربارەی باوکیان کە بە گورگان خوراوی دابنێن وەك بە درێژیی تێپەڕی کرد، هەروەها هەموو پیلان و تەگبیرەکانی تر وەك پیلان و تەگبیر لەلایەن ئافرەتەکانەوە، تەگبیر و پیلان لەلایەن دەست و پێی وەزیرەوە تا خرایە بەندیخانە، دەی زانینی ئەو شتانە داخواز بوو بۆ ئەوەی ئەو گەلە و ئەو خەڵکە بڕوا بێنن کەچی فەرموی بە پێغەمبەر(ﷺ)،

﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٠٣ وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ
لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٤ وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ١٠٥﴾

---

﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾ زۆربەی خەڵكی بڕوادار نین هەرچەند تۆ سوور بیت لەسەر بڕوا هێنانیان و هەوڵ و تەقەلا بدەیت و بەڵگە و نیشانەی روون دەربخەیت و نیشانی بدەیت، بەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) زۆر سوور و هەوڵ دەر بوو لەسەر بڕوا هێنانی ئەو خەڵكە، بەڵام ئەو خەڵكە لارو بەد بوون روویان وەرئەگێڕا و بیریان نەئەكردەوە لەو هەموو نیشانە و بەڵگە روونانە، لەبەر ئەوە سوودیان وەرنەگرت، ئەبوو ئەو خەڵكە گومانیان نەبوایە لە راستی پێغەمبەری ئازیزدا بیان زانیایە كە مەبەستی هەر رەزامەندی ئەو خوایە كە بانگیان ئەكات بۆلای، چونكە هیچ پوول و پارە و دەستكەوتێكی دنیایی داوا نەئەكرد لێیان وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ﴾ تۆ داوای هیچ كرێ و پارەیەك ناكەیت لەوانە لەسەر ئەو راگەیاندن و ئەم قورئانە تا بكەونە گومان و بڵێن: مەبەستی بەرژەوەندی خۆیەتی، یان تا ببێ بە ئەرك بەسەریانەوە و نەتوانن هەڵسن پێی ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ئەو قورئانە هەرپەند و ئامۆژگاری یە بۆ هەموو جیهانییان، واتە هۆی داوا نەكردنەكەت لەوانە ئەمەی كە ئەم قورئانە تایبەتی نییە بەوانەوە، بەڵكو گشتی یە بۆ هەموو كەس هەموو كۆمەڵ و هەموو تیرەو هەموو جیهانییان بەبێ جیاوازی، دەی شتی وا گشتی داوای كرێی لەسەر ناكرێ و نابێ بە ئەرك بەسەرشانی دەستە و كۆمەڵێكەوە.

لادانی ئەو خەڵكە لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنها و لەبەر ئەوە نییە كە بەڵگە و نیشانە نەبێ لەسەری، بەڵكو بەڵگە و نیشانە ئەوەندە زۆرە نایەتە ژمارە بۆیان، بەڵام بیریان لێناكەنەوە و روویان لێ وەرئەگێڕن، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ﴾ رابەرو بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە لە ئاسمانەكان و لە زەویدا، ئەوانە رائەبوورن بەلایاندا و بەچاو ئەیانبینن لەكاتێكدا ئەوانە روو وەرئەگێڕن لێیان و هیچ

بیریان لێناکەنەوە، بەڵێ بەڕاستی رابەرو بەڵگەکان بە زۆری و بە لێشاو پرژو بڵاو بوونەتەوە لەم بوونەوەرە پان و فراوانەدا و خراونەتە بەرچاوی دڵ بە هەمیشەیی و لە هەموو کاتێکدا، ئەو هەموو رابەرو بەڵگەیانە هاوار ئەکەن و بانگی هەموو کەس ئەکەن بۆ لای خوا و پەرستنی خوا بە تاك و تەنها، بەڵام ئەوانەی کە بەد و نەفامن ئەو بەڵگە و رابەرانە نابینن و بانگکردنەکەیان نابیستن. نازانین سەرنجی کام بدەین و بیر لە کام بکەینەوە، بیر لە هەڵهاتنی خۆرو ئاوا بوونەکەی بکەینەوەو سەرنجی رووناکی و تاریکی یەکە بدەین کە بە وردی و بێ وەستان دێن بەدوای یەکدا بەرە بەرە و بە نەرمی و لەسەر خۆ زیاد و کەم ئەکەن، سەرنجی ئاو و دەریا و چەشمە و کانیاوەکان بدەین کە شەپۆل ئەدەن و دێن و ئەچن، بیر بکەینەوە لەو هەموو گژو گیا و سەوزە و رووەکانە کە گەشە ئەکەن و پەرە ئەسێنن، بیر لەو هەموو گیانلەبەرە جۆراو جۆرانە بکەینەوە کە لە زەویدا ئەگەڕێن و لە دەریا و ناو ئاوەکاندا مەلە ئەکەن و ئەفڕن لەهەوادا، بیر کردنەوە و سەرنج دانی هەرکام لەوانە کە باسکرا و هەر شتێکی تر ئەبوو بەس بووایە بۆ سۆز و پەرۆشی هەستی دڵ و دەروون و پڕ بوونیان لە بڕوا و ملکەچی بۆ خوای داهێنەر و پەروەردگار، بەڵام چی بکەین لەو کەسانەی کە بەد و روو وەرگێڕن لەو هەموو نیشانە و بەڵگە روونانە؟ زۆر لەوانەش کە بڕوا ئەهێنن هاوبەش رەوادان روو ئەکاتە دڵیان لە شێوەیەك لە شێوەکانیدا، کەواتە بڕوای ساف و پاك و خاوێن پێویستی هەیە بە وریایی یەکی هەمیشەیی کە هەموو خەتەرەیەکی شەیتانی دوور بخاتەوە لە دڵ لە هەموو جوڵانەوە و کارو کردەوەیەکدا، هەروەها هەر شتێکی تر لەم زەوییەدا نرخ دارە دڵ داگیر ئەکات و لای ئەدا لە نیازی غەیری خوا، لەبەر ئەوەی هەموو کارو کردەوەکان تەنها بۆ خوا بن، بڕوای پاك و خاوێن پێویستی هەیە بەوەی کە لە دڵدا ملکەچی و بەندەیی نەبێ بۆ هیچکەس بێجگە لەخوای تاك و تەنها، دەی زۆربەی خەڵکی ئەو بڕوا پاك و خاوێنەی نییە،

لەبەر ئەوە فەرمووی: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾ زۆربەی خەڵکی ئەو بڕوا ناهێنن بەخوا و بڕوایان نییە مەگەر لە کاتێکدا کە هاوبەش ڕەوا دەرن بۆ خوا، ئیتر هاوبەش ڕەوا دانی گەورە یان بچوك کە ئەم جۆرە زۆر زۆرە و خەڵکیش بەخۆی نازانیێ، لەم جۆرەیانە چاوەڕوانی خێرو شەڕ و سوود و زیان لە غەیری خوا یان پشت بەستن لەهەر کارێکدا بەهەر هۆیەك لەم دنیایەدا، پێویستە بڕوادار هەر هۆو سەبەبێك بەکار بێنێ و پشتی پێ ببەستێ ئەبێ لەم ڕووەوە بێت کە خوا فەرمانیداوە بەبەکار هێنانی، ئەو شتانەی کە بە ڕووکەش و ڕواڵەت هۆی فەراهەم هێنان و پێکهێنانن، ئینجا ئەبێ بڕوا وابێ کە ئەو سەبەب و هۆیانە لە خۆیاندا هیچیان پێناکرێ و هیچیان بەدەست نییە، بەڵکو هەموو شت بە دەست خوایە و بە بڕیاری خوایە و هەرکات خوا مەیلی نەبێ هیچ هۆ و سەبەبێك کار ناکات و هیچی لێ پەیدا نابێت، بۆ نموونە: ئاگر هۆی سووتاندنە، تیغ هۆی بڕین و زامدار کردنە، کەچی کە خوا مەیلی نەبوو نە ئاگر ئیبراهیمی سوتاند، نە تیخەکە ئیسماعیلی بڕی، هەروەها هەر هۆیەکی تر. بە کورتی لەکاتی بەکار هێنانی هۆ و سەبەبەکاندا ئەبێ بڕوادار هەرچاوی لە خوا بێت و هەموو شتێك هەر لە خوا بناسێ، چ ئەو شتانەی کە بە ڕواڵەت هۆ و سەبەبیان هەیە، هۆ و سەبەبەکان ئەمەی کە گوتمان پاڵفتە و ناوەڕۆکی قورئان و حەدیسە و لادان لەمە لادانە لە حەقیقەتی قورئان و حەدیس و ئەبێ بڕوادار لەسەر ئەو بارو شێوەیە هۆو سەبەبەکان بەکار بێنێ شتیان لێوە بناسێ:(ئیبن و عەباس) و کەسانێکی تر ئەفەرمون: یەکێك لەو شتانە کە دروست نییە گوتنی ئەمەیە کابرا بڵێ: ئەگەر سەگەکەمان نەبوایە پشیلە مریشکەکانی ئەخوارد، واتە ئەوەش هاوبەش ڕەوادانە، زۆر کەس هاوبەش ڕەوا دەرن لەمەدا کە دەرسێك ئەڵێتەوە یان ئامۆژگاری یەك ئەکات کە بە ڕواڵەت بۆ خوای ئەکات، بەڵام لە دڵی خۆیەوە چاوەڕوانی ئافەرین و پێخۆش بونی خەڵکی یە، کە ئەوە پێی ئەگوترێ: ریا و ڕووپامایی و بە دەگمەن دەست ئەکەوێت کەسێك کە پاك بێت لەو دەرد و نەخۆشی یە بەدە، هەروەها هەر کارێکی خێرو چاکە کە هیچ نیازێکی تری لەگەڵ بێت، بێجگە لە نیازی فەرمانبەری و ڕەزامەندی خوا، زۆربەی ئەو خاوەن نیازانەش بێ ئاگان لەو نیازە بەد و پوچەڵانەو هەست بەو دەردو نەخۆشی یانە ناکات... لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لە حەدیسێکدا

کە(- ئەبو عەلی - موصلی) ئەیهێنێ لە(معقلی کوڕی بەصار) ەوە. لەم حەدیسەدا ئەفەرموێ:(هاوبەش رەوادان لەناو ئێوەدا شاراوەترە لەخشپەی پێی مێرووله).(ئیمامی ئەحمەد) حەدیسێك ئەهێنێت لە(محمودی کوڕی لەبید) ەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ:(مەترسی ترین ئەو شتانەی کە من مەترسی یان لێ ئەکەم لەسەرتان بریتییە لە هاوبەش رەوادانی بچوك، ئەوانیش عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا: هاوبەش رەوادانی بچوك چییە؟ ئەویش فەرموی: ریا و رووپامایییە، لە رۆژی دواییدا کاتێك کەخەڵکی کردەوەکانیان ئەهێنن، خوا ئەفەرموێ: بڕۆن بۆلای ئەوانە کە ئێوە لە دنیادا رووپامایتان بۆ ئەکردن، ئینجا سەرنج بدەن بزانن ئەجرو پاداشتتان دەست ئەکەوێت یان نەء). ئەم جۆرانە ئەو هاوبەش رەوادانانەن کە شاراوەن و پێویستی هەیە بە وریایی و ئاگاداریی یەکی هەمیشەیی بۆ خۆپاراستن لێیان تا بڕواکەیان پاك و خاوێن و پاڵفتە بێت. بەدتر و پیس تر لەمانە هاوبەش رەوادانی گەورەیە کە ئاشکرایە و خاوەنەکەی لە ریزی بڕواداران ناهێڵێ، نەك وەك بچووکەکە کە گوناهێکە ئەجرو پاداشتی ناهێڵێ یان کەمی ئەکاتەوە، ئەو گەورەیانە کە لەگەڵ بڕوا بەخوا کۆنابێتەوە و خاوەنەکەی بە بڕوادار دانانرێت، بریتییە لەو هەموو بت پەرستییە جۆر بەجۆرانەی کە باو و ناسراو بوون لە هەموو چەرخ و زەمانەکانی نەفامیدا، هەروەها ئەو هەموو کار و کردار و وتارانەی کە زانایانی ئیسلام دیاریی یان کردوون و کۆیانکردوونەتەوە لە کتێبەکانیاندا، جێگەو شوێنی جیاوازیان بۆ دیاریی کردووە و ناو براوە بە:(کتاب الردة) کورتەی ئەو هەموو هاوبەش و رەدا دانانەی کە لەگەڵ بڕوادا ناگونجێ و یەك ناکەوێ، کورتەی ئەوانە بریتین لە بڕوا بەهەر بەرنامەیەکی تر بێجگە لە بەرنامەی خواو ملکەچی بۆ غەیری خوا، ئیتر لەهەر کاروبارێکی ئەم دنیادا، جا ئەم ئایەتەی کە ئێستا ئەژین لەگەڵی هەرچۆن ئەو بت پەرستن و هاوبەش رەوادانەی ئەو چەرخەیە کە ئەمە ئەگرێتەوە، هەروەها ئەو لادان و شوێن کەوتن و ملکەچی یە ئەگرێتەوە کە لەم چەرخی دوایی یەدا پەیدا بوون، بۆ هەر بەرنامە و بیرو باوەڕەکانی ئەم زەوییە کە نەگونجێ لەگەڵ بەرنامەکەی خوادا. ئینجا ئایا ئەوانە کە روو وەرئەگێڕن لە ئایەتەکانی خوا و لەو هەموو بەڵگەو نیشانانە کە خوا نیشانی داون لەم بوونەوەرە پان و فراوانەدا، ئایا ئەوانە بە تەمای هیچ هەن و چاوەڕوانی هیچ شتێ ئەکەن بێجگە لەوەی ئەم فەرمودەیە دەست نیشانی بۆ ئەکات،

أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلۡ
هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ

---

﴿أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ ئایا ئەوانە ناترسن و بێ باکن لەوەی سزا و تۆڵەیەك بێت بۆیان و داگیریان بکات، یا کت و پڕ و لەناکاودا رۆژی دوایی بێت بۆیان، لە کاتێکدا کە بێ ئاگان و هەست ناکەن بە هاتنەکەی و ئامادە نین بۆی؟ واتە بە تەما بوونی بێجگە لەو دووانە نەفامی یە و هۆی بێزاری لێدەربڕینە. ئینجا کاتێ کە ئەو خەڵکە نەفامە گوێ یان نییە لە ئایەتەکانی قورئان و ئەو هەموو رابەرو بەڵگە و نیشانە روونانە و پشتیان تێ ئەکەن و هاوبەش بۆ خوا دائەنێن ! هاوبەشی ئاشکرا یان شاراوە کە زۆربەی خەڵکی بەو جۆرەن، کاتێ ئەوانە بەو جۆرەن نابێ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لە کاری خۆی بوەستێ و نابێ گوێ بدا بەو نەفام و لادەرانە، لە رێگەی خوا، بەڵکو بەردەوامە لەسەر کارو فرمانی خۆی، ئەوانەی کە رێنموونی وەرئەگرن و شوێنی ئەکەون و رێگە راستەکە ئەدەنە بەر و لادانی لادەران کاریان لێناکات، وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ﴾ ئەمە رێگەی منە، واتە بانگکردن بۆلای خوا و پەرستنی تەنها ئەو بە بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك، ئەمەیە رێگەی من کە رێگەیەکی تەنهایە و راستە بە بێ هیچ خواری و بە بێ گومان و دوو دڵی یەك. ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾ بانگ ئەکەن بۆلای خوا لەکاتێکدا لەسەر روونـاکی دڵ و زانـینی تـەواو و بـڕوای بێگومـان و رێنموونیم لەلایەن خواوە، منیش و هەر کەسیش کە شوێنی من کەوتبێ و پەیڕەوی کردبم، یان بانگ ئەکەم بەو زانین و روونـاکی ی دڵەوە منیش و هەرکەسیش کە پەیڕەوی کردبم بانگ ئەکەین بۆلای خوا ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾ خوا پاك و بێگەردە و بەپاك و بێگەردی دائەنێین لە هەر شتێ کە شایستەی ئەو نییە،

وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ ۗ أَفَلَمْ
يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا

---

﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ من هيچ كاتێك له‌ هاوبه‌ش ره‌وا ده‌ران نیم، به‌ڵكو خوای خۆم به‌و شێوه‌یه‌ ئه‌په‌رستم كه‌ پاك و بێگه‌رده‌ و هیچ هاوبه‌شێكی بۆ ره‌وا نادەم. چ هاوبه‌شی ئاشكرا و گه‌وره‌، چ هاوبه‌شی بچووك و نادیاریی، واته‌ ئه‌مه‌ رێگه‌ی منه‌ و هه‌ركه‌س ئه‌یه‌وێ با په‌یره‌وی من بكات و هه‌ركه‌س نایه‌وێ من له‌سه‌ر رێگه‌ی خۆم ئه‌ڕۆم و هه‌ر ئه‌وه‌ ئه‌ده‌مه‌ به‌ر. هه‌ر ئه‌و رێگه‌ی پێغه‌مبه‌ره‌(ﷺ) رێگه‌ی هه‌موو بانگ كارانه‌ تا رۆژی دوایی، ئه‌بێ ئه‌مانیش به‌و جۆره‌ جاڕی ئه‌وه‌ بده‌ن خۆیان جوێ بكه‌نه‌وه‌، پێویسته‌ هه‌ر له‌ یه‌كه‌م جاره‌وه‌ ده‌ری ببڕن كه‌ ئه‌وان كۆمه‌ڵ و ئوممه‌تێكی ترن جیاوازن له‌ هه‌موو ئوممه‌ت و گه‌لانی تر، سه‌ركردایه‌تی تایبه‌تی خۆیان هه‌یه‌ كه‌ جیاوازه‌ له‌ هه‌ر سه‌ركردایه‌تی یه‌كی تر، نابێ فش و فوڵ بن و تێكه‌ڵ و پێكه‌ڵی بكه‌ن و بەبێده‌نگ بۆ خۆیان دانیشن.

ئینجا سه‌رنج رائه‌كێشێ بۆ باوی خوا له‌ په‌یامه‌كانیدا، بۆلای هێندێ له‌ نیشانه‌ و به‌ڵگه‌كانی خوا له‌ ولآتدا له‌باره‌ی پاشه‌رۆژو چاره‌نووسی گه‌ل و ئوممه‌ته‌ پێشووه‌كان، چونكه‌ به‌ڕاستی بیر كردنه‌وه‌ له‌وانه‌ و سه‌رنجدانی نیشانه‌ و دروشمه‌كانیان زۆر به‌كاره‌ بۆ ته‌مێ خواری و گه‌ڕانه‌وه‌ له‌ رێنه‌ هه‌ڵه‌ و كاری به‌دی ئه‌وان، جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ قورئان جار به‌جار سه‌رنج رائه‌كێشێ بۆلای ئه‌و به‌سه‌رهات و رووداوانه‌ وه‌ك لێره‌دا ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم﴾ ره‌وانه‌مان نه‌كردووه‌ پێش تۆ پێغه‌مبه‌ر بێجگه‌ له‌ پیاوانێك كه‌ وه‌حیمان كردووه‌ بۆیان ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ﴾ له‌ دانیشتوانی شاره‌كان نه‌ك كۆچه‌ر و لادێكان، چونكه‌ شارستانی یه‌كان دڵ نه‌رم تر و به‌ئارام و خۆگر ترن له‌سه‌ر هه‌ڵگرتنی بانگ و په‌یامه‌كانیان، پیاوانمان نارد نه‌ك فریشته‌ یان تیره‌یه‌كی تر، به‌ڵكو ئه‌وانیش وه‌ك تۆ ئاده‌می بوون، كه‌واته‌ په‌یامه‌كه‌ی تۆ به‌ پێی باو و ره‌وشتی خوا هاتووه‌... ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ﴾ ده‌ی ئایا ئه‌و بێ بڕوایانه‌ نه‌گه‌ڕاون به‌سه‌ر خاك و ولآتدا تا به‌هۆی ئه‌وه‌وه‌ سه‌رنج بده‌ن ئایا چۆن بوو دوا رۆژ و چاره‌نوسی ئه‌وانه‌ی كه‌ له‌

پێش ئەمانەوە بوون، بێگومان نیشانە و دروشمی وێران بوونی ئەو پێشووانە هەیە لەو وڵاتانەدا کە بەهۆی یاخی بوونیان لەخواو لە فروستادەکانی ئەوەیان بەسەرهات، کەواتە ئەمانیش وەك ئەوان تێدا ئەچن.(حسن) بەم جۆرەی تەفسیر کردووەتەوە، هێندێ ئەفەرمون مەبەست ئەوەیە: پێشووەکان دڵیان بە ژیانی دنیا زۆر خۆش بوو و بیریان نەئەکردەوە لەوەی ژیانی دنیا بۆ کەس نامێنێ و هەر گرو فرێکە، کەواتە با ئەمانیش تەمێ خوار بېن و بڵ نەبەستن بەم ژیانەوە، لەسەر هەر بار پرسیارەکە بۆ سەرزەنشتە، ئەم فەرمودەی کە دێت بەدوایدا لەگەڵ تەفسیری دووەمدا رێك ترە، ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ﴾ بێگومان نیشتمانی دوایی و ژیانی رۆژی دوایی چاکە و چاکترە بۆ ئەوانەی کە لە دنیادا خۆیان پاراستووە لە بێ بڕوایی و گوناهو تاوان. ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی ئایا ئێوە ژیر نین تا تەمێ خوار نەبن لە پێشووەکانەوە و بەهۆی ئەوەوە وەك ئەوان باری ژیانی کەم و کورتی ئەم دنیایە بدەن بەسەر ژیانی خۆشی و نەبڕاوەی ئەو دنیادا؟ واتە دەی با ژیر بن و خۆتان زیان بار و بەش بڕاو نەکەن، ئینجا شێوەی کاتی سەخت و ناخۆشی ئەو فروستادانە نیشان ئەدات پێش ئەوەی کاتی بەدی هاتنی بەڵێن و هەڕەشەکانی خوا و باو و رەوشتەکەی خوا بەدی بێت کە هەرگیز گۆڕان و دوا و بەری بۆ نییە، ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾ بێگومان ئەم فەرمودەیە پەیوەستە و بەستراوە بە وتەیەکەوە کە نەگوتراوە، جا زانایانی تەفسیر چەند وتە و وشەیەکیان دیاریی کردووە و هەرکام باشە و ئەگونجێ: با بێ بڕواکانی ئەم ئوممەتە هەڵنەخەڵەتێن بەوەی بە ئارام و خۆشی ئەژین و رائەبوێرن، چونکە گەلە بێ بڕواکانی پێشوو مۆڵەت دران هەتا پێغەمبەرەکانیان نائومێد بوون لە سەرکەوتن بەسەریاندا لە دنیادا و لەسزادانیان، یان نائومێد بوون لە بڕوا هێنانیان ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ خەتەرەو خەیاڵیان وا چوو کە درۆیان لەگەڵ کرا لەلایەن دڵ و دەروونی خۆیانەوە کە بە تەمای سەرکەوتنی خۆیان بوون و لەناوچوونی بێ بڕواکان. یان درۆیان لەگەڵ کرا لەلایەن ئومێدەکەیانەوە و هیواو ئومێدەکەیان راست دەرنەچوو، واتە ماوەی بێ بڕوایی و دوژمنایەتی بێ بڕواکان و چاوەڕوانی ئەمان بۆ سەرکەوتن ئەوەندە درێژەی کێشا تا هەستیان کرد بە نائومێدی و خەیاڵ و خەتەرەی دڵیان وا چوو کە سەرکەوتنیان لە دنیادا وا نابێ، گەیشتە ئەو رادەیە، ئینجا ﴿جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا﴾ یارمەتی و سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات.(ئیبنو لجوزی و قورطوبی و زەمەخشەری) هەرکام بە وتەیەکی کورت تر پەیوەستی

یەکە ئەنجام ئەدەن کە هەر ئەوە ئەگرێتەوە کە گوتمان، کەواتە پێویست نییە بە درێژە پێدان و واز ئەهێنین بەوەی گوتمان، لەسەر هەربار ئەم ئایەتە تەنگی و تەنگەتاوی و ناڕەحەتی یەك نیشان ئەدات کە دڵ ئەهێنێتە لەرزەو موچرکە بە لەش‌و دەماردا ئەهێنێ بۆ کەسانێ کە دڵ وریا و خوا ناسن، چۆن وایان بەسەر نەیەت کە بیر بکەنەوە لەوەی پێغەمبەران کە هەڵبژاردەی خوان ئەوەندە تەنگەتاو بن تا ئەو رادەیە کە باسکرا؟ باوی خوا لە پەیام و بانگەوازەکانیدا هەر بەو جۆرە هاتووە و سەخت و سامناکی بەسەرهات و رووداوەکانی فروستادەکانی گەیشتبووە ئەو رادەیە. ئەبێ بەو جۆرە داخ و مەراق و توش و تاڵی یان چەشتبێ، ئینجا خوا دەرووی لێکردوونەتەوە، ئەوەش بۆیە وا بووە تا زاڵ کردن و یارمەتی دانەکەی خوا سوك و ئاسان و هەرزان نەبێ، چونکە ئەگەر بەو جۆرە بووایە لەهەر لایەکەوە درۆزنێك و ناڕاستێك هەڵئەسا و لافێکی لێ ئەداو بە فرو فێڵ کارێکی گرنگی بۆخۆی ئەنجام ئەدا، ئەو کاتە هەق و ناهەق تێکەڵ ئەبوون و جوێ نەئەکرانەوە لە یەکتر، دەی ئەوەش لە هەموو شت خراپتر و زیاندار ترە. پەیام و بانگەوازەکانی خوا یاسا و بەرنامەن بۆ ژیان، پێویستە پارێزگاری بکرێن و پاس بکرێن لە درۆزن و لاف لێدەران بە درۆ و پڕوپاگەندە. بانگکردن بۆلای خوا کڕین و فرۆشتن و بازرگانی یەك نییە بۆ ماوەیەکی کورت، تا دەستکەوتی خۆی ببێ، ئەگینا واز لەوە بهێنرێ و کارێکی تر بگیرێتە دەست کە سود و بەرهەمی ئاسان ترو زۆر تر بێت ! ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ پەیڕەوی پێغەمبەران بکەن و بانگەوازەکانی ئەوان بسێننەوە لەناو گەل و کۆمەڵی نەفامانـدا – کە ئەو کۆمەڵانەش ئەوانەن کە لایان دابێ لە ئاین و لە بەرنامەی خوا لە هەر چەرخ و کات و وڵاتێکدا – ئەوانە پێویستە خۆیان ئامادە بکەن بۆ هەڵگرتنی هەموو ئەرك و ناخۆشی یەك، پێویستە لەسەر رووناکی قورئان و رەوشت و رووداو و بەسەرهاتی پێغەمبەرمان بڕۆن و ئەو ئایەتانەی کە خوا ناردنی بۆ سەر پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی، ئەو ئایەتانە بکەن بە بەرنامە بۆ خۆیان و لە سایەی ئەو ئایەتانەدا بژین، ئەگەر وا نەکەن کارەکەیان بۆ ناڕوا، بەڕاستی بیر کردنەوە لەم ئایەتەی کە خەریکین پێیەوە پێویستی سەرشانی ئەوانەیە تا بتوانن بەرگەی بگرن، ئەوەتا لەپاش ئەو رووداو بەسەرهاتە دڵ تەزێنانە ئینجا فەرموی: یارمەتی و سەرخستنی ئێمەیان بۆ هات،

فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي
ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ
وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾

---

**﴿فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ﴾ رزگار كرا ئەو كەسەی كە ئێمە ویستمان و بمانەوێ. ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆ ئەو رزگار كراوانە كە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ سزای ئێمە ناگێڕرێتەوە و بەرگری ناكرێ لە كۆمەڵی تاوانباران و ئەوانە كە شیاو و شایستەی سزادان بن، كەواتە ئەوانەی كە رزگار كراون ئەم شیاو و شایستانە نین. لەبارەی ئەو دوو وشەیەوە لە ئایەتەكەدا: ﴿ظنوا، كذبوا﴾ كە بە رواڵەت نابێ و ناگونجێ. لەو بارەیەوە چەند وەڵامێ دراوەتەوە چەند شتێ گوتراوە بۆ كردنەوەی ئەو گرێیە، بەڵام ئەوەی كە لە تەفسیرەكەیدا دەست نیشانمان بۆ كرد لە هەموو قسە و تەئویلەكان بەهێزتر و چاكترە لەبەر ئەوە هەڵم بژارد. ئەوەش ئەوە بوو كە وتەی ﴿ظنوا﴾ بریتی بێت لەو خەتەرە و خەیاڵانەی كە لەو كاتە سەختانەدا دێن بە دڵدا، مەبەست بە وتەی﴿كذبوا﴾ درۆ لەگەڵ كردن بێت لەلایەن دڵ و دەروونی خۆیانەوە كە بە تەمای سەركەوتن بوون و وا دەرنەچوو، خوا خۆی باش ئەزانێ.**

**لەم داستانی یوسفەدا(علیه السلام) چەند جۆر لە ناڕەحەتی و تەنگی بووە، وەك دەست نیشانی بۆ كرا بە جۆرێ چەند جار نومێد و چاوەڕوانی خۆشی نەئەكرا، كەچی دوا رۆژی سەركەوتن و شادمانی هەر بۆ ئەو بوو بە گوێرەی باوی خوا كە پاشەڕۆژی بەختەوەری بۆ خۆگران و پارێزگارانە، بەڵێنی خوا هەرگیز گۆڕانی نییە و ئەبێ بەدی بێت، داستانی یوسف نموونەیەك بوو لە داستانی پێغەمبەران و رەوانە كراوەكانی خوا، هەركەسێك ژیر بێت پەند و ئامۆژگاری لێ وەرئەگرێ، داستانەكەی راستی نامەكانی خوای روونكردەوە، وەك راستی ئەم پەیام و قورئانەش روون ئەكاتەوە كە بەبێ ئەوەی بە رووكەش و رواڵەت هیچ پەیوەندی ببێ لە نێوان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) و ئەو نامەیەدا. كەواتە ئەبێ ئەم قورئانە هەق و راست بێت بە هیچ جۆر ناگونجێ دەست هەڵبەست بێت، هەموو ژیرێك ئەبێ بڕوا بێنێ كە لەلایەن خواوە هاتووە وەك دەست نیشان ئەكات بەمانە كە ئەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ سوێند بەخوا لە داستان و سەرگوزەشتەی نێرراوەكانی خوادا چەند تەمێ و**

ڕێنموونی هەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی ژیریی یەکی پاك و خاوێن و پاڵفتەن، بەهۆی ئەو داستان و سەرگوزەشتانەوە چەند شتی نەزانراوو نەناسراو ئەزانرێن و ئەناسرێن ﴿مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ﴾ ئەم قورئانە قسە و هەواڵێکی درۆو دەست هەڵبەست نەبووە و هەرگیز ناگونجێ درۆو دەست هەڵبەست بێت، ﴿وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ واتە بەڵکو ئەم قورئانە بەڕاست گێڕو روونکەرەوەی راستی ئەو نامانەیە کە لە پێش ئەمەوە هاتوون، ﴿وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ روونکەرەوەی هەموو شتێکە کە باسکردنی پێویست بێت لە ئاییندا. ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ڕێنموونی و میهرەبانییە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕوایان هەیە و ئامادەن بۆ بڕوا هێنان، هەرچەند ئەم قورئانە بۆ هەمووان هاتووە و ئەو سیفەتانەی کە باسکران بۆ هەموانە، بەڵام هەر بڕوادار سوود و بەهرەی لێ وەرئەگرێ لەبەر ئەوە هەر باسی بڕوادار ئەکات.

سوپاس بۆ خوا بەیانی یەك شەممە ١٤١٢/٣/١٤ لێبوومەوە لە تەفسیری سورەتی یوسف، لەم کاتەدا لە شاری لەندەن بووین کە هاتین بۆ چارەسەری چەند نەخۆشی یەك کە دووچار بووین، داواکارم لەخوا ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکات و لێم وەرگرێ و ئەوەی کە ماوە لێرەوەیە تا سورەتی(الكهف). داواکارم کەخوا بە میهرەبانی خۆی سوود بەخشی بکات بۆ برایانی کورد، ئینجا داواکارم کە لە پێشەوە شیفای دڵ و دەروونمان بدات لەپاش ئەوە شیفامان بدات لە نەخۆشی یەکانی لەش و جەستەمان،

والحمد لله أولا و آخر و صلى وسلم على سيدى و مولاى رسول الله.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾

## سورەتی (الرعد)

## مەککەیی یە و (٤٣) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

من کە خەریکم بەم تەفسیرەوە ناچاریی یەو ئەبیٚ ئەم قورئانە بە هەموو زمانیٚ تەفسیر بکریٚ و رابگەیەنریٚ، ئەگینا من لە کویٚ و زانین و تیٚگەیشتن و دەستەواژەی ئەم قورئانە لە کویٚ؟ بە ناچاری من دەم ئەدەم و خەریکی ئەم کارە ئەبم سا خوای میهرەبان یارمەتیم بدات و بەو هەموو کەم و کوڕی و ناتەواوی یەوە لیٚم وەرگریٚ.

شتیٚکی ئاشکرایە قورئان بە زمانی عەرەبیش تەفسیریٚك ناکریٚتەوە کە پڕ بە پڕ بیٚت ویٚ، بەڵکو تەفسیری بە عەرەبیش هەر نزیك خستنەوەیەتی لە زانین و تیٚگەیشتنی خەڵکی یەوە. بە عەرەبیش بەو جۆرەیە چ جای بە زمانیٚکی تر. دەی پەروەردگاری میهرەبان کۆمەك و یارمەتی دەر بە بۆ ئەم بەندە زۆر ناتەواوەت.

ئەم سورەتە دەست پیٚ ئەکات بە مەسەلەی وەحی کردن بەم قورئانە و ئەو بەرنامە راستەی کە ئەم نامەی پیٚهاتووە، کە بریتییە لە پەرستنی خوا بە تاك و تەنها و بڕوا بە زیندوو بوونەوە کە ئەوەش بنەڕەتە بۆ هەموو شتیٚ، بۆ چەسپاندنی ئەو بنەڕەتە راستە دڵ و دەروون رائەکیٚشیٚ و ئەیخولیٚنیٚتەوە بەم بوونەوەرە نایابەدا و شتە نایاب و دڵڕفیٚنەکانی ئەخاتە بەرچاو کە بەهۆی ئولفەت و دەق پیٚوە گرتنەوە فەرامۆش ئەکریٚن، بە شیٚوەیەك باسەکە ئەکات هەرکەس چاوی دڵی کویٚر نەبیٚ و بە تەواوی رووناکی لیٚ نەبڕابیٚ، وریا ئەبیٚتەوە و دڵی پڕ ئەبیٚ لە بڕوا بەو نامەیە، هەر فەرمان بەری ئەو کەسە ئەکات کە ئەم نامەیەی نارد و ئەو کەسەی کە ئەم نامەیەی بۆ هات. کەواتە با بە هەموو دڵ و بە هەموو وریایی یەکەوە گویٚ بگرین لەم ئایەتانەی کە ئەم سورەتە ئەیدات بە گویٚچکەماندا، لە یەکەم جارەوە ئەو وتە پیرۆزە ئەهیٚنیٚ کە لەسەرەتای(١١٣) سورەتدا هاتووە، ئەفەرمویٚ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ئینجا هەندیٚ لەو چواردە پیتانە ئەهیٚنیٚ کە لە سەرەتای نۆزدە سورەتدا هاتوون وەك چەند جار باسمانکرد، ئەفەرمویٚ: ﴿الٓمٓر﴾ چەند جاریٚك لە

سەرەتای ئەم سورەتانەدا بە کورتی یان بە درێژیی باسی مەبەست لەم پیتانەمان کرد بە تایبەتی لە سەرەتای سورەتی(یس) دا کە یەکەم جار دەستم بە تەفسیری ئەو سورەتە کرد لە هەمووان زیاتر درێژەم پێدا، دەست نیشانمان کرد بۆ ئەو رایانەی کە زانایانی تەفسیر هێناویانە لەم بارەیەوە، یەکێ لەو رایانە ئەمەیە کە دەست نیشانە بۆ ئەوەی ئەم قورئانە موعجیزەیە و لای خواوە هاتووە و لە توانای هیچ کەسێکی تردا نییە، واتە ئەم قورئانە پێکهاتووە لەو پیتانەی کە خەڵکی وتەو وتاری خۆیانی لێ پێك ئەهێنن – بە تایبەتی گەلی عەرەب کە یەکەم گەل بوون ئەم قورئانە چوو بە گوێ یاندا – لەگەڵ ئەوەدا چەند جار قورئان بەری لێ بڕینەوە کە بتوانن وێنەی بهێنن، تا ئەو رادەی بتوانن وێنەی کەمترین سورەتی بڵێن و ئەوانیش بەو هەموو زانا و رەوان بێژەکانیانەوە، هەوڵ و تەقەلایاندا و بێجگە لە دامان و دەستە پاچەیی هیچی تریان بۆ نەمایەوە. بێگومان ئەم پیتانە پەیوەندی یان بەم قورئانە و وەحی بەم قورئانەوە هەیە، بەم بەڵگەیە کە لەپاش ئەم پیتانە هەر ئەو باسە ئەهێنێ بە دوایاندا وەك لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ﴾ جا لەسەر ئەم رایە ئەڵێن: ئەوئایەتانەی کە پێکهاتوون لەم جۆر پیتانە ئایەتەکانی نامەن، واتە قورئان کە تەواو ترین و گرنگ ترین نامەیە بە جۆرێ هەر ئەو شایانە بە نامە و نامە ناو ببرێ. یان ئەو ئایەتە پێکهاتووانە بەڵگەو نیشانەی روونن لەسەر ئەم نامەیە و بەڵگەو نیشانەن لەسەر ئەوەی کە وەحیە و لە لایەن خواوە هاتووە، چونکە پێکهاتوون لەو جۆرە پیتانە کەچی هیچکەس ناتوانێ وێنەیان بڵێ: ﴿وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ تۆ و بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە و کە هەر هەق و راستە، یان ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە هەر هەق و راستە و بە هیچ رەنگ، ناڕاستی و چەوتی رووی تێ نەکردووە و دەست نادات بۆ ناهەقی، ئەو پیتانە نیشانەن لەسەر ئەوە کە لای خواوە هاتووە و هەرچیش لای ئەوەوە هاتبێ هەر هەق و راستە. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوایان نییە و بڕوا ناهێنن بەوەی کە لەلایەن خواوە هاتووە، واتە بڕوایان نییە بەو بەرنامە و بیرو باوەڕەی کە لەم قورئانەدا هاتووە.

ئەمە بوو سەرەتا و قاپیی سورەتەکە کە مەبەستی سورەتەکە نیشان ئەدات بە کورتی و دەست نیشان ئەکات بۆ چەند مەسەلەو شتە گرنگ و بنەڕەتی یەکانی ئەم ئایینە پیرۆزە، جا لەبەر ئەوە دەست ئەکات بە نیشاندانی زۆر لەو شتانەی کە بەڵگەی ئاشکران لەسەر توانین و دەسەڵاتی خوا،

ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾

---

زۆر لە شتە نایابەکانی ئەم بوونەوەرە ئەخاتە بەرچاو کە روونکەرەوەی دەسەڵات و لێزانین و کاردروستی خوان وەك لەمەو پاش دێن.

١- ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ﴾ خوایە کە ناوی(الله) یە کەسێکە کە ئاسمانەکانی بەرز کردووەتەوە، واتە دروستی کردوون بە بەرز کراوەیی بەبێ هیچ پایە و ستوونێك، ﴿تَرَوْنَهَا﴾ ئەوەتا بەچاو ئەیان بینن وان بەلای سەرووتانەوە بەبێ هیچ پایەو ستوونێك، ئاسمان بەهەر مەبەستێك بگیرێ و بەهەر جۆر خەڵکی تێی گەشتبن وا لەبەر چاوەوە کە هەن و بەلای سەرووەوە راگیر و دامەزراون بەبێ ئەوەی هیچ شتێ راگیری کردبن، ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ئەم رستەیە چەند جار تەفسیرمان کردەوە، یەکێ لەوانە لە سورەتی(طه) دا کە لە پێش ئێرە تەفسیرمان کرد، کەواتە با لێرەدا بۆ ئەوە هیچ نەڵێین. ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ خۆرو مانگی ژێر بار کردووە. ﴿كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ هەرکام ئەگەرێ و گەردش ئەکات تا ماوەیەکی ناوبراوی دیاریکراو. ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ تەگبیری هەموو کاروباریێ ئەکات بە هەمیشەیی، هەموو بڕیارێکی ئەم بوونەوەرە و هەرچی وا تیایدا هەر ئەو ئەیدات و هەموو شتێ بە ئیرادە و دەسەڵاتی ئەو ئەڕوا و ئەنجام ئەدرێ﴿يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ ئایەتەکان بە روونی باس ئەکات ئایەتی هەموو نامەکان، یان مەبەست لێرەدا هەر ئایەتەکانی قورئانە کە جێگیر و جێنشینی ئایەتی هەموو نامەکانە، ئەو ئایەتانەی کە رابەرو بەڵگە و نیشانەی روناکن و رێنموونی ئەکەن بۆ هەموو شتێکی پێویست، ئەوانەی بۆ کردوون و رێنموونی بۆ کردووە و نیشانی داون ﴿لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾ بەڵکو بروای رێك و راست بێنن بە زیندوو بوونەوەو گەیشتن بە حوزوری خواو حیساب و پرسیاری پەروەردگارتان، واتە تا بیربکەنەوە و بۆتان دەربکەوێ توانین و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا و بەهۆی ئەوەوە بزانن ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی ئاوای هەیە. دەسەڵاتی هەیە بەسەر زیندوو کردنەوە و حیساب و پرسیار و تۆڵە و پاداشتدا.

وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَـٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَـٰوِرَٰتٌ وَجَنَّـٰتٌ مِّنْ أَعْنَـٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ
صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ
لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَـٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٥﴾

---

**٢- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ﴾ خوا ئەو كەسەیە کە زەوی ڕاخستووە و بە پانی و بە درێژاییدا تا ئاستێك کە چاو بڕی ئەم پەڕو ئەوپەڕی ناکات ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ﴾ گێڕاویەتی لە زەویدا چەند شاخێکی دامەزراو لە جێگەی خۆیاندا، ﴿وَأَنْهَـٰرًا﴾ و چەندین ڕووبار کە ئاوەکانیان دێن و دەچن بە بێ وەستان، ئەم ڕووبارانەی هێنا بەدوای شاخەکاندا، چونکە ئەو شاخانە هۆی پێکهاتنی ڕووبارەکانن، هەرچۆنێ ئاو و ڕووبارەکانیش هۆی بەرو میوەجاتەکانن کە ئەیانهێنێ بەدوای ڕووبارەکاندا و ئەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ﴾ لە هەموو میوەجاتێك گێڕاویەتی لە زەویدا دوو جۆر، ئیتر دوان لە ڕەنگدا، وەك ڕەش و سپی، یان لە تامدا وەك ترش و شیرین، یان لە ئەندازەدا وەك گەورە و بچوك، یان لە چۆنییەتیدا وەك گەرم و سارد، وە هەروەها زمانی مەبەست بەو دوانە نێرو مێیە ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ﴾ شەو ئەدات بەسەر ڕۆژدا و تاریکی یەکەی ئەکات بەبەری ڕۆژدا، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا کە باسکران چەند رابەرو نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بیریان ئەگێڕن و بیر ئەکەنەوە، بەڕاستی هەرکەسێك بیر و هەست دار بێت هەر لەگەڵ بیرێك بکاتەوە لەو شتانە ئەبێ بزانێ خاوەن و داهێنەرێکیان هەیە کە دەسەڵاتی بێ سنوری هەیە و لێزان و کار دروستە، چونکە شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە ئەو شتانە خۆیان بەخۆیان پەیدا نەبوون و بەبێ هۆ و دروستکەرێك دروست نەبوون، کەواتە ئەبێ کەسێك دروستی کردبن، ئەو کەسەش خوای بێ وێنە و بێ هاوتایە.**

٣- ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ﴾ له زەویدا چەند ناوچە و بەش و پارچە هەیە کە لە پاڵ یەك دان و وان بەدەمی یەکەوەو هاوسێی یەکن ﴿وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ﴾ چەند باخاتێك لە درەختی مێو ﴿وَزَرۡعٞ﴾ کشتوکاڵ لە هەموو بابەت ﴿وَنَخِيلٞ﴾ دارخورما ﴿صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ﴾ واتە دوو جۆرن: جۆرێکیان چەند پەل و لقێکن و یەك بێخیان هەیە، واتە لەیەك بێخەوە یەك بنە و چەند لقی لێ پەیدا بووە، جۆرەکەی تریان هیچ پەل و لقی لێ نەبووەتەوە و یەك دار بەرز بووەتەوە ﴿يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ﴾ بە یەك ئاو دێراو ئەکرێن، ﴿وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ﴾ باوی هەندێکمان داوە بەسەر هێندێکی تریاندا لە خواردن دا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بەڕاستی لەوانەدا کە باسکرا چەند بەڵگە و نیشانەی روون هەیە بۆ ئەوانەی کە ژیرن و فامیان هەیە...

ئەم ئایەتانە ئەو هەموو شتە گرنگ و نایابانەی خستە بەرچاو و سەرنجی بۆ راکێشان و شتەکانیش ئاشکران و خوێندەوار و نەخوێندەوار، زانا و نەزان، شاری و کۆچەری وەك یەك ئەیانبینن و هەستیان پێ ئەکەن،ئایا کێ ئاسمان نابینێ بە رێك و پێکی کاروباریان ئەڕوات بەڕێوە بە بێ وەستان و تێکچوون؟ئایا کێ زەوی و شاخەکان و رووبارەکانی بە بەرچاوەوە نییە و هەست ناکات بەو هەموو بەرو میوەجاتە جیاوازە، کێ بێ ئاگایە لە هاتن و داگیر کردنی تاریکی شەو بۆ رووناکی رۆژ و هاتنی ئەو شتە بەدوای یەکدا، ئایا شتێکی ئاشکرا نییە بوون و پەیدا بوونی ئەو هەموو باخات و کشت و کاڵە لەم زەوییەدا کە بەیەك ئاو دێراو ئەکرێن کەچی هەموو جۆرێك جیاوازە لە جۆرەکانی تر لە تام و بۆن و رەنگ و شێوەدا؟ بێگومان هەموو کەس ئەزانێ ئەوانەی باسکرا هەن، دەی ئایا هیچکەس گومانی وایە کە ئەوانە خۆیان خۆیانیان بەرهەم هێنابێ، یان بە رێکەوت پەیدا بوون، پیرە مێردی شاعیر لەم بارەوە ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| خوایە ئەوانەی کە بێ باوەڕن | هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەرن |
| ئەگینا سەیری باخێکی گوڵ کەن | تەماشایەکی بە عەقڵ و دڵ کەن |
| ئەو رەنگە جوانەی پەڕەی(هەرجایی) | بە زەرەبینی تیشکی بینایی |
| لێی ورد بنەوە کە ئەو صنعەتە | کێ دەڵێ زادەی خووی تەبیعەتە؟ |

گەلاَی(گوڵ پەسەند) کام مەقسەت بڕی؟ (پەردە عەروسی) کێ پەردەی دڕی؟

کێ هات(لاولاو) ی بە دارا ئاڵاند؟ کام دەست گەردنی(وەنەوشە) ی شکاند؟

نەخێر هەرکەس ڕێزی خۆی بەلاوە بێت هەرگیز خۆی بێ ئابڕوو ناکات و شتی وا ناڵێت، کەواتە ئەبێ بڵێین کەسێکی بێ وێنە و بێ هاوتای لێزانی دەسەڵاتداری کاردروست و داهێنەر و بەرهەم هێنەری ئەوانەیە، ئینجا ئایا ئەو کەسە کە لە یەکەم جارەوە ئەم ئادەمی یەی دروستکرد لە نەبوون، چۆن ئەبێ نەتوانێ و دەست پاچە بێت لە دووبارە کردنەوەی بەڕاستی زۆر جێگای سەر سوڕمانە گومانی ئاوا بێ جێ، ئەبێ سەر سوڕ بمێنێ لەو گومانە پووچەڵە و لە خاوەن گوتنیان، وەك لە پاش هێنانی ئەو هەموو بەڵگە و رابەرانە رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەری نازیز(ﷺ) و پێی ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعۡجَبۡ﴾ ئەگەر تۆ سەرت سوڕ ئەمێنێ و سەرسوڕمان لە تۆوە ئەبێت، ﴿فَعَجَبٌ قَوۡلُهُمۡ﴾ قسە و پرسیاری ئەوانە هۆ و جێگەی سەرسوڕمانە، واتە با سەرسوڕمانت لە قسە و پرسیاری ئەوانە بێت کە بە بێزاری دەربڕین و سەرسوڕمانەوە ئەڵێن و پرسیار ئەکەن: ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا﴾ ئایا کاتێ ئێمە بمرین و ببین بە خۆڵ ﴿أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ﴾ ئایا بێگومان ئێمە سەر لە نوێ دروست ئەکرێینەوە؟ واتە ئایا زیندوو ئەکرێینەوە و تازە ئەکرێینەوە؟ واتە نەخێر شتی وا نابێ و جێگەی سەرسوڕمانە ! ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان بە زیندوو بوونەوە نییە و سەریان سوڕ ئەمێنێ لە بڕوا کردن بەوە، ئەوانە کەسانێکن کە بڕوایان نەهێناوە و بڕوایان نییە بە پەروەردگاریان، بەڵێ ئەگەر بڕوایان ببێ بەخوا و بزانن خوا کێ یە هەرگیز شتی وا ناڵێن، ئەوانە دڵ و ژیریی خۆیان زنجیر کردووە و بەکاری ناهێنن لەو شتە ڕاست و ڕەوادا، کەواتە تۆڵە و سزایان لە ڕۆژی دواییدا ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانە زنجیرەکان وان لە گەردنەکانیاندا، ئەوانە هاوڕێ یانی ئاگرن و نوساون پێیەوە لە کاتێکدا ئەوانە هەمیشە ئەمێننەوە لەو ئاگرەدا – خوا پەنامان بدات – ئەوانە کە سەریان سوڕ ئەمێنێ لە زیندوو بوونەوەیان ئەوەندە نەفام و نەحسن پەلە ئەنێنەوە لێت بە تۆڵە و سزا لە پێش خۆشی و سەلامەتیدا،

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ ۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۗ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ

---

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾ بەم رەنگە لە پێشەوە داوای سزا و تۆڵە ئەکەن، یان بەم جۆرە پێش هاتنی ئەو کاتەی کە دیارییکراوە بۆ سزا و تۆڵەکەیان، یان وەك لە(قتادة) ەوە هاتووە ئەو بت پەرستانە ئەیان گوت: ئەی خوایە ئەگەر ئەمەی محمد ئەیلێ لەلایەن تۆوە هاتووە بەرد ببارێنە بەسەرماندا لە ئاسمانەوە یان سزایەکی ئازار دەرمان بۆ بهێنە، ئەوانە هەرچۆنێ سەرنج نادەن و بیر ناکەنەوە لەو هەموو بەڵگە و رابەرە ئاشکرایانە، هەروەها تەمێ خواریش نابن بە سزاو لەناوچونی وێنەی خۆیان لە گەلە رابوردووەکان کە ئەوانیش پەلەیان نایەوە بە هاتنی سزا و تا هات و دووچاری کردن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ﴾ واتە پەلە ئەنێنەوە لە کاتێکدا لە پێش ئەمانەوە چەند سزا و تۆڵەیەك کە لەش و جەستەی پارە پارە کردن، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە هاتووە – خوایان لێ رازی بێت- یان چەند تۆڵەیەك کە لەبەر گەورەیی بوون بە داستان و سەرگوزەشتە کە لەناو خەڵکیدا باس بکرێن، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ﴾ بێگومان پەروەردگارت خاوەنی لێبوردنە لە خەڵکی لەگەڵ ستەم و ستەمکارانیشدا، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت بە تین و سەختە تۆڵە و سزا دانی. لێبوردنەکەی پێش خست لە سزا و تۆڵەکەی بەرامبەر پەلە نانەوەکەی ئەوان بۆ تۆڵە و سزا، لەوەدا دەرئەکەوێ جیاوازی ئەوەی کە خوای میهرەبان ئەیەوێ بۆ ئەوان لە جیاوازی ئەوەی کە ئەوانە ئەیانەوێ بۆ خۆیان، کەواتە لەوەوە ئاشکرا ئەبێ کە ئەوانە چاوی دڵیان بە تەواوی کوێرە و ئەوانە ئەوەندە پەستن هەر بۆ ئاگر چاکن، خوای میهرەبان ئەوەندە خاوەن بەزەییە قاپی لێبوردنی لەسەر پشتە بۆ ئەوەی بەندەکانی لە رێگەی تۆبە و پەشیمان بوونەوەوە بچنە ناو کۆشکی لێبوردنەکەی، بەڵام ئەوانەی کە پەست و نەحسن و هەر سوورن لەسەر تاوان و لەو قاپی یەوە ناچن ئەوانە ئەبێ تۆڵەی سەخت بچێژن، ئینجا هەمیتر ئەڕوا لەسەر ئەو نەفامانە و سەر سوڕ ئەهێنێ لێیان کە نەفامییان لەو رادەیەدایە بەو هەموو بەڵگە و رابەر و نیشانە روونانە

کۆتایی ناهێنن و کوێرن لە ئاستیان و بەهۆی ئەوەوە داوای تاکە ئایەت و بەڵگەیە ئەکەن کە خوا بینێرێتە خوارەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەمێناوە و ئەڵێن: ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓۗ﴾ کاشکێ بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەری موعجیزەیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە، مەبەستیان وێنەی ئەو موعجیزانەیە کە هات بۆ موسا و عیسا – سەلامی خوایان لێ بێت – ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞۖ وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ﴾ ئەی پێغەمبەر تۆ هەر ترسێنەری، واتە کاری تۆ ئەوەیە و هیچی تر، بەدەست تۆ نییە وەکو پێغەمبەرەکانی تر و بۆ هەموو کۆمەڵێك ڕێ نیشاندەرێك بووە کاریان ترساندن و ڕێنموونی بووە، ئیتر مەسەلەی موعجیزە بەدەست ئەوان نەبووە، بەڵکو هەر بەدەستی پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەیە.

لێرەدا دوایی هات ئەو گەردش و گەڕانە لە بوونەوەر و ناوچەکانی جیهاندا، ئینجا دەست ئەکات بە گەردش و خولانەوەیەکی تر بە دڵ و دەرووندا لە بارێکی ترەوە ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ﴾ خوا زانا و ئاگایە بەوەی هەموو مێیە هەڵی ئەپێچێ و هەڵی ئەگرێ لە سکیدا و ئەوەی کە منداڵ دانەکان کەم و کوڕی ئەکەن و ئەوەی کە زیادی ئەکەن، جا وەرە ئەی کەسێك کە بێبەش نیت لە فام و ژیریی، وەرە بیر بکەرەوە و خەیاڵ بهاوێژە تا کەمێك تێ بگەیت لە فراوانی و گشتێتی زانین و ئاگاداریی خوا، بیر بکەرەوە لە هەرچی مێینە وا لەم دنیایەدا لە دەشت و لە دەر لە لادێ و لە شار لەماڵ و خانوو لە ئەشکەوت و هەموو کون و درز و هەموو شوێنە ئاشکرا و شاراوەکان، ئینجا بیر بکەرەوە لەو بێچووانە کە کەم و کوڕی هەیە تیایاندا، یان زیادە و فراوانی لە جەستە و قەبارەدا، وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە هاتووە – خوا لێیان ڕازی بێت – یان لەمانەوە لە منداڵ داندا کە لەوانەیە چوار پێنج ساڵ ئەمێنێتەوە وەك لە زانایانەوە ریوایەتکراوە، یان لە ژمارەی بێچووەکاندا، ئیتر بەجارێ یان چەند جار.

ئەگێڕنەوە لە ئیمامی شافیعی یەوە کە ئەفەرموێ: پیاوێکی یەمەنی هەواڵی پێدام کە ژنەکەی پێنج سکی کردووە و لە هەموو سکێکدا پێنج منداڵی بووە، هێندێ ئەفەرمون مەبەست کەم و زیادەیە لە خوێنی حەیزدا، بەڵام با تایبەتی نەکەین و ئەمەش یەکێك بێت لەو تیر و بارانەی کە بەری ئەو گشتێتی یە بکەوێ کە وتەی(ما) ئەگەیەنێ. وەرە بیر بکەرەوە لەو هەموو شتانە کە ژمارەی ئێمە ناگات پیایاندا، هەمیشە دەور دراون بەزانینی خوا لەمە و پێش بێ سەرەتا و ئێستا و لەداهاتوویشدا بە بێ دوایی هاتن و کۆتایی،

وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ
مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَـٰتٌ مِّنۢ
بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ

**﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ﴾ هەموو شتێ لای خوا و لە زانینی خوادا بە ئەندازەیە کە نە تێپەڕ ئەکات لێی و نە کەم ئەکات﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ﴾ زانایە بە هەموو غەیب و نادیاری یەك و هەموو هەست پێکراوێك ﴿ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ﴾ گەورەیەکی پایە بەرزە بەسەر هەموو شتێکدا بەرز و بڵندە بەسەر هەموو شتێکدا لە زات و لەزانین و لە هەموو سیفەتەکانیدا، کەواتە گەورەتر و بەرز ترە لەوەی کە هەموو دروستکراوەکانی پەی پێ ببەن و ئەوری رادە و پلەی بدەن ﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ﴾ یەکسانە بۆ خوا لەلایەن ئێوەوە ئەو کەسەتان کە وتەو قسەی نهێنی بکات و بیشارێتەوە، وە ئەو کەسەتان کە ئاشکرای بکات و نەیشارێتەوە﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ﴾ یەکسانە لای خوا ئەو کەسەی کە لە شەودا خۆی ئەشارێتەوە و ئەوەی کە لە رۆژدا دەرئەکەوێ و ئاشکرایە، ئا بەم جۆرە و شێوەیانە زانینی بێ سنووری خوا نزیك ئەکاتەوە لە تێگەیشتن و فامی کەم و کورِی ئێمەیە وەك لەبارەی خواوە ئێمە هەرچی بڵێین ناچاری یە ئەگینا ئەبێ وتە و دەستەواژەی ئێمە بەچی دا بگات، ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَـٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾ بۆ ئەو کەسە کە باسکرا لە خۆ داشارەر و ئاشکرا هەیە چەند مەلائیکەیەك کە دێن و بە دوای یەکدا لە کاتێکدا کە پارێزەرن بۆی لە پێش دەم و لە دوایەوە، بە فەرمانی خوا ئەیپارێزن لە زیان بەهۆی فەرمانی خوایەوە، هەندێ ئەفەرمون: ئەیپارێزن لە سزای خوا هەرکاتێ کە گوناهی کرد، پاراستنەکەی بەوەیە کە داوای مۆڵەت و لێبووردنی بۆ ئەکەن لە خوا، هەرچەند بەم جۆرەش ئەگونجێ، بەڵام خوێندنەوەی بە(بأمر الله) دژیەتی، کەواتە با هەر بە پێی یەکەم تەفسیر بگرین، هەر بەو شێوەیە بە کورتی ئەڵێین بە بێ درێژە پێدان و زیادلە رووکەش و دەقەکە نارۆین، وەك چەند راو ریوایەتێك هاتووە لەو بارەیەوە و لە کتێبی تەفسیرەکان دا باسکراون، با هیچکام لەوانە نەڵێین، چونکە بە تەواوی دڵنیا نین لەو ریوایەتانە، بەس ئەوەندە ئەڵێین: ئەوانە هەرچی بکەن بە پێی قەزا و قەدەری خوا ئەجوڵێنەوە و هۆی پاراستن لەناو چوارچێوەی ئیرادەومەیلی خوادا بە وێنەی هەر شتێکی تر کە خوا کردبێتی بەهۆ و سەبەب.**

لەپاش ئەوەی باسی گشتێتی زانینی خۆی کرد و دەور دانی بەندەکانی بەو زانینە، بۆیان هەیە چەند مەلائیکەیەك كە پارێزگاری یان ئەکات، لەپاش ئەوە ئاگاداریان ئەکات بەوەی کە پێویستە گویٚ رایەڵی یان و دەین و هەواڵی خۆیان لەسەر خۆیانەو هەرچییان بەسەر بێت سوچی خۆیانە، ئەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ بەڕاستی هەر دەستە و کۆمەڵێك هەر بارو حاڵێکیان ببیٚ لە خۆشی یان ناخۆشیدا خوا نایگۆڕیٚ و لایناباتەتا ئەوان بار و حاڵی خۆیان نەگۆڕن بە هەست و بە نیاز و بە کردەوە، واتە هەرچەند خوا زانایە بە هەر رووداو و بەسەرهاتێك پێش بەدی هاتنی، بەڵام خوا هەر بە پێی زانینەکەی رەفتار و کردەوە ناکات لەگەڵ بەندەکانی، بەڵکو کاتیٚ ئەیکات کە ئەوان بە کردەوەی خۆیان ئەوەی کە خوا ئەیزانیٚ بەدی بێنن، کردەوەی خوا لەگەڵیان لەپاش کردەوەکەی ئەوانە و بە پێی کردەوەکەیانە، بە کورتی هەرچییان بۆ ببیٚ و بەسەر بێت لە کردەوەی خۆیانەوە پەیدا ئەبیٚ و بەرهەمی کردەوەی خۆیانە. لەم بارەیەوە(ئەبو شەیخ و ئیبن و ئەبو شەیبە و مەردەوییە) حەدیسێکی قودسی ئەهێنن لە(ئیمامی علی) یەوە کە بە روونی ئەم مەسەلە و ئەوەی لەم ئایەتە وەرئەگیریٚ روونی ئەکاتەوە: ئەفەرمویٚ: خوا ئەفەرمویٚ: سوێند بە عیزەت و جەلالی خۆم و بەرز و بڵندیی خۆم بەسەر عەرشدا هەر دانیشتوانی شارو هەر دانیشتوانی خانەوادە و ماڵێك، هەر پیاوێك لە دەشت و بیابانێکدا لەسەر هەر گوناهو کارێك بن کە من پێم ناخۆشە، ئینجا لەوەوە بگۆڕێن بۆ گویٚ رایەڵی ی من کە پێم خۆشە، هیچکام لەوانە نابن مەگەر من ئەگۆڕێم بۆ ئەوان لە سزادانیان کە پێیان ناخۆشە، بۆ میهرەبانیم پێیان کە پێیان خۆشە و شادمانن پێی، هیچ دانیشوانی شارو خانەوادە و ماڵێك هیچ پیاوێك نییە لە دەشت و بیابانێکدا لەسەر بارو حاڵ و گویٚ رایەڵی یەکبن کە من پێم خۆشە، ئینجا لەوەوە وەرگەڕێن بۆ گوناهو نافەرمانی کە من پێم ناخۆشە، هیچکام لەوانە بەو جۆرە نییە مەگەر منیش ئەگۆڕێم لە میهرەبانی پێکردنیان کە پێیان خۆشە بۆ سزادانیان کە پێیان ناخۆشە.
بەڕاستی ئەوەی کە ئەم ئایەتە نیشانی ئەدات دووشتە:

١- بارو ئەرکێکی قورس و گران ئەخاتە گەردنی بەندە.

٢- رێز گرتنێکی گرنگ دەربارەی بەندە کە کردەوەی ئەو هۆ و مایەی بەدی هاتنی خواست و بەرهەمی مەیل و ئیرادەی خوایە.

وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ ﴿١٣﴾ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ

---

ئینجا ئەو نەفامانە ئەترسێنێ کە پەلەیان ئەنایەوە بۆ هاتنی سزاو ناخۆشی، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ کاتێ خوا ویستی سزا و ناخۆشی یەك دەربارەی هەر دەستە و کۆمەڵێك هیچگێڕانەوەیەك نییە بۆی، واتە ئەبێ بەدی بێت، نییە بۆ ئەوانە بێجگە لە خوا هیچکار بەدەست و یارمەتی دەرێك. بێگومان گەڕانەوە و گێڕانەوە نییە بۆ هەر شتێك کە خوا ئیرادەی کردبێ چ خۆش و چ ناخۆش، چ میهرەبانی و چاکە و چ سزاو ئازار، بەڵام لێرەدا هەر باسی سزا و ناخۆشی کرد، چونکە شوێن باسەکە شوێن و باسی پەلە ئانەوەی ئەو نەفامانەیە بە هاتنی ناخۆشی پێش ئەوەی پەلە بنێنەوە بە هاتنی خۆشی، کەواتە لێرەدا ئەم بارە باس ئەکات، لە پێشەوە باری لێبوردنی پێش خست لە سزادان تا دەرکەوێ بێ ئاگایی یان، لێرەدا هەر باسی سزای کرد کە کاتێ هات گەڕانەوەی بۆ نییە لەبەر ترساندنیان.

ئینجا گەردش و خولانەوەیەکی تر ئەکات لە دڵ و دەروون لەلایەکی ترو لە بارێکی تری ئەم بوونەوەرە و چەند شتێکی سەرنج ڕاکێش و سامناك ئەخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾ خوا ئەو کەسەیە کە پزیزکە و چەخماخەتان نیشان ئەدات لەبەر ترساندن و هیوا و ئومێدتان، ترساندن بەوەی کە شتێکی داچڵەکێنەری دڵ و دەمارە، هێندێ جار ئەبێت بە ئاگر و تریشقە، هەروەها هێندێ جار هۆی هاتنی لافاوێکی وێران کەرە وەك چەند جار بینراوە، لەلایەکی ترەوە هیوا و ئومێد بەمەی بارانێکی پیت و فەڕ داری بە دوادا دێت کە وڵاتەکە زیندوو ئەکاتەوە و کانیاوەکان ئەتەقێنێ، ﴿وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ﴾ فەراهەم ئەهێنێ هەورە قورسەکان بەهۆی ئەوەی ئاوی زۆریان پێیە و

هەڵگری ئەو ناوە قورسەن ﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾ هەورە گرمە پاك و بێگەردی خوا دەرئەبڕێ لە کاتێکدا وەسف و سەنا و سوپاسی ئەکات ﴿وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ﴾ فریشتەکانیش زیکر و تەسبیحی خوا ئەکەن لەبەر هەیبەت و سامناکی و بیم لەخوا ﴿وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ﴾ هەورە تریشقەکان ئەنێرێ و بەرەڵای ئەکات کە بریتین لەو ئاگرەی کە لە هەور دێتە خوارەوە بەو گرمە و دەنگ و نەعرەتە سامناکەوە کە دڵ و دەمار دائەچڵەکێنێ ﴿فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ﴾ ئینجا بەو تریشقانە دووچار ئەکات و ئەدات لەهەرکەسێك کە مەیلی بکات و بیەوێ، ئەمانەی کە باسکران بە هەر جۆرێدا ئەبن و هەر هۆیەکیان هەبێ شتێکی ئاشکران لەم بوونەوەرەدا، بەهەر جۆر تەفسیر کرابن و لەسەر هەر راو بۆچوونێك کە باسکراوە و لە کتێبەکاندا بلاّو کراوەتەوە، ئەم شتە ئاشکرایانە هەن و هەرکەس چاوی دڵی بە تەواوی کوێر نەبووبێت و هەرکەس رێزی خۆی بگرێت لە پێش هەموو شتێکەوە سەرنجی ئەو دەستە قودرەتە ئەدات کە داهێنەر و فەراهەم هێنەری ئەوانەیە کە باسکران و خرانە بەرچاو، ئەبێ بەملکەچی یەوە بڕوا بێنێ بە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە و ئەم شتانەی کە باسکران بڕوا بێنێ لەبەر ئەو بارو شێوەی کە رێنموونی ئەکات و فەرمان ئەدات، بەڕاستی لەگەڵ بوونی ئەو هەموو نیشانە و بەڵگە ئاشکرایانەدا بێ بڕوایی جێگەی سەر سوڕمانە، بێ بڕواکان جێگەی هەموو تانە و تەشەرێکن، لێرەدا دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ﴾ واتە خوا ئەو کەسەیە کە پەروەردگار و داهێنەری ئەو شتانەیە کە باسکران لە کاتێکدا کە ئەو بێ بڕوایانە دەم بازی و دەمە دەمێ ئەکەن لە خوادا و ئەوپەڕی قسە بەشەڕ دان ئەکەن و ئەیانەوێ رای پڕو پووچی خۆیان سەرخەن !! ئەو نەفامانە دەربارەی خوا بەو جۆرەن ﴿وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ لە کاتێکدا کە خوا زۆر پیلانی بەتینە و کەس لەدوای ئەو دەرناچێت، یان خوا هێزو توانینی زۆر بەتینە و هیچکەس و هیچ شتێ بەرامبەر کێی پێناکرێ لەگەڵی ﴿لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ﴾ هەر بۆ ئەو هەیە نزاو لاڵە لێکردنی هەق و راست و نزا و هاوار و داوا کردن لەو نەبێت راست نییە، یان هەر ئەو شایانی پەرستنە و هیچ کەسێکی تر شایان نییە،

وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ
ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ
۩ ﴿١٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا
ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ

---

یعنی، ﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ ئەوانەی بێجگە لە خوا ئەو نەفامانە نزاو هاوار و لاڵەیان لێ ئەکەن ﴿لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ﴾ نایەن بە هاواریانەوە و هیچ داوایەکیان وەرناگرن و داواکەیان جێ بەجێ ناکەن ﴿إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ﴾ مەگەر بە وێنەی وەرگرتن و جێ بەجێ کردن بۆ کەسێك کە تینوو بێت و لە دوورەوە هەر دوو مشتی رابکێشێ بۆلای ئاو بۆ ئەوەی بگاتە دەمی ﴿وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ﴾ بێگومان ئەو ئاوەش ناگاتە دەمی ﴿وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ﴾ دوعا و نزای بێ بڕوایان لە بتەکانیان هەر لە زایە بوون دایە و هیچ بەرهەمێکی نییە و نابێ، بەڕاستی بەو چیرۆکە زۆر شیرین و بەجێیە و ئەوپەڕی نائومێدی نیشان ئەدات، شێوەیەکی زۆر سەیر ئەخاتە بەرچاو، شێوەی کەسێکی زۆر تینوو لە دوورەوە دەست راکێشێ بۆ ئاو و دەم بکاتەوە بە هاوار و نزا ئاوەکە بێت بۆ دەمی، دیارە نە ئاوەکە ئەتوانێ بێت و نە ئاگای هەیە لەو تینووە و نە هەست ئەکات بە ناڕەحەتی و تینووی یەتی یەکەی! ئینجا لەم کاتەدا کە باسی ئەو نەفامانەی کرد کە نزا و هاوار ئەکەنە بتەکانیان، لەو کاتەدا جاڕی ئەوە ئەدات کە هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا سەرجەم ملکەچە بۆ مەیل و ئیرادەی خوا پێی خۆش بێت یان نەء، هیچ شتێك ناتوانێ سەرپێچی بکات لێی، ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ﴾ هەر بۆ خوا ملکەچ و داماوە بە بێ سەرپێچی هەرکەس وا لە ئاسمانەکان و زەویدا لەکاتێکدا بە ئارەزوو و پێخۆشی و بە بێ بێزاری و پێناخۆشی، واتە

هەموو كەس بڕوادار و بێ بڕوا ملكەچن بۆ خوا هەموو كاروباری بە پێی مەیل و ئیرادەی خوایە، بەڵكو سێبەرەكانیان لە بەیانیان و لای ئێوارەكانیش هەر ملكەچ و داماون لەبەردەم مەیل و ئیرادەی خوا و بە پێی ئەو گۆڕین و زیاد و كەم ئەكەن، ئەوەتا بەیانیان سێبەرەكان بەرەو رۆژئاوا ئەوپەڕی رادە و ئەندازەی سێبەری دارەكان درێژ ئەبن تا نیوەڕۆ، ئینجا كەم و كورت ئەبنەوە و بەرەو رۆژهەڵات دەست ئەكەن بەزیاد بوون و درێژ بوون تا ئەگەنە ئەوپەڕی رادەی خۆیان، هەروەها لە هەموو رۆژێك بە بێ گۆڕان و وەستان لە هەموو رۆژێكدا تا دنیا دنیایە ! مەبەست بەم سوژدەیە لێرەدا ئەو ملكەچی و بەر حوكمی یەیە، بە سوجدە ناوی برد كە باسەكە باسی نزاو عیبادەت و پەرستنە و سوجدەش ئەوپەڕی نیشانەی پەرستنە ! پاكی و بێگەردی بۆ ئەم قورئانە وبۆ نێرەری قورئانەكە. ئینجا لەم كاتەدا بە لاقرتی پێكردنەوە چەند پرسیارێك ئاراستەی ئەو نەفامانە ئەكات كە بەڕاستی شایستەی ئەوەن هەر ریسوا بكرێن و لاقرتییان پێ بكرێ.

ئەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر پرسیار بكە لەوانە و بڵێ ئایا كێ یە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، لە كاتێكدا هەموو كەس بە خۆیان و سێبەرەكانیشیانەوە وان لە قەبزەی قودرەتی خوادا پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێت؟ ئەوە پرسیارێك نیە داوای وەڵامیان لێ بكرێ، چونكە لە ئایەتەكەی پێشوودا وەڵامی هەیە، بەڵكو ئەو پرسیارە بۆ ئەوەیە وەڵامەكەی ببیستن بە گوتن، بێگومان بەچاو ئەیبینن و وەڵامەكەی ئاشكرایە، لەبەر ئەوە فەرمان ئەدات كە پێغەمبەر(ص) وەڵامەكەش بداتەوە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ خوا پەروەردگار و فەرمان دەر و فەرمان رەوایە. ئینجا بە بێزاری دەربڕینەوە پرسیاریان لێ بكە، ﴿قُلْ﴾ بڵێ پێیان: ﴿أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا﴾ دەی ئایا ئێوە بێجگە لە خوا بڕیار ئەدەن چەند دروستكار و كاربەدەستێكی بێ نرخ و

دەستە پاچە کە خاوەنی هیچ سوود و قازانجێك نین بۆ خۆیان کە بۆی پەیدا بکەن، خاوەنی هیچ زیانێك نین کە بەرگری بکەن لە خۆیان چ جای بۆ ئێوە کە ئەیان پەرستن؟ مەبەست لەم پرسیارە بێزاری لێدەربرینە لە باوەڕو کردەوەکەی ئەوان، چونکە ئاشکرایە کە ئەو بێ نرخ و دەستە پاچانەیان بڕیار داوە بە هاوبەشی خوا و ئەیان پەرستن. ئینجا چەند پرسیاری تریان لێ بکە، بۆ ئەوەی راو بڕیارەکەیان نیشان بدەیت بە شتێکی پووچەڵ و ناهەق و بەتاڵ، بەم رەنگە﴿قُلْ﴾ پێیان بڵێ: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ﴾ ئایا کوێرو چاو ساغ یەکسانن و وەك یەك وان؟ ﴿أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ﴾ واتە ئەوە لێ گەڕێ و ئەم پرسیارەی تر بکە: ئایا تاریکی یەکان و رووناکی یەکسانن و وەك یەك وان؟ واتە هەق و ناهەق جیاوازن لە یەکتر بە وێنەی جیاوازی کوێرو چاوساغ و تاریکی و رووناکی، بێجگە لەوە دەست نیشان ئەکات بەوە کە بێ بڕوا کوێرە و نابینا، بڕوادار چاوساغ و بینایە، حاڵی بێ بڕوا وەك تاریکی یە و حاڵی بڕوادار نوور و رووناکی یە، بەڵێ شتێکی راستە کوێر شتی ئاشکرا نابینێ، بێ بڕواش ئەو هەقە روونە هەست پێ ناکات، هەروەها بێ بڕوایی تەم و تاریکی یە بەسەر دڵ و دەروونەوەو بەرگری ئەکات لە ناسین و زانینی هەق، ئیمان و بڕوا نوور و رووناکی یە کە دڵ و دەروون زانا ئەکات و وریا و هەست هۆش داریان ئەکات و بەجوانی هەق و ناهەق لەیەك جیا ئەکەنەوە، لە چەند شوێنێکدا قورئان تاریکی و رووناکی گێڕاوە بە وێنەو چیرۆك بۆ بێ بڕوایی و ناهەق و بڕوا و هەق، لەو هەموو شوێنانەدا تاریکی یەکەی بە کۆ(جمع) هێناوە و رووناکی یەکە بە تاك، ئەوەش دەست نیشانە بەوە کە بێ بڕوایی و ناهەق چەند جۆر و شێوەیەکە بڕوا و هەق هەر یەك جۆر و یەك شێوەیە، بەڵێ دیارە و ئاشکرایە کە قورئان ئەبێ هەموو شتێکی هەر راست و رەوا و بەجێ بێ، ئینجا واز ئەهێنێ لە پرسیارەکانی پێشوو و ئەگوێزێتەوە بۆ ئەم پرسیارە، ئەمانە پرسیار نین،

أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَـٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّـٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا

**بەڵکو لە شێوەی پرسیار دان: ﴿أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ﴾ ئەی ئایا ئەوانە چەند هاوبەشێکیان گێڕاوە و داناوە بۆ خوا کە شتیان داهێنابێ و دروستکردبێ وەك داهێنان و دروستکردنی خوا، ﴿فَتَشَـٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە دروستکراوەکانیان لێ بشێوێ و نەزانن کام هینی خوایە و کام هینی بتەکانە، کەواتە ئەگەر وا بوایە، ئەوانە عوزر و بەهانەیان ئەبوو لە پەرستنی ئەو بتانەدا، چونکە ئەو کاتە ڕێ یان هەبوو بڵێن: ئەمانیش وەك خوا دروستکراویان هەیە، کەواتە ئەمانیش وەك خوا شایان و شایستەی پەرستنن؟ بەڕاستی ئەمە لاقرتی پێکردنێکی دڵ تەزێنە بۆ ئەو نەفامانە کە ئەزانن بتەکانیان دروستکراوێکی بێ نرخە و دەستە پاچەن و ئەیان زانی و دانیشیان ئەنا بەوەدا کە ئەم بوونەوەرە خوا دروستی کردووە، جا لەبەر ئەوە ئەبێ بەدوای ئەم شێوە پرسیارەدا ئەمە بێت کە ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ﴾ بڵێ: خوا داهێنەر و دروستکاری هەموو شتێکە ﴿وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّـٰرُ﴾ هەر ئەو تاك و تەنهای زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، بێگومان وێنە و چیرۆك زۆر بەکارە بۆ نیشاندان و پێناسینی مەبەست، لەبەر ئەوە لە قورئاندا ئەو هەموو وێنە و چیرۆکە هاتوون، جا لەبەر ئەو بارە ئەوا لێرەدا دوو چیرۆك و وێنەی تر ئەهێنێتەوە بۆ هەق و ناهەق، بۆ نزا و پەرستنی هەمیشەیی و نەفەوتاو و پەرستن و نزای دانەمەزراو و فەوتاو، بۆ هەق و خێری دامەزراو و لەسەرخۆ، بۆ شەڕ و ناهەقی، یان ئیش کەر و تواوە، یەکەم ئەفەرموێ:﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾ هێناویەتی و ئەهێنێتە خوارەوە ئاو لەلای ئاسمان و لای سەرەوە ﴿فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا ﴾ بەهۆی ئەوەوە چەند شیو و دۆڵێك لافاوی هەڵئەنیشێ بە ئەندازەی خۆیان. واتە بەو ئەندازەی کە بۆی دیاریکراوە بە پێی کاردروستی خوا، یان بە ئەندازەی ئەو شیو و دۆڵانە کە جیاوان لە زۆری و کەمیدا.**

فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ
وَالْبَاطِلَ ۚ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً ۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾
لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ
مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ ۚ أُولَٰئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٨﴾

---

**﴿فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا﴾ ئینجا ئەو لافاوە خەوش و خاڵ و کەف و چڵك و چەپەڵی هەڵئەگریٚ و ئەهێنیٚ. چیرۆکی دووەم ئەفەرمویٚ: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ﴾ لەو شتانەی کە خەڵکی ئاگری لەسەر تاو ئەدەن و هەڵی ئەگرێنن لەناو ئاگرەکەدا، یان لە کاتێکدا ئەو شتانە ولن لەناو ئاگردا، ئەو شتانەش وەك ئاڵتون و زیو و ئاسن و مس کە بەو جۆرەیان لیٚ ئەکەن ﴿ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ﴾ بە نیازی دروستکردنی خشڵ و زێوەر کە لە ئاڵتون و زیوەکە پێکدێت، یان بە نیازی شتێکی تر کە سودی لیٚ وەرئەگیریٚ وەك ئەو هەموو قاپ و قاچاغ و شتانی ترە کە پێویستی هەیە پێیان لە ژیانی دنیادا، جا لەو شتانەدا کە ئاگریان لەسەر تاو ئەدەن و سوریان ئەکەنەوە پەیدا ئەبیٚ ﴿زَبَدٌ مِّثْلُهُ﴾ کەف و چڵك و چەپەڵی یەك بە وێنەی ئەو چڵك و چەپەڵی یەی کە لافاوەکە ئەیهێنیٚ ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ﴾ بەو جۆرە باس و خواسە نایاب و گرنگە خوا باسی هەق و بەتاڵ ئەکات و وێنە و چیرۆکیان بۆ ئەهێنێتەوە، واتە شتە پاك و خاوێنەکان ئەکات بە وێنە و چیرۆك بۆ هەق، کەف و چڵك و چەپەڵی یەکە ئەکات بە وێنە و چیرۆك بۆ ناهەق و بەتاڵەکە ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً﴾ ئینجا کەف و چڵك و چەپەڵی یەکان ئەڕۆن بە تو دراوی و نامێنێتەوە ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾ ئەوی کە سود ئەگەیەنیٚ بە خەڵکی وەك ئاوە پاڵفتەکە لە وێنەی یەکەمدا و ئاڵتون و زیو و مسە خاوێن و پاڵفتەکە لە وێنەی دووەم. ﴿فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەوە ئەمێنێتەوە و جێگیر و دامەزراو ئەبیٚ لە زەویدا، بەڕاستی هەردوو وێنەکە ئەوەندە رێك و راست و بەجێن سەر سوڕ ئەمێنیٚ لێیان، بەڕاستی بڕوادار ئەبیٚ ئەوپەڕی رادە دڵخۆش و شادمان بێت بەو بڕوا و ئایینە هەق و راستەی کە لەسەریەتی و چاولەبەری چاکە و بەهرەکەی خوابیٚ کە بە میهرەبانی خۆی پێی بەخشیوە، ئینجا بەڕاستی هەردوو چیرۆکەکە زۆر راست و روونکەرەوەی مەبەستەکەن، ئەوەتا ناهەق و بەتاڵ کە شتێکی بەد و پیسە لە یەکەم جارەوە ئەو ئەبینریٚ و وا بە دەرەوە و بەرز بووەتەوە، هەق و راستی یەکە دەرناکەویٚ و داشاراوە، کەچی ئەبینریٚ ناهەق و بەتاڵەکە ون ئەبیٚ و**

نامێنێ و وەك هەر نەبووبێ، بەڵام بە مەرجێ هەوڵ و تێكۆشان ببێ بۆ نەهێشتن و لابردنی، كەواتە پێویستە بڕوادار نەوەستێ و تێكۆشان بكات و نەترسێ لە ناهەق هەرچەند بە رووكەش و رواڵەت بەرز بووبێتەوە و بافیشی كردبێتە خۆی، ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ﴾ بەو جۆر و شێوە نایابە خوا چیرۆك و وێنەكان باس ئەكات و ئەیانهێنێتەوە و دوا رۆژی بانگەوازی راست و عەقیدە و بیر و باوەڕە پاك و وتار و كرداری راست و پاك روون ئەكاتەوە و ئەیان خاتە بەرچاو، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ بۆ ئەوانەی كە گوێ رایەڵی ئەكەن بۆ پەروەردگاریان و ئەچن بەدەم بانگ و بانگەوازەكەیەوە، بۆ ئەوانە هەیە ئەجرو پاداشتی جوان و شیرین كە بەهەشتە، وەك(قتادة) ئەفەرموێ. یان ژیانی پاك و خاوێن بەبێ تەم و لێڵی، وەك(مجاهد) ئەفەرموێ. ﴿وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ﴾ ئەوانەی كە گوێ رایەڵی یان نەكردبێ و نەچووبن بەدەم بانگەواز كردنەكەی خواوە و بڕوایان نەهێنابێ بەو هەقە روون و ئاشكرایە دووچاری سزا ئەبن بە جۆرێ: ﴿لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ ئەگەر ببێ بۆیان هەرچی وا لە زەویدا هەموو بە سەرجەم ﴿وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ وێنەی ئەوەش ﴿لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ﴾ فیداكاری پێ ئەكەن و ئەیدەن لە پێناوی رزگار بوونیان لەو سزایە﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ﴾ ئەوانە بۆیان هەیە حیسابی سەخت و بەد ﴿وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ جێ و شوێنی گەڕانەوەیان دۆزەخە﴿وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ بەد و خراپە نیشتەجێی ئەوانە، واتە دۆزەخ، یان ئەو شوێنەی كە ئامادە كراوە بۆیان، بەڕاستی لاقرتی كردنێكی دڵ تەزێنە ناوبردنی جێ و شوێنەكەیان بە(مهاد) كە لە زمانی عەرەبیدا ناوە بۆ جێی ئارام گرتن و حەوانەوە.

لەپاش نیشاندانی ئەو هەموو شتە گرنگانە لە ناوچەكانی بوونەوەر و لەناو دەروون كە ئەم یەكەمی سورەتە هێنانی و خستنیە بەرچاو، بەشی دووەم ئەوا دەست ئەكات بە دەستكاری كردن و داچڵەكاندنی ویژدان و ژیریی، لەبارەی وەحی و پەیام و مەسەلەی تاك و تەنهایی خوا و هاوبەش رەوادەران، مەسەلەی داوا كردنی موعجیزە لەلایەن بێ بڕواكانەوە و پەلە نانەوەیان بە هاتنی هەڕەشە و رۆژی دوایی. ئەم گەڕان و گەردشە دەست پێ ئەكات بە باسی سروشتی بڕوا و سروشتی بێ بڕوایی، یەكەم دائەنێ بە زانین و دووەم بە كوێری و نابینایی، سروشتی بڕواداران و بێ بڕواكان و سیفەت و نیشانەی هەردولا، بە دوای ئەوەدا چەشمەندازێ لە چەشمەندازەكانی رۆژی دوایی ئەخاتە بەرچاو، باسی نازو رێزی بڕواداران و سزای سەختی بێ بڕواكان ئەكات، هەروەها چەند شتی تر كە لە كاتی خۆیدا – بە یارمەتی خوا – پێی ئەگەین.

۞ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ
وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ
﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً

**یەکەم مەسەلە کە باسی ئەکات مەسەلەی وەحی یە، لە سەرەتای سورەتەکەدا باسی ئەکات، لێرەدا جارێکی تر باسی ئەکاتەوە بە جۆر و شێوەیەکی تازە. ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ﴾ ئایا کەسێك کە بزانێ ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە هەر ئەوە هەق و راستە، بە وێنەی کەسێکە کە کوێر بێت؟ واتە کەسێك کە زانا بێت بەوە وەك کەسێکە کە نەزان بێت، بەڵام لەباتی نەزان کوێری فەرمو. لەبەر ناشیرین کردنی حاڵی ئەو نەزانە، لە راستیشدا ئەو کەسە کوێری راستەقینەیە کە بریتییە لە کەسێك کە چاوی دڵی کوێر بێت، چونکە هۆی نەزانین کوێری چاو نییە، بەڵکو کوێری دڵە، بێگومان هەرکەسێ چاوی دڵی کوێر نەبێ ئەزانێ و بڕوای هەیە کە ئەم قورئانە هەق و راستە، خەڵکی بەرامبەر ئەم شتە راستە دوو جۆرن: بەشێك چاوی دڵی بینایە و کەواتە ئەزانێ و هەست ئەکات بەو شتە راست و روونە، بەشێکی تر هەرچەند چاوی سەری بینا بێت، بەڵام چاوی دڵی کوێرە، کەواتە ئەو شتە راستە نابینێ هەرچەند روون و ئاشکرایە و بە هەموو جۆر راستی یەکەشی بۆ روون ئەکرێتەوە بە بەڵگە و نیشانە و چیرۆك وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ هەر ئەوانە بیر ئەکەنەوە و ئامۆژگاری وەرئەگرن کە خاوەنی ژیریی یەکی پاك و خاوێنن، کەواتە هەقیان بیر خرایەوە بە باشی وەری ئەگرن و بەدڵ هەستی پێ ئەکەن، ئینجا سیفەت و نیشانەی ئەو خاوەن ژیریی یانە باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ﴾ ئەوان کەسانێکن کە عەهد و پەیمانی خوا بەجێ ئەهێنن و ئەوەی کە بەڵێن و بڕیاریان داوە لەسەر خۆیان هەڵنەسن پێی و ئەو**

پەیمانەی کە خۆیان بەستووە پێیەوە و گرێیان داوە لەسەر خۆیان هەڵی ناوەشێننەوە، ئەو عەهد و پەیمانی خوا ئەگرێتەوە کە یەکەم و گەورەتریان پەیمانی بڕوایە و دوو جۆری هەیە:

١- ئەو پەیمانە سروشتی یەیە کە پەیوەستە بە بوونەوەر و ئەو سروشتە هەست ئەکات بە بوونی داهێنەرێك کە هەموو شت بە مەیلی ئەو پەیدا ئەبێ و هەموو شت لە دەستی قودرەتی ئەو دایە، ئەبێ هەموو شت هەر لە ئەو بناسرێ و هەر ئەو بپەرسترێ.

٢- ئەو پەیمانە تازەیە کە لەگەڵ پێغەمبەراندا بەسترا کە خوا رەوانەی کردن بۆ ئەوەی ئەو پەیمانە تازە بکەنەوە بە بەندەکانی خوا و پەیمانە کۆنەکەیان بیر بخەنەوە و روونی بکەنەوە بۆیان، داخوازی ئەو پەیمانی بڕوایە روون بکەنەوە بۆیان کە بریتی یە لە ملکەچی تەنها بۆ خوا، فەرمانبەری خوا و هەڵسان بە کردەوەی چاك و خۆپارێزی، دوور کەوتنەوە لە کردەوە و رەوشتی بەد و خراپ، روو کردنە خواو پشت بەستن تەنها بەو. ئینجا ئەو پەیمانە لەگەڵ خوادا بنەڕەت و بناغەیە بۆ هەموو پەیمانەکانی تر کە ئەبەسترێ لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ئیتر پێغەمبەران یان خەڵکی تر، خزم و خوێش یان بێگانە. یەکە یەکە یان بە کۆمەڵ، چونکە ئەو کەسەی کە چاودێریی و پارێزگاری پەیمانی گەورە بکات ئەبێ چاودێریی و پارێزگاری هەموو پەیمان و بەڵێنەکانی تر بکات کە فەرمان و رەزامەندی خوای لەسەر بێت، کەواتە ئەو بەڵێن و پەیمانە گەورەیە بنەڕەتێکە کە کۆشکی ژیان لەسەر ئەو راگیر و دامەزراوە، هەرچەند ئەو بناغە و بنەڕەتە هەموو کارو کردەوەی چاك ئەگرێتەوە.

بەڵام لەبەر گرنگی و زیادە روونکردنەوە بە تایبەتی ئەم چەند سیفەت و نیشانەیش باس ئەکات و وەك سەربەخۆ نیشانیان ئەدات:

١- ﴿وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ ئەو کەسانەی کەپەیوەندی ئەکەن بەوەی کە خوا فەرمانیداوە پەیوەندی پێوە بکرێ ئاوا بە کورتی ئەیفەرموێ و پەیوەندی پێوە کراوەکە باس ناکات بە درێژیی، چونکە ئەو درێژە پێدانە لێرەدا مەبەست نییە، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە کە گوێ رایەڵی و فەرمانبەری تەواو بکەن بە بێ لادان و پێچ و

پەنا، ئاخری ئایەتەکە دەست نیشان ئەکات بەو هەستەی کە ئەبێ ببێ لە دەروونیاندا لەگەڵ ئەو گوێ رایەڵی یە تێرو تەواوەدا کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ﴾ بیم و ترس ئەکەن لە پەروەردگاریان و ئەترسن لە بەدیی و سەختی حیساب و پرسیاریان، کەواتە ژیرن خۆیان حیساب و پرسیار لە خۆیان ئەکەن پێش هاتنی رۆژی دوایی، وتەی ﴿یخشون﴾ و ﴿یخافون﴾ هەرچەند زانایان بە جیاوازیان داناون، بەڵام لە راستیدا جیاواز نین، بەس ئەمە راستە کە(راغبی ئەسفەهانی) ئەفەرموێ: یەکەم ترسێکە کە بە گەورە گرتن و بە گرنگ گرتنی لەگەڵ بێت سەبارەت بە ترس لێکراوەکە.

٢- ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەوانەی کە خۆگری یانکرد و خۆگرن لەبەر بەدوا گەڕانی رەزامەندی خوا و هەر لەبەر ئەوە نوێژیان بە رێك و راستی بەجێهێناوەو بەجێ ئەهێنن.

٣- ئەفەرموێ: ﴿وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ لەوەی کە پێمان داون و کردوومانە بە بەش و رۆزی یان، هێندێ ئەدەن بە خەڵکی بە نهێنی و بە ئاشکرا، بە نهێنی لە کاتێکدا کە بە نهێنی باشتر بێت، وەك لەبەر مەترسی لە رووپامایی و ناو و شۆرەت، یان لەبەر پاراستنی ئابرووی ئەو کەسەی کە پێی ئەبەخشرێ، بە ئاشکرا کاتێ ئاشکرا کردن باش بێت وەك بە نیازی ئەوەی خەڵکی چاوی لێ بکەن، یان لەبەر ئەوەی دەری بڕن کە گوێ رایەڵی شەرع ئەکات و ملکەچە بۆ فەرمانی شەرع، یان لەبەر ئەوەی کە ئەیدات زەکاتە و فەرزە لەسەری و بە ئاشکرا ئەیدات تا بە فاسق و گوناهکار سەیر نەکرێ. هەرکام لە نهێنی و ئاشکرا کردن جێ و شوێنی خۆی هەیە و ئەناسرێ، بە هەرکام بەخشینی ماڵ بەرهەمێکی گەورەی هەیە لە ژیاندا، هۆی پێکهێنانی برایەتی و خۆش ویستنە، مایەی پاککردنەوەی دەروونە، دەروونی خاوەن ماڵ لە چرووکی و چاو برسێتی و دەروونی پێ بەخشراو لە حەسادەت و کینە، نیشانەیە لەسەر پاك و

خاوێنی گەل و کۆمەڵ، کۆمەکی و دەست گیرۆیی و دەست گرتنی نێوانیان، هۆیەکە لە هۆیەکانی نەهێشتنی داماوی و هەژاری.

٤- یەکێ تر لەو شتە گرنگانەی کە بە تایبەتی باسیان ئەکات ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ﴾ بە چاکە بەرگری خراپە ئەکەن، واتە بەرامبەر بە خراپە چاکە ئەکەن، بەڵام ئەوە بۆ کار و کردەوە و مامەڵەی نێوان خەڵکی یە نەك لە بارەی ئایینەوە، بەڵکو لەوەدا ئەبێ بەرگری بکرێ بە گوێرەی ئەو حەدیسەی کە ئەفەرموێ: هەرکەس لە ئێوە بێ شەرعی یەکی بینی، ئەبێ بەرگری بە دەست و بە زۆر، ئەگەر بەوە نەیتوانی بە قسە و بە زمان، ئەگەر بەوەش نەیتوانی ئەبێ بەدڵ و بەم رەنگە بێزار بێت و خەشمدار بێت لێی و ئیش بکات بە دڵی و نیازی وابێ هەرکات دەسەڵاتی بوو نەیهێڵێ. ئینجا ئەفەرموێ: بە بێ ئەوانە بڕوا نییە و نامێنێ ئەندازەی ناوکە و دانەوێڵەی خەرتەلەیەك. واتە بە بڕوادار نامێنێ، بەڕاستی کارەکەمان زۆر سەخت و سامناکە و زۆربەی خەڵکی بێ ئاگایە لێی، جا لەبەر ئەوەیە ئیمامی ئەحمەد - خوای لێ رازی بێت - ئەفەرموێ: هەرکەس بە پێی ئەو حەدیسە رەفتار نەکات بێ بڕوایە و لە ریزی بڕواداران دەرئەچێ. ئینجا با بزانرێ کە ئەو چاکە کردنە بەرامبەر بە خراپە کاتێکە کە بەو چاکەیە خراپەکەر کۆتایی بێنێ بە خراپەکەی، بەڵام ئەگەر بەوە خراپتر بوو و لەخۆی گۆڕا و بایی بوو، لەو کاتەدا چاکەکردن خراپەیە و ئەبێ بەرگری بکرێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ ئەوانەی کە خاوەنی ئەو سیفەت و نیشانانەن بۆ ئەوانە هەیە پاشەرۆژی ئەم دنیایە کە بەهەشتە، چونکە پاشەرۆژی راستەقینە کە گوترا مەبەست بەهەشتە وەك ئەفەرموێ: ﴿ٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ مەبەست ئەوە نییە کە ئەو پاشە رۆژە تایبەتییە هەر بەوانەی کە باسکران، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەوانە ئەو پاشە رۆژەیان بۆ هەیە ئیتر با کەسانی تریش بۆیان ببێ، وەك گوناهبارانێ کە بە بڕواوە مردبن کە لە پاش سزادان هەر ئەچنە بەهەشت، ئەگەر بڵێین و بە شێوەی تایبەتی کردن واتا و تەفسیری بکەینەوە وەك هێندێ ئەفەرمون ئەبێ بڵێین: ئەو پاشە رۆژە هەر بۆ ئەوانە هەیە بە بێ سزادان، تا هیچ گرێ و دژایەتی پەیدا نەبێ لە نێوان ئەم ئایەتەوە و ئەو هەموو حەدیسە سەحیحانەدا کە بەهەشت دەکەن بە دوارۆژی هەر کەسێك کە بە بڕواوە بمرێ، ئیتر هەرچەند گوناهبار بێت و سزای بدرێ.

جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾
سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾

---

ئینجا پاشە رۆژەکە روون ئەکاتەوە بەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ﴾ واتە بۆ ئەوانە هەیە بەهەشت و باخاتی نیشتەجێی و مانەوە بە هەمیشەیی. لە کاتێکدا و بە شێوەیەك ﴿يَدۡخُلُونَهَا﴾ ئەوانە ئەچنە ناویەوە ﴿وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ﴾ ئەوانەش کە سالحن لە باوك و دایکەکانیان و ژن و هاوسەرەکانیان و ئەولاد و نەوەکانیان، ئەمانەش کە ئەچن بەهۆی چاکی و سەلاحەتی خۆیان ئەچن، بەلام رێز ئەگیرێن بە کۆبوونەوەیان و گەیشتنیان بە یەك، یان ئەمانە بەهۆی کردەوەی خۆیان شایستەی ئەو رادەو پلە بەرزە نین، بەلام خوا بەرزیان ئەکاتەوە بۆ رادە و پلەی ئەو زۆر چاکانە لەبەر زێدە رێزگرتنیان، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی سورەتی(الطور) کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖ﴾، لەسەر هەر بار ئەو یەکگرتن و کۆبوونەوەیە بەهرەو خۆشی یەکی ترە خوای میهرەبان ئەیبەخشێ بە بەندە بڕوادارەکانی – داواکارین خوا بێ بەشمان نەکات و بەشدارمان بکات لەوەدا –.

ئەوانە بەو خۆشی و شادومانی یەوە وان لە جێ و شوێنی خۆیاندا، ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ﴾ فریشتەکان ئەچن بۆلایان لە هەموو قاپی یەکەوە، قاپی مەنزڵەکانیانەوە وەك لە چەند ریوایەتێکدا هاتووە، یان لە هەموو قاپیی چاکەکانیانەوە کە هەرکام لە نوێژ و رۆژو و کردەوەکانی تر قاپی تایبەتیان هەیە ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾ لە کاتێکدا ئەڵێن پێیان: سەلامتان لەسەر بێت ئەوەش مزگێنی تێدایە بە سەلامەتی یان بە هەمیشەیی، یان سەلامتان لێ ئەکەین بەهۆی خۆگرتنتان لە دنیادا. پاشە رۆژی دنیاتان چاك بوو، واتە ئەم بەهەشت و خۆشی و شادومانی یە. بەڕاستی زمان و قەڵەمی ئێمە کول و کۆڵە لە دەستەواژە و نوسینی ئەو بەهرە و خۆشی یە کە ئەم ئایەتانە نیشانی ئەدەن، نازانین چی بڵێین و چی بنوسین.

وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾

---

**ئینجا بەرامبەر ئەم دەستە و کۆمەڵە بەرز و بەرێز و خوا پێداوانە و دەستە و کۆمەڵی پەست و بێ نرخ و سیاچارە دێنە بەرچاو کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ ئەوانەی کە پەیمانی خوا هەڵئەوەشێننەوە لەپاش بەهێز کردن و بەستنەوەی خۆیان پێیەوە و بەڵێن و بڕیاریان بدەن لەسەری، پەیمان لەسەر ئەو بارو جۆرەی کە لە ئایەتی پێشوودا باسکرا ﴿وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ و ئەیپچڕن ئەوەی کە خوا فەرمانیداوە بە پەیوەندی کردن پێیەوە ﴿وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ خراپەکاری ئەکەن لە وڵاتدا بەرامبەر چاکە و کردەوە چاکەکان کە دەستەی چاکان و چارەنووسیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ ئەوانە بۆیان هەیە نەفرین و دووری لە میهرەبانی خوا و دەرکردن لە قاپی بەزەیی خوا – خوا پەنامان بدات لەو چارە رەشییە – ئەو بێ بڕوا و نەفامانە خۆشنود و کەیف خۆشن بەم ژیانی دنیا و نیعمەتەکەی کە ئەڕوا و نامێنێتەوە بەهۆی ئەوەوە چاو هەڵناخەن بۆ رۆژی دوایی و ناز و نیعمەتە نەبڕاوەکەی، لەگەڵ ئەوەدا هەموو نیعمەت هەر بە دەست خوایە و ئەو فراوانی ئەکات یان کەم و کورتی ئەکات. کەواتە لە دنیا و لە رۆژی دواییدا هەموو کاروبار یەکسانە و بەدەست ئەوە. ئەگەر ئەوانە بەدوای دەستکەوتی رۆژی دواییدا بگەڕێن زیان ناگەیەنێ بە رۆزی و نیعمەتی دنیایان و نابێتە هۆی بێ بەشی یان، بەڵام خەریك بوونیان هەر بە بەشی دنیاوە هۆی بێ بەشی یانە بۆ رۆژی دوایی کە هەموو نیعمەت و رۆزی و رۆزی دنیا لەچاو بەش و نیعمەتی رۆژی دواییدا شتێکی زۆر کەمە وەك دەست نیشان ئەکات**

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ
﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن
قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَاْ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ
تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾

---

بەوانە و ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ خوا ڕۆزی زۆر ئەکات و بە لێشاو ئەیدا بۆ هەر کەسێك کە خوا خۆی مەیلی ببێ، کەم و کورتیشی ئەکات، ﴿وَفَرِحُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوانە کەیف خۆش بوون لە دنیادا بە ژیانی دنیا و هەر چاویان بڕیوەتە ئەو، ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ﴾ لەکاتێکدا ژیانی دنیا لەچاو ژیانی ڕۆژی دواییدا هیچ نییە بێجگە لە شتێکی کەم و هەموو توێشوو و نانێکی بە پەلە کە ئامادە ئەکرێ بۆ کەسێکی سەفەری، یان نان و خۆراکێ کە ئەدرێ بە شوان.

لە پێشەوە دەست نیشانی کرد بەوەی ئەو بێ بڕوایانە کوێرن، جا ئەوا لێرەدا هێندێ لە بەرهەمی کوێری یەکەیان باس ئەکات کە ئەوانە ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە بوونەوەری یانە نابینن و ئەم قورئانەیان بەس نییە بە بەڵگە و موعجیزە و داوای بەڵگە و موعجیزە ئەکەن، لە بەشی یەکەمی سورەتەکەدا باسی ئەمەی کرد لێیانەوە، دەم کوتی کردن بەوەی کە پێغەمبەر هەر ترسێنەرە و موعجیزە و بەڵگە هەر بەدەست خوایە، لێرەدا بەمە دەم کوتیان ئەکات کە هۆی ڕێنموونی و گومڕایی هەر بە مەیل و ئیرادەی خوایە و هەرکەس بگەڕێتەوە بۆلای خوا ڕێنموونی ئەکات وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە و بێ بڕوان ئەڵێن، ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ با لە لایەن پەروەردگاری یەوە ئایەت و موعجیزەیەك بهێنرایەتە خوارەوە بۆ سەری ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ﴾ ئەی پێغەمبەر لە

وەلآمی ئەوانەدا بڵێ: بەڕاستی خوا مەیلی هەرکەسی ببێ گومڕای ئەکات، ڕێنموونی هەرکەسێك ئەکات بۆلای خۆی و ئەیخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆی کە ئەو کەسە گەڕابێتەوە بۆلای خۆی و ڕووی کردبێتە ئەو ئایینە هەقەی کە ڕێنموونی کراوە بۆی، واتە ئایەت و بەڵگە و موعجیزە خەڵکی ڕاناکێشێ بۆ بڕواهێنان، بەڵکو بڕواهێنان هۆی تایبەتی خۆی هەیە کە بریتییە لە گەڕانەوەی بەندە بۆلای خوا و ڕوو کردنی بەلای خوا. هەرکەس بەو جۆرە بێت خوا ئەیخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆی، ئەو کەسە شایستەیە بۆ ئەوەی خوا بەهرەمەندی بکات بە بڕواهێنان، کەواتە ئەو کەسەی کە ناگەڕێتەوە بۆلای خوا و خۆی یاخی ئەکات لەخوا شایستەی گومڕا کردنە، کەواتە خوا گومڕای ئەکات، بە کورتی ئامادەیی دڵ و هەوڵ و بەدوا گەڕانی ڕێنموونی هۆی بەهرەمەندی یە بە بڕوا هێنان، ئەو دڵەی کە خۆی نەبزوێنێ بۆلای خوا بێگومان دوورە لەو بەهرە و بەهرەمەندی یە. ئینجا شێوەی شیرینی ئەوانە نیشان ئەدات کە ئەگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ﴾ واتە ئەوانە کەسانێکن کە بڕوایان هێناوە لە کاتێکدا بە هەمیشەیی دڵیان بە ئارام و دامەزراوە بە قورئان کە پەند و ئامۆژگاری خوایە، کەواتە تەنها قورئانیان بەسە و ئیتر داوای هیچ بەڵگە و موعجیزەیەکی تر ناکەن وەك(مقاتل) ئەفەرموێ. ناوبردنی بە ﴿ذکر﴾ لە چەند ئایەتێکدا هاتووە، یان مەبەست بە﴿ذکر﴾ یاد و باسی خوایە و هەستکردن بە پەیوەستی دڵ بە خواوە، لەسەر هەر بار ئەمە ڕاستە کە ئەفەرموێ ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ بێدار و ئاگاداربن کە هەر بە زیکری خوا دڵەکان دامەزراو و بە ئارام ئەبن، بەڵێ بێگومان بە بێ ئەو یاد و هەستە قورئان نابێتە هۆی ئارام و دامەزرانی دڵ، کەواتە ئەو یاد و هەستە هۆی نزیکە. ئینجا ئەم بەڵێن و موژدە ئەدات بەو کەسانەی کە خاوەنی ئەو دڵە بە ئارامانەن و لە باتی ئەوان ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان بەجێهێناوە ﴿طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ﴾ خۆش بەختی و خۆشی ژیانی پاك و خاوێن و خۆزگە پێ بردن بۆ ئەوانە و گەڕانەوەی شیرین و دوا ڕۆژی چاك – بە چەند

جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە -. ئینجا ئەبوایە ئەو نەفامانە سەریان نەکردایەتەوە ناردنی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، چونکە ئەو یەکەم کەس نەبووە کە رەوانە کرابێ بۆ سەر خەڵکی، بەڵکو لە پێش ئەمەوە گەلان و ئوممەتانی تر هاتوون و تێپەڕیانکردووە هەرکام پێغەمبەریان بۆ رەوانە کراوە. کەواتە با پێغەمبەر(ﷺ) گوێ ی نەبێ لە نەفامی بڕوا نەهێنانی ئەوانە و لەسەر کار و فرمانی خۆی بڕوا وەك ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِيٓ أُ... قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ﴾ بەو جۆرە ناردن و رەوانە کردنە گەورە و گرنگە تۆمان رەوانە کردووە موعجیزەی ئاشکرات پێیە، یان بە وێنەی ناردنی پێغەمبەرانی تر تۆمان رەوانە کردووە لە گەل و ئوممەتێکدا کە لە پێش ئەوانەوە چەند گەل و ئوممەتی تر هاتوون و تێپەڕیانکردوو تۆمان رەوانە کردووە لەناو ئەو گەل و ئوممەتەدا، ﴿لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ بۆ ئەوە بخوێنی بەسەریا دا ئەوەی کە وەحیمان کردووە بۆلات. ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾ لەکاتێکدا ئەوانە بڕوا ناهێنن بە کەسێك کە بەخشندە و میهرەبانە و خاوەن بەزەیی گەورەیە، واتە کاتێکدا کە بڕوا ناهێنن بە ئێمە، بەڵام فەرموێ: ﴿يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ﴾ تا بزانرێ ناردنەکەی لە بەزەیی و میهرەبانی یە نەك لەبەر هیچ جۆرە پێویستی یەك نە بە ئەوان و بە هەموو بوونە و هەروەها بەو وتە پیرۆزە سەرنج رائەکێشێ بۆ بڕوا هێنان و سەرزەنشتی بێ بڕوا ئەکات و بڕوا نەهێنانەکەیان ئەکات بە جێگەی سەرسوڕمان ! ﴿قُلْ هُوَ رَبِّي﴾ بڵێ ئەو خ... میهرەبانە پەروەردگاری منە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نییە بێجگە ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ پشتم هەر بەو بەستووە و گەڕانەوەم هەر بۆلای ئەوە، واتە تۆ بۆ ئەوە ناردووە ئەم قورئانە بەسەریاندا بخوێنی، جا ئەگەر بڕوایان نەهێنا ئەوا راگەیەنە تۆ پشتت هەر بەخوا بەستووە و تۆبە و گەڕانەوەت هەر بۆلای ئەوە، تۆمان رەوانە کردوو ئەوە ناردووە ئەم قورئانە بەسەریاندا بخوێنی، جا ئەگەر بڕوایان نەهێنا ئەوا راگەیەنە ک پشتت هەر بە خوا بەستووە و تۆبە و گەڕانەوەت هەر بۆلای ئەوە،

تۆمان ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی ئەم قورئانە بخوێنی بەسەریاندا کە ئەم قورئانە ئەوەندە گەورە و گرنگ و بەکارە و ئەوەندە موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرایە گەیشتووەتە ئەم ڕادەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ أَنَّ قُرۡءَانٗا سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ﴾ ئەگەر خوێنراوێك شاخ و چیاکانی پێ هەڵکەنرایە لە شوێنەکانی خۆیان و بڕەوێنرێن وەك شاخی(طور) کە خرایە لەرزە و پارە پارە کرا، ﴿أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ﴾ یان زەوی پێ لەت لەت بکرایە بە ڕووبار و کانیاو، وەك ئەو بەردەی کە موسا هەڵیدا و دوانزە کانی و چەشمەی لێ پەیدا بوو، ﴿أَوۡ كُلِّمَ بِهِ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ یان قسەی پێ بکرایە لەگەڵ مردووانـدا، واتە پێی زینـدوو بکرایەتەوە وەك عیسا خوا ئەوەی کرد بە بانگکردنی مردوو زیندوو بوویەوە، ئەگەر بهاتایە هەر خوێنراوەیە ئەو موعجیزانەی پێ بکرایە، بێگومان هەر ئەم قورئانە ئەبوو، چونکە لەم قورئانەدا ئەوەندە شتی نهێنی و تایبەتی هەیە لەوانەیە ئەو موعیجزانەی پێ بکرێ، بەڵام ئەو قورئانە بۆ ئەوە نەهاتووە، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە کە ئاراستەی خەڵکی بکرێ بۆ پەروەردە کردنیان و گەیاندنیان بە ئەوپەڕی پلەی ئادەمێتی، لە ڕاستی دا ئەم قورئانە چەند کەسانێکی پێ گەیاند کە لەسەر دەستیاندا شتی وا کرا لەو موعجیزانە نایاب تر و بە کەڵك تر بوو، ئەوانە بەم موعجیزانە مێژووی گەلان و میللەتانیان گۆڕی، ڕەوشت و کردارێکی دامەزراوی هەڵ کەند لە دڵاندا کە ڕووی ئادەمێتی زیندوو کردەوە تیایاندا، شتێکی پارە پارە کرد کە بەهێزتر و ڕەق ترە لە زەوی، ئەوەش بریتی بوو لەو هەموو بیرو باوەڕە پڕو پووچەی کەساڵەها جێگیر بوو بوو لە باوك و باپیرەوە هاتبوونە خوارەوە و دەقیان پێوە گرتبوو، چەند گەل و کۆمەڵێکی زیندوو کردەوە کە لە مردوو بێ کەڵك تر بوون، ئەو هەموو گۆڕاندن و گۆڕانکاری یە فەراهەم هات لە جیهاندا و هیچ هۆیەکیش لە ئارادا نەبوو بێجگە لەم قورئانە و بەرنامە پاك و بەرزەکەی ئەم قورئانە. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەم ئایەتە دەرخستنی لاری و ئەوپەڕی سەرکێشی ئەوانەیە تا ئەو ڕادە یە کە ئەگەر ئەو هەموو موعجیزانە ببینن هەر بڕوا ناهێنن، کەواتە وەڵامی ﴿لو﴾، ﴿لما آمنوا﴾ ە بە وێنەی ئایەتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا﴾ هەر چەندە بەم جۆرەش هەڵ ئەگرێ، بەڵام ڕادەی یەکەم ڕێك و گونجاوە لەگەڵ شوێنەکەدا – خوا خۆی باشتر ئەزانێ –،

بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۗ وَلَا يَزَالُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ
ٱلۡمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ
﴿٣٢﴾ أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ

---

**ئینجا واز ئەهێنێ لەوەی کە ئەم قورئانە لەو رادەیەدایە، بەلأم خوا بەو جۆرەی نەکرد قورئانەکەی ئەم جۆرە موعجیزانە بنوێنێ بەڵکو بەم جۆرە قورئانی هێنا و کاری پێکرد کە بینراو و ئەبیستن، بۆ هۆی ئەوە دەست نیشان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ﴾ وتەی ﴿بل﴾ ئەو واز هێنانە نیشان ئەدات، رستەکەی پاشی دەست نیشانە بۆ هۆی کارەکە و ئەفەرموێ: هەر بۆ خوایە و بەدەست ئەوە هەموو کاروبار، خۆی ئەزانێ چی ئەکات و هەرچیش ئەو ئەیکات هەر ئەوە راستە و کار دروستی هەر لەوەدایە﴿أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ دەی ئایا ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە نەیان زانیوە و بۆیان دەرنەکەوتووە﴿أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًاۗ﴾ کە ئەگەر خوا بیویستایە و بیەوێ ئادەمی ی ئەخستە سەر رێگەی راست و ئەیخات بە سەرجەم و تێکڕایی؟ بەم رەنگە بە جۆرێکی دروست ئەکردن کە هەر بۆ بڕوا هێنان و گوێ رایەڵی دەستیان بدایە وەك مەلائیکە، یان بە زۆر ناچاری ئەکردن لەسەر بڕوا هێنان، بەلأم هیچکام لەو دووبارەی پێ نەکردن، بەڵکو لێزانی و کاردروستی خوا داخواز بوو کە ئەم ئادەمییە لەسەر ئەم بارە دروست بکات کە خاوەنی مەیل و ئیرادە بێت و بتوانێ هەر بارێك هەڵبژێرێ کە خۆی مەیلی بکات، واتە ئایا بڕواداران بێ ئاگا بوون و نەیان زانیوە کە کار بەو جۆرەیە کە گوتمان؟ کەواتە با واز بهێنرێ لە بێ بڕوایان بۆ بڕیاری خوا دەربارەیان،**

چونکە ئەگەر وەك بێ بڕواکانی پێشوو لەناویان نەبات و لە ڕیشەیان نەهێنێ بە بێ سزاو ئازار نابن لەم دنیایەدا پێش هاتنی کات و ماوەی خۆیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە قوتار نابن و بەڵکو بە هەمیشەیی بەهۆی کردەوەی خۆیان کە کردوویانە، دووچاریان ئەبێ سزایەکی سەختی دڵداچڵەکێنەر﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ﴾ یان پەیدا ئەبێ لە شوێنێکی نزیك لە وڵاتەکەیانەوە کە بەهۆی ئەوەوە بێ ئارام ئەبن و بە بیم و ترسەوە ئەژین﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ﴾ هەتا بەڵێنی خوا بێت، واتە مردنیان یا ڕۆژی دوایی کە سزای سەخت و ڕاستەقینە لەوێدا هەیە، ئەو بەڵێنەش کە خوا داویەتی ئەبێ بەدی بێت، ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بەڕاستی خیلاف وەعد ناکات و بەڵێنی خۆی بەدی ئەهێنێ، هەر لە دنیاشدا بەڵگە لەسەر ئەو هەڕەشەی کە کردی لەم بێ بڕوایانە زۆرە وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا هەڕەشە کرا بە زۆر لە فروستادە و پێغەمبەرەکان لە پێش تۆوە﴿فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئینجا منیش مۆڵەتم داو ماوەیەك وازم هێنا لەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بوو، ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ ئینجا لەپاشان گرتنم و تۆڵەم لێ سەندن ﴿فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ دەی ئایا چۆن بوو سزا و تۆڵەکەی من دەربارەیان؟![1] مەسەلەی دووەم لەم سورەتەدا هاوبەش و بڕوا بە هاوبەش و بت پەرستییە، ئەم مەسەلەیە لەسەرەتای سورەتەکەدا باس و لێکۆڵینەوەی لێکرا، ئنیجا ئەوا لێرەشدا قسە و لێکۆڵینەوەی لێ ئەکاتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تر. بە شێوەی چەند پرسیارێك کە لاقرتی و بێ ئابڕوویی نیشان ئەدات بەو نەفامانە کە ئەو بتە

---

[1] سوپاس بۆ خوای میهرەبان ئەم بەیانی یە جومعە ١٤١٢/٤/٣ بەرامبەر ١٩٩١/١٠/١١ گەیشتمە ئایەتی(٣٣) ی سورەتی(الرعد) لەشاری لەندەن، خوا بە میهرەبانی خۆی لێم وەرگرێ و ئەوەی ماوە پێم تەواو بکات کە لەم ئایەتەوەیە تا سورەتی(الكهف) آمين والحمد لله رب العالمين.

پرو پووچانە ئەبەنە ریزی خوا و ئەیانکەن بەهاوبەشی. ئەو خوایەی کە ئاگادار و چاودێر و کاربەدەستە بۆ هەموو کەس، پاداش و تۆڵەی هەیە بۆ بەندەکانی لەسەر و بە پێی کردەوەکانیان، ئەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ﴾ ئینجا ئایا کەسێک کە ئەو راوەستا بێت بەسەر هەموو کەسێکەوە بەهەر کردەوەیەک کە کردبێتی و بیکات، واتە ئاگادارو چاودێر و کاربەدەست و دەسەڵاتدار بێت بەسەر هەموو کەس و کردەوەکانیاندا. بەڵام بەو جۆرەی کە فەرموی کاریگەر و دڵ و دەمار داچڵەکێنەرە، چونکە وای نیشان ئەدات و ئەیخاتە بەرچاو کە خەڵکی خوا ئەبینن و بەو هەموو دەسەڵات و ئاگاداری یەوە وەستاوە بە دیاری یانەوە لە هەمووکاتێکدا لە ئاشکرا و پەنهانیدا. دەی هەر کەسێک بیر لەوە بکاتەوە ئەبێ هەمیشە لە شەرمدا بێت و زاتی نەبێ هیچ شتێک بکات کە خوا پێی نارازی بێت، ئەفەرموێ: ئایا خوا کە بەو جۆرەیە یەکسانە لەگەڵ ئەو بتە پرو پووچانەدا، ئەبێ هەرکەسێک ژیر بێت، ئەوانە بباتە ریزی خوا و بیپەرستێ؟ بێگومان نەخێر هەرکەس بێبەش نەبێت لە هەموو ژیری یەک هەرگیز ئەوەندە پەست نابێ بۆچوون و بڕوای وای هەبێ. هەرگیز وەک ئەو نەفامانە نابێت کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ﴾ چەند هاوبەشێکیان بڕیار داوە بۆ خوا، ئەو خوایەی کە باسکرا ! جا لێرەدا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە بەم شێوەیە ئەوانە دەم کوت بکات و بەریان لێ ببڕێتەوە: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: ﴿سَمُّوهُمْ﴾ ئەو بتانە لەناوبەرن، ئەوانە ناویان چییە و ئەوانە چین؟ واتە شیاوی ئەوە نین ناو ببرێن و باس بکرێن وەک بەو جۆرە لە چەند شوێنێکی تردا ئەفەرموێ.

أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾

---

**ئینجا واز ئەهێنێ و بێدەنگ ئەبێ لەوە و بە شێوەیەکی تر دەم کوتیان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بەخوا و شتێکی بۆ باس ئەکەن کە خوا نایزانێ و ئاگای لێ نییە لە زەویدا؟ واتە ئایا ئێوە کە ئادەمین شتێك ئەزانن کە خوا نایزانێ و ئێوە هەواڵی پێ ئەدەن؟ ئای ئەمە چەند لاقرتی پێکردنێکی دڵتەزێنە بۆ هەرکەسێك کە بێبەش نەبێت لە ژیریی !! ئینجا واز لەوەش ئەهێنێ و ئەفەرموێ: ﴿أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ﴾ ئەی ناوی ئەوانە ئەبەن بە هاوبەش بە رووکەش و وتەی دەمی رووت بە بێ ئەوەی لە راستیدا ببن، وەك بە زەنجی یەکی قولە رەش بگوترێ: بەفر یان کافوور؟ بە کورتی ناوبردنی ئەوانە بە هاوبەش و بڕیاری شایستەیی یان بۆ پەرستن هیچ بەڵگە و نیشانەیەکی لەسەر نی یە، نە بەڵگە و نیشانەی ژیریی، نە بەڵگە و نیشانەیە کە لە ئایینی خوادا هاتبێ و بیسترا بێت. ئینجا ئەفەرموێ: ﴿بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە واز بێنن لە لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو نەفامانەدا، چونکە هیچ سوودی نییە لەبەر ئەوەی شیرین کراوە لایان پیلان و خراپەکاری یان بۆ ئیسلام و لادان و دژایەتی یان بۆی، بەرگری کراون لە رێگەی هەق و راستی. واتە بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوە گومڕا کراون لەلایەن خواوە ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ هەرکەسیش خوا گومڕای بکات بە هیچ رەنگ نییە بۆ ئەو کەسە هیچ رێگە نیشان دەرێك کە بیخاتە سەر رێگەی راست. واتە ئەوانە خۆیان بە ویستی خۆیان روویان وەرگێڕاوە لە بڕوا هێنان و بیر کردنەوە لە بەڵگە و نیشانەکانی بڕوا هێنان بەهۆی ئەوەی باوی خوا بەدی هاتووە دەربارەیان کە خوا گومڕای کردوون. بەرهەم و دوا رۆژی کردەوەکەی خۆیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزا لەم ژیانی دنیادا بە کوشتن و بەسەرهاتی سەخت و داچڵەکینەر ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ﴾ بێگومان سزای رۆژی دوایی سەخت ترو نارەحەت ترە کە دووچاریان ئەبێت ﴿وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ بێگومان نییە بۆیان هیچ پارێزەرێك لە خواو لە سزای خوا...**

﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى
ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا ۖ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ۖ
وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ۚ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُوا وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ
﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ

---

لەبەرامبەر ئەو سیاچارانەدا خواپەرست و لەخواترسەکان هەن کە بەهۆی بڕوا و کردەوە چاکەکانیانەوە خۆیان پاراستووە، کەواتە ئەوانە بێ باك ئەبن لەوەی سزا بدرێن لە ڕۆژی دواییدا بەڵکو زیاد لەوە ئەو بەهەشتەیان هەیە کە بەڵێن دراوە بە خۆپارێزان و لەخواترسەکان، جا لێرەدا هێندێ لە نازو ڕێزەکەیان باس ئەفەرموێ لەم فەرمودەیەدا: ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ﴾ وێنە و سیفەتی ئەو بەهەشتەی کە بەڵێن دراوە بە خۆپارێزەران و لەخوا ترسەکان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ﴾ دێن و ئەڕوات و لەژێری درەخت و کۆشکەکانیدا ڕووبارەکان، لە ئایەتی سورەتی(محمد) دا چوار جۆر لەو ڕووبارانە باس ئەکات: ڕووباری ئاوی خۆش، ڕووباری شیری تام خۆش و نەگۆڕاو، ڕووباری عارەقێ کە بەلەزەت و خۆشە بۆ بخۆرەکانی، ڕووباری هەنگوینی ساف پاڵفتە کراو. کەواتە چاك وایە لە هەموو شوێنێکدا ئەو ڕووبارانە بېرڕێن بەسەر ئەو چوار ڕووبارەدا – خوا بە میهرەبانی خۆی دەرخواردمان بدات – ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ﴾ خۆراك و میوەکانی هەمیشەیین، نەك بە وێنەی بەرو میوەجاتی ئەم دنیایە کە هەرکام ماوەیەکی خۆی هەیە و ئیتر نامێنێ و لەپاشان دەست پێ ئەکاتەوە و وەك لە حەدیسدا هاتووە هەر دەنك و دانەیەك لێبکرێتەوە دەست بەجێ لە جێگەیدا وێنەکەی پەیدا ئەبێتەوە، هەروەها سێبەرو سەهەندی درەختەکانیشی هەمیشەیین نەك وەك درەختەکانی ئەم دنیایە کە گەڵا ڕێزان ئەکەن و بێ سێبەر ئەمێننەوە و لەپاش

ماوەیەك دووبارە گەلاّ دەرئەكەن و دەست پێ ئەكەنەوە، ﴿تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ﴾ ئەو بەهەشتە گرنگە كە باسكرا پاشەڕۆژی ئەوانەیە كە لە دنیادا خۆیان پاراست لە بێ بڕوایی و گوناه﴿وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾ پاشەڕۆژی بێ بڕواكان كە بە ویست و دەسەلاّتی خۆیان بڕوایان نەهێنا تا مردن، پاشەڕۆژی ئەوانە هەر ئاگری دۆزەخە – خوا پەنامان بدات لێی –، جا با ئێمە ژیر بین و بیر بكەینەوە و ئەو دوو پاشەڕۆژە بەراورد بكەین، ئینجا هەروەها ئەڕوات لەسەر باسی وەحی و خواپەرستن بە تاك و تەنهایی و هەڵوێستی نامەدارەكان بەرامبەر قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) دەرئەخات و ڕوونی ئەكاتەوە كە ئەم قورئانە حەكەم و بڕیار دەری ڕاست و ڕەوایە لەوەی كە نامە پێشووەكان هێناویانە لە پێش ئەمەوە، هەر ئەم قورئانە دواترینی هەموو نامەكانی ترە و ئەبێ هەموو كەس و هەموو شتێ بگەڕێتەوە بۆلای ئەم قورئانە و قسە هەر قسەی ئەمە، هەر بڕیارێك لە بڕیارەكانی نامە پێشووەكان كە خوا ویستبێتی مانەوەی ئەمەیە لەم قورئانەدا، هەر بڕیارێكی سڕیبێتەوە لە بڕیارەكانی نامە پێشووەكان كەلێنی ئەما بێت و بەرژەوەندی لەمانەوەیدا نەبێت لەم قورئانەدا نەهاتووە، كەواتە ئەبێ هەموو كەس هەر چاو بڕێتە قورئان و گوێ ڕایەڵی ئەم بێت، لەبارەی داوا كردنی موعجیزە لە پێغەمبەر(ﷺ) داوا كردنێكی بێ جێیە، چونكە ئەوە بەدەست خوایە و پێغەمبەر هەر ڕاگەیاندنی ئایین و فەرمانی خوای لەسەرە.

جا با گوێ شل كەین بۆ قورئان لەم ئایەتانی داهاتووەدا ئەو باس و مەسەلانەمان بۆ ڕوون ئەكاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ ئەوانەی كە نامەمان پێ بەخشیون، واتە ئەوانەیان كە بە ڕاستی دەستیان گرتووە بە نامەكەیانەوە و هەر شوێنی ئەو كەوتوون ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ شادمان و كەیف خۆش ئەبن بەوەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ، واتە بەم قورئانە، چونكە ئەبینن یاسا سەرەكی یەكان و بنەڕەتی یەكانی بیرو باوەڕی خوا

پەرستی بە تاك و تەنهایی تێدایە، هەروەها بەرێزەوە دان ئەنێ بە ئایەتەکانی پێش خۆیدا، یەك هۆی پەیوەستی یان داناوە بۆ بڕواداران کە بیان بەستێ پێکەوە کە بریتییە لە بڕوا بە خوا و پەرستنی خوا بە تاك و تەنها، جا لەبەر ئەوە ئەو نامەدارە راستەقینانە دڵخۆش و شادن بەم قورئانە ﴿وَمِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ مَن يُنكِرُ بَعۡضَهُۥ﴾ لەناو حیزب و کۆمەڵەکانیاندا، هەروەها لە کۆمەڵی بت پەرستەکانیشدا کەسی وا هەیە کە دان نانێ بە هێندێ لەو قورئانە کە لەگەڵ ئارەزووی ئەواندا نەگونجێ، بێگومان بڕوا نەهێنان بە هەر بەندو بەشێکی بڕوا نەهێنانە بە هەمووی، جا بەرامبەر ئەوانە بۆ دەم کوتکردن و بەرپەرچ دانەوەیان ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: من هەر فەرمانم هەر بەوە پێدراوە کە خوا بپەرستم و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێم و هیچ شتێك نەکەم بە هاوبەشی. دەبێ ئەوەش شتێکی رێك و راستە و رێگە نییە بۆ هیچ کەس کە دانی پێدا نەنێ ﴿إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ﴾ هەر بۆ لای خوا بانگی خەڵکی ئەکەم گەڕانەوەم هەر بۆلای خوایە. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرمانی پێدرا کە بەرنامەکەی خۆی بە روونی دەربڕێ بەرامبەر بڕوا نەهێنان و داننەنانی ئەوانەی کە دان نانێن بە هێندێ لەوەی بۆی هاتووە لای خواوە کە بریتییە لە شوێن کەوتن و دەست گرتنی تێرو تەواوی بەوەی کە بۆی هاتووە، ئیتر هەموو نامەدارەکان پێیان خۆش بێت یان هێندێکیان پێیان ناخۆش بێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئەوەی بۆی هاتووە دواترین بڕیاری خوایە و بە زمانی عەرەبی هاتووە و بە باشی ئەیزانێ و لێی تێ ئەگات، ماتوڵ ئەوەی بۆی هاتووە دواترین بڕیاری خوایە لە عەقیدەدا هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە و هەر ئەو ئەکات بە حەکەم و حاکم وەك ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّٗاۚ﴾ بەو جۆرە ناردنە روون و نایابە ئەو قورئانەمان هێنایە خوارەوە بۆلای تۆ ئەی پێغەمبەر بە حوکم و بڕیارێك و بە زمانی عەرەبی.

وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ
كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُوا ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾

---

﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر تۆ شوێنی ئارەزوواتی ئەوانە بکەوی لە پاش ئەو زانینەی کە هاتووە بۆت، واتە ئەوەی کە بۆت هاتووە شتێکی ڕاست و ڕەوا و یەقینی یە بێ گومان و دوو دڵی، ئەوەی کە ئەوانە ئەیڵێن ئارەزووی نەفسە و بەبێ زانینە، ئەگەر تۆ شوێنی ئەو ئارەزووانە بکەوی﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ﴾ نابێ بۆ تۆ لەلایەن خواوە هیچ کاربەدەست و یاریدەدەرێك کە یارمەتیت بدات، هیچ پارێزەرێك کە بەرگریت لێ بکات، ئەگەر لەلایەن بێ بڕوایانەوە ڕەخنەت لێ بگرن بەوەی ئادەمیت ڕەخنەکەیان ناڕاست و بێ جێیە، چونکە هەموو پێغەمبەران ئادەمی بوون وەك تۆ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا ڕەوانەمان کردووە لە پێش تۆ چەند پێغەمبەرو فروستادەیەك﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً﴾ گێڕاومانە بۆیان چەند خێزان و هاوسەران و ئەولاد و نەوەیەك، ئەگەر ڕەخنە و بیانوویان ئەوە بێت کە موعجیزەی بۆ نەهێناون بە وێنەی موعجیزەی ماددی یەکانی پێغەمبەرانی پێشوو ئەم ڕەخنە و بیانووەشیان هەر ناڕاست و بێ جێیە، چونکە موعجیزە تەنها بەدەست خوایە و هەر پێغەمبەرێك هەر جۆرە موعجیزەیەکی هێنابێ لەسەر ئیزن و فەرمانی خوا بووە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ نەبووە و نەگونجاوە بۆ هیچ فروستادەیەك و لە توانایدا نەبووە کە هیچ موعجیزەیەك بێنێ مەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست لە ئایەت ئایەتی نامەیە کە حوکم و بڕیار بێنێ بە پێی ویست و خواستی خەڵکی. بەم جۆرەش هەر جوانە و ڕێك تریشە لەگەڵ ئایەتی داهاتودا،﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ بۆ هەموو کات و ماوەیەك حوکم و بڕیارێکی دیاریی هەیە کە ئەنوسرێ لەسەر خەڵکی بە پێی حیکمەت و کاردروستی

خوا. ئەم رستەیە بەرپەرچ دانەوەی ئەو نەفامانەیە کە ئەیان گوت چۆن جیاوازی هەیە لە هێندێ حوکم و بڕیاری ئەم قورئانە لەگەڵ حوکم و بڕیاری نامە پێشووەکان. واتە ئ مم شەریعەتانە هاتوون بۆ رێك و پێککردنی خەڵکی، دەی سروشتی خەڵکی جیاوازە و لە هەر چەرخێکدا هێندێ حوکم و بڕیار رێك و رەواترە و بۆ چەرخێکی تر رێك و رەوا نییە، جا ئەم قورئانە دواترین نامەیە، کەواتە هەموو حوکم و بڕیارەکانی ئەبێ هەتا هەتایی بێ، هێندێ لە حوکم و بڕیارەکانی پێشوو کاتی بوون، کەواتە ئەو جیاوازی یە ئەبێ پەیدا ببێ لە نێوان ئەو کاتی یانە و هەتا هەتایی یەکانی ئەم قورئانەدا، خوا بە بڕیارەکانی ئەم قورئانە ئەو کاتیانە ئەسرێتەوە، خوا خۆی ئەزانێ کام بۆ سڕینەوە چاکە و کام بۆ هێشتنەوە چاکە، ئەوە بە پێی ویست و ئیرادەی خوایە، وەك ئەفەرموێ: ﴿يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ خوا ئەیسڕێتەوە ئەوەی بیەوێ و مەیلی بکات و ئەیهێڵێتەوە ئەوەی کە بیەوێ و مەیلی بکات ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ هەر لای خوایە ئەسڵی نامە کە دیاریی کراوە تیایدا کام دامەزراوە و ئەمێنێتەوەو کام دەست ئەدات بۆ گۆڕان، نامە هەر لە خواوە دەرئەچێ، هەر ئەو دەست کاری تێدا ئەکات، بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆی، بەرگری کار نییە بۆ ویست و مەیلی ئەو، وتەی(أم الكتاب) تەفسیر کراوەتەوە و بە زانینی خوا کە بێ سنورە و گشتی یە بۆ هەموو شتێ. وەك تەفسیر کراوەتەوە بە(لوح المحفوظ) بەڵام بەو جۆرەی کە تەفسیرمان کردەوە و دیارییمان نەکرد بێ ترس ترە و خوا خۆی باش ئەزانێ. ئینجا ئایا مەبەست بەوەی کە ئەسڕرێتەوە، هەر بڕیارو شەریعەتە یان مەبەست هەموو شتێکی تریشە وەك رۆزی و شتەکانی تریش؟ وا دەرئەکەوێ لە چەند ریواتێکەوە بە گشتی مەبەستە و لێرەدا سڕینەوەو هێشتنەوەی شەریعەتەکان مەبەستی یەکەم و سەردەستەیە. لەسەر رای یەکەم هیچ گیروگرفت و گرێ یەك نییە، بەڵام ئەگەر بە گشتی مەبەست بێت زۆر جێگەی لێکۆڵینەوە و قسە و باسە مەگەر بەم جۆرە بگوترێ کە هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: ئەو سڕینەوەو هێشتنەوە هەر بە نەزەر(لوح المحفوظ) ەوە، نەك بە نەزەر زانینی خواوە، چونکە هەر شتێ و هەر بارێ لە زانینی خوادا تێپەڕی کردبێ دەست نادا بۆ گۆڕان و دەستکاری، ئەگینا نەزانین روو ئەکاتە خوا، بەڵام

ئەگونجێ جیاوازی و گۆڕانکاری لە نوسراوی(لوح المحفوظ) ببێ، بەم رەنگە شتێ لە(لوح المحفوظ) دا نوسرابێ، ئینجا بە پێی زانین و مەیلی خوا، پێچەوانەی دانرابێ، بەم رەنگە ئەوەی کە نوسراوە نەبەسترابێ بە هیچ شتێکەوە لەبەر هەر هۆیەك خوا خۆی ئەزانێ، بەلام لە زانینی خوا بەسترابێ بە کارێکەوە، بۆ وێنە: لە(لوح) دا نوسرابێ کە فلان تەمەنی هەر(٥٠) ساڵە بەلام لە زانینی خوادا شەست ساڵە و بەستراوە بە مەرجێکەوە وەك(صدقە) کردن یان نزایەك کە بیکات یان بۆی بکرێت کە ئەگەر ئەو مەرجەی بەدی نەهات تەمەنی ناگاتە شەست و خوا خۆی ئەزانێ ئەو مەرجە بەدی دێت، کەواتە لەبەر ئەوە لە زانین دا(٦٠) ە. بەڕاستی ئەم مەسەلەیە زۆر قورس و گرانە و بە بێ ئەم تەئویلە چارەسەر ناکرێ و ئەبێ بە مایەی سەر لێ تێکچوون و بڕیار دانی(بداء) بۆ خوا – پاکی بۆ خوای بێگەرد – واتە دەرکەوتنی باری راستەقینە و پەشیمان بوونەوە لە راو و بڕیاری پێشوو کە ئەوەش بڕیار دانی نەزانینە بۆ خوا ! خواش پاك و بێگەردە لەوە. ئەبێ تەفسیری ئەم ئایەتە بەم جۆرە بکەینەوە، خوا ئەیسڕێتەوە لە(لوح المحفوظ) دا ئەوەی کە مەیلی ببێ و ئەیهێڵێتەوە ئەوەی کە مەیلی ببێ و زانینی هەر لای خۆیەتی، بە پێی ئەو زانینە ئەو سڕینەوەو هێشتنەوە ئەکات. ئەبێ بەم جۆرە تەفسیری بکەینەوە یان بە پێی جێگا و شوێنەکە ئەو سڕینەوە و هێشتنەوە ببڕین هەر بەسەر بڕیاری ئەو نامە و شەریعەتانەدا کە دەست ئەدەن بۆ سڕینەوە و هێشتنەوە، ئەوە هیچ گرێ یەکی تێدا نییە، چونکە خوا بە پێی زانین و کاردروستی خۆی لە نامە و شەریعەتی ئوممەتەکاندا هێندێ بڕیاری داوە کە کاتی بوون و بە پێی بەرژەوەندی و کاردروستی ئەو بڕیارە کە دراوە چاك و شایستە بووە. لە پاشان بۆ ئوممەتێکی تر بەرژەوەندی لەبارو جۆرێکی تردا بووە هەتا کاتی ئەوە هات کە بڕیارو دەستوری هەمیشەیی و هەموو کاتێ دەرکرێ، ئەوەش بە ناردنی دواترین نامە و دواترین پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا ئەم باسە کۆتایی پێ ئەهێنین و ئەڵێین ئایا خوا ئەو بێ بڕوایانە بگرێ و هەڕەشەی کە لێی کردون لە ژیانی پێغەمبەردا بەدی بێنێ یان دوای بخات بۆ دوای نەمان و دەرچوون لە دنیا؟

وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ

هەرکام لەم دوو بارە یەکسانە و هیچ گۆڕانکاری یەك پەیدا ناکات لەو پەیامی خوا و لە بڕیاری خوادا وەك ئەفەرموێ بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ): ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ ئەگەر نیشانت بدەین هێندێ لەوەی کە هەڕەشەمانپێ کردووە لەوانە، واتە لە ژیانی تۆدا بەدییان بێنین یان تۆ بمرێنین و تۆ ئەوە نەبینی، لەسەر هەر بار﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾ تۆ ئەی پێغەمبەر هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو هەر لەسەر ئێمەیە حیساب و پرسیار لە کردەوەی خەڵکی نەك لەسەر تۆ.

ئینجا خوای میهرەبان پێغەمبەر و بڕواداران دڵخۆش ئەکات و موژدەیان پێ ئەدات بە سەرکەوتنی موسڵمانان و ئایینەکەی و بەرە بەرە پەستی و ژێر کەوتنی دوژمنەکانی ئەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ واتە ئایا ئەوانە بڕوایان نییە بە هاتنی ئەو هەڕەشەی ئێمە کردومانە و گومانیان هەیە تیایدا، ئایا نابینن کە ئێمە خاك و وڵاتی بێ بڕواکان کەم و کورتی ئەکەینەوە لە هەموو ناوچە و تەرەفەکانی یەوە بە گرتن و هێنانی بۆ ژێر دەستی ئیسلام و ئەوانی لێدەردەکەین بە کوشتن و بەدیل گرتن و ڕاونانیان، واتە ئەوە ئەبینن، دەی ئایا ئەوە سەرەتا نییە بۆ بەڵێن و هەڕەشەکانی ئێمە؟ بەم جۆرە ڕیوایەتکراوە لە(ئیبن و عەباس و حسن و ضحاك و ئیبن و عطیة و سدی) و چەند کەسانی تر – خوا لێیان ڕازی بێت –. وە لە(ئیبن و عەباس و مجاهد) ەوە بەم جۆرەش ڕیوایەتکراوە: ئایا ئەوانە نابینن کە ئێمە کەم و کوڕی دێنین بەسەر خاك و وڵاتدا بە مردنی گەورەو پیاو ماقوڵ و زاناکانیاندا، واتە ئێمە لە دنیادا گۆڕانکاری و ڕوداوی جۆر بەجۆر بەسەر وڵاتاندا ئەهێنین بە وێران کردن لەپاش ئاوەدانی، وە مردن لەپاش ژیان، وە بە زەبونی زەلیلی لەپاش بەرزیی و سەرکەوتن و دەسەڵات، وە کەم و کوڕی لەپاش تێرو تەواوی، ئەو دەستکاریی و گۆڕانکاری

یە ئەبینن بە چاوی خۆیان، دەی ئایا بە چیدا ئەنازن و بیٚ باکن لەوەی خوا لەوانی تێك بدات و سەر شۆڕ و زەبوون و بیٚ دەسەڵاتیان بکات، لەپاش ئەوەی زۆردار و بەرز و دەسەڵاتداران، کەواتە با بترسن و بێنە خوارەوە لە لوت بەرزیی کەشخە و خۆ بەزل زانی، لەسەر ئەم بارە مەبەست بە وتەی(الأرض) خاك و وڵاتانە بە تێکڕایی و مەبەست بە(أطراف) ئەشراف و گەورە و پیاو ماقوڵانە، هەرکام لەم دوو تەفسیرە ڕێك و گونجاوە و ڕێك و ڕاستە بۆ ترساندنی یاخی یەکان و دڵخۆش کردنی چاکان و پاکان، بەڵام تەفسیری بەوەی هێندیٚ لە زانایانی تازە ئەیکەنەوە و ناوی ئەبەن بە تەفسیری عیلمی و ئەڵێن: مەبەست کەم و کوڕی زەوی یە لەلای هەردوو قوتبەکەوە: ژوور و خوارو پانی و فراوانی لای خەتی ئیستوادا. تەفسیری بەم جۆرە پێچەوانەی رووکەش و رواڵەتە بەبیٚ هیچ هۆیەك بۆ لادان لەو رواڵەتە، بێگومان دروست نییە لادان لە روکەش و رواڵەت بە بیٚ هۆیەکی بەهێز، کەواتە با گویٚ نەدریٚ بەو تەفسیرە، بەڵکو تەفسیر بکرێتەوە بە یەکیٚ لەو دوانە کە باسکران، ئەمەی کە دێت بەدوای سەرەتای ئایەتەکەدا ڕێك و گونجاوە کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦۚ﴾ خوا ئەکات و بڕیار ئەدات لە کاتێکدا هیچ کەس نییە هەڵمەت بداتە سەر بڕیارەکەی بە تێکدان و هەڵوەشاندنەوە﴿وَهُوَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ ئەو حیساب و پرسیاری چەسپانە و بە زوویی حیساب ئەکات و بە پێی کردەوەکە پاداشت و تۆڵە ئەداتەوە، چەسپانە چونکە بەدیٚ دێت و هەرچیش بەدی بێت نزیکە، بێجگە لەوەش هەموو تەمەنی دنیا چاو نادات لەچاو دوا نەهاتنی ڕۆژی دواییدا،(ئیبن و عەباس) – خوایان لیٚ ڕازی بێت – ئەفەرمویٚ: مەبەست بە(حساب) تۆڵە سەندنە، ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات و دڵخۆشی ئەداتەوە بەوەی لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تر پیلان و دوژمنایەتی یان لەگەڵ کراوە و لە دوا ڕۆژدا ئەوان سەرکەوتوو بوون و دوژمنانیان لەناوبران، ئەمانەش کە دوژمنایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەمدا لەناو ئەبرێن و پاشە ڕۆژیان دۆزەخە ﴿وَقَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ ئەی پێغەمبەر بێگومان بیٚ بڕوایان لەپێش ئەمان پیلان و دوژمنایەتی یان کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان،

فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ۖ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

---

﴿فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا﴾ ئینجا هەموو پیلان و نیازی شەڕ هەر بۆ خوایە و بەدەست خوایە و بە ئاگاداری و زانینی خوایە وەك ئەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ خوا ئاگایە و ئەزانێ ئەوەی کە هەموو کەس ئەیکات، کەواتە پیلانەکانی ئەو بێ بڕوایانە کار ناکات و پیلانەکانیان بە هیچ دەرئەچن، چونکە پیلان بریتییە لە نیازی بەد و هەوڵدان بۆ گەیاندنی کاری بەد بە کەسێك بە نهێنی، دەی ماتوڵ هەموو کار بەدەست خوایە و خواش ئاگادارە بە هەموو شتێك، ئیتر ئەی پیلانی ئەوانە چی تێدا بەسەر بێت؟ ئەبێ خوا تۆڵەیان لێ بسێنێ لەسەر ئەو کردەوە و پیلانانەیان، ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بە بەڵێنی دڵخۆش کەر و هەڕەشەی سەخت و دڵتەزێن کەر بۆ ئەوانەی کە شایستەی دڵخۆش کردن و هەڕەشە لێکردنن، ئەفەرموێ: ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾ لەمەوپاش بێ بڕواکان ئەزانن بۆ کێ ئەبێت پاشەڕۆژی خۆش و کامەرانی، واتە ئەگەر تا ئێستا نەتان زانیوە بێگومان لەمەو لا ئەزانن کام لە ئێوە و ئێمە بەختەوەر و کامەران ئەبێت. لەسەرەتای سورەتەکەدا پەیام و پێغەمبەرێتی روونکردەوە کە شتێکی هەق و راستە، ئینجا سورەتەکە دوایی ئەهێنێ بە باسی بێ بڕوایی و دان نەنانی بێ بڕواکان پێی و شایەتی دانی خوا لەسەر راستی یەکەی، کەواتە سەرەتا و دوایی یەکیان گرت، ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَسْتَ مُرْسَلًا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە ئەڵێن تۆ رەوانە کراو نیت لەلایەن خواوە ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر لە وەڵام دا بڵێ: بەسە خوا بە شایەت لە نێوان من و ئێوەدا ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەو کەسەی کە هەر لای ئەوە زانینی نامە، واتە خوا، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست لەم کەسە بڕوادارانی نامەدارانن کە شایەتی یاندا لەسەر ئەم قورئانە لە مەکەش و لە مەدینەش. ئەمەش هەر ئەگونجێ، بەڵام ئەوەی یەکەم لە دڵدا بەهێزترو دامەزراو ترە.

لەم سورەتەدا چەند نیشانەیەك دەرکەوت بۆ ئەم بەرنامە ئیسلامییە. هەق وابوو لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا دەست نیشانمان بکردایە بۆیان، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەستی نێوان

ئایەتەکان نەپچڕێنین بەهۆی ئەو باس و وەستانە وامان بە چاك زانی کە ئەو باسانە دوا بخەین بۆ ئێستا و لێرەدا دەست نیشان بکەین بۆ هێندێ لەوانە بە یارمەتی خوا:

١- دەست گرتن بەو بەرنامە و لا نەدان لەوەی خوا دیاریی کردووە بە بێ ئەوەی راو ئیجتیهادی تێکەڵ بکرێت بەم جۆرە بە روونی بێ پێچ و پەنا و بە ئاشکرا باسی ئەو بەند و بیر و باوەڕانە بکرێ کە بنەڕەتی و سەرەکین لەم ئایینەدا، هیچی لێ نەشاردرێتەوە بە بێ تەفرە و دواخستن. یەکەم و سەرەتای ئەوانە ئەوەیە کە خوایەتی و پەروەردگارێتی تەنها بۆ خوایە کە ناوی(الله) یە. جا لەبەر ئەوە ملکەچی و گوێ رایەڵی و پەیڕەوی ئەبێ هەر بۆ ئەو خوایە بێت. ئەبێ جاڕی ئەوە بدرێ هەرچەند دژایەتی و بەربەرەکانێ و سەرکێشی ببێ لەلایەن بێ بڕواکانەوە، هەرچەند ئەو رێگەیە سەخت و سامناك بێت، نابێ گوێ بدرێ بەوەی بێ بڕوا و سەرکێشەکان بەوە یاخی تر ئەبن و پیلانیان زۆترو بەهێزتر ئەبێت، بەڵکو ئەبێ ئەو بیر و باوەڕە سەرەکی و بنەڕەتی یانە بەو جۆرە بە روونی باس بکرێ و راگەیەنرێ، هەروەها هەر جۆرە دروشم و نیشانەیەك دیاریی کرابێ لە ئاییندا یان هەر خوو رەوشتێك کە ئایینەکە بڕیاری دابێت. نابێ هیچکام لەوانە دەستکاری و گۆڕانکاری یان تێدا بکرێ لەبەر خۆپارێزی لە خەشم و قینی یاخی و بێ بڕواکان. بەڕاستی هەر ئەوەیە بەرنامەی بزوتنەوە بەم ئایین و عەقیدەیە لەسەر ئەو بارو شێوەی کە خوا ئەیەوێ، هەر ئەوە بەرنامەی بانگکردن بۆلای خوا لەسەر ئەو رێگە و رێبازەی کە پێغەمبەری ئازیز پێیدا رۆیشتووە(ﷺ) لەسەر فەرمانی خوا و بە پێی رەزامەندی خوا... کەواتە هیچ کەسێکی تر رێگەی لادانی نییە لەو رێگەیە، بۆی نییە رێگە و رێبازێکی تر بداتە بەر... ئینجا خوا چارەسەر ئەکات و خوا بەسە بۆ بانگکەرانی رێگاکەی خۆی، خوا یاخی و سەرکێشەکان سەرکوت ئەکات.

٢- بەرنامەی قورئان بۆ بانگکردنی خەڵکی دوو نامەی گرتووە بە دەستەوە، نامەیەکی خوێنراوە کە ئەم قورئانەیە، نامەیەکی سەرنج دراو و بیر لێکراوە کە ئەم بوونەوەرەیە بەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانە کە شایەتن لەسەر دەسەڵاتی خوا و کار بەدەستی خوا و تەگبیری خوا لە هەموو کار و بارێکدا. لەگەڵ ئەو دوو نامەیەدا دەفتەری مێژوویی ئادەمی ئەخاتە بەرچاو کە بەسەرهات و رووداوەکانی نیشانەیەکی روون و ئاشکران لەسەر ئەو دەسەڵات و کاربەدەستی یەی خوا، ئینجا بەو هەمووە بەرەنگاری

ئادەمی ئەوەستێ لە هەموو تەرەف و ناوچەکانی یەوە بە جارێ ئەدوێ لەگەڵ هەست و دڵ و ژیریی یەکەی ! جا ئەم سورەتە هەڵساوە بەوە و ئایەتەکانی کەوتە بەرچاو و گوێمان، ئەبێ ئەم قورئانە نامەی ئەم بانگ و بانگەوازە بێت، کە هەموو بانگکەرانی رێگەی خوا پشتی پێ ببەستن، لەپێش هەموو شتێکی ترەوە. ئەبێ لەم قورئانەوە فێر بین کە چۆن بانگی خەڵکی بکەین، چۆن دڵە خەوتوو و بێ هۆشەکان خەبەر بکەینەوە، چۆن رۆحە کوژاوەکان هەڵگیرسێنینەوە. بێگومان ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی ناردووە داهێنەری ئەم ئادەمی یە و زاناو ئاگادارە بە رەوشتی ئەم ئادەمی یە، خەبەر دارە بە هەموو کون و کەلەبەری، ئەو کەسانەی کە بانگ ئەکەن بۆ رێگەی خوا هەرچۆنێ پێویستە پەیڕەوی بەرنامەی خوا بکەن لە یەکەم جارەوە لە بارەی روونکردنەوە و پێ ناسینی خوایەتی خوا و پەروەردگاری و حاکمێتی خوا، هەروەها ئەبێ رێگەی قورئان بدەنە بەر لە چوونە ناو دڵ و دەروون لە پێناسینی خوا بە بەندەکانی خوا، تا ئەو دڵانە گەردن کەچی یان هەر بۆ خوا بێت، دان بنێن هەر بە پەروەردگارێتی و دەسەڵات و پەروەردگاری خوادا.

لەبەر ئەوە نیشاندان و پێناسینی خوای تاك و تەنها و دوورخستنەوەی هەموو جۆرە وێنە هاوبەش رەوادانێك، قورئان زۆر بە روونی سروشتی پەیام و پێغەمبەرێتی پێغەمبەران باس ئەکات و ئاشکرای ئەکات... چونکە هەڵە و لادانی زۆر پەیدا بوو لە بیر و باوەڕی نامە دارەکانی پێشوودا، لە سەرەنجامی تێکەڵ و پێکەڵی یەك کە فەراهەم هێنرا لە نێوان سروشتی خوایەتی و پێغەمبەرێتیدا، بە تایبەت بیرو بۆچوونی مەسیحی یەکان کە سیفەت و نیشانەی خوایەتیاندا بە عیسا(علیه السلام)، بەهۆی ئەوەوە شوێن کەوتووەکانی کەنیسەکان سەرگەردان بوون و دژایەتی و دووبەرەکی زۆر کەوتە نێوانیان.

تەنها بیرو باوەڕی مەسیحی یەکان دووچاری ئەو سەرگەردانی و دووبەرەکی یە نەبووە، بەڵکو هەموو بیرو باوەڕە بت پەرستیەکانیش دووچاری ئەوە بوون، چەند سیفەت و نیشانەیەك بڕیار درا بۆ پێغەمبەرێتی کە مایەی دوور کەوتنەوە بوون لە ناسینی راست و راستەقینە، جا زۆر لەو هەڵە و بۆچوونە پووچانە کەوتنە ناو بیر و باوەڕی بت پەرستی عەرەبەوە... جا لەبەر ئەوە هەردەمە پەڵپ و بیانوویەکیان ئەگرت و داوایان ئەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ). داوای موعجیزەی ماددیی یان ئەکرد لێی، داوای زانینی غەیبیان ئەکرد. بە جادوو بازیان دائەنا، هێندێ جار دەیان وت پەیوەندی بە جنۆکەوە هەیە، هێندێ جار

داوایان ئەکرد کە فریشتەی لەگەڵ بێت. لەبەر ئەوە قورئان هات هەقیقەت و بارە راستەکەی ئاشکرا کرد وەك لە ئایەتەکانی رابردوودا تێپەڕی کرد.

٣- لەم سورەتەدا - وەك لە چەند سورەتێکی تریشدا - دەست نیشانی کرد بەوەی کە کاری ئەم ئایینە و پاشەرۆژی ئەم بانگ و بانگەوازە بەدەست خوایە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر راگەیاندنی لەسەرە، رێنموونی وەرگرتنی خەڵکی هەر بەدەست خوایە. کەواتە لەمە دەرئەکەوێ کە پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە بانگی خەڵی ئەکەن بۆلای خوا، پێویستە شەرم بکەن لەخواو پەلە نەنێنەوە لە خوا. بۆیان نییە بڵێن: زۆر هەوڵماندا و کەم کەس هات بەدەم بانگەکەمانەوە، یان تاکەی خوا نایەت بە دەم نزاو هاوارمانەوە و ستەمکاران ناگرێ و ئێمە سەرناخات لەگەڵ ئەوەدا هەر ئێمە یارمەتی دەری ئایینی خواین؟! هەرچەند راگەیاندن هەمیشە بنەڕەت و یاسای کردەوە بووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها بۆ هەموو بانگکەرانی ئوممەت، بەڵام گێڕانی هەر راگەیاندن بەکارو کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا بووە کە جیهاد پێویست نەکرابوو، لەپاش ئەوە هەر راگەیاندن بەس نەبووە، بەڵکو تێکۆشان و جیهادیش پێویست بووە بە هەموو بەشەکانی یەوە، بە پێی دەسەڵات و توانا. کەواتە ئەو کەسانەی کە لایان وایە کارو کردەوەی بانگکەرانی رێگەی خوا هەر راگەیاندنە و بەس، ئەو کەسانە هەڵەن، چونکە ئەگەر وایە ئەبێ کات و جێ و شوێنی ئایەتەکانی جیهاد کەی بێت و کامە بێت؟ ئەوانە هەڵەن هەرچۆنێ ئەوانەش هەر هەڵەن کە بڕیاری جیهاد ئەدەن، بەڵام ئەیبەستنەوە بەچەند مەرج و شەرتێکەوە بە پێی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆیان چونکە جیهاد هاتە پێشەوە ئەبێ بکرێ بە بێ هیچ مەرج و شەرتێك، بێجگە لەوەش راگەیاندن یەکەم پلەی جیهادە و هەرکاتێك بەرێکی کرا هەر بە سروشت هەموو جۆرەکانی جیهاد دێت بەدوایدا، چونکە بێگومان نەفامان ئەبێ بەرەنگاری بانگکەران بوەستن، رێگەیان لێ بگرن، ئەوانیش کۆتایی ناهێنن، کەواتە ئەبێ جەنگ و فیداکاری روو بدات و بەرپا ببێ.

٤- لەم سورەتەدا دەست نیشان ئەکات بەوەی کە مەیل و کردەوەی خەڵکی دەخڵی هەیە بە چارەنوس و دوا رۆژی یەوە، ویست و ئیرادەی خوا بە پێی ویست و کردەوەی بەندەیە. لەگەڵ ئەوەدا هەموو روداو و هەموو شتێ بەسراوە بە مەیل و ئیرادە و فەراهەم هێنانی خوا. ئەو مەسەلەیە شتێکی هەق و راستە و لە قورئانەوە بە روونی

وەرنەگیریٚ، بەندە نە ناچار و بیٚ دەخڵە و نە ئازاد و سەربەستە کە ماوەیەکی دوور و درێــژ چــەند دەســتەیەك لــەم ئوممەتــە دووچــاری ئــاژاوە و بــەر بــەرەکانیٚ بــوون، لــەو مەسەلەیەدا، دەستەیەك بەندەی بە ناچار و بیٚ دەسەلاٚت دائەنا و دەستەیەکی تر بە خود سەرو سەربەست.

٥- ئەم سورەتە بەڕوونی دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوەی کە بڕوا نەهێنان بەم ئایینە و گــویٚ رایــەڵی نــەکردن بــۆی نیــشانەی لادانــی سروشــتە و لــەکار کــەوتنی کۆئەنــدامی وەرگرتن و بۆچوون و تێگەیشتنە، بڕوا نەهێنان و بیٚ بڕوایی کوێری یە و نابینایی یە، هەرچۆنیٚ بڕوا هێنان بینایی یە. کەواتە بە شایەتی خوا ئەو کەسانەی کە بڕوا ناهێنن کوێرن و نەفام و ناژیرن، ئەوانــەی کە بڕوایــان هێنــاوە بینــا و ژیــرو فامــدارن. بەڕاســتی هــەر کەسێك بێبــەش نــەبیٚ لــە ژیریــی هــەرکاتێك بــەراوردێك بکات لــە نێــوان ئــەوەی کــە ئیــسلام هێناویــەتی، لەگــەڵ هــەموو بــیرو بــاوەڕو بۆچــوونەکانی تــردا، هــەرکاتیٚ ئــەو بەراوردە بکات بۆی دەرئەکەویٚ کە بیٚ بڕواکان کوێرو نابینان. ئەبیٚ هەڵوێستی ئێمەی موسڵمان بەو جۆرە بێت بەرامبەر هەموو ئەو بــاوەڕو بەرهەمــەکانی بیرو بۆچوونەکانی غــەیرە ئیــسلامی بێجگــە لــە زانین و زانیــاری یــە رووتــەکان کــە پێغەمبــەری ئــازیز(ﷺ) دەســت نیشانی بــۆ کــردووە لــە فەرمودەکــەی خۆیــدا کــە فــەرمووی:(انــتم اعلــم بــشؤون دنیاکم) ئێوە زاناترن بەکارو فرمانی دنیاکەتان. لەم شتە ماددییــە رووتانــەدا قــەیناکات موسڵمان لە ناموسڵمان شت وەرگریٚ و فێری پیشەسازی و پزیشکی ببن. بــەلاٚم بێجگــە لەوە دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانیٚ کە شوێنی ناموسڵمان بکەویٚ و ببیٚ بە قوتــابی و شاگردی. هەر شوێن کەوتن و قوتابێتی یەك موسڵمان بیکات هۆی دەرچوونی یەتی لــە ئیــسلام و دژ و پێــچەوانەی شــایەتی خــوا ئەجوڵێتــەوە، کەواتــە زۆر جێگــەی ســەر سوڕمانە کەزۆر کەس هەیــە خۆی بــە موســڵمان دائەنیٚ و لاف موســڵمانێتی لیٚ ئــەدات کەچی بەرنامەی ژیانی وەرئەگریٚ لە کەسانێك کە بە شایەتی خوا کوێرن. ئــەم ئایینــە نابیٚ بە کاڵتە و فش و فۆڵی بگیریٚ، بــەڵکو بەئەوپــەڕی هێــزو گرنگی بگیریٚ، موسڵمان خــۆی وا دابــنیٚ کــەوا بــە ئاســۆ و لوتکــەی هــەرە بــەرزەوە و ناموســڵمان و بــیٚ بــڕوا بــە سەرگەردانی لەناو چاڵی نەفامی و گومڕاییدا ئەخولێتەوە، جا هەرکەس بەو جۆرە نییە با بزانیٚ کە ئەم ئایینە بیٚ پێویستە پێی و خوا بیٚ پێویستە لە هەموو شت و لە هــەموو جیهان و جیهانییان.

٦- هەر خراپە و شێوان و ئاژاوە و لاری یەك كە رووی كردووەتە ژیانی خەڵكی، سەرجەم ئەگەڕێتەوە بۆلای لادان لەو بەرنامە راست و رەوایە كەلەلایەن خواوە هات بۆ رێنموونی و بەختەوەری جیهان و جیهانی یان... ژیان لەم دنیایەدا چاك نابێ مەگەر بەمەی سەركردایەتی بەدەست كەسانێكەوە بێت كە ژیر و بینان و بڕوایان هەیە هەر ئەوەش هەق و راستە كە لەلایەن خواوە هات. هەرگیز ژیان چاك نابێت و رێگەی راست ناداتە بەر بە هیچ بەرنامە و سەركردایەتی یەكی تر، چاك نابێ نە بە دەرەبەگی و نە بە سەرمایەداری، هەرچۆنێ چاك نابێ بە شیوعی یەتی ئیشتراكی، وەك بە ئاشكرا دەركەوت و هەر خۆیان بۆ خۆیان دەركەوتن و ئاشكرا بوون، هەروەها چاك نابێ بە سیۆقراتی و دیكتاتۆری و دیموكراتی. چونكە ئەوانە سەرجەم بەرنامەی كەسانێكن كە بە شایەتی خوا كوێرن، بەڵگە و نیشانەی ئاشكرا لەسەر بێ كەڵكی و بەكار نەهاتنی ئەو هەموو بەرنامانە ئەو هەموو لاری و نالەباری و ئاژاوەو خراپەیە كە رووی زەوی داگیر كردووە لەم چەرخی بیستەمەدا كە گەیشتووەتە ئەوپەڕی رادە لە تێرو تەواوی و زۆری و فراوانی كەرەسە و هۆی ژیانی بەختەوەری و كامەرانی لەگەڵ ئەوەدا ژیان و جیهان بەو جۆرە سەخت و سامناكەیە كە هەموو كەس ئاگادارە پێی. پاڵفتەی باس و مەبەستەكە ئەمەیە موسڵمان ئەبێ بڕوای هەبێ بەمەی كە هەر ئەوە هەق و راستە كە لەلایەن خواوە هاتووەتە خوارەوە، ئەبێ تەنها بەرنامەی خوا وەرگرێ و ئیتر هیچ بەرنامەیەكی تر وەرنەگرێ، هەر بیر و باوەڕێكی كۆمەڵایەتی یان ئابوری یان رامیاری كە لە جیهاندا بووبێ یان ببێ سەرجەم فڕێ بدات، بێجگە لە تاقانە بەرنامەكەی خوا و شەرعەكەی خوا كە دای ناوە بۆ بەندەكانی، دان نان و باوەڕ بە راست و رەوایی هەر بەرنامە و هەر یاسا و هەر بڕیارێك كە دەستكردی خوا نەبێ، تەنها بەو بڕوا و دان نانە بەندە لە ئیسلام دەرئەچێ، چونكە ملكەچی و گوێ رایەڵی و فەرمان بەری ئەبێ هەر بۆ خوا بێت بەڕاستی ئەو بڕوا و دان نانە بێجگە لەوەی دژو پێچەوانەی ئیسلامە، لەهەمان كاتدا رەوا دانی سەركردایەتی و جێنشینی یە لەم جیهانەدا بۆ ئەوانەی كە كوێر و نابینان، ئەوانەی كە بەڵێن و پەیمانی خوا هەڵئەوەشێننەوە، ئەوەی كە خوا فەرمانیداوە بە پەیوەستی لەگەڵی ئەوانە ئەیپچڕن، ئاژاوە و خراپەكاری ئەكەن لە وڵاتدا، بێگومان بڕوا و رازی بوون بەوە گەورەترین تاوان و ناهەقی یە، ئادەمیتی و ئادەمی بە درێژایی مێژوی دوچاری هەموو بەد بەختی و لاری و نالەباری بوون بەهۆی

ئەو هەموو بەرنامە و بیرو باوەڕانەی کە لەم زەوییەدا هەڵقوڵاون لەسەر دەستی ئەوانەی کە لاف ژیری و زانایی یان بۆ لێ ئەدان و بە دانا و بیر و هۆشدار و فەیلەسوف ناو ئەبران. هیچ کاتێ ئادەمی بەختەوەرو کامەران نەبوو، ئادەمێتی یەکەی بەدی نەهات، نەگەیشتە رادەو پلە و پایەی خۆی مەگەر لە ژێر سایەی بەرنامەکەی خوادا لەو کاتە کەم و کورتانەی کە ئەو بەرنامە حاکم و کار بەدەست بوو. داواکارین خوا بە میهرەبانی خۆی وێنەی ئەو کاتە پیرۆزانە بهێنێتەوە بۆ رزگار کردنی بەندەکانی آمین.

لێبوومەوە بە یارمەتی خوای میهرەبان لە تەفسیری ئەم سورەتە لە ١٤١٢/٥/١١ هەر لەم رۆژەدا دەستمکرد بە تەفسیری سورەتی(إبراهیم) ١٩٩١/١١/٨ خوا یارمەتیم بدات بۆ تەواوکردنی ئەوەی کە ماوە لەم تەفسیرە آمین.

وصلی وسلم علی سیدنا محمد و آله و صحبه.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ

## سورەتی(إبراهیم)
## مەککەیی یە و(٥٢) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتەش باس و مەبەستە سەرەکی یەکانی وەحی و پەیام و تاك و تەنهایی خوا و زیندوو بوونەوەو حیساب و پرسیارە وەك زۆربەی سورەتە مەککەیی یەکانی تر. بەڵام بە پێی باوی قورئان لەهەر جێگا و شوێنێکدا بە شێوەیەکی جیاواز کە تام و بۆن و هەناسەیەکی تایبەتی هەیە، بە جۆرێك وەك مەبەستێکی تازە بێت و یەکەمجارە راگەیەنرێ. ئەم سورەتە چەند مەبەستێکی سەرەکی لەبارەی عەقیدەوە نیشان ئەدات، بەڵام دوانیان کە گەورەو گرنگترن نیوەی سورەتەکەیان داگیر کردووە:

١- یەکێتی پەیامی پێغەمبەرەکان و بانگ و بانگەوازەکەیان.

٢- باسی چاکە و بەهرەی خوا بەسەر بەندەکانەوە بڕوادار و بێ بڕوا، چاك و خراپ، گوێ رایەڵ و یاخی وەك لەمەوپاش ئەو دووانە وەرئەگیرێن لە ئایەتەکانەوە.

ئینجا با گوێ شل کەین بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزو بەفەڕانە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ﴾ پێکهاتوە لە وێنەی ئەم پیتانە نامەیە کە هێنامانە خوارەوە بۆ لای تۆ ئەی پێغەمبەر، واتە ئێمە ناردوومانە و تۆ دات نەهێناوە. مەبەست لە ناردنەکەی بۆ لات ئەمەیە﴿لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ بۆ ئەوەی خەڵکی دەربێنێ لە تاریکی یەکانەوە بۆلای رووناکی. تاریکی گومان و شتی پڕوپوچ. تاریکی باو و عادەتی بەد، تاریکی گومڕایی و سەرگەردانی لە چۆڵ و بیابانی بت و پەرستراوە ناهەقەکان، سەرگەردانی چەند بۆچوون و هەڵسەنگاندنی ناڕاست و ناڕەوا... خەڵکی دەربێنێ لەو تاریکی یانە بۆ نورو رووناکی کە ئەو تاریکی یانە ئاشکرا ئەکات، ئاشکرایان ئەکات لە دەروون و بیرو هۆشدا، ئینجا ئاشکرایان ئەکات لە ژیاندا.

باوەڕ بەخوا ڕووناکی یەکە لەدڵدا، بەهۆی ئەم ئادەمییە ڕووناك ئەبێتەوە بە تەواوی، ئەم ئادەمییەی کە پێکهاتووە لە قوڕ و گیان و ڕووحەکەی کە دروستکراوێکی تایبەتییە و جیاوازە لە دروستکراوەکانی تری خودا، ئینجا هەرکاتێ ئەو ڕووناکی و بڕوایەی لەگەڵ نەبوو بەشە قوڕەکەی زاڵ ئەبێت و ئەبێ بە قوڕێکی ڕەش و تاریك، قوڕێکی پێکهاتوو لە خوێن و گۆشت بە تەنها لەم خاك و کەرەسەی ئەم زەوییە و بەبێ ئەو ڕووناکی بڕوایە ئەبێتەوە بە قوڕە پەتی یەکە.

بڕوا بە خوا ڕووناکی یەکە دەروونی پێ پاك و خاوێن ئەبێ، بەهۆی ئەوەوە ڕێگەی ڕاستی خۆی پێ ئەدۆزێتەوە، ڕێگەی گەیشتن بەخوا بە ڕووناکی و بەبێ هیچ تەپ و تۆزو تەم و مژێك. تەپ و تۆز و تەم و مژی گومان و بێ ئارامی و شتی پڕو پووچ. یان تەم و مژی ئارەزووات و بۆچوونی ناڕەوا، هەرکاتێ ئەو ڕێگەیەی بینی بە ڕوونی ئەیداتە بەر بەبێ هەڵکەوتن و هەڵخلسیکان، بەبێ دوو دڵی و سەرگەردانی.

بڕوا بەخوا نورو ڕووناکییە لە هەموو بارو ڕوویەکەوە، نورو ڕووناکی ناسین و زانین و داد و ئازادی و سەربەستی، نورو ڕووناکی خۆشی و شادمانی پەیوەندی بەخوا، ئارامی و دڵنیایی بەداد و میهرەبانی و کار دروستی خوا لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەو ئارامی و دڵنیایی یەی کەهۆی خۆگری یە لەناخۆشیدا. سوپاس و چاولەبەری لە خۆشیدا.

بڕوا بەخوا نورو ڕووناکییە کە مایەی ژیانی ڕاستەقینە و کامەرانییە، هەموو ئادەمی یەکسانن کە هۆی یەکێتی و پەیوەستی نێوانیان پەیوەندی یانە بە خواوە، ملکەچی و بەندەییان تەنها خوایە، کەواتە ئادەمی نابن بە دووبەش، بەندە و خاوەن و ئاغا، بەڵکو هەموو یەکسان و بەندەی خوان، پەیوەستن بە بوونەوەرەوە و بە ئارامی و ئاشتی ئەژین لەگەڵ بوونەوەرو هەرچی لەم بوونەوەرەدایە.

بڕوا بەخوا بەرنامەیەکی تێرو تەواوە نەك تەنها بیرو باوەڕێکی دەرونییە، بەرنامەی ژیانە و دامەزراوە لەسەر بنەڕەتی بەندەیی بۆ خوا، ملکەچی و گوێ ڕایەڵی هەر بۆ ئەو، ڕزگاربون لە پەرستنی بەندەو هەرکەس و هەر شتێکی تر. ئەم بەرنامەیە ڕێك و پێکە لەگەڵ سروشتی ئادەمی و پێویستیاتی ڕاست و ڕەوای سروشتی ئادەمی بە جۆر و شێوەیەك کە خۆش بەختی و کامەرانی و ئارامی و ئاشتی هەر لەوەدایە،

بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ

**ئینجا ئەفەرموێ:﴿بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ﴾ واتە ئەم نامەیەمان هێنایە خوارەوە بۆلای تۆ بۆ ئەوەی خەڵکی دەربێنی لە تاریکی یەوە بۆ نوورو ڕووناکی بە ئیزن و فەراهەم هێنانی پەروەردگاریان، کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) هەر ڕاگەیاندنی بەدەستە و کاری ئەو هەر ڕاگەیاندنە، ئینجا مەبەست بەو ڕوناکی یە ڕوون ئەکاتەوە بەمەی لەباتی ئەودا ئەفەرموێ: ﴿إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ واتە خەڵکی دەربێنی لە تاریکی یەکانەوە بۆ ڕێگەی کەسێك کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا و هیچ شتێ ناتوانێ سەرپێچی لێ بکات و سوپاس کراوە. سیفەتی یەکەم هەڕەشە و ترساندن نیشان ئەدات دەربارەی بێ بڕوایان، هەرچۆنێ سیفەتی دووەم بیرخستنەوە و ئامۆژگاری نیشان ئەدات دەربارەی بڕوادار و سوپاس کاران، ئینجا بەدوای ئەو دوو سیفەتەدا ئەم ڕستەیە ئەهێنێ: ﴿ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە بۆ ڕێگەی خوایە کە ناوی(الله) یە و هەر بۆ ئەوەو داهێنراو و موڵکی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەویدا. ئینجا هەرکەس دەرئەچێ لەو تاریکی یانە، ئەوە ڕێگەی خوا ئەداتە بەر ئەوە ئاشکرایە کە بەختەوەرە و لێرەدا قورئان دەربارەی هیچ نافەرموێ، بەڵکو دەست ئەکات بە هەڕەشە و ترساندنی ئەوەی کە بڕوا ناهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ﴾ لەناو چوون و نەمان بۆ بێ بڕواکان لەبەر سزایەکی بەتین کە دووچاریان ئەبێ، ئەوانەی کە سپڵەن و چاو لەبەری ئەو چاکەیە نین کە پێغەمبەر(ص) بۆی هێنان لەلایەن خواوە. ئینجا چەند سیفەتێکیان بۆ باس ئەکات کە هۆی**

ئەو بێ بڕوایی و سپڵەیی یەیە، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەوانە کە ژیانی ئەم دنیایە هەڵدەبژێرن و باوی ئەدەن بەسەر ژیانی ڕۆژی دوایی نەبڕاوەدا﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ﴾ بەرگری ئەکەن و خەڵکی لائەدەن لە ڕێگای خوا، نیازی لاری و چەوتی ئەکەن بۆ ئاینی خوا و ئەیانەوێ لەسەر بارە ڕاستی یەکەی نەبێ بە پێی ئارەزووی خۆیان، بێگومان هەڵبژاردن و باودانی ژیانی دنیا دژە لەگەڵ داخوازی بڕوا و ڕێگەی ڕاستی خوادا، بە پێچەوانەی هەڵبژاردن و باودانی ژیانی ڕۆژی دوایی بەسەر ژیانی دونیادا، چونکە لەو کاتەدا ژیانی دنیا ڕێك و پێك ئەبێت و ئەبێ بە خزمەت گوزار و کشت و کاڵ بۆ ڕۆژی دوایی. ئەوانەی کە باوی ژیانی دوایی ئەدەن خۆشی و ژیانی دنیایان لە دەست ناچێ – وەك هێندێ نەفام و نەزان ئەڵێن و وا گومان ئەبەن – بەڵکو ژیانی ڕاست و ڕەوا و ژیانی بەختەوەری دنیا کاتێ دەستکەوت ئەبێ کە باوی ژیانی دوایی بدرێ، چونکە لەو کاتەدا بەندە هەڵئەسێ بەکارو فرمانی جێنشینی یەکەی لە زەویدا، بەشێ لە فرمانی جێنشینی یەکەی ئەوەیە کە وڵات ئاوەدان بکاتەوە و هەموو خێرو بێرو هێز و وزەی دنیا بەکار بێنێ و ژێر دەستی بکات و خەڵکی بەهرەمەند ببێ پێیان وەك قورئان دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ دروستی کردووە بۆتان و بۆ سودی ئێوە هەرچی وا لە زەویدا، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ﴾ ئەوانەی کە باوی ژیانی دوایی ئەدەن بەو جۆرەن، پێچەوانەی ئەوانەی کە باوی ژیانی دنیا ئەدەن کە هەموو ئاوات و مەبەست و ئامانجیان داگیر کردن و دەستکەوتە بەهەر جۆر و لەسەر هەر بار تەنها بۆ خۆیان و بۆ بەرژەوەندی خۆیان و پێکهێنانی ئارەزوی خۆیان، ئینجا لەبەر ئەوە بەرگری ئەکەن لە ڕێگەی خوا و ئەیانەوێ دادو ئاینی خوا نەیەتە کایە و لەسەر باری ڕاستەقینەی خۆی نەڕوا،

أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ

---

ئەو کاتە ڕێیان بەرەڵابێ بۆ سەر کێشی و خراپە کاری و دەست درێژیی و زاڵی بەسەر بەندەکانی خوادا بە بێ بەرگری ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ﴾ ئەوانەی کە باسکران لە گومڕایی یەکی دووردان. بێگومان تەنها بەرنامەی ئایین و بڕوا بە خوا مایەی ژیانی ڕاستەقینەیە و هۆی بەهرەمەندی یە بەو ژیانە، لەبەر ئەوە خوای میهرەبان فروستادە و پێغەمبەرەکانی نارد بۆ ڕێنموونی بۆ ئەو ژیانە و خستنە سەر ئەو ڕێگەیە. بۆ ئەوەی ئەو فروستادە و پێغەمبەرانە بتوانن و بگونجێ، ئەو ڕێنموونی و ڕاگەیاندنە. خوای میهرەبان ئەو پێغەمبەرو فروستادانەی نارد بۆ سەر گەلەکان، بە زمانی خۆیان وەك ئەفەرمویێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ﴾ هیچ فروستادەیەکمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بە زمانی گەلەکەی بۆ ئەوەی پەیامەکەی خوایان بۆ باس بکات بە ڕوونی، هەرچەند پێغەمبەری نازیز(ﷺ) ڕەوانە کراوە بۆ سەر هەموو کەس، بەڵام لەبەر ئەوەی عەرەب بووە ئەویش وەك پێغەمبەرانی تر بە زمانی گەلەکەی ڕەوانە کراوە، ئینجا گەلەکەی لەپاش خۆی پەیامەکەیان هەڵگرت و گەیاندیان بە هەموو جیهان، هیچ گرێیەك لەوەدا نییە و لە ڕاستیدا جێگەی هیچ قسە و باسێك نییە، ئەو قسە و باسە کاتێك ئەبوو کە بگوترایە هیچ پێغەمبەرێکیان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بۆ سەر گەلەکەی. پێغەمبەری نازیزمان(ﷺ) بە زمانی گەلەکەی ڕەوانە کرا بۆ سەر هەموو کەس ئیتر با ڕاگەیاندنەکەی لەلایەن خۆیەوە بۆ هەموو کەس نەبووبێ، بەڵکو هەر بۆ عەرەب بووبێ و هەموو پێغەمبەرێك پەیامەکەی خوای ڕاگەیاندووە و کاری ئەو بریتی بووە لەوە﴿فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ﴾ ئینجا خوا مەیلی هەرکەسی بووبێ گومڕای کردووە، مەیلی هەر کەسێکیشی کردبێ ڕێنموونی کردووە و خستوویەتی یە سەر ڕێگای ڕاست،

وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ
ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٥﴾

**﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ هەر ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا. کار دروست و لێزانیشە و هەموو کار و کردەوەکانی بەجێیە، ئینجا بێگومان گومڕا کردن و ڕێنموونی یەکەش راست و رەوایە و بە پێی ویست و کردەوەی بەندەکان، نەك بە زۆر و ناچارکردن. ئینجا نموونەیەك ئەهێنێ لەو پێغەمبەرانە کە رەوانە کراون بە زمانی گەلەکەی، کە پێغەمبەرێکی بەناوبانگ و ناسراو بووە و بەسەرهات و رووداوی فراوان و جۆر بەجۆر رووی تێکردووە: ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾ سوێند بەخوا موسامان نارد بە موعجیزەکانمانەوە، واتە ئەو(٩) موعجیزە گرنگانەی کە بەناوبانگن ﴿أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ واتە رەوانەمان کرد بەوەی کە گەلەکەت دەربێنە لە تاریکی یەکانەوە بۆلای رووناکی. یان رەوانەمان کرد بەم رەنگە پێمان وت... هتد. ﴿وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ﴾ ئامۆژگاری یان بکە بە رۆژەکانی خوا، واتە بە رووداوە گرنگەکانی ئەو رۆژانەی کە دەستی قودرەتی خوایان تێدا ئاشکرا بوو، واتە بە چاکە و بەهرەکانی خوا بەسەریانەوە و ئەو چاکە و بەهرەیانەیان بیر بخەرەوە با چاو لەبەری خوا بن و سەری بەندەیی بۆ داخەن، ئەو چاکە و بەهرەیانە وەك گێڕانی دەریاکە بە راگوزەر و سێبەر کردنی هەور بەسەریانەوە و باراندنی گەزۆو شەلاقە و هەروەها وەك(ئیبن و عەباس و ئیبن و کەعب و موجاهید و قتادة) ئەفەرمون. یان ئامۆژگاری یان بکە بە بەسەرهات و رووداوەکانی گەلە پێشووەکان کە خوا سزای دان و لەناوی بردن بەهۆی یاخی بوونیان لە فرمانی خوا و پێغەمبەرەکانیان. واتە بیان ترسێنە بەو رووداو و بەسەرهاتانە تا بترسن و خۆیان بپارێزن لە یاخی بوون و نافەرمانی وەك(موقاتیل) ئەفەرموێ. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴾ بەڕاستی لەو رۆژانی خوادا چەند بەڵگە و نیشانەی روون هەیە بۆ هەموو زۆر خۆگرێ و زۆر سوپاس گوزارانێ. بێگومان لەو رۆژانەدا سزا و ناخۆشی بووە کە بەڵگەیە لەسەر خۆگری، نازو خۆشیش بووە کە بەڵگەیە لەسەر سوپاس. هەرچەند لەو رۆژانەدا هۆی خۆگری و سوپاس هەیە بۆ هەموو کەسێ، بەڵام هەر خۆگرو سوپاس گوزارە بەهرەمەند ئەبن لەبەر ئەوە تایبەتی کرد بەوانەوە، ئینجا هێندێ لە شێوەی پەیام و راگەیاندن و ئامۆژگاری و بیر خستنەوەکەی موسا نیشان ئەدات،**

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ
يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم
بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن
كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ
حَمِيدٌ ﴿٨﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ﴾ باسی ئەوە بکە کە موسا وتی بە گەلەکەی ﴿اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ باسی چاکە و بەهرەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ﴿إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ﴾ لەو کاتەدا کە رزگاری کردن لە دەستە و بەستەکەی فیرعەون لە کاتێکدا﴿يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ پێیان ئەچەشتن بە هەمیشەیی و بەدوای یەکدا سزای بەد بە چەند جۆرو شێوەیەك، بە تایبەتی دوو جۆریان باس ئەکات:**

**١- ﴿وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ﴾ کوڕەکانتان بە زۆری ئەکوشت و سەریان ئەبڕین بۆ بێ هێز کردن و کەم کردنی ژمارەی پیاوەکانیان.**

**٢- ﴿وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾ ئافرەتەکانیان ئەهێشتەوە لەبەر کارەکەری و ریسوا کردن و بێ هێز کردنیان.**

**﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ لەوەدا کە باسکرا تاقیکردنەوەیەکی گەورە هەیە لەلایەن پەروەردگارتەوە. تاقیکردنەوە لە یەکەم جارەوە بە سزا بۆ خۆگری و بەربەرەکانی تو بڕیاردان لەسەر خۆ رزگار کردن و ئامادەیی بۆ وەستان بەرامبەر ستەم کە ئەمە خۆگری یە بە راستی، ئەوە سیفەتێکی چاکە نەك هەر سەرشۆڕ کردن و زەبوونی... دووەم تاقیکردنەوە هەیە بە رزگار کردن لەبەر سوپاس کردن و چاو لەبەری بۆ خوا، دامەزراوی لەسەر رێگەی راست. ئینجا هەروەها موسا(علیە سەلام) لەسەر راگەیاندنەکەی رۆیشت و سەرەنجامی سوپاس و ناسوپاسی یان بۆ باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ﴾ باسی ئەو کاتە بکەن کە پەروەردگارتان بەڕوونی رایگەیاند، بەم رەنگە فەرموێ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾**

سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە بۆتان زیاد ئەکەم﴿وَلَئِن كَفَرْتُمْ﴾ ئەگەر نا سوپاسی بکەن و چاولەبەری چاکەی من نەبن ﴿إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ بەڕاستی سزای من زۆر بەتینە بۆ ناسوپاسان کە دان نانێن بە چاکەی من دا، ئیتر ئەو سزادانە بە نەمانی ئەو چاکە و نیعمەت بێت، یان بێفەڕی و خێر لێ نەبین بێت، یان بەوە بێت کە ببێتە هۆی زیان لەلایەن دوژمن و ناحەزانەوە، یان بە هاتنی سزایەك بێت لە دنیادا، یان لە ڕۆژی دواییدا بە جۆرێ کە خوا بیەوێ. ئینجا ئەو بەڵێن و هەڕەشەیە شتێکی ڕاستە و هیچ جێگەی گومان و دوو دڵی نییە، چونکە لەلایەن خواوە هاتووە. ئەگەر بیانەوێ شتەکە بە ڕوونی دەرکەوێ بە ئەندازەی بیر لێکردنەوە بۆمان دەرئەکەوێ: بێگومان سوپاسی چاکە بەڵگەیە لەسەر دەروون پاکی و سروشتی ڕێك و ڕاست، ئەو کەسەی سوپاسی خوا ئەکات و چاو لەبەری یەتی بێگومان چاودێری و ڕەزامەندی خوا ئەکات لە بەکارهێنانی ئەو نیعمەت و چاکەیە و هەرگیز بەکاری ناهێنێ لەشەڕو خراپەدا، بەڵکو بەکاری ئەهێنێ لە سوود و بەهرەمەندی خۆی و خەڵکیشدا، ئەو کاتە خەڵکیش ئامادە ئەبن بۆ کۆمەکی و یارمەتیدانی، ئەوەش ئەبێ بەهۆی زۆر بوون و پەرەسەندنی ئەو نیعمەتە. بە پێچەوانەی ناسوپاسی و سپڵەیی. ئەمەی کە گوتمان مەبەست ڕوونکردنەوەیە ئەگینا تەنها بەڵێنەکەی خوا بەسە بۆ دڵنیایی و بڕوا بەو شتە ڕاستە. ئینجا دەست نیشانی کرد بەوەی کە نە سوپاس کردن سوود ئەگەیەنێ بەخواو نە ناسوپاسی زیان ئەگەیەنێ، بەڵکو سوود و زیانەکە هەر ڕوو لە خەڵکی ئەکات وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ﴾ موسا پێی فەرمون: ﴿إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ ئەگەر ئێوە و هەرکەس وا لە وڵات و زەویدا ناسوپاسی بکەن و سپڵەبن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ بێگومان خوا بێ پێویستی سوپاس کراوە. واتە خوا زیانێك ڕووی تێ ناکات بەهۆی ناسوپاسی و سپڵەیی ئێوە، چونکە خوا بێ پێویستە بەهیچ شتێك و سوپاس کراوە و شیاو و شایستەی سوپاسە، ئیتر با سوپاس نەکرێ لەلایەن هیچ کەسێکەوە. ئینجا ئامۆژگاری و تەمێ و بیرخستنەوەکەی درێژە پێ ئەدات، بەڵام قورئان لێرەدا بەجۆرێ ئەیهێنێ ناو و باسی موسای تێدا نییە، دەست نیشان ئەکات بۆ بەر بەرەکانێ و ناژاوەی نێوان ئوممەتە ڕابوردووەکان لەگەڵ پەیام و پێغەمبەرەکانیاندا لە چەرخ و وڵاتە پێشووەکاندا،

أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا
يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ
أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ
فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ

---

**ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ ئایا نەهاتووە بۆتان و پێتان نەگەیشتووە هەواڵی گرنگی ئەو گەلانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون ﴿قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ﴾ گەلی نوح و عاد و سەمود ﴿وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ﴾ ئەوانەی کە لەپاش ئەوان بوون و هاتن ﴿لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ﴾ لەکاتێکدا هیچ کەس نایانزانێ بێجگە لە خوا. لێرەدا پێویستە بوەستین و بیر لەوە بکەینەوە کە زۆر کەس هەن باسی پشت بە پشت ئەکەن تا ئادەم و لاف ئەو زانینە لێ ئەدەن کە خوا هەر بۆ خۆی داناوە !پێویستە ئەوانە ئاگادار بکرێنەوە و تەمێ بکرێن بە گەڕانەوە و لەو لاف لێدانە، خۆیان بپارێزن لەوەی بەدرۆ بخرێنەوە بەو حەدیسە یان ئەو ئەسەرەی کە ئەفەرموێ: ﴿كذب النسابون﴾. ئەو گەل و ئوممەتانەی کە پاش سەمود هاتن تا ئوممەتەکەی موسا زۆرن و ناویان لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵام دەنگ و بانگەوازی پێغەمبەرەکان هەر یەك بووە، هەڵوێستی بێ بڕواکانیش هەر یەك بووە وەك ئەفەرموێ: ﴿جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ فروستادەکان و پێغەمبەرەکانیان هاتن بۆ سەریان بە موعجیزە و بەڵگەی ئاشکراوە ﴿فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ ئەم فەرمودەیە بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە، هێندێکیان ئەهێنم:**

**١- بێ بڕوا نەفامەکانی ئەو گەلانە پەنجەکانی خۆیانیان گەست لە رق و قیندا.**

**٢- دەستیان گرت بەسەر دەمیاندا بەسەر سوڕمانەوە لە وتە و قسەی پێغەمبەرەکانیان.**

**٣- دەستیان گرت بەسەر دەمیاندا بە لاقرتێ و پێکەنینەوە.**

٤- دەستیان گرت بەسەر دەمی خۆیاندا بۆ دەست نیشان کردن بە بێدەنگ بوون و قسە نەکردنی پێغەمبەرەکان.

٥- دەستیان گرت بەسەر دەمی پێغەمبەرەکاندا بۆ ئەوەی قسە و باسەکەیان نەکەن.

٦- بڕوایان نەهێنا و پێغەمبەرەکانیان بە درۆزن دانا.

بەهەرکام هەڵنەگریٰ و رای هێندیٰ لە زانا بەرزەکانی پێشووە. بەچەند شێوەیەکی تریش تەفسیر کراوەتەوە کە ئەگەڕێتەوە بۆ یەکیٰ لەمانەی کە باسکران﴿وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ﴾ گوتیان بەڕاستی ئێمە بیٰ بڕواین و بڕوامان نییە بەوەی کە ئێوەی پیٰ رەوانە کراوە. واتە بە پێی قسە و لاف خۆتان ﴿وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٍ﴾ بەڕاستی ئێمە لەوەی کە ئێوە بانگمان ئەکەن بۆلای لە گومانێك داین کە بیٰ ئارام کەرە بۆ دڵ و دەروونمان. واتە ئێمە بڕوامان نییە بەوەی کە ئێوە ئەڵێن: خوا ئێمەی ناردووە بۆلاتان، گومانمان هەیە و دڵمان بیٰ ئارامە لەو ئاین و خواپەرستی یەی کە ئێوە بانگی ئێمەی بۆ ئەکەن، وا دەرئەکەویٰ لە یەکەم جارەوە بە بێگومان و دوو دڵی بڕوایان نەبوویٰ لە پاشان کەوتبنە گومان و دوو دڵی، کەواتە دژایەتی نییە لە نێوان ئەو دوو وتەدا کە گوتیان.ئەوەی کە ئەوانی بۆ بانگکراوە خوایەتی و پەروەردگاری خوایە، بێگومان ئەوەش شتێکی زۆر راست و رەوانە و سروشت و ژیریی وەری ئەگریٰ بە بیٰ گیرو گرفت و بوونەوەر شایەتە لەسەری، کەواتە گومان لەوەدا جێگەی سەرسوڕمان و بێزاری دەربڕینە.

جا لەبەر ئەوە﴿قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ﴾ فروستادەکانیان گوتیان پێیان بە سەرسوڕمان و بێزاری دەربڕینە ﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا گومان هەیە لە خوایەکدا کە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە؟! خوای میهرەبان بانگی ئەوانەی ئەکرد بۆ بڕوا هێنان، کە مایەی لێبوردن و سڕینەوەی گوناهو تاوانە، بەڵام لەبەر ئەوەی چاکە و منەتەکەی خوا ئاشکرا بکات لە رێوە ئەفەرمویٰ: ﴿يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ واتە ئایا گومان هەیە لەو خوایەدا کە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە و لە کاتێکدا ئەو خوایە بانگتان ئەکات بۆ ئەوەی بسڕێتەوە و ببوریٰ لە گوناهەکانتان بەهۆی باوەڕ هێنانتانەوە،

وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۚ قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ
يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ

---

**﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۚ﴾ بۆ ئەوەی دواتان بخات تا ماوەیەکی ناوبراوی دیاریی کراو، واتە بانگتان ئەکات بۆ باوەڕهێنان تا بەهۆی ئەوەوە لەناوتان نەبات و لە ڕیشەتان نەهێنێ، ئەوەش بە پێی باوی خوا کە هەر گەل و ئوممەتێك پەڵپ و بیانووی گرتبێ و داوای موعجیزەیەکی کردبێ و ئینجا ئەو پەڵپەی بەدی هاتبێ و ئینجا لەپاش ئەوە باوەڕی نەهێنابێ خوا لەناوی بردووە و لە ڕیشەی هێناوە. (ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ: بۆ ئەوەی بتانژیەنێ بەخۆش و کامەرانی تا مردن. ئینجا ئەو نەفامانە ڕەخنەیەکی تریان ئەگرت لە پێغەمبەرەکانیان بەم ڕەنگە ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەیان گوت: ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ ئێوە هەر ئادەمی یەکن وێنەی ئێمە ﴿تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەتانەوێ بەرگری ئێمە بکەن لە پەرستنی ئەوەی کە باوك و باپیرمان ئەیان ویست ﴿فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ دەی بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن لەسەر ڕاستی ئەو داوا و لافەی کە لێی ئەدەن. ئەو نەفامانە لەباتی کەشخە و شانازی بکەن بەوەی کە خوا لە تیرەی ئادەمیپێغەمبەرانی هەڵبژاردووە، کەچی ئەوەیان ئەکرد بەهۆی گومان و دوو دڵی، لایان وابوو ئەو پێغەمبەرانە بە ئارەزووکاری ئەو داوایە ئەکەن بیریان لە بێ نرخی و هیچ و پووچی ئەو بتانە نەئەکردەوە، بیریان نەئەکردەوە لەو ئایینە ڕاستەی کە بانگیان ئەکەن بۆی، بەڵکو داوای بەڵگە و نیشانەیەکی بەهێز و ناچار کەریان ئەکرد لێیان ! جا لەبەر ئەوە وەڵامی ئەوانەیان بەم جۆرە دایەوە کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ﴾ پێغەمبەرەکانیان گوتیان پێیان: ﴿إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئێمە هەر ئادەمی یەکین وێنەی ئێوە﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦۖ﴾ بەڵام خوا منەت ئەنێ بەسەر هەرکەس لە بەندەکانی کە خوا بیەوێ بەمەی هەڵی ئەبژێرێ بۆ ئەو کارە گەورەیە﴿وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ﴾ نەبووە و نابێ بۆ ئێمە موعجیزە و بەڵگەتان بۆ بێنین مەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا. واتە هێنانی موعجیزە و بەڵگە لە کارو فرمانی ئێمە نییە، بەڵکو تایبەتی یە بە خواوە،**

وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا
سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ

---

**﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ کەواتە با بڕواداران هەر پشت بەخوا ببەستن، واتە ئێمە و هەموو بڕواداران ئەبێ هەر پشت بە خوا ببەستین لە ئارامی و خۆگریمان لەسەر دوژمنایەتی و ئازاردانی ئێوە ﴿وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ئایا چی هەیە بۆ ئێمە و چ هۆیەك هەیە بۆ ئەوەی کە پشت نەبەستین بەخوا ﴿وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا﴾ لەکاتێکدا کە ڕێگای خۆمانی نیشان داوین و خستوینی یەتە سەری؟ واتە هیچ هۆیەك نییە و ئەبێ هەر پشت بەو ببەستین و کاروبارمان هەواڵەی ئەو بکەین﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا﴾ بەڕاستی خۆمان ئەگرین لەسەر ئازار دانتان و ئازاردانی ئێوە کارمان لێناکات ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ کەواتە با هەر پشت بەخوا ببەستن پشت بەستووەکان، ئیتر گوێ یان لە هیچ کەس و هیچ شتێك نەبێ، ئینجا لەم کاتەدا یاخی یەکان خۆیانیان بە تەواوی دەرخست کاتێ کە بۆیان دەرکەوت دەمەقاڵێ سوودی نییە و بە قسە و باس ئەو بڕوادارانە کۆتایی ناهێنن، دەستیانکرد بە هەڕەشە و تاپاڵ و بەکار هێنانی هێزو زۆر، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ﴾ بێ بڕواکان گوتیان بە فروستادە و پێغەمبەرەکانیان ﴿لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾ بەڕاستی دەرتان ئەکەین لە خاك و وڵاتەکەمان، یان بەڕاستی ئەگەڕێنەوە ناو میللەت و کەلەکەمان و ئایینەکەی ئێمە ئەگرنە گەردن. بێگومان پێغەمبەرەکان هەرگیز ئایینی ئەوانیان نەویستووە، کەواتە مەبەست ئەوەیە کۆتایی بێنن لە داوای خۆیان و لاڤ پێغەمبەرێتی لێ نەدەن وەك جاری جاران لە پێش ڕەوانە کردنیان. جا لێرەدا دەرئەکەوێ چۆنێتی ئاژاوە و بەربەرەکانێی ئەوانە. نەفامەکان بەهیچ جۆر نایانەوێ بوونی ئیسلام و ڕازی نابن کە ببێ و هەرگیز بێ دەنگ نابن لێی و ئاشتی لەگەڵ ناکات. بێگومان ئیسلامیش ئەبێ دەرکەوێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ و لە شێوەی کۆمەڵێکی نەوەستاو و هەمیشە لە بزووتنەوەدا بێت و بە سەرکردایەتی یەکی سەربەست و سەربەخۆ. کەواتە ئەبێ کۆمەڵی نەفامانیش بوەستن بەرامبەریان و جەنگ و ئاژاوە پێك بێت.**

فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ ذَٰلِكَ
لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسۡتَفۡتَحُواْ

---

ئینجا کاتیٚ کۆمەڵی نەفام تاوان و ستەمیان گەیشتە ئەو رادەیە بانگەوازی خوا بوەستێنیٚ هێزو دەسەلاٌتی گەورە دێتە مەیدان و ئەدات لە هێزی دوژمنی نەفام وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرمویٚ: ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئینجا خوای پەروەردگاریان وەحی کردە لای ئەو فروستادانە بەمەی کە سوێند بەخوا ستەمکارەکان لەناو ئەبەین و نایان هێڵن﴿وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ﴾ ئێوە نیشتەجیٚ ئەکەین لە خاك و ولاٌتی ئەوان دا لەپاش لەناو بردن و لە ریشە هێنانی ئەوان ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾ بۆ کەسێك کە ترسا بێت لە وەستانی لە حوزوری من دا، واتە لە وەستانی رۆژی دواییدا. یا ترسا بێت لە ئاگادار و وەستانی من بەسەریەوە، ترسا بێت لە هەرەشە و سزای من. کەواتە کەسێك نیشتەجیٚ ئەکریٚ کە دەست درێژیی ناکات و خۆی بەزل نازانیٚ بەسەر بیٚ هێزو داماواندا، خراپەکاری بلاٌوناکاتەوە لە ولاٌتدا، بەڵکو چاکە و چاکەکاری بلاٌو ئەکاتەوە، چونکە ئەترسیٚ لەخواو لە سزای خوا، کەواتە شیاو و شایستەیە بۆ دامەزراندن و نیشتەجیٚ کردن لە ولاٌتدا، بەلاٌم پێویستە بزانریٚ کە ئەو دەستی قودرەتی خوا کاتیٚ هاتووەتە کار کە پێغەمبەرەکان و بڕواداران بە تەواوی پچڕان و جیابوونەوەیان بەکارهێنا بێت لەگەڵ بیٚ بڕواکان، بە تەواوی وەستا بن بەرامبەریان تا بوون بە دوو دەستە و کۆمەڵی جیاواز، کۆمەڵی خوا بە تەواوی دەستیان گرتبیٚ بە ئایین و بەرنامەکەی خۆیانەوە. هەرگیز ئەو دەستە قودرەتە نەهاتووەتە کایە بۆ کۆمەڵێکی فشو فۆڵی تێکەڵ لە گەڵ کۆمەڵی نەفامان، بەسەر شۆڕی و سەرکۆی کارو کردەوەی لە ولاٌتدا. ﴿وَٱسۡتَفۡتَحُواْ﴾ واتە کۆمەڵی ستەمکار و یاخی یان، کۆمەڵی بڕواداران بەرامبەر یەك وەستان و هەرکام داوای سەرکەوتن و زاڵ بوونیان کرد لەخوا، یان ئوممەتەکان داوایان کرد بەم جۆرە گوتیان: ئەی خوایە ئەگەر ئەم فروستادانە راست ئەکەن دەی خوایە سزامان بدە. یان پێغەمبەرەکان کاتیٚ کە نائومێد بوون لە بڕوا هێنانی گەلەکانیان، بەم سیٚ جۆرە تەفسیر کراوەتەوە.

وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا
يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ
غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ
لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾

---

لەسەر هەربار دوا رۆژ و چارەنوسی یاخی و بێ بڕواکان بەم جۆرە ئەبێ کە ئەفەرموێ: ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ زیانبار بوو و تیاچوو هەموو خۆ بەزل زان و یاخی و دژو دوورە پەرێز لە هەق ﴿مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ﴾ کە دۆزەخ لە پێشی یەوەیەتی ﴿وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ﴾ ئاو ئەدرێ لە ئاوێك کە کێم و زووخە لە کاتێکدا: ﴿يَتَجَرَّعُهُۥ﴾ قوم قوم ئەیخواتەوە و ناتوانێ بە یەك جار لەبەر پیسی و بۆگەنی و قیزەونی ﴿وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ﴾ ناتوانێ قوتی بداو نزیك نییە لە قوتدانی مەگەر بە زۆر و بە زەحمەت ﴿وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ لە هەموو شوێنێکەوە مردنی بۆ دێت ﴿وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ نابێ بە مردوو و نامرێ. واتە لە هەموو تەرەفێکەوە یان لە هەموو بەش و پارچەکانی یەوە، سزاو هۆی مردنی بۆ دێت، بەلأم نامرێ و رزگار ببێ ﴿وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ لەبەر دەمییەوە سزایەکی قورس و بەتین و ئەستور هەیە کە سزای هەمیشەیی و نەبڕاوەیە. یان بەرگری کەری یەتی لە هەناسەدان، یان کات لەدوای کات

سزای سەخت و بەتین بۆی دێت. خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات، بەڕاستی هەق وایە بە بیر لێکردنەوەشی تیکە لە گەروودا بگیرێ و خەو شوم ببێ لە مەردوم.

لەپاش دەست نیشان کردن بۆ ئەو چارەنوس و پاشەڕۆژە سەخت و سامناکە، لە پاش ئەوە ئینجا شێوەی نائومێدی و بەش بڕاوی بێ بڕواکان نیشان ئەدات لە وێنە و چیرۆکێکدا کە هەر لە دەست قورئان دێت شتی وا نیشان بدات. ئەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ ﴾ سیفەت و وێنەی نایابی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە پەروەردگاریان لەمەدایە کە دێت: ﴿أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾ کردەوەکانیان وەك خۆڵە مێشێك وایە کە بە توندی با بردبێتی و لەپێش چاو ونی کردبێ لە ڕۆژێکی بای سەختدا، واتە لە ڕۆژێکدا کە با بە تەوژم و توندی هەڵی کردبێ تێیدا. ئینجا مەبەستەکە روون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ ئەو بێ بڕوایانە لە ڕۆژی دواییدا دەسەڵاتیان نابێ بەسەر هیچ شتێکدا لەوەی کە کردوویانە لە دونیادا، واتە هیچ بەرهەم و سەوابێکیان دەستکەوت نابێ هەرچۆنێ هیچ لەو خۆڵە مێشە دەستکەوت نابێ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴾ هەر ئەوەیە ون بوون و زیان و لەدەست دەرچوونی دوور و گەورە چونکە بە هیچ جۆر چاوەڕوانی دەست کەوتنی نابێ، ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئایا نەتزانیوە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، بە لێزانی و کاردروستی و لەبەر کارێکی گەورە و گرنگ، نەك بە خۆڕایی و بێ مەبەستێکی گرنگ ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ ئەگەر بیەوێ و مەیلی ببێ ئێوە لائەبات و ناتان هێڵێ، دروستکراوێکی تازە ئەهێنێ لەباتی ئێوەدا،

وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ
تَبَعًا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡ

﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ بێگومان ئەو نەهێشتنی ئێوە و دروستکراوی تر هیچ شتێکی نەگونجاو و نارەحەت نییە لەسەر خوا و هیچ ئەرکێکی نییە، چونکە کەسێك کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردبێ ئەتوانێ و زاڵە بەسەر ئەوەدا. ئینجا کوت و پڕ هەست و خەیاڵ ئەگوێزێتەوە لەم دونیایەوە بۆ ڕۆژی دوایی و شێوە و وێنەی بێ بڕواکان ئەخاتە بەرچاو کە وتو وێژ و دەمەقاڵێ ئەکەن لەنێوان خۆیاندا لەبارێکەوە، لەنێوان شەیتان و ئەمان دا، ئەفەرموێ: ﴿وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ بێگومان هەموو پێکەوە بە گشتی دێنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان بە جۆرێك ئاشکرا ئەبن بۆ پرسیار و حیسابی خوا ﴿فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ﴾ ئینجا بێ دەسەلاّت و ژێر دەستەکان ئەڵێن بە زۆردار و خۆ بەزل زانەکان: ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعًا﴾ بەڕاستی ئێمە لە دنیادا ژێر دەستە و شوێن کەوتوو بووین بۆ ئێوە، واتە شوێن ئێوە کەوتین لە ئایین و بیرو باوەڕدا ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ﴾ دەی ئایا ئێوە بەرگری هیچ شتێ لە سزای خوا ئەکەن لە ئێمە؟ لە وەلاّم دا سەرۆکەکان ﴿قَالُواْ﴾ ئەڵێن: ﴿لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡ﴾ ئەگەر خوا ڕێنموونی ئێمەی بکردایە و ئێمەی بخستایەتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئێمەش ئێوەمان ئەخستە سەر ڕێگەی ڕاست. لە وەلاّمەکەیانەوە بێزاری و تەنگەتاوی دەرئەکەوێ، واتە تەشەر و لۆمەمان لێ مەدەن، ئێمە و ئێوە وەك یەکمان بەسەر هاتووە و ئەوانە لەو کاتەدا دان ئەنێن بە دەسەلاّتی خوادا و ئەیانەوێ بەوە خۆیان ڕزگار بکەن لە تەشەر و لۆمەی ژێر دەستەکان، بەلاّم هیچکام ڕزگار نابن لە لۆمە و تەشەر. ژێر دەستەکان ڕزگار نابن، چونکە کاتی خۆی دەستیان هەڵگرت لە پیاوەتی و ئادەمێتی خۆیان و وازیان هێنا لە ئازادی و سەربەستی یەکەیان، ئەوان بوون بەهۆی یاخی بوونی سەرۆکەکان، ئەگەر ئەوان کە زۆر و کۆمەڵ بوون نەبوونایە بەژێر دەستە و خزمەتکار، سەرۆکەکانی خۆیان لێ نەئەگۆڕا و یاخی نەئەبوون، سەرۆکەکانیش بەو وتەی کە گوتیان ڕزگار نابن، چونکە ئاشکرایە کە خوا فەرمانی نەداوە بە گومڕایی و کاری بەد، بەڵکو خەڵکی بە مەیل و خواستی خۆیان ئەکەوتنە سەر ڕێگەی بەد و گومڕایی.

سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ
وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ
فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّۖ
إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٢﴾

---

**ئینجا ئەڵێن: ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا﴾ یەکسانە لەسەرمان و بۆمان ئایا بێزاری و غەمباری دەربڕین یان خۆگری و ئارامی دەربڕین، واتە هیچکام سودی نییە بۆمان و تازە کارمان لە کارەکا ترازاوە ﴿مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ﴾ نییە بۆمان هیچ لادان و راکردن و رزگار بوون لەو سزایەی کە تێی کەوتووین، ئینجا لەوێدا شەیتان دێتە کایە و وتە و قسەیەك ئەکات کە زۆر دڵتەزێنە و کاریگەرە لە دڵی هەمووان دا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ﴾ کاتێ کە دوایی ئەهێنرێ بەکارو بڕیار بەم جۆرە بەهەشتی و دۆزەخی یەکان دەست ئەکەن بە تەشەر و جوێندان و نەفرین کردن لە شەیتان کە بوو بەهۆی بەد بەختی و سزادانیان. لەو کاتەدا شەیتان ئەڵێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ﴾ بێگومان خوا بەڵێنی پێدان بە بەڵێنێکی هەق و راست و راست لەگەڵ کردن ﴿وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡ﴾ منیش بەڵێنم پێدان بە درۆ کە گوتم زیندوو بوونەوە نییە و سزا و ئازار دان نابێ. ئینجا من درۆم لەگەڵ کردن ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ﴾ هیچ زۆر و دەسەڵاتێك نەبوو بۆ من بەسەرتاندا ﴿إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِي﴾ بەڵکو من بانگم کردن بۆ گومڕایی و ئینجا ئێوەش گوێ رایەڵ بوون و بە گوێتان کردم ﴿فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم﴾ کەواتە لۆمەی من مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ﴾ بەڕاستی نە من بە هاوارەوە چوو و رزگار کەری ئێوەم و نە ئێوەش بە هاوارەوە چوو و رزگار کەری منن ﴿إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُ﴾ بەڕاستی من بڕوام نییە و دان نانێم بە گێڕانی من بە هاوبەش بۆ خوا کە ئێوە لە پێشەوە و لە دنیادا کردتان ! بەم رەنگە منتان ئەپەرست و گوێ رایەڵی من بوون و منتان بە دۆست و کاربەدەستی خۆتان دائەنا، واتە من بەریم لە ئێوە و لە کردەوەتان ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بەڕاستی بۆ ستەم کارە بێ بڕواکان سزایەکی سەخت و ئازار دەر هەیە، ئەم رستەیە ئەگونجێ وتەی شەیتان بێت و کۆتایی قسەکانی خۆی پێ بێنێ بۆ دڵ تەزاندنی بێ بڕواکان کە لە دنیادا شوێنی کەوتن و گوێ رایەڵی یان کرد. هەرچۆنێ دەست ئەدات کە فەرمودەی خوا بێت و بەدوای قسەکانی شەیتان دا هاتبێت.**

وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ
رَبِّهِمْ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ
أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا

---

ئینجا بەرامبەر ئەو سیاچارە و بەد بەختانە ئەفەرموێ: ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ئەخرێنە ناو بەهەشتانێ کە رووبارەکان دێن و ئەچن بە ژێریاندا، ئەخرێنە ناو ئەو بەهەشتانە بە جۆرێ هەمیشەیی و ئێجگاری ئەبن تیایاندا. ئەخرێنە ناویان ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بە ئیزن و فەرمانی پەروەردگاریان لەکاتێکدا ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ بەخێر هاتن و ڕێزگرتنیان لەو بەهەشتانەدا بە وتەی سەلامە، سەلام کردنیان لە نێوان یەکدا. سەلام کردنی مەلائیکە لێیان، یان سەلامی خوا لێیان. خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو بەهرەیەدا. لەپاش ئەوەی دەست نیشانی کرد بۆ حاڵ و باری سیاچارە و بەش بڕاوان و حاڵ و باری خۆش بەخت و بەهرەمەندان. لەپاش ئەوە ئینجا دوو وێنە و چیرۆك ئەهێنێ بۆ وتە و بیر و باوەڕی ئەو دوو دەستەیە، رووی فەرمودە ئەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) یان هەرکەسێك کە دەست بدات بۆ زانین، ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ﴾ ئایا نەتزانیوە ﴿كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا﴾ چۆن خوا وێنە و چیرۆکێك باس ئەکات ﴿كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾ واتە وێنەی وتە و وشەیەکی پاك و خاوێنی هێناوەتەوە بە درەختێکی پاك و خاوێن کە: ﴿أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ بێخەکەی دامەزراو بێت لە زەویدا و ریشەکەی کۆتایی و سەر و لق و پەل بەرز بووبێتەوە بە حەوادا، لە کاتێکدا ﴿ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ بەرو میوەکەی بدات بە ئیزن و فەرمانی پەروەردگاری لە هەموو کاتێکدا.

(ئیبن و عەباس) و جەماوەری زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: مەبەست بەو وتە و وشەیە وتەی ﴿لا إله إلا الله﴾ یە، مەبەست بەو درەختە درەختی خورمایە بەلای(ئیبن و عەباس و ئیبن و مەسعود و ئەنەس و مجاهد و عیکریمە و ضحاك) ەوە – خوا لێیان رازی بێت –.

وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ
خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾

**ئینجا دەست نیشان ئەکات بەهۆی ئەم وێنە و چیرۆکەئەفەرموێ: ﴿وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ خـوا وێنـە و چـیرۆکەکان بـاس ئـەکات بـۆ خـەڵکی بـەڵکو بـیر بکەنەوە، واتە خوا وێنە و چیرۆکێ باس ئەکات، چونکە وێنە و چیرۆك هۆی روونکردنـەوە و تێگەیشتن و بیر کردنەوە و وەرگرتنی پەند و ئامۆژگارییە.**

**ئینجا وێنە و چیرۆکی بەد بەخت و سیاچارەکان باس ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ﴾ وێنـە و چـیرۆکی وتـە و وشـەی بـەد و پـیس وەك وتـەی بـێ بڕوایـی و هاوبـەش رەوادان بـە وێنـەی بـە وێنـەی درەختێکـی بـەد و پیسە وەك درەخـتی گوژاڵکـە کـە ﴿ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ﴾ هەڵکـەنرا بـێ و لـە ریـشە هێنرابـێ لەسـەر زەوییـەوە. واتـە ریـشەی نەکوتابێ لە زەویدا، بەڵکو وەك بەسەر زەوییەوە بێت، کەواتە ﴿مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ جێگیر بوون و مانەوە و دامەزراندنی نییە، بەڕاستی وێنە و چیرۆکەکە زۆر شیرین و راست و رەوایە، ئەوەتا وتەی هەق چونکە ریشەی کوتاوە لـە بوونـەوەردا و دامـەزراوە، هـیچ شـتێك کاری لێناکات و هەر ئەمێنێتەوە، بەرو بەرهەمی ئەو هـەموو کردارو و رەوشتە پاك و خاوێنەیە کە هەمیشە هەیە و تەواو نابێت، بە پێچەوانەی ئەو وتەی ناڕاست و دامەزراو نییە و بەڵکو هەر جارێ لە وێنـە و پۆشـاکێکدا دێـت و دەرئەکـەوێ و لەپاشـدا ئـەڕوا و نـامێنێ و دامـەزراو و جێگـری بوونی نییە. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چارەنوس و دوا رۆژی خاوەنی هـەردوو وتەکە، دەربـارەی خـاوەنی وتـە پـاك و خاوێنەکـە ئەفـەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە دامەزراو و جێگیریان ئەکات بەو وتە دامـەزراوە ﴿فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾**

لەم ژیانە نزیکەدا لەم دنیادا، بەم ڕەنگە دەست ئەگرن بەو وتە پاکەوە و ناگۆڕێن بەهۆی سزا و ئازار دان و هەرشتیٚ کە هۆی گۆڕان و لادانە ﴿وَفِي ٱلْأَخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی دواییشدا لەکاتی زیندوو کردنەوە و حیساب و پرسیاردا، یان لە کاتی پرسیار لێکردن لە گۆڕدا وەك لە حەدیسدا هاتووە. دەربارەی خاوەنی وتە پیسەکە ئەفەرمویٚ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خوا بیٚ بڕوا ستەمکارەکان گومڕا و ون و دانەمەزراو ئەکات، واتە بەهۆی وتە دانەمەزراوەکەیان ﴿وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ خوا مەیلی هەرچی بکات و بیەویٚ ئەیکات. کەواتە هیچ ڕەخنەیەك نییە لەسەر خوا لە هەر کارو کردەوەیەك کە ئەیکات، چونکە هەرچی خوا مەیلی بکات و ئەیکات هەر ئەوە هەق و ڕاستە. لە چەند شوێنێکدا باسکرا کە بەندە مەیل و هەڵبژاردنی هەیە و ناچار نییە و مەیل و ئیرادەی خوا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا. خوا لە ئەزەل دا زانا و ئاگادار بووە بە مەیل و کردەوەی بەندە و بە پێی ئەو مەیل و بڕیاری خوا هاتووە و دەرچووە.

لەسەرەتای ئەم سورەتەوە دەست نیشانی کرد بۆ چاکە و بەهرەی خوا بەسەر خەڵکی یەوە بەناردنی ئەم پەیام و نامە و پێغەمبەرە(ﷺ) ئینجا بەدوای ئەوەدا باسی پەیامی موسای کرد و چاکە و بەهرەی خوای بیر خستەوە لەناردنی ئەو پەیام و پێغەمبەرەدا، ئینجا بە کورتی دەست نیشانی کرد بۆ هەموو پەیامەکان و هەڵوێستی بیٚ بڕواکان و ئینجا لەناو چوونیان بەهۆی یاخی بوونیان لە فەرمانی خوا و سپڵەیی یان بەرامبەر چاکە و بەهرەکانی خوا. ئینجا ئەوا لێرەدا دێتە سەر باسی بیٚ بڕواکان و سپڵەکانی ئەم ئوممەتە کە خوا ئەو چاکە و بەهرەیانەی ڕشت بەسەریاندا بە ناردنی ئەم ئاین و پێغەمبەرە(ﷺ)، بانگی کردن بۆ ئەوەی لێیان ببوریٚ، کەچی سپڵەیی یان بەکار هێنا و یاخی بوون، بیٚ بڕوایی یان هەڵبژارد بۆ خۆیان تا دووچاری دەردی خۆیان بوون، سەرنج ڕائەکێشیٚ و سەر سوڕ ئەهێنیٚ لەو هەڵوێستە بەدەیان.

۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ
وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ

---

**ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا﴾ ئایا سەرنجت نەداوە و ئاوڕێکت نەدایەوە بۆ لای ئەوانەی کە چاکە و بەهرەی خوایان گۆڕییەوە بە سپڵەیی و بێ بڕوایی. واتە لەباتی بڕوا هێنان و سوپاس و چاولەبەریی بۆ خوا سپڵەیی و بێ بڕوایی یان بەکار هێنا ﴿وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ﴾ گەل و کۆمەڵەکەی خۆیانیان خستە ناو ماڵ و جێگەی نەمان و لەناوچوون. ئەو جێ و شوێنەش کە بریتییە لە﴿ جَهَنَّمَ﴾ دۆزەخ لە کاتێکدا ﴿يَصْلَوْنَهَا﴾ ئەچنە ناوی بەجۆرێ بە تەواوی پێی ئەسوتێنرێن لە ڕۆژی دواییدا ﴿وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾ دۆزەخ قەرارگا و جێی نیشتەجێ یەکی زۆر بەدە، ئەو خستنە ناو ئاگرە کە لە ڕۆژی دواییدا بەدی دێت قورئان وای نیشان ئەدات کە بەدی هاتووە، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿احلوا﴾کە بۆ رابوردووە.**

**١- لەبەر ئەوەی هۆی تێخستنەکە لە رابوردوودا بەدی هاتووە.**

**٢- هەواڵەکە ئەوەندە راستە وەك بەدی هاتبێ و ئێستا بە چاوەوە بێت و سەرنجی بۆ رابکێشرێ و دەست نیشانی بۆ بکرێ.**

**ئەو بێ بڕوایانە چاکە و نیعمەتی ناردنی پێغەمبەر و بانگەوازەکەیان گۆڕی یەوە بە یاخی بوون و بێ بڕوایی، بانگکردنەکەی کە بۆ پەرستنی خوا بوو بە تاك و تەنها وەریان نەگرت ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ چەند وێنە و هاوبەشێکیان بڕیاردا بۆ خوا بۆ ئەوەی خەڵکی گومڕا بکەن و لایان دەن لە ڕێگەی خوا. ئایەتەکە وان نیشان ئەدات کە سەرۆك و گەورەکانی قورەیش بە دەستی ئەنقەست خەڵکی لابدەن لەو بیرو باوەڕە پاکە و بیان گێڕن بە بت پەرست، لەبەر ئەوەی بیرو باوەڕی تاك و تەنهایی دژی دەسەڵات و بەرژەوەندی ئەو یاخی یانەیە کە ئەیانەوێ خۆیان بکەن بە پەرستراو و گوێ رایەڵ کراوی ژێر دەستەکان و گێڕانیان بە بەندەی ئەڵقە لە گوێ.**

قُل تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا يُقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا مِمَّا
رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ
لِتَجْرِيَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾

---

ئەو یاخی یانە لە هەموو کات و چەرخێکدا ئەوە نیاز و مەبەستیانە. کەواتە ئەوانە با بترسن لەم ترساندن و هەڕەشە سەخت و دڵتەزێنە کە فەرمانیدا پێغەمبەر(ﷺ) ئاراستەیان بکات: ﴿قُل تَمَتَّعُوا﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: رابوێرن. بە ئارەزووی خۆتان ئەم ماوە کەم و کورتەی ئەم دنیایە تا کاتی دیاریکراو ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ ئینجا بێگومان گەڕانەوە و چارەنوستان هەر بۆلای ئاگرە. واز لەوانە بێنە و گوێ یان مەدەرێ ﴿قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ بڵێ بەو بەندانەی من کە بڕوایان هێناوە ﴿يُقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ﴾ با بە رێکی نوێژ بەجێ بێنن ﴿وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ بەخت بکەن و بیدەن لەوەی کە کردوومانە بە رۆزی یان بە نهێنی و بە ئاشکرا ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾ لەپێش ئەوەی رۆژێك بێت کە نە کڕین و فرۆشتن و فیداکاری تێدایە و نە خزمایەتی و خۆشەویستی و دۆستایەتی کە بەهۆی ئەوەوە رزگار بوون ببێ لە سزا و ئاگری دۆزەخ. واتە بێ بڕوایان رزگار نابن لە سزای ئەو رۆژە نە بە کڕینی خۆیان بەهەر شتێ، وە نە بەهۆی هیچ دۆست و خزم و خۆشەویستێك کە تکایان بۆ بکات. ئینجا لەم کاتەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەو هەموو نازو نیعمەت و چاکە و بەهرەی کە خوا لەم بوونەوەرەدا دروستی کردوون بۆ ئەو خەڵکە لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی ئەوان سپڵەن و سوپاسی ناکەن، ئەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ خوا کەسێکە کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ باراندوویەتی لە ئاسمان و لای ژوورەوە ئاوێك ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە دەری هێناوە بۆتان لە رزق و رۆزی و لە میوەجات و بەر و میوە، ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ﴾ ژێر باری کردووە بۆتان کەشتی بۆ ئەوەی بگەڕێ بە دەریادا بە فەرمانی خوا ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ﴾ ژێر باری کردووە بۆتان جۆگە و رووبارەکان کە بیان گێڕن بە ئارەزووی خۆتان،

وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا
سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ وَإِذْ قَالَ
إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾

---

**﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ﴾ ژێر باری کردووە بۆتان خۆرو مانگ بەجۆرێ هەمیشەیین لەبەجێهێنانی کارو فرمانی خۆیان بۆ بەرژەوەندیتان﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ ژێر باری کردووە بۆتان شەو و رۆژ کە دێن بەدوای یەکدا، ئەو چاکە و نیعمەتانە کە باسکران کە خوا رشتوونی بەسەر بەندەکانیدا بە بێ داوا و ئاگای خۆیان، بێجگە لەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ پێی بەخشیون هێندێ لە هەموو ئەوانە کە داواتان کردووە لە خوا﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ﴾ ئەگەر نیعمەتی خوا بژمێرن بۆتان ناژمێررێ. خوای پەروەردگار ئەو هەموو چاکەی رشتووە بەسەر ئەم ئادەمییەدا لەگەڵ ئەوەدا وێنە و بڕیار ئەدات بۆ خوا و سوپاسی ناکات لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ بەڕاستی ئادەمی، واتە بێ بڕواکان زۆر ستەمکار و سپڵەن، ستەم کارە لەخۆی و لە نیعمەت و چاکەکانی خوا بە سپڵەیی و دان نەنان پێیان و بە سوپاس کردنی غەیری خوا. خوای میهرەبان بەو جۆرە ئەو چاکە و بەهرەیانەی خستە بەرچاو و بێگومان هەرکەس بیر لەوانە بکاتەوە ئەگەر بە تەواوی دڵ مردوو نەبێ ئەبێ بێدار ببنەوە و بە سۆز و پەرۆشەوە بکەوێتە یاد و سوپاسی ئەو خوایە. جا لێرەدا باسی(ابراهیم) دێنێ کە نموونەیەکی تێرو تەواو بووە بۆ بەندەی خواناسی سوپاس گوزاری چاو لەبەری خوا، هێندێ لە نزاو لاڵەکانی ئەهێنێ کە سەرانسەر مایەی خۆش بەختی و بەهرەمەندی یە بۆ رۆڵە و نەوەکانی لەپاش خۆی کە هێندێ لەوانە قورەیشە و دانیشتوانی مەککە، کەواتە ئەبێ ئەمان یەکەم کەس بن بۆ بڕوا هێنان و گوێ رایەڵی و سوپاس گوزاری، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم بە نزا و پاڕانەوە وتی: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا﴾ ئەی**

پەروەردگارم ئەم وڵات و شارە بگێڕە بە خاوەن ئارامی و ئاسایش و بێ باك و مەترسی. لە سورەتی(البقرة) دا فەرموی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنًا﴾ ئەی پەروەردگارم ئەمە بگێڕە بە شارو وڵاتێکی خاوەن ئارامی و ئاسایش. ئەم دوو نزایە جیاوازن لەیەکتر. نزای سورەتی(البقرة) ئەوەیە: خوا بیخاتە ریزی وڵات و شارە بێ باکەکان. نزای ئێرە ئەمەیە کە ترس و بێ باکی یەکەی نەمێڵێ. هێندێ ئەفەرمون: نزای(البقرة) پێش ئەوەبوو کە کرابێ بە شار. نزای ئێرە لە پاش گێڕانی بووە بە شار. لەسەر ئەم رایە ئەبێ دووجار نزای کردبێ بۆ ئەو وڵاتە. لەسەر هەر بار خوای میهرەبان ئەو نزایەی وەرگرت و ئەو شارو وڵاتەی تا ئێستا پاراستووە لە وێران بوون و سام و ترس بەجۆرێ وێنەی نەبووە لە دنیادا. هەروەها ئەبێ تا کاتی تەواو بوونی ماوەیەك کە بۆی دیاریی کراوە و بێگومان حەزرەتی ئیبراهیم مەبەستی ئەوە نەبووە تا هەتا هەتایە بمێنێ بە ئارامی و ئاسایش، چونکە ئاشکرایە کە ئەم دونیایە نامێنێ، بە کورتی خوا ئارامی و ئاشتی داوە بەو شار و وڵاتە بە شێوەی گشتی ئیتر ئەگەر لە هێندێ کاتدا بێ ئارامی پەیدا بووبێ و لەپاشان نەما بێت و ئارامی هاتبێتەوە، ئەوە ناکرێ بە رەخنە و دژی مەبەستەکە نییە. لەپاش دوای ئارامی و بێ باکی، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ﴾ خۆم و رۆڵە و کوڕەکانم بپارێزە و دورخەرەوە لەوەی بتەکان بپەرستین. هەرچەندە ئیبراهیم پێغەمبەر بووە و خوا پاراستوویەتی لە گوناه، بەڵام بەندە تا خواناس تر بێت لەخواترس ترە و باشتر پەنا ئەبات بە خوا، زۆرجار پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) نزای کرد و ئەیفەرمو: ﴿یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك﴾ ئەی کەسێك کە دڵەکان وەرئەگێڕی دڵم دامەزرێنە لەسەر ئایینەکەت، عەرزیان کرد تۆ پێغەمبەری و خوا لێت بوردووە لە هەموو شت، لە وەڵامدا فەرموی: ﴿قلب المؤمن بین اصبعین من اصابع الرحمن﴾ دڵی بڕوادار لە نێوان دوو پەنجەدایە لە پەنجەکانی خوادا ﴿یقلبه کیف یشاء﴾ وەری ئەگێڕێ چۆن مەیلی ببێ. کەواتە پێویستە بەندە لە هەموو کارو بارێکی دا پەنا بەخوا ببات و داوای یارمەتی لێ بکات.

﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەی پەروەردگارم ئەو بتانە زۆر لە خەڵکی یان گومڕا کردوو و لایان دان لە ئایین و ڕێگەی ڕاست، واتە بوون بەهۆی ئەوە ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي﴾ ئینجا هەرکەس لە ڕۆڵەکانم پەیڕەوی منی کردبێ و شوێنم کەوێ لە خواپەرستیدا، بێگومان ئەو کەسە لە منە و بەشێکە لەمن ﴿وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرکەس سەرپێچی کردبێ لێم و پەیڕەوی نەکردبم ئەوا بێگومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی. واتە من هەقم نییە بەسەریەوە هەواڵەی تۆی ئەکەم و خۆت ئەزانی دڵە بەسۆز و بەزەیی دارەکەی باوکی پێغەمبەران – سەلام لە خۆی و کوڕەکانی بێت – هێشتا کۆتایی نەهێنا لەو سەرپێچی کەرانە و هەر میهرەبانی و بەزەیی لێ هەڵئەقوڵا، جا لێرەدا جێگای لێکۆڵینەوەو پرسیارە کە چۆن بەرامبەر بێ بڕوایان داوای لێبوردن ئەکات. لە وەڵامدا زانایان چەند شتێکیان فەرموە:

١- (سدی) ئەفەرموێ: بە مەرجێ تۆبەی کردبێ.

٢- (موقاتیل) ئەفەرموێ: مەبەست هەر گوناهێکە بێجگە لە هاوبەش ڕەوادان و بێ بڕوایی.

٣- (ئیبن و الأنباری) ئەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە ئەگەر خوا مەیلی ببێ و گوناهبارەکەش موسڵمان بێت.

٤- هێندێ ئەفەرمون ئەو داوایە پێش ئەوە بووە کە ئاگادار کرابێ بەوەی بێ باوەڕ و بت پەرست لێبوردنی بۆ نابێ و ئەوەش قەدەغە نییە پێش ئەو ئاگادار کردنە بە وێنەی داوا کردنی لێبوردن لە باوکی.

٥- مەبەستی ئەوەبووە کە خوا دەسەڵاتدارە بەسەر لێبوردندا بەم ڕەنگە بیگێڕێ بە بڕوادار.

٦- هێندێ تر ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە کاری ئەو کەسە حەواڵەی خوا ئەکات.

رَبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُ

---

ئینجا ئەڕوا لەسەر نزاکەی و ئەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ﴾ ئەی پەروەردگارمان ﴿إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ﴾ من هێندێ لە رۆڵە و نەوەکانم نیشتەجێ کرد لە دۆڵ و شیوێکدا کە خاوەنی شینایی کشتوکاڵ نییە و هەرگیز شینایی و کشتوکاڵی تێدا نەبووە ﴿عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ﴾ لای ماڵەکەت کە زۆر ڕێز گیراوە و بەهیچ جۆر دروست نییە بێ ڕێزی دەربارەی، یان قەدەغە کراوە و هەموو یاخی و سەرکێشی سام و بیمی لێکردووە، یان قەدەغە کراوە لە لافاو. بێگومان لەو کاتەدا ئەو ماڵە پیرۆزە نەبووە لەو شوێنەدا، کەواتە ناوبردنی بەماڵ یان بەپێی ئەوەیە کە خوا ماڵێکی بووبێ لەو شوێنەدا و خوا هەواڵی پێدابێ، یان بەپێی ئەوەیە کە زانینی خوا تێپەڕی کردووە بە بوونی ئەم ماڵە و هەواڵی دابێ بە ئیبراهیم و ئەمیش بە پێی ئەوە ناوی بردووە بەماڵ. ﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەی پەروەردگارمان لەبەر ئەوە ئەو رۆڵە و نەوەیانە بە ڕێك و ڕاستی نوێژ بەجێ بێنن، واتە هۆی نیشتەجێ کردنیان لەو شوێنەدا ئەوەیە کە نوێژ بەجێ بێنن لای ئەو ماڵەدا کە یەکەم مزگەوتێکە دانراوە بۆ ئادەمی و جێگەی حەج و عومرە کردنیان ئەبێ ﴿فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ ئینجا ئەی خوایە بگێڕە چەند دڵێك لە دڵانی ئادەمی بە جۆرێ مەیل و سۆزیان ببێ بۆلای ئەو نیشتەجێ کراوانە تا بێن بۆلایان، رۆزی یان بدە لە هەموو جۆرە بەرو میوەجات ﴿لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾ بەڵکو بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن و چاولەبەری ئەو چاکە و نیعمەتانە بن. ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُ﴾ ئەی پەروەردگارمان بێگومان تۆ ئەزانی و ئاگای بەهەرچی ئێمە ئەیشارینەوە و هەرچی دەری ئەبڕین و ئاشکرای ئەکەین،

وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ
إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۚ رَبَّنَا
وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾

---

**﴿وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ شاراوه نییه لەسەر خوا هیچ شتێ نە لە زەوی و نە لە ئاسمان. واتە لە نزا و پەرستنی خوادا دیمەن و روالەت بەس نییە و مەبەست نییە، بەڵکو ئەبێ بەڕاستی رووی دڵ بکرێتە خوا. ئینجا بیر لە چاکە و نیعمەتی خوا ئەکات بەسەری یەوە و بەهۆی ئەوەوە زمانی دەست ئەکات بە سوپاس و سەناوی خوا: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ﴾ هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایە کە ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم لە کاتی پیری و لەگەڵ نائومێدیم لە منداڵ، کە بەخشینی منداڵ لەو کاتەدا گرنگ تر و بەنرخ ترە، چونکە منداڵ درێژە دانە بە ژیانی باوک، دەی چەند خۆش و بە لەزەتە منداڵ لەو کاتی پیری یەدا کە کاتی هەستکردنە بە نەمان و کۆچکردن لەم دنیایەدا ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ بەڕاستی پەروەردگارم زۆر بیسەر و وەرگری نزایە.(ئیبن و عەباس) – خوا لێیان رازی بێت – ئەفەرموێ: ئیسماعیلی پێ بەخشی لە تەمەنی نەوەد و نۆ ساڵیدا، ئیسحاقی پێ بەخشی لە تەمەنی سەد و دوازدە ساڵیدا، کەواتە کۆ کردنەوەیان لەم نزایەدا ئەبێ لەکاتێکدا بووبێ کە ئیسحاقیشی پێ بەخشرابێ یان مژدەی پێدرابێ بە بوونی و مژدە دانی خوا بەهەر شتێ وەك بەدی هاتبێ وایە﴿رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾ ئەی پەروەردگارم من و هێندێ لە رۆڵە و نەوەکانم بگێڕە بە بەجێ هێنەری نوێژ بە رێك و پێکی و هەمیشەیی ﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ﴾ ئەی پەروەردگارمان نزاکەم وەرگرە، فەرموێ: هێندێ لە نەوەکانی بێ بڕوا ئەبن و نوێژ بەجێ ناهێنن، ئینجا نزاکانی دوایی هێنا بەم نزایە: ﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ﴾ ئەی پەروەردگارمان ببورە لە من و لەباوکم و لەدایکم و لە هەموو بڕواداران، گوناهو تاوانمان بسڕەوە لە رۆژێکدا کە حیساب و پرسیار دێت و بەرپا ئەبێ، واتە رۆژی دوایی.**

وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٖ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهۡطِعِينَ مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ ﴿٤٤﴾

---

**ئینجا کۆتایی باس و سورەتەکە ئەهێنێ بەوەی چەند شێوەیەکی سەخت و سامناك ئەخاتە بەرچاو کە دووچاری ستەمکارە بێ بڕواکان ئەبێ لە ڕۆژی دواییدا. بێگومان بەوە دڵنەوایی بڕواداران ئەکات وەك هەڕەشەیەکی دڵتەزێن ئاراستەی بێ بڕوا ستەمکارەکان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعۡمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ﴾ خوا دامەنێ بە بێ ئاگا لەوەی کە ستەمکارەکان ئەیکەن، ئەگەر ئەم فەرمودەیە ئاراستەی پێغەمبەر کرابێ ئەوا مەبەست بەهێز کردنی دڵی یەتی لەسەر بڕوا بە ئاگاداری خوا. واتە بە هەمیشەیی بەردەوام بە لەسەر بڕوات بە ئاگاداری خوا بەسەر هەموو شتێکدا، وێنەی ئەوە زۆرە لە قورئاندا: وەك ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، ﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ هەروەها ئەگەر ئاراستەیی هەر یەکە یەکە کرابێ لە بڕواداران. چونکە هیچ بڕوادارێك ئەو گومانەی نییە. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست هەر جاڕدان و ئاگادار کردنەوەیە بەوەی خوا تۆڵەیان لێ ئەسێنێ و ڕەفتاریان لەگەڵ ناکات بە وێنەی کەسێك کە بێ ئاگا بێت. واتە مەبەست هەڕەشە کردن و ترساندنیانە، ئەو بێ بڕوا ستەمکارانە بە دیمەن و بە ڕواڵەت لەم دنیایەدا بە خۆشی و بێ باك ژیان ئەبەنە سەر، بەڵام قوتار نابن و لە دەستی قودرەتی خوا دەرناچن، بەڵکو ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٖ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ هەر بۆ ڕۆژێك دوای خستوون کە چاوەکان لەو ڕۆژەدا حەوارە ئەبن و نانووقێن. واتە لەو ڕۆژەدا لەبەر سام و بیم و سەرگەردانی چاو هەبڵەق ئەبێت، لە کاتێکدا ﴿مُهۡطِعِينَ﴾ بە چەسپانی ئەڕۆن بە دەم بانگ کەریانەوە. واتە لەگەڵ هەبڵەق بوون و سەرگەردانیدا بە**

چەسپانی ئەچن بەدەم بانگ کەریانەوە و شوێنی ئەکەون بە بێ وەستان ﴿مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ﴾ چاویان ناگەڕێتەوە بۆلای خۆیان و لەسام و بیم دا هەبڵەق و سەرنجی خۆیان نادەن﴿وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ﴾ دڵەکانیان بۆش و بێ هۆش و گۆشن،(قتادة) ئەفەرموێ: دڵەکانیان بەرز ئەبێتەوە بۆلای گەروویان و نە دەرئەچن، نە ئەگەڕێتەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.(سەعیدی کوڕی جوبەیر) ئەفەرموێ: دڵەکانیان هاتوچۆ ئەکات و جێگیر نابێ لە شوێنی خۆیاندا، بە کورتی لەو ڕۆژەدا چاو هەبڵەقە و دڵ جێگای خۆی نامێنێ و روو بەرز بووەتەوە بەرەو ئاسمان و دڵ بێ هۆش و گۆشە لە سام و بیم و ترسدا، خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات. ئەمە بوو ئەو ڕۆژەی کە ئەوانە دوا ئەخرێن بۆی، ئەمەبوو ئەو ڕۆژەی کە چاوەڕوانیان ئەکات لەپاش مۆڵەت دانیان لەم دنیایەدا. کەواتە بترسێن بەمەی کە لەو ڕۆژەداهیچ عوزرو بەهانەیەك نامێنێ بۆ ئەوانە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ ئەی پێغەمبەر خەڵکی بترسێنە لە ڕۆژێك کە سزایان بۆ دێت ﴿فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە لە خۆیان لە دونیادا بە گوناهو تاوان و بێ بڕوایی ئەڵێن ﴿رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ﴾ ئەی پەروەردگارمان دوامان بخە تا ماوەیەکی کەم، واتە بمانگێڕەوەبۆ دنیا و مۆڵەتمان بدە بۆ ماوەیەکی کەم کە گوێ رایەڵی بانگ و بانگەوازەکەی تۆی تێدا بکەین و شوێنی فروستادەکانت بکەوین. لە وەڵامی داوا و پاڕانەوەکەیاندا ئەگوترێ پێیان: ﴿أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ﴾ ئایا لە پێشەوە سوێندتان نەدەخوارد کە گۆڕان و گواستنەوەو دەرچوونتان نییە لەو بار و حاڵەی کە وان لەسەری واتە لەپاش مردن ژیان و دنیایەکی ترتان نابێ. ئایا داوای ئەو دواخستن و گەڕانەوە ئەکەن لە کاتێکدا کە ئەو سوێندەتان ئەخوارد، واتە وەڵام ئەدرێنەوە بە دەم کوت کردن و لەکەدار کردن و بیرخستنەوەی قوسوریان لە دنیادا،

وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾

---

**﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ نیشتەجێ بوون لە جێ و شوێن و ماواکانی ئەوانەی کە ستەمیانکرد لە خۆیان﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ﴾ بە روونی دەرکەوت بۆتان کە چۆنمان کرد بەوانە، دەرکەوت بۆتان بە بینین و بیستن هەواڵیان، چەند وێنە و چیرۆکمان باسکرد و بۆمان هێنانەوە، واتە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە لەگەڵ ئەوەدا ئێوە سوێندی واتان ئەخوارد ! ﴿ وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ ﴾ بێگومان ئەوانە واتە ئەو ستەم کارانەی کە ئێوە نیشتەجێ بوون لە شوێن و جێگاکانیان وەك زۆربە ئەفەرمون، یان بێ بڕواکانی قورەیش وەك هێندێ ئەفەرمون. ئەوانە پیلانیانکرد دەربارەی پێغەمبەرەکانیان، یان دەربارەی پێغەمبەرو بڕواداران. پیلانیانکرد بە پیلانە گەورەکەی خۆیان کە هێز و توانای خۆیانیان تێدا بەخت کرد ﴿وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ﴾ واتە وەڵامی خوایە تۆڵەی پیلانەکەیان یان پیلانەکەیان نوسراوە و ئامادەیە لای خوا و خوا پەکی ئەخات و نایهێڵێ ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ ئیتر هەرچەند پیلانەکەیان بەدی هاتبێ و کرابێ بۆ ئەوەی کە شاخەکانی پێ بترازێ و لە شوێنەکانی خۆیان نەمێنن، واتە ئەوەندە بەتین و بەهێز بێت کە رەق تر و بەتین تری پێ بڕوا و نەمێنێ وەك شاخەکان کە وێنە و چیرۆکن لە هێز و دامەزراویدا، هەرچەندە پیلانەکەیان تا ئەو رادە بەهێز و بەتین بێت یاخی نییە لە دەسەڵات و هێزی خوا و دەسەڵاتی خوا زاڵە بەسەریدا و دەوری داوە. لەسەر ئەم بارە وتەی(إن) پێی ئەگوترێ:(غائية) و هێندێ ئەفەرمون(نافية) یە، لەسەر ئەم رایە واتە ئەوانە پیلانی بەتین و بەهێزی خۆیان کرد، پیلانەکەیان لەوانە نییە و لاواز ترە لەوەی کە شاخەکانی پێ هەڵکەنرێن و لە شوێنەکاندا نەمێنن. واتە ئایەتەکان و شەریعەتەکەی خوا کە وەك شاخەکان وان لە بەهێزی و دامەزراویدا،**

فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ
ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى
ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا
كَسَبَتْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ
وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٥٢﴾

---

**﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ﴾ کەواتە خوا دانەنێن بە تێکدەر و بەدی نەهێنەری بەڵێنێ کە داویەتی بە فروستادەکانی کە بەڵێنی زاڵ بوون و سەرکەوتنی وتە و ئایینەکەی پێداون﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ بەڕاستی خوا زاڵی خاوەن تۆڵەیە لە دوژمنانی بۆ دۆستەکانی﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەوییە ئەگۆڕێ بە زەوییەکی تر جیاواز لەم زەوییە، ئاسمانەکانیش ئەگۆڕێن بە ئاسمانانێکی تر جیاواز لەم ئاسمانانە کە ناسراون. ئیتر ئەو گۆڕاندنە بە گۆڕاندنی شێوە و وێنە و سیفەتەکانیان، یان بە گۆڕینی خۆیشیان بە هەرکام ئێمە نازانین چۆنییەتی یەکەی و باوەڕمان پێی هەیە بەهەر جۆر مەبەست بێت ﴿وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ هەموو دێنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان لەبەر فەرمان و حیساب و پرسیاری خوای تاك و تەنهای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا، زاڵ بەسەر هەر شتێکدا کە مەیلی ببێ ﴿وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ تاوانبارەکان ئەبینی لەو ڕۆژەدا بە بەستراوی و جوت کراوی لەشیان پێکەوە، یان لەگەڵ شەیتانەکاندا، یان بە جوت کراوی و بەستراوی دەست و قاچیان لەناو کۆت و زنجیرەکاندا. بە هەر جۆر و لەسەر هەر بار ئەو شێوەیە ئێجگار ئازار دەر و ڕیسوا کەرە خوا پەنامان بدات لێی، لەکاتێك دا ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ﴾ کراس و پۆشاکەکانیان لە قەترانە کە شتێکی ڕەش و بۆگەن و سوتێنەرە و ڕاکێشەرو هەڵگیرسێنەری ئاگرە، قەتران لەم دنیایەدا ڕۆن و پیوێکی پیسە کە حوشتری گەڕی پێ ئەمەنوون تا گەڕۆلی یەکەی بسوتێنێ. جا ئەبێ قەترانی ڕۆژی دوایی چۆن بێت؟ خوا پەنامان بدات ﴿وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ﴾ گڕو بڵێسەی ئاگر ڕوو و دەم و چاوەکانیان داگیر ئەکات و دای ئەپۆشێ وەك پەردەیەك بهێنرێ بەسەریاندا.**

خوای داد پەروەر ئەوەیان بەسەر دێنێ تا هەرکەس لەوان بکات بە تۆڵە و بەرهەمی کردەوەی خۆی وەك ئەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ واتە بۆ ئەوەی خوا تۆڵە و پاداشتی هەموو کەسێکی تاوانبار بدات بەوەی کە کردوویەتی لە دنیادا، یان هەموو کەسێك لە چاك و خراپ، چونکە کاتێ تۆڵە و سزای تاوانباران بداتەوە لەبەر تاوان و خراپەکانیان، بێگومان چاکان و پاکانیش ئەگەیەنێ بە بەرهەمی کردەوەی خۆیان لەبەر چاکی و پاکی یەکەیان. ئەگونجێ ئەم رستەیە پەیوەست بێت بە وتەی ﴿بر زوا﴾ واتە هەمووان دێنە دەرەوە لە گۆڕەکانیان تا خوا پاداشت و تۆڵەی هەموو کەس بداتەوە بە پێی کردەوەی خۆیان. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ بەڕاستی خوا حیساب و پرسیاری چەسپانە. بەڵێ خوا دەسەڵاتدارە بەسەر حیساب و پرسیاری هەمووان لە کەمترین کاتدا، چونکە هیچ شتێ خوا خەریك ناکات لە هیچ شتێك. ئنیجا کۆتایی سورەتەکە ئەهێنێ بە وێنەی ئەوەی دەستی پێکرد لە سەرەتاکەیدا. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی و جیاواز ئەفەرموێ: ﴿هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەم قورئانە راگەیاندنە بۆ هەموو ئادەمی و ئامۆژگاری تێدایە بۆیان ﴿وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ﴾ واتە راگەیاندنە بۆیان بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری بکرێن، بۆ ئەوەی بترسێنرێن پێی ﴿وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ بۆ ئەوەی بزانن کە خوا هەر تەنها خوایەکە، واتە ئایەتەکانی بکەن بە رابەر و بەڵگە لەسەر ئەو تاك و تەنهاییە ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ بۆ ئەوەی خاوەن ژیریی یە پاك و خاوێنەکان بیر بکەنەوە و پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.

ئەمەیە یاسا و بناغەی ئاییني خوا کە بەرنامەی ژیانی لەسەر دائەمەزرێ، بێگومان مەبەست تەنها زانین نییە، بەڵکو مەبەست پێکهێنان و دامەزراندنی ژیانە لەسەر ئەو بناغە و بنەڕەتە، ماتوڵ هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خوا، ئیتر ئەبێ ملکەچی و گوێ رایەڵی هەر بۆ ئەو بێ... ئەبێ هەر ئەو حاکم و کاربەدەست و دانەری یاسا و شەرع بێت. بەرپا کردنی ژیان لەسەر ئەو یاسا و بناغەیە جیاوازی یەکی تێرو تەواوی هەیە لەگەڵ هەر ژیانێك کە بەرپا بووبێ لەسەر بناغەیەکی تر، کە بێجگە لەوە رەوادانی پەرستنی شتێکی ترە، بێجگە لەخوای تاك و تەنها. جیاواز لە بڕوا و بۆچووندا، لە خورەوشتدا، لەکار و باری رامیاری و ئابوری و کۆمەڵایەتی و هەموو ناوچە و بەشێك لە بەشەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵ، ئەو بت پەرستییەی کە(ئیبراهیمی خەلیل) داوای لە خوا کرد کە خۆی و کوڕ و نەوەکانی بپارێزێ لێی، تەنها ئەو شێوە سادە نییە کە عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا خەریك بوون پێیەوە و

بەجێیان ئەهێنا، هەروەها نەفامانی تر لەهەر چەرخ و سەردەمێکدا، هەرچۆنێ ئەو شێوە سادەیە بریتییە لە هەموو شێوەکانی بت پەرستی و هاوبەش ڕەوادان بۆ خوا. بەڵکو پێویستە بە قوڵی مەسەلەکە بگیرێ، هەرچۆنێ پێویستە بە قوڵی بتەکان بناسین و کورتی هەڵنەهێنین لەو دارو بەرد و مانگ و خۆر و هەموو شتەکانی تردا کە لە سەردەم و چەرخە نەفامییەکاندا ئەپەرستران و ئەپەرسترێن. ئەو هاوبەش ڕەوادانەی کە دژ و پێچەوانەی وشەی ﴿لا إله إلا الله﴾ یە هەموو حاڵ و بارێك ئەگرێتەوە کە ملکەچی و گوێ ڕایەڵی تەنها بۆ خوا نەکرێ لە هەموو بار و ڕوویەکەوە، تەنها بەرنامە و یاسای خوای تێدا نەکرێ بە بەرنامە لە هەموو بار و ڕوویەکی ژیانەوە، کەواتە لەهەرکات و لەهەر وڵاتێکدا هەر شیعار و ئاڵایەك بەرز بکرێتەوە بێجگە لە شیعار و ئاڵای خوا بێگومان ئەوە بت پەرستییە و دژ و پێچەوانەی وتەی پیرۆزی ﴿لا إله إلا الله﴾ یە. هەرکاتێ شیعار و ئاڵای نەتەوایەتی یان نیشتمانی، یان گەلی یان هەر شتێکی تر وێنەی ئەوانە بەرز بکرێتەوە، تێکۆشان و فیداکاری یان بۆ بکرێ بە جۆرێ گوێ نەدرێ بەوەی ئەو شیعار و ئاڵایە دژی شەریعەتی خوابێ یان نا، ئەگەر دژ بوو هەر لایەنی ئەو شیعار و ئاڵایە بگیرێ بێگومان ئەوە بت پەرستییە و ناگونجێ لەگەڵ خواپەرستیدا، هەرچەند ئەو کەسەی کە ئەو ئاڵایە بەرز ئەکاتەوە خۆی بەخوا پەرست و موسڵمان دابنێ و نوێژ و ڕۆژو و عیبادەت بۆ خوا بەجێ بێنێ بە ڕواڵەت. ئیسلام نەهاتووە بۆ تەنها نەهێشتن و ڕووخاندنی ئەو دار و بەرد و بتە سادانە، ئەو هەموو سزا و مەینەت و تێکۆشان و فیداکاری یە کە پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان پێی هەڵسان تەنها بۆ ئەوە نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە فەرمانبەری و ملکەچی و گوێ ڕایەڵی تەنها بۆ خوا بێت لە هەموو کارو باری ژیاندا. ئەو کەسانەی کە ئەم بۆچوون و بڕوایان نەبێ و لەگەڵ ئەوەدا خۆیان بە موسڵمان دابنێن پێویستە لەسەریان کە بزانن دوورن لە ئیسلامەوە و ئەبێ بگەڕێنەوە لەو بیر و باوەڕو بۆچوونە پووچەوە بۆ لای ئیسلام و ملکەچی تەنها بۆ خوا و پەیڕەوی تەنها بۆ خوا و ئایینی خوا.

لەڕۆژی ١٤١٢/٦/٢٢ بە یارمەتی خوا لێ بوومەوە لە تەفسیری ئەم سورەتە و بە یارمەتی خوا دەست ئەکەم بە تەفسیری(الحجر) خوا بە میهرەبانی خۆی لێم وەرگرێ و ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکات و سوود بەخشی بکات، آمین.

**وصلى الله وسلم على سيد القادة و قائد السادة محمد وعلى آله و صحبه**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾

## سورەتی (الحجر)
## مەککەیی یە و (٩٩) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتە پێنج گەردش و خولانەوە ئەکات بە دڵ و دەروون، هەرکام بۆ مەبەستێکی تایبەتی و هەموویان ئەخولێنەوە بە دەوری یەك شتدا کە گەیاندن و ئاشکرا کردنی چارەنوس و پاشە رۆژێکی سامناکە کە روو ئەکاتە بێ بڕواکان.

بەشی یەکەم و گەردشی یەکەم لەبارەی باو و رەوشتی خوایە، سەبارەت بە پەیام و ئایینی خوا و بڕوا پێهێنان و بێ بڕوایی پێی.

دووەم لەبارەی هێندێ لە رابەر و ئایەتەکانی خوایە کە لەم بوونەوەرەدا خوای پەروەردگار دایناوە و ئەو کار دروستییەی کە بەکاری هێناوە.

سێ یەم مەسەلەی ئەم ئادەمی و ئادەمێتی یە نیشان ئەدات.

چوارەم باسی لەناوچون و نەمانی گەلە رابوردووەکان ئەکات.

پێنجەم باسی ئەو راستی و کاردروستی یە ئەکات کە لەم بونەوەرەدایە و کۆتایی دێت بە هاتنی رۆژی دوایی و پاداشت و تۆڵەی ئەو رۆژە.

وەك بۆمان دەرئەکەوێ لە ئایەتەکاندا، لە یەکەم جارەوە ئاماژە ئەکات بە گەورەیی و گرنگی ئایەتەکان و روونی و ئاشکراییان، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * الر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ﴾ واتە ئەم ئایەتە گرنگانەی کە لەم سورەتەدان و پێکهاتوون لە وێنەی ئەم پیتانە، ئایەتی نامەیەکی تێرو تەواوە کە شایستە ترینی هەموو نامەیەکە، ئایەتی قورئانێکی نایابی روون و رەوانن و روونکەرەوەی هەق و ناهەقن. ئینجا بە نهێنی هەڕەشەیەك ئاراستە ئەکات و هان ئەدات لەسەر بڕوا هێنان و زایە نەکردنی هەل و هەڵکەوتی بڕوا هێنان کە لەم کاتی دنیادا لە دەستایە،

رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ
فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَا أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤﴾ مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا
وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ ﴿٥﴾ وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا
بِالْمَلَائِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ وَمَا كَانُوا إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە زۆر جار پێیان خۆشە و ئاوات ئەخوازن کە کاشکێ موسڵمان بوونایە. واتە ئەگەر کەسانێك بن ئەمڕۆ بڕوا نەهێنن بەم نامە گرنگە، بێگومان رۆژێك دێت کە پەشیمان ئەبنەوە و ئاوات ئەخوازن کە کاشکێ بڕوایان بهێنایە، ئیتر ئەو کاتە کاتی مردن و دیتنی سزا بێت کاتی هاتنی بەسەرهات و رووداوەکانی رۆژی دوایی بێت، یان کاتی هاتنە دەرەوەی گوناهباران لە دۆزەخ و مانەوەی بێ بڕواکان. لەسەر هەر بار ئاواتەکەیان بەدی نایە و مەگەر هەر هەناسەی سارد و داخی سەخت بخۆن، هێندێ ئەفەرمون: وتەی ﴿رب﴾ بۆ گەیاندنی کەمێتی نەك زۆری، واتە ئەوەندە رۆژەکە سەخت و سامناکە بێ هۆش و بێ ئاگا ئەبن لە هەموو شتێ، ئەگەر جار بەجارێك هۆشێك بکەنەوە ئەو ئاواتە ئەخوازن. بەم جۆرەش چاکە و ئەگونجێ، خوا خۆی باشتر ئەزانێ. ئینجا هەڕەشەیەکی تریان ئاراستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ﴾ ئەی پێغەمبەر لێیان گەڕێ و وازیان لێ بێنە و نائومێد مەبە لێیان با بخۆن و رابوێرن و ئومێدی مانەوە و تەمەن درێژیی و گەیشتن بە ئامانج بێ ئاگا و خەریکیان بکات لە بڕوا هێنان و گوێ رایەڵی. ئەم ئادەمی یە خاڵی نییە لە ئومێد و ئاواتی شتێ کە پێی خۆشە و هەموو جۆرێکی بەد و خراپ نییە، بەڵکو ئەوەی کە بەد و خراپە ئەو جۆرەیە کە زیادە رەوی تێدا بکات تا ئەو رادەی خەریکی بکات لە خوا و قەزا و قەدەر و**

مردن و رۆژی دوایی، کە ئەم جۆرە بەد و کوشندەیە لێرەدا مەبەستە. وەك خواردن و رابواردنیش دوو جۆریان هەیە، بەد و کوشندەکەیان ئەم جۆرەیە کە شێوە و دیمەنێکی ناژەڵی ئەکات بە بەری ئادەمیدا تا ئەو رادەی هەموو مەبەست و ئامانجی ئەوەیە سکی تێر بکات و هەمیشە بیری وا بەلای ئەوەوە، ئەم جۆرانەیە کە هۆی ئەم هەڕەشە سامناکەیە کە ئەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئینجا بێگومان لەمەوپاش ئەزانن، ئەزانن چیتان بەسەر دێت، ئەزانن بەدیی و خراپی کردەوەکانیان، بەلأم لە کاتێکدا ئەزانن کە بێ سوودە و کەڵکی نابێ، بێگومان باوی خوا ناگۆڕێ، لەناوچوونی گەلان بەستراوە بە ئەجەل و ماوەیەك کە خوا بڕیاری داوە بۆیان، بەستراوە بەو کردەوەو رەوشتەی خۆیان کە بە پێی ئەوە باوەکەی خوا بەدی دێت، ئەو ئەجەل و ماوەیە نە دوا ئەکەوێ و نە پێش ئەکەوێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ﴾ هیچ شار و دێ یەکمان لەناو نەبردووە و لە ریشەمان نەهێناوە مەگەر لەکاتێکدا کە نامە و ئەجەل و ماوەیەکی زانراوی بووە و نوسراوە لای خوا، ﴿ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ هیچ ئوممەت و گەلێك پێش ناکەوێ لە ئەجەل و ماوەکەی و دواش ناکەون، کەواتە هەڵنەخەڵەتێن بە نەهاتنی سزا و دواکەوتنی کات و ماوەیەکی کەم، ئەو ئەجەل و ماوەیە خوا داویەتی بە ولأت و گەلەکان، تا دەرکەوێ چی ئەکەن و کردەوەیان چۆنە، بە پێی ئەو کردەوەی ئەوانە بڕیاری خوا بەدی دێت، ئینجا باسی بێ شەرمی و بێ ئەدەبی ئەو بێ بڕوایانە ئەکات دەربارەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە کە ئەم قورئانەی بۆ هێنان، کە تەمێ و ئامۆژگاری یان ئەکات و بێداری یان ئەکاتەوە، لەو شتانەی کە بێ ئاگایان ئەکات، ئەیان ترسێنێ بە باو و رەوشتی خوا، کەچی ئەوانە لەبەر نەفامی خۆیان لاقرتی ئەکەن و بێ شەرمی ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ﴾ ئەو بێ بڕوا و نەفامانە گوتیان و ئەڵێن: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ ئەی کەسێك کە پەند و ئامۆژگاری

هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەری بەڕاستی و بێگومان تۆ شێتیت، ناوبردنی ئەم قورئانە بە پەند و ئامۆژگاری لەلایەن ئەو بێ بڕوایانەوە بە شێوەی لاقرتییە وەك دانانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بە شێت و ئەوپەڕی بێ شەرمی و نەفامی یان ئاشکرا ئەکات، چونکە هەموو کەسێك کە ئاسیبێتی زانیویەتی کە ژیرترینی هەمووانە و لە پێش پێغەمبەرێتیدا ناو برا بە﴿محمد الأمين﴾، هەروەها ئەمەش کە گوتیان: ﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّـٰدِقِينَ ﴾ با مەلائیکەمان بۆ بێنی کە شایەتی بۆ بدات کە تۆ پێغەمبەری لەلایەن خواوە، ئەگەر تۆ لە راستگۆیانیت و راست ئەکەیت کە لاف پێغەمبەرێتی لێ ئەدەیت، ئەم وتە و داواشیان نیشانەی لارە جڵەوی نەفامی یانەیە و مەبەستیان هەر بڕو بیانووی رووت بووە، ئەگینا ئەگەر مەلائیکەش بهاتایە هەر کۆڵیان نەئەدا و پەڵپێکی تری بێ جێیان ئەگرت. بەرامبەر ئەو لاقرتی و بێ شەرمی و نەفامی ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿ مَا نُنَزِّلُ الْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ ئێمە مەلائیکە ناهێنینە خوارەوە مەگەر بە جۆرێ راست و رەوا و کاردروستی تێدا بێت، یان مەگەر بەهۆی شتێکی هەق و راست کە سزادان و لەناوبردنی بێ بڕوایانە و کاتی مردنیان ﴿ وَمَا كَانُوٓا إِذًا مُّنظَرِينَ ﴾ ئەو کاتەش ئەوانە مۆڵەت دراو نابن و نەئەبوون بە مۆڵەت دراو، واتە ئەگەر لەسەر داوا و پەڵپی ئەوان مەلائیکە بێتە خوارەوە ئەبێ دەست بەجێ بڕوا بێنن ئەگینا لەناو ئەبرێن، کەواتە ئەو مۆڵەتەی کە بوویان نامێنێ. یان مەلائیکە ناهێنینە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەران مەگەر لەبەر سزادان و لەناوبردنی بێ بڕواکانی گەلەکەی لە کاتی تەواو بوونی ئەجەل و ماوەی دیاریی کراویان، لەو کاتەدا نە مۆڵەتدان و نە دوا خستن نامێنێ. ئەوانە داوای مەلائیکە یان ئەکرد و هاتنی مەلائیکەش بەو جۆرە مەترسی تێدا بوو و سوود بەخش نەئەبوو بۆیان. ئەوەی کە چاك و سوود بەخش بوو خوا بۆی هێنایە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە،

إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم
مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ
وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾

---

**کەواتە با بیر بکەنەوە و ڕێنموونی پێ وەرگرن وەك وەرنەگیریێ لەم فەرموودەیەوە کە ئەفەرمویێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە پەند و ئامۆژگاریمان هێنایە خوارەوە، واتە ئەم قورئانە، بەڕاستی ئێمە پارێزەرین بۆی و ئەیپارێزین لەهەر دەستکاری و گۆڕین و گۆڕاندن. کەواتە چاکتر بۆ ئەوان دەستگرتن و رووکردنیانە بۆ ئەو قورئانە. خوا باشترینی داناوە بۆ ئەوان لەوەی کە ئەوان ئەیانەویێ بۆ خۆیان، بێجگە لەوەش دەم کوتی ئەو بێ شەرمانەی کرد کە ئەیان گوت تۆ شێتی، ئینجا دڵێ ئەوایی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەکات و ئەفەرمویێ: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ سوێند بەخوا رەوانەمان کردووە چەند فروستادە لەپێش تۆ لەناو تاقمەکانی پێشووی رابوردوودا ﴿ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ هیچ نێرراو و فروستادەیەکیان بۆ نەهاتووە مەگەر گاڵتە و لاقرتی یان پێکردووە، واتە تەنها گاڵتە و لاقرتی بە تۆ نەکراوە، بەڵکو بە هەموو فروستادەکانی پێش تۆیش کراوە ﴿ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ واتە هەرچۆنێ بێ بڕواییمان بردووەتە دڵی بێ بڕواکانی پێش تۆ، هەروەها بێ بڕوایی ئەخەینە ناو دڵەکانی ئەم تاوانبارانە ﴿ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ﴾ لە کاتێکدا بڕوا ناهێنن پێی، واتە بەخوا یان بەم ئامۆژگارییە ﴿وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ بێگومان رۆیشت و تێپەڕی کرد باوی خوا لە پێشووەکاندا بە سزا دان و لەناوبردنیان. واتە ئەمانیش ئەگەر بڕوا نەهێنن، وێنەی رووداو و بەسەرهاتی ئەوانیان بەسەر دێت. هۆی بڕوا نەهێنانی ئەمانە ئەوە نییە کە بەڵگە و رابەری بڕوا هێنانیان نییە، بەڵکو هەر سەرکێش و یاخین تا ئەو رادەی ئەگەر بەچاوی خۆیان بەڵگە و نیشانەی بەهێز ببینن هەر دانی پێدا نانێن وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرمویێ: ﴿ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەگەر قاپی یەکمان لەسەر بکردنایەتەوە لە ئاسمانەوە ﴿فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ﴾ ئینجا بە رۆژی رووناك بەرز ببنەوە تێیدا،**

لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا
لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ
﴿١٨﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾

---

﴿لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا﴾ بێگومان ئەیان وت: ئێمە هەر چەواشە لێکراوین و چاومان بەستراوە بەهۆی ئەوەوە نابینین و ئەوەی کە بە بینینی دائەنێن هەر خەیاڵی رووتە ﴿بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ بەڵکو ئێمە کۆمەڵ و گەلێکین جادو لێکراو و جادوومان لێکراوە، واتە محمد جادوی لێکردووین و جادوبازی سەری لێ تێکداوین. ئینجا ئاماژە بۆ چەند رابەر و بەڵگەی روون و ئاشکرا کە ئەو یاخی و سەرکێشانە بیریان لێناکەنەوە و رێگەی راست نادەنە بەر. ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا﴾ بێگومان گێرامان و دروستمانکردووە چەند بورجێك لە ئاسماندا، واتە چەند ئەستێرەیەکی گەورە. یان چەند کۆشك و قەسرێك کە پاسەوانی وا بەسەرەوە یان چەند مەنزڵێك کە بۆ مانگ و خۆر دانراوە لە گەردش و خولانەوەکەیان دا ئەمێننەوە و ئەیان بڕن لەماوەی هەموو ساڵێکدا، یان مەنزڵی ئەستێرەکان، یان ئەستێرەی ئەو مەنزڵانە، یان ئەو دوانزە بورجەی کە بۆ خۆرە و لەماوەی ساڵدا ئەیان بڕێ، بەو جۆرانە تەفسیر کراوەتەوە و بە هەرکام شایەتن لەسەر دەسەڵاتی خوا وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ﴾ ئاسمانمان رازاندووەتەوەو ئارایشتمان کرد بۆ سەرنج دەران. ﴿وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ﴾ پاراستوومانە لە هەموو شەیتانێکی نەفرین لێکراو یان رەجم کراو و لێدراو و دەرکراو واتە لەگەڵ رازاندنەوە و ئارایش کردنندا پاکی و پارێزگاری هەیە لە هەموو شەیتانێك، کەواتە دەستیان پێ ناگات و پیس و چەپەڵی ناکەن و رێگەیان نییە خراپەکاری تێدا بکەن و خەڵکی لادەن لە رێی راست و گومڕا کردن، چونکە هەر بۆ ئەم

زەوییە دانراوە و کار و کردەوەی بەدی هەر بۆ دانیشتوانی ئەم زەوییەیە و بەرگری کراوە لە ئاسمان، مەگەر بە هەوڵدانێك کە هەموو جارێ هەوڵ ئەدات و بەرپەرچ ئەدرێتەوە و رێی لێ ئەگیرێ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ ﴾ واتە پاراستوومانە لە هەموو شەیتانێك، مەگەر کەسێك لەوان کە بە چەسپانی بیستراوی وەرگرێ ﴿فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ ئینجا ئەویش دەست بەجێ پارچە ئاگرێکی روون و ئاشکرا دوای ئەکەوێ و پێی ئەگات و لێی ئەدات. ئینجا ئایا شەیتان چییە و چۆنە و چۆن ئەیەوێ گوێ بگرێ و بیستراو لە مەلائیکە وەرگرێ؟ ئەمانە هەموو شتێکی غەیب و نهێنین و رێگە نییە بۆ ئێمە قسەی لێ بکەین، مەگەر لە دەقی حەدیسێك کە سەحیح بێت. بەڕاستی هیچ سوودێك نییە لە خۆ خەریککردن بەو جۆرە شتانەوە، چونکە ئەو جۆرە شتانە لەبارەی عەقیدە و بیرو باوەڕەوە هیچ شتێکی بە نرخ و مەبەست زیاد ناکەن، هیچ بەرهەمێکیان نییە جگە لە خۆ خەریك کردن و ژیریی ماندوو کردن و پەك خستنی لەکارو کردەوەی راستەقینەی خۆی. کەواتە لێرەدا با هەر ئەمە بزانین کە شەیتان رێگەی نییە دەستکاری و خراپەکاری بکات لەم ئاسمانە پاك و شیرینەدا.ئینجا دێتە سەر بەڵگەیەکی تر، دێتە سەر باسی زەوی ئەو شتە گرنگانەی کە خوا لەم زەوییەدا داینـاوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا ﴾ زەویمان راخستووە ﴿وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ﴾ دامان ناوە لەزەویدا چەند شاخی بەهێزی دامەزراو تا سەر لەنگەرە نەکات وەك لە چەند شوێنێکی تردا ئەفەرموێ. ﴿وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ﴾ رواندومانە و سەوزمان کردووە تیایدا لە هەموو شتێکی زانراو و دیاریکراو لەلایەن خواوە، یان ئەندازەی دیاریکراو لای خوا. ئە هەموو درەخت و بەرو میوەجاتە بەخۆی و هەمو بەش و پارچە و کەرەسەکانیانەوە زانراو و دیاریکراون و پێکهێنراون و تێکەڵ کراون لە رادە و ئەندازەیەکی دیارییدا !

وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾

---

﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ﴾ گێڕاومانە بۆتان لە زەویدا خۆراك و پێ بژێوی ژیانتان ﴿وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ﴾ گێڕاومانە ئەوانەی کە ئێوە ڕۆزی دەریان نین، وەك خێزان و ژێر دەستە و وڵاخ و ماڵات و پەلەوەر و هەموو شتەکانی تر کە بەخێویان ئەکن و بە ڕواڵەت ئێوە خاوەن و ڕۆزی دەریانن و لە ڕاستیدا بەس خوا ڕۆزی دەریانە، یان گێڕاومانە بۆتان و ئەوانەش هۆی ژیان ﴿وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ﴾ هیچ شتێك نییە مەگەر لای ئێمەیە و لە ژێر دەسەڵات و تەسەڕوفی ئێمەدایە هەموو کان و خەزنەکانی، واتە هەر شتێ کە بەندەیانم سوودی لێ وەرگرن و بەکاری بێنن ئێمە توانایین بەسەریدا و بەسەر بەخشینیدا، ﴿وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ نایهێنینە خوارەوە و نایبەخشین مەگەر بە ئەندازەیەکی زانراوی دیارییکراو بە پێی لێزانی و کاردروستی خۆمان ﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ﴾ بایەکمان ناردووە و ئەینێرین بە هەڵگری ئاو و ئاوس بە هەور و باران ﴿فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ﴾ بەهۆی ئەوەوە باراندمان لەلای سەرووەوە ئاو و بەهۆی ئاوەوە ئاوداشتمان کردوون و ئاومان دەرخوارد داون ﴿وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ﴾ ئێوە نین بە خەزن کەر و دەسەڵاتدار بەسەر ئەو ئاوەدا. واتە بەڵکو ئێمە دەسەڵاتدارین بەسەریداو ئەو ئاوە یەکێکە لەو هەموو شتانەی کە ئێمە دەسەڵاتدارین بەسەریدا. هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بە وتەی ﴿لواقح﴾ ﴿ملقحات﴾ە واتە پێوەن کەر. بەڵام هەرچەند با ئەو کارەش بکات و لەزمانی کوردیشدا ئەو جۆرە بایە هەیە و ناو براوە بە بای دار ئاوس. هەرچەند ئەوەش هەیە، بەڵام لێرەدا دوورە لە شێوەی ئایەتەکە کە ئەفەرموێ: ﴿فانزلنا من السماء﴾ هیچ دەست نیشانێکی تێدا نییە بۆ ئەو مەبەستە، کەواتە با نەیبڕین بەسەر ئەوەدا،

وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا
ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ
مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ

---

﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ﴾ بەڕاستی هەر ئێمە گیان ئەدەین بە گیاندار و زیندەوەران. ئێمە زیندەوەران ئەمرێنین و گیانیان لێ ئەسێنین ﴿وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾ هەر ئێمە کەلەپور بەرین بۆ هەموو کەس و ئەمێنینەوە لەپاش هەموو کەس، ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾ ئەم دوو وتەیە بە چەند جۆر تەفسیر کراوەتەوە، ئەوەی کە دڵ جێگیر بێت لەسەری ئەمەیە: سوێند بەخوا زانیومانە ئەوانەتان کە پێش تۆ کەوتوون لە هاتنە دنیا و ژیاندا، و ئەوانەتان کە دوا کەوتوون، یان ئەوانەتان کە لە پێشەوە مردوون و ئەمرن، و ئەوانەتان کە دواکەوتوون و دوا ئەکەون لە مردندا. ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْۚ﴾ بێگومان پەروەردگارت هەر ئەو کۆیان ئەکاتەوە بە زیندوویی ﴿إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی ئەو پەروەردگارە کار دروست و زانایە بە هەموو شتێ و بە پێی ئەوە بۆ هەموو کەس و هەموو ئوممەتێك ماوەو ئەجەلی دیارییکردووە، ئەزانێ کەی ئەمرێ و کەی زیندوو ئەکرێتەوە و هەموو کارو بارو ڕووداوەکانی تریش. خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەدا هەموو شت و هەموو کاروباری گێڕایەوە بۆلای خۆی، تەنانەت ئەو شتانەش کە بە دیمەن و ڕواڵەت لەو شتانەن کە سادە و ئاسایین و لە بەندەوە ئەناسرێن و ئەبینرێن.

ئینجا دێتە سەر باس و داستانی هەرە گەورەی ئادەمیزاد، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ بێگومان ئادەمیمان دروستکرد لە قوڕێکی وشك بووەوەی ڕەق وەك سواڵەت کە کاتێ تەقەی لێ بدرێ دەنگ ئەداتەوە، کە ئەو قوڕە ڕەقەش پەیدا بووە لە قوڕێکی ڕەشی ترشاو کە بۆنی کردبێ. ئەم باس و داستانە لە چەند شوێنێکدا لە قورئاندا هاتووە و دووجار لە پێش ئەم سورەتەوە هاتووە یەکەم لە سورەتی(البقرة) دا و دووەم لە سورەتی(الأعراف) دا، لە هەر شوێنێکدا بە شێوەیەکی جیاواز و بەشێوەیەك هاتووە کە پەیوەندی بە مەبەستی ئەو شوێنەوە هەیە، بۆ وێنە لە سورەتی(البقرة) دا باسەکە باسی

جێنشینی ئادەمە لەم زەویدا کە هەرچی وا تێیدا بۆ ئەم ئینسانە دروستکراوە. لەبەر ئەوە لەوێدا لە داستانەکەدا بەشێك دەست نیشان ئەکات کە هۆی گێڕانییەتی بە جێنشین، ئینجا باسی سوژدەی مەلائیکە بۆ ئادەم و سەرپێچی شەیتان لە سوژدە بردن، باسی نیشتەجێ کردنی ئادەم و هاوسەرەکەی ئەکات لەبەهەشتدا، و فریو دانی شەیتان بۆیان تا دەرکران لە بەهەشت و نیشتەجێ کران لەم زەوییەدا بۆ جێنشینی و هەڵسانی بە کار و فرمانی جێنشینی یەکەی. لە سورەتی(الأعراف) دا باس و مەبەستەکە ئەو کۆچ و کاروانەیە کە ئادەمی پێی هەڵسا لە بەهەشتەوە بۆ زەوی و ئینجا لە زەوییەوە بۆ بەهەشت، ئاشکرا کردنی دوژمنایەتی شەیتان هەر لە یەکەم جارەوە بۆ ئەم ئادەمییە تا لە سەرەنجامدا ئادەمی بوون بە دوو بەشەوە: بەشێك ئەگەڕێنەوە ئەو بەهەشتەی کە شەیتان باوك و دایکی هەمووانی لێدەرکرد. لەبەرئەوەی دوژمنایەتی یانکرد لەگەڵ ئەو شەیتانە، بەشێك بەرەو ئاگر ئەڕوات، چونکە شوێنی شەیتان کەوت، جا لەبەر ئەوە لەباس و داستانەکەدا بەشێك نیشان ئەدات کە پەیوەستە بەو باس و مەبەستەوە، لەم سورەتەدا مەبەستی سەرەکی و گرنگ دەرخستنی هۆی دروستکردنی ئەم ئادەمییەیە بەم جۆر و شێوە تایبەتییە کە دەست ئەدات بۆ ڕێنموونی و گومڕایی، جا لەبەر ئەوە لە داستانەکەدا ئەو شتانە ئەهێنێ کە پەیوەندییان بەو مەبەستەوە بەتین و بەهێز بێت. ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر ئایەتەکە کە لە یەکەم جارەوە باسی دروستکردنی ئادەمی کرد لەو قوڕەی کە باسکرا.

ئینجا باسی دروستکردنی تیرەی(جن) ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾(جان) مان دروستکرد لە پێش ئادەمدا لە ئاگرێکی گەرمی زۆر بەتین کە ئەچێت بەناو لەشدا لەو کونە وردیلانەدا کە بەچاو نابینرێن، ئیتر(جان) بریتی بێت لە باوکی تیرەی(جن) وەك ئادەم باوکی تیرەی ئادەمییە، وەك(ئیبن و عەباس) – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەفەرموێ. یان بریتییە لە شەیتان وەك(قتادة) ئەفەرموێ. لەسەر ئەم دوو ڕایە تیرەی شەیتان و(جن) یەکن و هێندێ ئەفەرمون جیاوازن، لەسەر هەر ڕاو بارێك دەرکەوت کە سروشتی ئەم دوو تیرە جیاوازە، لەمەوپاش باسی ئەوە ئەکات ئەوەی کە ئادەمی لێ دروستکرا بەشێکی تری تێکەڵ بوو کە ئەو ڕۆحەیە، بەڵام سروشتی شەیتان هەر لەسەر باری خۆی ماوەتەوە و بەش و پارچەی تری تێکەڵ نەبوو ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی کاتێ بکە کە پەروەردگارت فەرمووی بە مەلائیکە:

إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ
سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ
﴿٣١﴾ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن
صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ

---

**﴿إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ﴾ بەڕاستی من دروست ئەكەم بەشەرێك، گیان لەبەرێك كە پێستی بە دەرەوەیە و دانەپۆشراوە بە موو، لە قوڕێكی ڕەشی ڕەق كە لە قوڕێكی ترشاوی بۆن كردوو ﴿فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ ئینجا كاتێ ڕێك و پێكم كرد و شێوە و وێنەكەم تەواوكرد تا ئامادەبوو بۆ ئەوەی گیانی بكەم بە بەردا و فوم پێدا كرد لەو ڕۆحەی كە پیرۆزو تایبەتی یە بە خۆمەوە، دانانی ڕۆح بە هێنی خۆی لەبەر ڕێز و نرخ پێدانە بە وێنەی ﴿بیت الله، ناقة الله﴾ كاتێ ئەو دروستكراوەم بەو جۆرە لێكرد ﴿فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ بكەون بە ڕوودا بۆی بە سوژدەوە و سوژدەی بۆ بەرن بە سوژدەی ڕێز گرتن و قەدر پێدان نەك پەرستن ﴿فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ * إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ ئینجا ئەوانیش هەموو پێكەوە سوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس كە بریتییە لە شەیتان، یان بەڵام ئیبلیس ﴿أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ سەرپێچی كرد لەوەی لەگەڵ سوژدە بەرەكان بێت. بێگومان ئیبلیس لە تیرەی مەلائیكە نییە، كەواتە یان بە(تغلیب) ناوبراوە بە مەلائیكە، چونكە لەناویاندا بووە و ماوەیەكی زۆر هاوڕێیەتی كردوون، لەسەر ئەو بارە پێی ئەگوترێ:(مستثنی متصل) واتە دەركراوێكە كە لەوانە. بەڵام بە تەغلیبەكە بریتییە لە باودان و زاڵ كردنی هێندێ بەسەر هێندێكی تردا تا ڕادەیەك ناو و سیفەتی زاڵ كراوەكە بەكار بهێنرێ بۆ ئەوی تر كە ئەوەش باوە و زۆرە لە زمانی عەرەبدا. وەك(ابوین) كە بەكارهێنراوە بۆ(اب و ام)، یان(قمرین) بەكار**

هێنراوە بۆ(شمس و قمر) وە هەروەها. یان ئەڵێن: موستەسنای مونقەتیعە وەك دەست نیشانم کرد بۆ ئەوە کە لە یەکەم جاردا تەفسیرم کردەوە بە بێجگە. وە لە دووەمدا گوتم: بەڵام ئیبلیس. ئینجا ئایا خوا کەی ئەو فەرمودەیانەی ئاراستە کرد؟ یان لە کوێ فەرموی یان چۆن فەرموی؟ ئەو جۆرە پرسیارانە هیچ وەڵامێکیان نییە لای ئێمە، چونکە شتێکی غەیبین و دەقی ئایەت و حەدیسێکی سەحیح نییە بە دەستمانەوە، کەواتە لێ یان بێدەنگ ئەبین و حەواڵەی زانینی خوایان ئەکەین، هەروەها چۆنێتی دروستکردنی ئینسان لەو قوڕەی کە باسکراوە چۆنێتی گیان بەبەردا کردنی و بەرز بوونەوەی ئەو قوڕە بە رادە و پلەی بەرزی ئەم گیان لەبەرە نایابە. ئەمانەش هەر لە توانای زانینی ئێمەدا نین و با هەر بڕوامان پێی ببێ و لێیان بێدەنگ ببین. ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ﴾ خوا ئەفەرموێ: ئەی ئیبلیس﴿مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ چییە بۆ تۆ و چ مەبەستێکت هەیە لەمەدا کە لەگەڵ سوژدە بەرەکان نیت و چی بەرگریت ئەکات لە سوژدە بردن؟ ﴿قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ﴾ ئیبلیس گوتی: من نەبووم بەوەی سوژدە بەرم و رەوایە لە منەوە سوژدە بەرم بۆ بەشەرێك کە دروستت کردووە لە قوڕێکی وشك کە پێکهاتووە لە قوڕە رەشەیەکی ترشاوی بۆن کردوو. واتە من لە ئادەم بەرز و پیرۆز ترم، خود پەسەندی و خۆ لێ گۆڕانی هەڵیخەڵەتاند و باسی بەشی قوڕێتی یەکەی کرد و باسی بەشە بەرز و بڵندەکەی ئادەمی نەکرد کە ئەو رۆحەیە خوا بە هێنی خۆی داینا، واتە من رەخنەم هەیە لەو فەرمان و بڕیاری تۆ، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ خوا پێی فەرمو: ﴿فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا﴾ کەواتە دەرچۆ لە بەهەشت یان لە ئاسمان یان لە ریزی مەلائیکە﴿فَإِنَّكَ رَجِيمٞ﴾ چونکە بەڕاستی تۆ دەرکراوی و دوور خراوەی لە بەزەیی و میهرەبانی خوا،

(٣٤) وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ (٣٥) قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (٣٦) قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ
ٱلْمُنظَرِينَ (٣٧) إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ (٣٨) قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ
وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (٣٩) إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ (٤٠) قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ
(٤١) إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ (٤٢) وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ
أَجْمَعِينَ (٤٣)

---

﴿ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ بەڕاستی نەفرینی خوات لەسەرە تا ڕۆژی دوایی. بێگومان کاتێ نەفرینی لەسەر بێت تا ئەو ڕۆژە ئیتر ئەبێ هەر لەسەری بێت هەتا هەتایە بەبێ دواهاتن و بڕانەوە، چونکە ئەم ژیانی دنیا کات و شوێنی گەڕانەوەیە بۆلای خوا و لێبوردنی خوا لەهەرکەس کە خوا مەیلی ببێ دەی کاتێ لەم دنیایەدا بێبەش بێت لەوە ئیتر هەر بێبەش ئەبێت. ئینجا لەوێدا شەیتان سروشتی بەدی هاتە جۆش لەبەر ئەوە داوای مۆڵەتی کرد لەخوا تا دنیا دنیایە، نەك بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەو تۆبە بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی تۆڵە بسێنێ لە ئادەم و نەوەکانی ئادەم بە گومڕا کردن و لادانیان لە ڕێگەی خوا تا ئەوانیش وەك خۆش بەش بڕاو بن لە بەزەیی خوا لەبەر ئەوە ﴿ قَالَ ﴾ شەیتان گوتی: ﴿رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ ئەی پەروەردگارم کەواتە مۆڵەتم بدە و دوام بخە تا ڕۆژێ کە هەمووان زیندوو ئەکرێنەوە. واتە ڕۆژی دوایی، ئیتر ئایا مەبەستی ئەوە بووبێ هەوڵی گومڕا کردن بدات تا دواترین کەس مابێت، یان مەبەست ئەوەبووبێت کە هەرگیز نامرێ، وەك هێندێ ئەفەرمون. چونکە نەمرێ تا ئەو ڕۆژە ئیتر هەرگیز نامرێ، چونکە پاش هاتنی ئەو ڕۆژە ئیتر مردن نامێنێ، لەبەر ئەوە ئایەتەکە نافەرموێ: تا ئەو ڕۆژە، بەڵکو ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ ﴾ خوا فەرمووی﴿فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ * إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ﴾ ئینجا بێگومان تۆ لە مۆڵەت دراوانی تا ڕۆژی کاتێکی زانراو لای خوا، چونکە ئەو ڕۆژە هەر خوا خۆی ئەیزانێ، هێندێ ئەفەرمون: ڕۆژی زیندوو کردنەوە و ڕۆژی دوایی و ڕۆژی کاتی زانراو هەر یەکن، بەهەرکام ئەگونجێ و

هەڵئەگریٚ و مەبەستەکەی شەیتان پێکدێت کە لێرەدا دەری ئەبڕیٚ کە: ﴿قَالَ﴾ گوتی: ﴿رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي﴾ ئەی خوای من سوێند بە گومڕا کردنی تۆ بۆ من ﴿لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ ئەڕازێنمەوە و شیرین ئەکەم بۆ ئادەم و نەوەکانی ئادەم گوناهو بێ بڕوایی و هانیان ئەدەم لەسەری لە زەویدا، هەموویان گومڕا ئەکەم مەگەر ئەو بەندەیانەت لەوان کە هەڵت بژاردوون و تایبەتیت کردوون بۆ پەرستنی خۆت. واتە من کە توانیم فێڵ بکەم لە ئادەم و خەڵەتاندم لە ئاسماندا، پاشان ئەتوانم نەوەکانی هەڵخەڵەتێنم لە زەویدا بێجگە لەوانەی کە تۆ تایبەتیت کردوون بۆ بەندەیی خۆت ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی بە شەیتان﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ﴾ ئەم ڕستەیە بە چەند جۆرێك تەفسیری کراوەتەوە، ئەوەیان کە لە دڵمدا جێگیر و بەهێزە ئەمەیە: ئەمە ڕێگەیەکی هەق و ڕاستە و پێویستە لەسەرم چاودێری بکەم و بەدی بێنم، ئەوەش ئەمەیە: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ بەڕاستی بەندەکانی من تۆ هیچ هێزو دەسەڵاتت نییە بەسەریاندا مەگەر ئەوانەی کە شوێنت کەوتبن کە ئەوانەن لایان داوە و گومڕان، واتە بەندەکانی من دوو بەشن، ئەوانەی کە گومڕا نین و شوێنی تۆ ناکەون تۆ هیچ دەسەڵاتت نییە بەسەریاندا و ناتوانی لە ڕێگەی من لایان دەیت، تۆ دەسەڵاتت هەر بەسەر ئەوانەیاندا هەیە کە شوێنت ئەکەون و گومڕان، لەسەر ئەم بارە ئەو شوێن کەوتوانە دەرکراوی(متصل) ن واتە لە کۆمەڵی بەندەکانی خوان و لە سیفەت و کردەوەدا جیان. بەم جۆرەش هەر ئەگونجیٚ و مەبەستەکە ئەگەیەنیٚ، بەڵام بە ڕاستی بەم جۆرە ڕێك ترە و لەگەڵ ڕواڵەتی هێندیٚ لەوێنەی ئەم ئایەتەدا گونجاو ترە کە بکرێن بە دەرکراوی(منقطع)، چونکە ئەو شوێن کەوتووانە لە ڕاستیدا بەندەی خوا نین، ئەو کاتە ئەڵێین: خوا فەرمووی: بەڕاستی بەندە تایبەتییەکانی من تۆ هیچ دەسەڵاتت بەسەریاندا نییە. بەڵام دەسەڵاتت هەر بەسەر ئەوانەدا هەیە کە گومڕان و شوێنت ئەکەون، دوا ڕۆژ و چارەنوسی ئەوانەش ئەمەیە کە ئەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بێگومان دۆزەخ بەڵێنگای ئەوانەیە بە تێکڕایی و هەموو، واتە دۆزەخ جێگای بەدی هاتنی سزای شەیتان و هەمو شوێن کەوتووەکانییەتی،

لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾
ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا
يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾
وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ
سَلَٰمٗا قَالَ إِنَّا مِنكُمۡ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾

---

**﴿لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ﴾ بۆ دۆزەخ هەیە حەوت قاپی ﴿لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ﴾ بۆ هەر قاپی یەك هەیە لەوانە بەشێكی دابەش كراوی دیاریكراو كە تێی ئەچن. واتە خوا شوێن كەوتووەكانی شەیتان ئەكات بە حەوت بەشەوە هەر بەشێك لەوان ئەچنە تەبەقێك لە حەوت تەبەقەكانی دۆزەخ. زانایان ئەفەرمون: تەبەقی یەكەمی بۆ ئەو گوناهبارانەیە كە بڕوایان بە تاك و تەنهایی خوا هەیە و ئەخرێنە ناوی تا بە ئەندازەی گوناهەكانیان سزا ئەدرێن و لەپاشان دەرئەهێنرێن، ئەو یەكەمە لەوانی تر سزای سووك ترە ن هەروەها دووەم لە سێ یەم تا ئەگاتە حەوتەم كە لە هەموو سەخت ترە و جێگەی ناپاكانە وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا﴾ ئینجا بە بۆنەی باسی دوا رۆژی گومڕاكان و بەرامبەر ئەوان دوا رۆژی بەندە پاك و تایبەتییەكانی خوا باس ئەكات و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ﴾ بەڕاستی خۆپارێز و لەخوا ترسەكان وان لە باخ و بەهەشت و چەشمە و كانیاوەكاندا پێیان ئەگوترێ: ﴿ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ﴾ بچنە ناویانەوە بە سەلامەتی لە مردن و هەموو ناخۆشی یەك، بە جۆرێ بە ئارامی و بێ باكی و بێ مەترسی لەهەر شتێك ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ﴾ دائەڕنین هەر كینە و بوغزێك كە لە دڵیاندا بووبێ دەربارەی یەكتر، هەر قین و دوژمنایەتی و حەسادەتێك﴿إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ لە كاتێكدا بران و بەسەر كورسی و تەختەوە روو بەرووی یەكترن. واتە ئەژین بە خۆشی و خۆش ویستن و لە**

کۆڕ و دانیشتندا ڕوویان لە یەکە کە ئەوەش شیرین تر کۆڕ و دانیشتن ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾ دووچاریان نابێ لەو بەهەشتانەدا هیچ نارەحەتی و ماندوویەتی، هەرگیز دەرکراو نین لەو بەهەشتەدا و بەڵکو هەمیشەیین بە بێ بڕانەوە و تێر و تەواون بە بێ کەم و کوڕی و بەهرەمەند و شادمانن هەتا هەتایە. خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو خۆشی بەهرەیەدا. آمین. لەپاش موژدەدان بەچاکان و پاکان و هەڕەشە کردن لە بەدان و بێ بڕوایان، ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەواڵی لێبوردن و میهرەبانی خوا ڕاگەیەنێ بە بەندەکانی لەگەڵ سەختی و بەتینی سزادانی، ئەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر من لێبوردەی میهرەبانم، ﴿ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الْأَلِيمُ ﴾ هەر سزای من سەخت و ئێش و ئازار دەرە، بەڵێ لێبوردن و میهرەبانی ڕاستەقینە هەر بۆ خوا هەیە و هەرچی لێبوردن و میهرەبانی تر هەیە هەمووی بەرهەمی لێبوردن و میهرەبانی خوایە. هەروەها سزای سەخت و بەتینی ڕاستەقینە هەر سزای خوایە و هەرچی سزای تر بووە و هەیە سەرجەم نموونە و بەرهەمی سزای خوایە، ئینجا چەند داستان و سەرگوزەشتەیەك ئەهێنێ کە نموونەی ئەو دوو هەواڵەی تێدایە. لە یەکەم جارەوە داستانی لوط و گەلە بەدەکەی ئەهێنێ کە لە سەرەتاکەیدا لێرەدا بەشێك لە داستانی ئیبراهیم – سەلامی خوایان لێ بێت – کە بەرهەمی میهرەبانی خوای تێدا ئاشکرایە، ئەفەرموێ: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴾ هەواڵیان پێبدە کە میوانەکانی ئیبراهیم،﴿إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا﴾ لەو کاتەدا ئەچوون بۆلای ئیبراهیم و ئینجا گوتیان پێی سەلامت لێ ئەکەین، ئینجا لەپاش وەڵام دانەوەیان ﴿قَالَ﴾ گوتی پێیان: ﴿إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە بیم و مەترسیمان هەیە لە ئێوە. هۆی مەترسی یەکەش ئەوە بوو نەیناسین و نەیزانی مەلائیکەن و گومانی برد کە خراپەکارن،

قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ
﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا
ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾
إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾

---

**ئەوانیش: ﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان پێی: ﴿لَا تَوْجَلْ﴾ مەترسە و مەترسی مەکە لێمان ﴿إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ﴾ بەڕاستی ئێمە موژدەت ئەدەینێ بە کوڕێکی زۆر زانا کە خوا پێت ئەبەخشێ، ئەویش: ﴿قَالَ﴾ گوتی پێیان بە سەرسوڕمانەوە: ﴿أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ﴾ ئایا مزگێنیم پێ ئەدەن و مزگێنیتان پێدام لەگەڵ ئەمەدا پیری دووچارم بووە ﴿فَبِمَ تُبَشِّرُونَ﴾ کەواتە بەچی موژدەم ئەدەنێ ﴿قَالُوا۟ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ﴾ گوتیان: موژدەمان داویتێ بە هەق و بە ڕاستی و موژدەکەمان ڕاستە ﴿فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ﴾ کەواتە لە ڕیزی نائومێدان مەبە و نائومێد نەبی لە بەخشینی ئەو کوڕە پێت ﴿قَالَ﴾ ئیبراهیم فەرموی: ﴿وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾ ئایا کێ نائومێد ئەبێ لە میهرەبانی پەروەردگاری خۆی بێجگە لەوانە کە گومڕان و بێ بڕوان؟ لەپاش ئەوەی دڵ ئارام بوو و بۆی دەرکەوت کە ئەوانە مەلائیکەن و بێگومان ئەبێ کارێکی گرنگیان ببێ بێجگە لەو موژدەی کە دایان پێی،لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ ئیبراهیم پێی فەرمون: ﴿فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ ئایا کارو مەبەستتان چییە و لەبەر چ کارێک هاتوون ئەی نێرراوەکان؟ ﴿قَالُوٓا۟﴾ گوتیان: ﴿إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ﴾ بەڕاستی ئێمە نێرراوین بۆ لای گەل و کۆمەڵێکی تاوانبار، نێرراوین بۆ سزادان و لەناو بردنیان ﴿إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾ بەڵام ئال و شوێن کەوتووەکانی لوط بێگومان ئێمە ڕزگار کەریانین بێجگە لە ژنەکەی ﴿قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ بڕیارمان داوە بێگومان ئەو لەوانەیە کە ئەمێننەوە لە سزادا و لەناو ئەبرێ، بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە و ئەویش ئەگونجێ.**

﴿فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾

---

**﴿فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ ئینجا كاتێ نێرراوەكان هاتن بۆلای ئال و بەیتی لوط ﴿قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾ لوط پێی گوتن: بەڕاستی ئێوە دەستەیەكن نەناسراو، واتە ناتان ناسم لەبەر ئەوەی شێوەی شێوە و پۆشاكی سەفەریان پێوە نەبوو، لەدانیشتوانی وڵاتەكەش نەبوون، كەواتە مەترسی ئەكرد كە پیاو خراپ بن، یان ئێوە دەستە و كۆمەڵێكی نێرراون و بێزاری دەرئەبڕم لە هاتنتان چونكە هاتبوون لە شێوەی چەند كوڕێكی گەنجی جوان دا و باوی بەدی گەلەكەی خۆی ئەزانیْ كە ئەیانەویْ نێر بازی بەكار بێنن لەگەڵ میوانێك كە غەریب و نەناسراو بیْ، لەبەر ئەوە غەمی بوو كە پەلاماری میوانەكانی بدەن و ئەمیش بەرگری پیْ نەكریْ، هەركام لەم دوو بارە هەڵئەگریْ، بەڵام ئەم بارەی دووەمە لە دڵدا بەهێز ترە ﴿قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ ئەوانیش گوتیان: نەخێر هاتنی ئێمە هۆی ناخۆشی و بێزاری نییە، بەڵكو ئێمە هاتووین بۆ لات بە شتیْ، واتە سزادانیان، كە ئەوان تێیدا بە گومانن و باوەڕیان پێی نییە، ﴿وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ﴾ ئێمە هاتووین بۆلات بە شتێكی هەق و راستەوە كە جێگەی گومان نییە، بەڕاستی ئێمە راستگۆین لە هەواڵدان بەوەی كە دامان بە تۆ واتە بێگومان ئەو سزایە دێت بۆ سەریان ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ﴾ كەواتە شەو رەوی بكە بە خێزان و شوێن كەوتووەكانت لە بەشێكی شەودا، واتە لە ئاخری شەودا، یان لەپاش ئەوەی هێندیْ لە شەو بڕوا، ﴿وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ﴾ خۆت داوایان بكەوەو لە پاشیانەوە بڕۆ﴿وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ﴾ با هیچكەس لە ئێوە لا نەكاتەوە تا ئەو سزایە نەبینیْ كە دێت بەسەر گەلەكەیان و بەهۆی ئەوەوە دڵی نەرم ببیْ. یان مەبەست ئەوەیە بە بیْ وەستان و سستی بڕۆن ﴿وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾ بڕۆن و بەردەوام بن لەسەر رۆیشتن بۆ ئەو شوێنەی كە فەرمانتان پێدراوە، ئیتر ئەو شوێنە شام بێت یان هەر شوێنێكی تر،**

وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ
يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ
نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾

---

**﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴾ بڕیارماندا و وەحیمان کردە لای لوط کە دوا قەتە و دواترین کەسی ئەوانە ئەبڕێتەوە. واتە لە ریشە ئەهێنرێن بەجۆرێ هیچ کەسێکیان نامێنێتەوە لە کاتی بەرەبەیاندا و کاتێ ڕۆژیان لێ ئەبێتەوە ئەم گەلە بەدە بیستیان و کەوتە بەر گوێ یان – ئەڵێن ژنەکەی ئەو هەواڵەی پێدان – کە چەند کوڕێکی گەنجی جوان هاتوون بۆ ماڵی لوط بەهۆی ئەوەوە کەوتنە خۆشی وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ ئەهلی شارەکە هاتن بەرەو ماڵی لوط بەخۆشی و مـوژدە بەخشییەوە. ئەوان لەخۆشی خۆشیدان، بەڵام لوط(علیه السلام) کەوتە غەم و پەژارە، چونکە شارەزای ئەو گەلە بەدە بوو لەبەر ئەوە کەوتە هەوڵ و تەقەلا لەگەڵیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ﴾ پێی گوتن: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ﴾ بەڕاستی ئەوانە میوانی منن، کەواتە ئابڕوم مەبەن ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ﴾ خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن و ریسوام مەکەن و عارم مەهێننە سەر. ئینجا ئەوانە لەباتی ئەوەی شەرم بکەن و واز بێنن، ئەوەندە بەد بوون سەر زەنشتی(لوط) یان کرد و ﴿ قَالُوٓا۟﴾ گوتیان پێی: ﴿أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە ئایا جڵەوگیرییمان نەکردی لەوەی میوان راگیر بکەیت، یان لەوەی لەبارەی ئێمەوە قسە بکەیت لەوەی ئێمە ئەمانەوێ؟ ئینجا لوط کۆتایی نەهێنا لە هەوڵدان لەگەڵیان وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ﴾ لوط پێی فەرمون: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾ ها ئەوانە کچەکانی منن ئەگەر ئێوە کارو کردەوە ئەکەن، واتە لێتان مارە ئەکەم، واتە لە سەرۆکەکانتان، یان مەبەست بە کچەکان ژنانی گەلەکەیە کە وەك باوك وایە بۆ هەموویان، وەك بە درێژیی لەمەوبەر باسمانکرد، بەهەرحاڵ رێنموونی کردن بۆ بەکارهێنانی بارێکی پاك و خاوێن و سروشتێ کە ژیان لەسەر ئەوە ئەڕوا. لەم کاتەدا کە ئەو شێوە ناشیرین و بەدەی ئەوانەی خستە بەرچاو،**

لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا
عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾

**لەم کاتەدا ئەفەرموێ:** ﴿لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ **سوێند بە ژیان و تەمەنی تۆ ئەوانە وان لەسەر خۆشی و گومڕایی خۆیاندا، لە کاتێکدا سەرگەردانن و چاوی دڵیان نابینایە. کەواتە چاوەڕوانی چاك بوون و گەڕانەوەیان لێناکرێ پیاوەتی و سروشتیان لەکار کەوتووە و ترسیان لەخوا نییە.** ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ﴾ **ئینجا دەنگ و پیا هەڵشاخانێکی گەورە و گرنگ گرتنی و داگیری کردن بە وێنەی هەورە تریشقە لە کاتی خۆر کەوتن و کاتێ کە خۆریان لێ هەڵهات، وا دەرئەکەوێ وەك هێندێ ئەفەرمون سزاکەیان لەکاتی بەرە بەیان دا دەستی پێکردبێ و لەکاتی خۆر کەوتن و تەواو بووبێ، کەواتە**﴿مشرقين﴾ **لەگەڵ** ﴿مصبحين﴾ **دا رێك و دەستە ملن** ﴿فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ **ئینجا لای سەروی شارەکەیان یان شارەکانی گەلەکەی(لوط) مان گێڕا بەلای خوار و ژێر و زەبەرمان کرد** ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ﴾ **باراندمان بەسەر دانیشتوەکاندا وردە بەردێك لە سەنگ گڵ. لە شوێنی تردا ئەم رووداو و بەسەرهاتەمان بە روونترو درێژتر باسکرد، کەواتە لێرەدا بە کورتی بەسەریدا دەڕۆین** ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ﴾ **بەڕاستی ئەوەی کە گوتمان لەم داستان و بەسەرهاتەدا چەند بەڵگە و نیشانەیەك هەیە بۆ کەسانێك کە سەرنج دەرن و ئەوانەی کە بیر ئەکەنەوە و تەمێ خوار ئەبن** ﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ﴾ **بێگومان ئەو شارە وێران کراوە لە رێگەیەکی دامەزراودایە کە خەڵکی پێدا ئەگەڕێن و هات و چۆ ئەکەن و نیشانە و دروشمەکانی ماون** ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ **بەڕاستی لەوەی کە باسمانکرد لەبارەی ئەو شارەوە و بوونی بە بەرچاوەوە بەڵگە و نیشانەیەکی گەورە و گرنگ هەیە بۆ بڕوادارەکان کە ئەوان ئەزانن سەرەنجامی کارو کردەوەی بەد ئەبێ هەر سزا و لەناوچوون و بەد بەختییە. ئەوانەی کە بێ بڕوان نازانن کە کردەوەی بەد و خراپ هۆی ئەوەیە، ئینجا دێتە سەر روداو و بەسەرهاتی گەلی شوعەیب، ئەفەرموێ:** ﴿وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ﴾ **بێگومان دانیشتووەکان و خاوەنەکانی دارو درەختە زۆر پڕەکان لە ستەمکار و دەست درێژیی کەران بوو،**

فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الْحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَاهُمْ ءَايَاتِنَا
فَكَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ
﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِالْحَقِّ
وَإِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾

---

**﴿فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە تۆڵەمان لێ سەندن و ﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ بەڕاستی جێ و شوێنی گەلی لوط و گەلی شوعەیب لە ڕێگایەکی روون و ئاشکرادان و بەچاو ئەبینرێن و نیشانە و دروشمیان ئاشکرا و ناسراون، زۆربە و جەماوەری زانایان بەم جۆرە تەفسیریان کردووەتەوە هەرچەند لە پێشەوە باسی کرد، بەڵام لێرەدا دووبارەی ئەکاتەوە لەگەڵ ئەوی تردا، چونکە هەردوو لەسەریەك ڕێگەن لە نێوان حیجاز و شامدا. هێندێ ئەفەرمون: شوعەیب رەوانە کراوە بۆ سەر دوو گەل: مەدیەن و ئەیکە، مەبەست بەم دووانە جێ و شوێنی هەردوو گەلەکەیە. بەم جۆرەش هەر چاکە و ئەگونجێ، خوا خۆی چاك ئەزانێ. ئینجا دێتە سەر باسی(حیجر) کە ئەویش هەر لەسەر ئەو ڕێگای شامەیە لە نێوان حیجاز و شامدا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الْحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ﴾ بەڕاستی خاوەن و دانیشتووەکانی(حیجر) بڕوایان نەهێنا بە رەوانە کراوەکانی خوا و بە درۆزنیان دانان. بێگومان بڕوا نەهێنان بەهەر پێغەمبەرێك بڕوا نەهێنانە بە هەموو پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – جا لەبەر ئەوە لێرەو لە چەند شوێنی تردا بەو جۆرە نیشانی ئەدات ﴿وَءَاتَيْنَاهُمْ ءَايَاتِنَا﴾ بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانمان پێ بەخشین، واتە ئەو ئایەتانەی کە بەخشیمان بە پێغەمبەرەکەیان کە هەرچەند بە یەك ئایەت سەیر ئەکرا کە بریتی بوو لە حوشترەکەی کە بەناوبانگە. بەڵام ئەو حوشترە چەند بەڵگە و نیشانەیەکی ئاشکرای لێ ئەبینرا لەبەر ئەوە بە کۆ فەرموی نەك بە تاك ﴿فَكَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ کەچی ئەوانە روو وەرگێڕ بوون لێی، یان مەبەست لەو هەموو بەڵگە و نیشانە کە بوون لەگەڵ حوشترەکەدا ﴿وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ﴾ ئەوانە چەند ماڵ و خانوویەکیان داتاشی بوو لە بەرد و شاخەکان بەجۆرێ بێ ترس و بێ باك و بە ئارام بوون لە هاتنی سزادا بۆیان ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ﴾ ئینجا دەنگ و پیا هەڵشاخانێکی توونـد و بەهێز گرتنی و داگیری کردن لەکاتێ کەوتنە**

بەرەبەیان و ڕۆژیان لێبوویەوە. هیچ ئارامی و بێ باکی یەك ناگاتە ئارامی و بێ باکی ئەو گەلە کە خانووەکانیان لە بەردی ڕەقی شاخ داتاشرابێ، هیچ کاتێ ناگاتە کاتی ڕووناکی ڕۆژ بوونەوە ﴿ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ ئینجا هیچ سوودی پێ نەگەیاندن و بەرگری سزای لێ نەکردن هەرچییان کردبوو لەوەو بەر و هەرچییان هەبوو، هەرشتێکیان هەبوو، بەڵکو بەجارێ هەموو کەوتن بە ڕوودا بە مردوویی! ئا بەو جۆرەی کە تێپەڕی کرد چەند ئەڵقەیەك دوایی هات بە شێوەیەکی کورت لەو داستانەی کە لەم سورەتەوە ئاماژەی بۆ کردن، باو و ڕەوشتی خوای ئاشکرا کرد دەربارەی بێ بڕواکان لە کاتی دواهاتن و تەواو بوونی کات و ئەجەلی ئەو بێ بڕوایانە، لەم داستانانەدا کە تێپەڕیان کرد چارەنوس و دوا ڕۆژی بێ بڕوایان و بەدان و خراپەکاران هەر سزادان و لەناو بردنیان بوو لە دونیادا، هەڕەشە و ترساندنیان بە سزای ڕۆژی دوایی. ئینجا بەدوای ئەوانەدا ئەوا دوو فەرموده ئەهێنێ کە هۆ و بەڵگەن لەسەر ئەو دوا ڕۆژو چارەنووسە: یەکەم ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ﴾ ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیان دایە دروستمان نەکردووە مەگەر بە دروستکردنێك کە داد و هەق و لێزانی و کاردروستی لەگەڵ دایە، ئەوەش داخوازە بۆ لەناوبردنی ئەو بەد و خراپەکارانە لەبەر جێگیر نەبوون و نەهێشتنی خراپە و خراپەکاری ئەوان و جێگیر بوونی ڕێنموونی چاکان بۆ دامەزراوی و بەردەوامی یان لەسەر چاکە. دووەم: ئەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ﴾ بێگومان ڕۆژی دوایی دێت و بەدی دێت، دەی دیارە داد و کاردروستی لەوەدایە کە تۆڵە بسێنرێ لە بەدان و خراپەکاران و پاداشت و بەهرەمەندی چاکان و چاکە کاران بدرێتەوە. ئەوەش ئەوپەڕی دڵنەوایی و دڵخۆش کردنە بۆ چاکان لە یەکەم جارەوە گەورەی هەموو چاکان لەبەر ئەوە خوا فەرموی پێی: ﴿فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ کەواتە ڕوو وەرگێڕە لە بێ بڕواکان بە ڕوو وەرگێڕانێکی جوان کە بریتییە لە لێبوردن و تەشەر نەدان، وەك لە(ئیمامی عەلی و ئیبن و عەباس) ەوە ڕیوایەتکراوە – خوایان لێ ڕازی بێت –. لەم فەرمانەوە وا دەرئەکەوێ کە پێغەمبەر(ﷺ) توانا بووە بەسەر تۆڵەسەندن لێیان، بەڵام خوا فەرمانیدا خۆگر بێت و پەلە نەکات لە تۆڵەسەندندا، بەم ڕەنگە بیان ترسێنێ و بانگیان بکات بۆلای خوا لە پێشەوە، ئینجا ئەگەر هەر یاخی بوون جەنگیان لەگەڵ بکات. جا بەپێی ئەمە ئایەتەکە نەسڕراوەتەوە، لە(ئیبن و عەباس و قتادة و موجاهید و ضحاك) ەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – هاتووە کە سڕراوەتەوە بە ئایەتی جەنگ و شێر. لەسەر ئەم ڕایە ئەبێ مەبەست بەو فەرمانە جەنگ نەکردن و ئیدارە سازی بێت،

إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ
عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلْ
إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ
﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

---

لەسەر هەربار ئەو فەرمانە ئەوەیە کە گوتراوە کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت هەر ئەو زۆر دروستکارو داهێنەری زۆر ئاگا و زانایە، واتە داهێنەرە بۆ تۆ و ئەوان و هەموو شتێ، کەواتە شاراوە و پۆشیدە نییە لەسەری هەر شتێ کە روو ئەدات لە نێوان تۆ و ئەوان دا، کەواتە پێویستە هەموو کارو بارت هەر حەواڵەی ئەو بکەیت و بۆ ئەوەی ئەو بڕیار بدا لە نێوانیاندا، هەر بڕیاری ئەو رێك و راست و رەوایە. یان ئەڵێین: هەر ئەو ئێوەی دروستکردووە و ئاگاو زانایە بە بەسەرهات و رووداو و کاروبارتان، ئەزانێ جەنگ نەکردن و چاوپۆشی لەم کاتەدا چاکترە بۆتان تا کاتی تر کە جەنگ چاکترە لە واز هێنان و چاوپۆشی. بەڕاستی لە دڵدا باری دووەم بەهێز تر و دامەزراو ترە. ئایەتی داهاتووی پەیوەست ترە پێیەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى﴾ بەڕاستی پێمان بەخشیت حەوت ئایەت کە دووبارە کراوە و چەند بارە گوتراون، یان حەوت لەوانەی کە دووبارە و چەند بارە ئەکرێنەوە، ئەو حەوتەش بەلای زۆربەوە بریتین لە سورەتی(الفاتحة) کە حەوت ئایەتە و دووبارە و چەند جار ئەکرێنەوە لە نوێژدا ﴿وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ پێمان بەخشیت قورئانە زۆر گەورەکە. ئیتر مەبەست بە قورئانەکەش هەر سورەتی(الفاتحة) بێت وەك هێندێ ئەفەرمون. یان مەبەست هەموو قورئان بێت بێجگە لە سورەتی(الفاتحة) لەبەر زۆر گرنگی سورەتی(الفاتحة) بە تایبەتی گوتراوە وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. لە پێشەوە گوتمان: باری دووەم لە تەفسیری ئایەتەکەدا پەیوەست ترە لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ﴾.چونکە باری دووەم بریتییە لە فەرماندان بە خۆگری و چاوپۆشی لە کردەوە بەدەکانی بێ بڕواکان و

هەڵگرتنی ئەو بارە گرانە و ئەوەش دڵخۆشی و دڵدانەوەی ئەویّ و بێگومان گەورەترین چاکە و بەهرەی خوا کە ئەو دڵدانەوەی پیّ بکریّ ئەم بەهرە و چاکەیە کە بریتییە لە بەخشینی(الفاتحة) و قورئان.واتە ئەی پێغەمبەر خۆگر بەو چاوپۆشی بکە لە کردەوەی بەدی ئەوانە و دڵ رەنجە مەبە پێی، و شادمان و دڵخۆش بە بەوەی کە ئێمە(الفاتحة) و قورئانی گەورەمان پیّ بەخشیت. هەروەها ئەم ئایەتانی داهاتووەش هەر ئەو دڵنەوایی و دڵدانەوەیان لیّ وەرئەگیریّ: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ واتە چاوەکانت هەڵ مەخە و درێژە مەدە بە سەرنج دانیان بۆلای ئەو ناز و نیعمەتەی کە داومانە بە چەند دەستە و کەسیّ لە بیّ بروایان ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ غەمبار و دڵ غەمگین مەبە لەسەریان. واتە لەسەر بڕوا نەهێنانیان. پێغەمبەری بەزەییدار(ﷺ) زۆر دڵ گران ئەبوو بە بڕوا نەهێنانیان، چونکە زۆر بەزەییدار و میهرەبان بوو، واتە هەرچۆنیّ سەرت سوڕ نەمێنیّ لەو نازو نیعمەتەی کە داومانە بەوانە و هیچ نرخێکی بۆ دانەنێی و بە شتێکی چاکی سەیر مەکە، چونکە شتێکی کاتی یە و گڕ و فڕێکە و نامێنیّ و بەدوایدا سزای سەخت دێت بەبیّ دواهاتن و بڕانەوە، هەروەها غەمباریش مەبە لەبەر چارەنوس و رۆژی رەش و بەش براوی یان، چونکە بەهۆی بەدی و خراپی خۆیان داد و کاردروستی خوادادخوازە بۆ ئەوەی بەسەریان دێت. کەواتە لێیان گەڕیّ بۆ چارەنووسی خۆیان،﴿وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ باڵی بەزەیی و رێز و دڵ نەرمیت راخە بۆ بڕوا دارەکان ﴿وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ﴾ بڵیّ: بەڕاستی من ترسێنەرێکی روون و ئاشکرام سزا و خەشمی خوا روون ئەکەمەوە بۆ بیّ بروایان و یاخی یان لەخوا، ئەو وتەیە وتەی هەموو پێغەمبەرانە کە ئاراستەی گەل و ئوممەتەکانیانکردووە و بێگومان لەگەڵ ئەو وتەیەدا وتەی موژدەشیان ئاراستە کردووە. بەڵام لێرەدا ئەم وتەی باس نەکرد، چونکە موژدە شایستەی ئەو بیّ بڕوایانە نی یە کە لاقرتی ئەکەن بە ئاینی خوا لەگەڵ ئەوەدا خوایش ئەم هەموو نازو رێزەی پێدان و کەچی هەر لە بیّ بڕوایی و لاقرتی خۆیان نەکەوتن و ناکەون. ﴿كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ﴾ لەبارەی پەیوەندی ئەم ئایەتەوە چەند شتێك گوتراوە لە نێوان ئەوانەدا ئەوەی لەدڵدا بەهێز تر بێت - زانینی راستی هەر لای خوایە - ئەمەیە کە پەیوەندی بە

ئایـەتی(٨٧) ەوە هەیـە: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ﴾ و هـەروەها چـەند رایـەك هەیـە لـەبارەی مەبەسـت بـە ﴿ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴾ ەوە، بەهێز و دامـەزراوترینیان ئەمەیە: مەبەست نامەدارەکانـە، واتـە بێگومـان بەخشیمان بە تۆ ئـەی پێغەمبـەر و هێنامانـە خوارەوە بۆ سـەرت(الفاتحة) و قورئـانی گـەورە، هەرچۆنیٚ هێنامانە خوارەوە نامە بۆ سەر دابەش کەرەکان، واتە جولەکە و گاور ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ﴾ کە قورئانیان گێڕا بە چەند بەش و پارچەیەك هـەرکام بە دڵیان بێت بڕوایـان پێـی ئـەهێنا و هـەر بەشـێك بـەپێی ئارەزوویـان نەبووایـە بـیٚ بـڕوا ئـەبوون پێـی،(قـازی ئـەبو السعود) – خـوا پاداشـتی بداتـەوە – زۆر بەجوانی و بە وردی ئەم راو بارەی باو داوەو روونـی کردوەتـەوە لـە تەفسیرەکەیدا. بـە جـۆریٚ زۆر بـەهێز و دامـەزراوی ئـەکات لـە دڵـدا، هەرکـەس ئەیەویٚ با تەماشای بکات و لەبەر زیـادە درێـژە پـیٚ نـەدان وازم لێهێنـا و دەقـی گوتراوەکـەی ئەوم نەهێناوە ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئینجا سوێند بە پـەروەردگارت ئـەی پێغەمبەر پرسیار ئەکەین لە هەموو ئەوانە بە تێکڕایی. واتـە ئەوانـەی کـە قورئانیان گێڕا بـە چـەند بـەش یـان لـە هـەموو کـەس کـە لێـرەدا ئەوانـە یەکـەم و سـەر دەسـتەن، پرسـیاریان لـیٚ ئەکەین لەوەی کردیان لە دنیادا. لە سورەتی(الـرحمن) دا ئەفـەرمویٚ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾ لەو رۆژەدا هیچ ئادەمی و جنۆکەیەك پرسیار لـە گونـاهی نـاکریٚ. دەی ئایـا چـۆن ئەم ئایەتـە یـەك ئەکـەویٚ لەگەڵیـدا بـۆ کردنـەوەی ئـەم گرێیـە و نەهێشتنی دژایەتییە کە بە رواڵەت هەیە، چەند وەڵامێك دراوەتەوە بەهێزترینیان بەلامـەوە ئەمەیە: مەبەسـت بـە پرسـیار کـردن لێـرەدا پرسـیاری لەکـەدار کـردن و تاوانبـارکردن و تۆڵـە سـەندنە.مەبەسـت بـە پرسـیار نەکردن لە ئایەتی ئەویٚ پرسیار نەکردنێکە کە مەبەست وەڵام دانـەوە و دان نـانی تاوانبـارە کـە بێـت بـە تـاوان و گوناهەکەیـدا – خـوا خـۆی بـاش ئـەزانیٚ. ئینجا رووی فـەرمودە ئەکاتـە پێغەمبـەری خۆشەویسـت(ﷺ) کـە بـە رێگـەی خۆیـدا بـڕوات و بـە روونـی ئـەوەی فـەرمانی پێدراوە رایگەیەنیٚ،

﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ کەواتە ئەوەی فەرمانت پێدراوە بە ئاشکرا و بە روونی دەری برە و. رایگەیەنە بە جۆرێ هەق و ناهەق جوێ بکەرەوە لە یەکتر ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ روو وەرگێڕە لە هاوبەش رەوا دەرەکان و گوێ یان مەدەرێ و هیچ نرخیان بۆ دامەنێ ﴿ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴾ بەڕاستی ئێمە چارەسەری لاقرتی کەرەکانت بۆ ئەکەین، واتە لەناویان ئەبەین و بەرگری زیانیان ئەکەین لێت. ئەوانە چەند کەسێك بوون لە سەرۆکەکان کە هێز و دەسەلاتێکیان هەبوو و هەمیشە نەئەوەستان لە پیلان و بەرگری و رێگرتن لە بانگ و بانگەوازەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، خوا ئەو بەلێنەی بەدی هێنا و چارەسەری کردن و هەرکام دووچاری دەرد و سزای خۆیانی کردن و لەناوی بردن، ئەو بەلێنەی کە ئەوەندە راست بوو بە کردەوەی رابوردوو نیشانیدا و فەرموی: ﴿كفيناك﴾ چارەسەرمان کرد و نەیفەرمو: ﴿نكفيك﴾ چارەسەری ئەکەین. والحمد لله رب العالمين.ئینجا لەکەداریان ئەکات بە سیفەتێکی بەد تر ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ واتە ئەو لاقرتی کەرانە کە بڕیار ئەدەن و ئەگێڕن لەگەڵ خوادا پەرستراوی تر کە ئەوە لە هەموو تاوانێ بەد ترە و گەورەترە لە تاوانی پێشوو، ئەم تاوانەکان و بنەڕەتی هەموو گوناهو تاوانەکانی ترە. چونکە ئەم تاوانە لە رێوە لەگەڵ خوادا کردوویانە و تاوانی پێشوو لە رێوە لەگەڵ پێغەمبەردایە، کەواتە باسی ئەم تاوانە دڵدانەوە و دڵنەوایی پێغەمبەری(ﷺ) تێدایە، وەك فەرمویەتی: ئەوانە تەنها بە تۆوە نەوەستان، بەڵکو تێپەڕیان کرد بۆ خوایش چ جای تۆ. ﴿فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە `لەمەوپاش و لە داهاتوودا ئەزانن، ئەزانن کە چیتان بەسەر دێت، ئەزانن کە خۆیان بەش بڕاو کرد و خۆیان دووچاری سزای نەبڕاوە کرد، بەڕاستی هەڕەشە و ترساندنێکی زۆر گەورە و سامناکە، بێگومان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئادەمی بووە و بە سروشت دڵتەنگ و غەمبار ئەبوو بە وتار و کردارە بەدەکانی ئەو بێ بڕوایانە دەربارەی ئایینەکەی و قورئانەکەی،

وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

---

لەبەر ئەوە خوای میهرەبان ڕێگەی ڕزگاری نیشان داو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەزانین کە تۆ دڵت تەنگ ئەبێ بەوەی ئەوانە ئەیڵێن ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ کەواتە پەروەردگارت بە پاکی ڕاگرە لەهەر شتێ شایانی زاتی پاکی ئەو نییە لە کاتێکدا سوپاسی بکە و هەموو چاکە و نیعمەتەکانی ئەوت لەبەرچاو بێت و بڵێ(سبحان الله وبحمده): ﴿وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ لە سوژدە بەران بە، واتە سوژدەی بۆ بەرە کە نیشانەی ئەوپەڕی بەندەیی و پەرستنە، یان مەبەست بە سوژدە نوێژە و بە سوژدە ناوی بردووە، چونکە سوژدە گەورەترین بەشەکانی یەتی وەك لە حەدیسدا وەرئەگیرێ کە ئەفەرموێ: ﴿اقرب ما یکون العبد من ربه وهو ساجد﴾ نزیك ترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری کاتێکە کە سوژدەی بۆ ئەبات ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ﴾ پەروەردگارت بپەرستە، واتە هەمیشەیی و بەردەوام بە لەسەر پەرستنی هەتا مردنت بۆ دێ، وەك لە(ئیبن و عەباس و عمر و حسن و قتادة و ئیبن و زەید) وە ڕیوایەتکراوە. بە کورتی وەك لە تەفسیری گەورەدا ئەفەرموێ: بەرامبەر وتە و کردەوە بەدەکانی ئەو بێ بڕوایانە خوا فەرمانیدا بە پێغەمبەر(ص) بەو چوار شتە کە باسکران. بێگومان کورتەی ئەو چوارە بریتییە لە پەنا بردن و دڵ بەستن بەخواوە و ڕوو کردنە خوا بە تەواوی، شتێکی ڕوونە کە هۆی ڕزگاریش هەر ئەوەیە، لەبەر ئەوە هەرکاتێ هەر ناخۆشی و ناڕەحەتی یەك ڕووی تێ بکردایە پەلاماری نوێژی ئەدا کە هۆی بەهێزی پەیوەندی بەندەیە بە خوای خۆیەوە، کەواتە کار و پیشەی موسڵمان و ڕێگەی گەیشتنی بە ئامانج هەر ئەمەیە کە بە هیچ جۆر لانەدا لە ڕێگە و بیر و باوەڕەکەی خۆی. نەچێ بەدەم نەفامێتی و نەفامانەوە و بە ڕوونی بیرو باوەڕی خۆی ئاشکرا بکات، لە هەموو ناخۆشی و تەنگاودا پەنا بەخوا ببات.

خوا بە میهرەبانی خۆی دامەزراومان بکات لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی خۆی و دڵمان پەیوەست بکات بە خۆیەوە – آمین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ

## سورەتی (النحل)
## مەککەیی یە و (١٢٨) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم سورەتەش وەك سورەتە مەککەیی یەکانی تر مەبەستە سەرەکی یەکەی بریتییە لە مەسەلەی عەقیدە، خوایەتی خوا و وەحی خوا و زیندووبوونەوە، لەگەڵ ئەوەدا چەند باس و مەبەستێکی تریش بە گرنگ ئەگرێ لە پەیوەندییان هەیە بەو مەسەلە سەرەکی یانەوە وەك یەکێتی ئایینی خوا، یەکێتی کار و فرمانی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – یەکێتی باو و رەوشتی خوا دەربارەی بێ بڕواکان، هەروەها چەند باس و مەسەلەیەکی تر کە بە یارمەتی خوا دێن لەناو بەناوی ئایەتەکانی سورەتەکەدا. بت پەرستەکان هەموو جارێ پەلەیان ئەنایەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) بە هاتنی سزای ئەم دونیایان و رۆژی دوایی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەیترساندن پێی، بە تایبەتی کاتێ ئەیانبینی ماوە ئەدرێن و رائەبورێن بە خۆشی لەگەڵ ئەو هەموو تاوانەدا کە ئەیکەن، کاتێ ئەوەیان ئەبینی زیاتر پەلەیان ئەنایەوە و زیاتر دەم درێژیی و لاقرتییان ئەکرد، گومانیان ئەبرد ئەو هەڕەشە و ترساندنەیان کە ئاراستە ئەکرێن قسەی رووتە و راستی تێدا نییە، نەیان ئەزانی ئەو مۆڵەت دانی ئەوانە کار دروستی تێدایە و بەزەیی و میهرەبانی لەوەدایە، بیریان نەئەکردەوە لەو هەموو رابەر و بەڵگەیانە کە قورئان سەرنجی بۆ رائەکێشان، ئینجا بەرامبەر ئەو پەلە نانەوەی ئەوانە فەرموی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ *أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ﴾ بەڵێن و فەرمانی خوا هات، واتە بێگومان دێت بە جۆرێ وەك هاتبێ لەمەو بەر و هەواڵ ئەدرێ بە هاتنەکەی. ئیتر مەبەست بەو بەڵێن و فرمانە سەرکەوتن و زاڵ بوونی موسڵمانان و سزادان و لەناوچوونی بێ بڕواکان بێت، یان مەبەست هاتنی رۆژی دوایی بێت، لەسەر هەر بار مەیل و ئیرادەی خوا دەرچووە بەو هاتنە هەموو رووداو و هەموو شتێ بەرهەمی ئەو مەیل و ئیرادەیە،

فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ تَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾

---

**﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ کەواتە پەلە مەنێنەوە بە هاتنی ئەو بەڵێن و فرمانە. پەلە نانەوە بە هیچ جۆر پێشی ناخات لەکاتی دیارییکراوی ئەو هاتنە، بێگومان ئەو بێ بڕوایانەی کە پەلەیان ئەنایەوە بە هاتنی ئەو بەڵێن و ڕۆژە خوا نەناس و هاوبەش ڕەوا دەر بوون بۆ خوای تاك و تەنها و پاك لەهەر جۆرە هاوبەشێك وەك ئەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە پاکی و بێگەردی بۆ خوا و خوا پاکە و بەرز و بڵندە لەهەر شتێ کە ئەوانە ئەیکەن بە هاوبەشی ئەو خوایەی کە پاکە لەهەر هاوبەشێك، واز ناهێنێ لە خەڵکی بەبێ ڕێنموونی و بە بێ بەرنامەیەك لە لایەن خۆیەوە، بەڵکو باوی وا هاتووە ئایین و بەرنامەی خۆی ناردووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر و فروستادەکانی وەك ئەفەرموێ: ﴿يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ واتە مەلائیکە ئەنێرێتە خوارەوە بە وەحی کە لەکار و فرمان و پیشەی خۆیەتی و تایبەتی یە بە خۆیەوە، ئەو وەحی یە ئەهێنێتە خوارەوە کە وەك گیان و ڕۆح زیندوو کەرەوەیە و هۆی زیندوو بوونەوەیە بۆ دڵ و دەروون و هەست و ژیریی و گەل و کۆمەڵ، کە ئەوەش گەورەترین چاکە و بەهرەی خوایە بەسەر بەندەکانی یەوە، بەبێ ئەوە هیچ گیان و ڕۆحێکی تر نرخ و سوودی نییە، مەلائیکە بەو ڕۆحە ئەینێرێتە خوارەوە بۆ سەر هەر کەسێك لە بەندەکانی کە خوا خۆی مەیلی کردبێ و ویستبێتی. ئەم دوو کردەوە: ﴿ینزل، یشا﴾ ڕابوردوون، بەڵام لە شێوەی ئێستا و داهاتوودا نیشانی ئەدات، لەوەدا دوو شت وەرئەگیرێ:**

**١- ئامادەکردن و خستنیان لەبەرچاو.**

**٢- دەست نیشانە بۆ ئەوەی ئەو ناردنە باوێك بووە لە باوەکانی خوا، نەك کردەوەیەکی یەکجار و دووجار.**

کورتەی ئەو وەحی یەش کە بەو مەلائیکەتانەدا ناردی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ﴾ واتە ئەینێرێتە خوارەوە وەحی بەوەی کە خەڵکی بترسێنن و راگەیەنن پێیان هیچ خواو پەرستراوێك نییە بە هەق و بەڕاستی بێجگە لەو خوای تەنها، بێگومان ئەو فروستادانە هەرچۆنیچ ترسێنەری خەڵکی بوون، هەروەها موژدەدەریش بوون، بەڵام لێرەدا باسی ئەمەیشی نەکرد، چونکە زۆربەی سورەتەکە ئەخولێتەوە بە دەوری بێ بڕوا و هاوبەش رەوادەران و سپڵەکاندا کە دانیان نەئەنا بەو هەموو چاکە و نیعمەتانی خوادا، حەڵاڵەکانی خوایان حەرام ئەکرد و لە ئایینی خوا هەڵئەگەڕانەوە، دەی بەرامبەر ئەوانە ترساندن رێك و رەوایە. ئەبێ بانگ بکرێن بۆ لەخوا ترسی و خۆپارێزی لە هۆی خەشم و نارەزایی خوا وەك ئەفەرموێ:(فاتقون) کەواتە بترسن و خۆتان بپارێزن لەمن، واتە ماتوڵ خوا ئەو بەندەیانەی ناردووە بەوەی خەڵکی بترسێنن لە هاوبەش رەوادان، کەواتە بترسن لە من، بترسن لەوەی پێچەوانەی فەرمانی من بجوڵێنەوە.

ئینجا دەست ئەکات بە نیشاندان و دەست نیشان کردن بۆ بەڵگە و نیشانە روونەکانی خوا، بەڵگە و نیشانەی دروستکردن و داهێنانی دروستکراوەکانی کە بەڵگەیەکی روونن لەسەر تاك و تەنهایی داهێنەر، بەڵگە و نیشانەی چاکە و نیعمەتەکانی کە بەڵگە و نیشانەن لەسەر تاك و تەنهایی بەخشندەکەیان، ئەو بەڵگەیانە نیشان ئەدات بە پۆل پۆل و دەست پێ ئەکات لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دروستکردنی ئادەمییەوە، ئەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە بە رێك و پێکی و لێزانی و کاردروستی بەجۆرێ هەموو کارو بارەکەیان بەجێیە و دەست نادەن بۆ دەست کاری و گۆڕانکاری. کەواتە ئەو داهێنەرە ئەبێ تاك و تەنها بێت بە بێ هیچ جۆرە هاوبەشێك وەك ئەفەرموێ: ﴿تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە خوا ئەوانەی دروستکرد لەکاتێك دا بەرز و بڵندە لەهەرچی ئەوانە کردوویانە بە هاوبەش.

﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ﴾ ئادەمی دروستکرد لە دڵۆپە ئاوێك، واتە بێجگە لە یەکەم ئادەمی کە باوکی هەمووانە وەك لە چەند ئایەتێك دا باسی دروستکردنی کراوە بە درێژیی. دروستی کرد لەو دڵۆپە ئاوە سادەیە﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ ئینجا لەکاتێکدا ئەو دروستکراوە کەسێکە زۆر گۆیایە و بەر بەرەکانی و بەرگری ئەکات لە خۆی و بە گوفت و گۆ و مەبەست و نیازی خۆی بە بەڵگە روون ئەکاتەوە. واتە ئەو ئادەمییە کە لەو ئاوە سادەیە دروستی کردووە دەست بەجێ و بەبێ گۆڕانکاری یەکی تر ئەگەڕێ بەو کەسە کە باکرا.

بێگومان ئەو گۆڕان و گواستنەوەیە کارێکی زۆر گەورە و گرنگە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر ئەو دەستە قودرەتە تاك و تەنهای خوا کە ئەو کار و کردەوە گەورەی کرد. هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: مەبەست بەم فەرمودەیە سەرزەنشت و تەشەر دانە لە ئادەمی بەوەی سپڵەیە و چاو لەبەری چاکەی خوا نییە و بە پێچەوانەوە لار و دژە و باوەڕی بە زیندوو بوونەوە نییە. واتە خوا ئادەمی دروستکرد لەو دڵۆپە سادە و کردی بەم ئادەمییە تێرو تەواوە کەچی ئەو ئادەمی یە سپڵەیە و بیر ناکاتەوە لە دروستکردنی خۆی و ئەوەندە نەفامە دژایەتی و بەریەرەکانی ئەکات و دەمە دەمێ و چەنەبازی ئەکاو ئەڵێ. کێ ئێسکە رزیوەکان زیندوو ئەکاتەوە. بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ و چاکە. هێندێ تر ئەفەرمون: بە شێوەی گشتی بگیرێ چاکترە. واتە مەبەست دەربڕینی سپڵەیی و دەست نیشان بۆ ئەو بەڵگە روونەی کە باسکران. بێگومان ئەم رایە لەدڵدا جێگیر ترە و راستە وەك(خازن) ئەفەرموێ. خوا باش ئەزانێ.

وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ٦ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ

لەپاش ئەوەی باسی دروستکردنی ئادەمی کرد، ئینجا باسی هێندێ لەو شتانە ئەکات کە دروستی کردوون و ژێر باری کردوون بۆ ئادەمی و هەموو چاکە و نیعمەتێکن بەسەر ئادەمییەوە، لەیەکەم جارەوە باسی ئەو گیانلەبەرە چوار پێ یانە ئەکات کە ژیانی ئادەمی لەسەر راگیرە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ﴾ بزن و مەڕ و رەشە وڵاخ و حوشتری دروستکردووە بۆ ئێوە. یان ئەوانەی دروستکرد، ئینجا هێندێ لە سوود و بەرهەمەکانیان ئەخاتە بەرچاو و ئەفەرموێ: ﴿فِيهَا دِفۡءٞ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەو گیان لەبەرانەدا هۆی خۆ گەرم کردنەوەتان کە بریتییە لەو پۆشاك و جل و بەرگەی کە لە پێست و موو و خوری و کورکی ئەوانە پێك ئەهێنرێن، وەك(ئیبن و عەباس) - خوا لێیان رازی بێت - بەپێی ریوایەتی(ئیبن و جەریر) یان مەبەست پۆشاکە و دەوار و خێوەت وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. ﴿وَمَنَٰفِعُ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەوانەدا چەند سوود و مەنفەعەتێ تر کە هەموو ئەوانەشتێکی پێویستن و ناچاری هەیە پێیان، بێجگە لەهۆی خۆ گەرم کردنەوە، ئەوەش وەك ئەو پێخەف و فەرش و شتانەی کە پێك ئەهێنرێن لێیان، هەروەها شیر و ماست و رۆن و هەموو شتەکانی تر ﴿وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾ لەوانە خۆراك بە گۆشت و رۆن و شتە خوراوەکانی تریان ﴿وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەو گیان لەبەرانەدا زینەت و جوانی کاتێ کە ئەیان هێنێتەوە لە لەوەرگا بۆ پەچە و بۆ ماڵ. لە کاتێکدا کە دەریان ئەکەن لە پەچە و گەلە خانەکانیان بۆ دەرەوە ﴿وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِ﴾ واتە بارەکانتان هەڵئەگرن لە وڵاتی خۆتانەوە بۆ شار و وڵاتێکی تر کە پێی نەگەیشتن خۆتان بە خۆتان چ جای بەبار و کۆڵەکانتانەوە مەگەر زۆر بە نارەحەتی و مانوێتی و بەکارهێنانی نیوەی هێزو توانینی خۆتان ئەگەر ئەو وڵاخە بارییانەتان نەبوایە.

إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا
تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾

---

﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ بەڕاستی پەروەردگارتان بەزەییدار و بە شەفەقەت و میهرەبانە پێتان بەهۆی ئەوەوە ئەو بار هەڵگرانەی بۆ دروستکردوون، کەواتە پێویستە چاو لەبەری و سوپاسی خوا بکەین. ئەو هەموو نیعمەت و چاکە و بەهرە گرنگانەی کە خستی یە بەرچاو بەهۆم ئەم گیان لەبەر و حەیوانانەوە دەستکەوتی ئادەمی ئەبن، ئەو چاکە و بەهرەیانە نرخ و خۆشی یەکەیان زۆر ئاشکرا تر و ڕێزدار ترن لە وڵاتی لادێ و کۆچەر و کشتوکاڵ کاراندا، چونکە لەو جۆرە وڵاتانەدا ژیان بە تەواوی بەستراوە بەو گیان لەبەرانەوە کە لەم ئایەتەدا دەست نیشانی بۆ کردن. ئینجا هێندێ گیان لەبەری تر ئەخاتە بەرچاو کە ژیان نەبەستراوە پێیانەوە، بەڵام مایەی خۆشی و کامەرانین و ژیان بەوانەوە جوان و شیرینە، ئەفەرموێ: ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ﴾ خوا ماین و ئەسپ و ئێستر و گوێ درێژی دروستکرد بۆ ئێوە ﴿لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ لەبەر ئەوەی سوارییان پێ بکەن، لەبەر زینەب و ئارایش کردن بۆتان، بێگومان بوونی ئەمانە کە باسکران شتێکی شیرین و جوانە و مایەی کەشخەی شادمانییە بۆ خاوەنەکانیان و ئەوەش هێندێکە لە خۆراکی دڵ و دەروون﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ خوا دروست ئەکات و دائەهێنێ ئەوەی کە ئێوە نایزانن و بێ ئاگان لێی. بێگومان بە پێی یاسای ڕەوانبێژیی ئەوەی کە دروستی ئەکا و ئێمە بێ ئاگایی لێی ئەبێ لەو شتانە بن کە بۆ سواری دەست ئەدەن و مایەی زینەت و جوانین. ئیتر ئەوانە گیان لەبەر بن یان نە. کەواتە ئەگەر گیان لەبەرمان دەست نەکەوێ لە وێنەی ئەم وڵاغە سواری یانەی کە باسکران، ئەو هەموو

سەیارە و تەیارە و هۆی بار و گواستنەوەی کە خوا دروستی کردن لەدنیادا لەسەر دەستی ئادەمیدا کە مایەی جوانی و زینەت و ئارایشن، تەنها ئەمانە بەسن بۆ بەدی هاتنی ئەو بەڵێنەی کە ئەم ئایەتە دای پێمان. ئینجا بە بۆنەی گواستنەوە و بار و کۆچ و سواری و گەڕان و ڕۆشتن بە ڕێگەی بینراو و هەست پێکراودا بۆ گەیشتن بە ئامانجی دنیایی، بەو بۆنەیەوە باسی ڕێگەی ڕاستی مەعنەوی و هەست پێ نەکراو ئەکات کە دانە بەر و ڕۆیشتن پێیدا خەڵکی ئەگەیەنێ بەخواو دەستکەوتی مەبەست و ئامانجی ڕاست و ڕەوا و ڕاستەقینە. ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە لەسەر خوایە و خۆی پێویستی کردووە لەسەر خۆی ڕوونکردنەوە و ڕێنموونی بۆ ڕێگەی ڕاست کە لانەدا لە مەبەست، وەك کابرا خۆی نیازی ئەوەی کردبێ. ﴿وَمِنۡهَا جَآئِرٞ﴾ هێندێ لە ڕێگە لادەرە لە مەبەست و ئامانج و لە هەق، ڕێبوارەکەی ناگەیەنێ پێیان تێپەڕی ئەکات، هەرکام لەو دوو ڕێگەیە بە ویست و مەیلی خوایە،وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە و مەیلی ببوایە ڕێنموونی ئەکردن و ئەیگەیاندن بە هەق بە تێکڕایی و هەمووتان، بەڵام بەو جۆرە نەیویست بەڵکو ویستی ئەم ئادەمی یە بە جۆرێ دروست بکات کە هەڵگرێ و دەست بدات بۆ هەردوو بارەکە: ڕێنموومایی و گومڕایی، و لێی گەڕێ تا ویست و ئیرادەی خۆی یەکێ لەو دوو بارە هەڵبژێرێ. کەواتە هێندێ ڕێی ڕاستی هەڵبژارد و دایە بەر و هێندێ ڕێگەی لار و لادەری دایە بەر، هەرکام لە ویست و مەیلی خوا دەرناچێ. کە ویستی ئادەمی بەو جۆرە دروست بکات سەربەستی و ئازادی بێ لەو هەڵبژاردنەدا. ئینجا پۆلێکی تر لە بەڵگە و نیشانە و نیعمەتەکانی خوا ئەخاتە بەرچاو،

هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ
لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ
يَتَفَكَّرُونَ ١١

---

ئەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾ خوا کەسێکە کە هێناویەتە خوارەوە لە ئاسمان و لای سەرەوە ئاوێك، واتە باراندن کە بە پێی یاسا و چەند هۆیەکی تایبەتی کە خوا بۆی داناوە ئەیبارێنێ، ئەو بارانە کە دوو چاکە و نیعمەتی گەورە و گرنگی تێدایە بۆ خۆمان و بۆ مەڕ و مالاَت و ولاَخ و حوشترەکانمان کە لە ئایەتی پێشوودا ئاماژەی بۆ کردن:

١- ﴿لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ ﴾ بۆتان هەیە لەو ئاوەدا شەرابێ کە ئەیخۆنەوە. واتە هێندێکی ئەخۆنەوە کە بە بێ ئەوە ژیانتان نابێ، یان خوا کەسێکە کە هێنایە خوارەوە و لە ئاسمانەوە ئاوێك بۆتان، کە هێندێ لەو ئاوە شەرابە و ئەیخۆنەوە ﴿وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴾ لەو ئاوەوە و بەهۆی ئەوەوە رووەك و لەوەڕ پەیدا ئەبێ، یان هێندێ لەو ئاوە رووەك و لەوەڕێکە کە مەڕ و مالاَت ئەلەوەڕێنێ تێیدا. ﴿ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ ﴾ خوا ئەڕوێنێ بۆتان بەو ئاوە کشت و کاڵ﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ ﴾ زەیتون و دار خورما و هەموو جۆرەکانی مێو و ترێ ﴿وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ﴾ لەهەموو بەر و میوەجات ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باسکرا، واتە باراندنی ئاو و ئەوەی بەهۆی ئەو ئاوەوە پەیدا ئەبێ، بەڵگەیەکی روون هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بیر ئەکەنەوە و بەهۆی ئەوەوە ئەو شتانە ئەکەن بە نیشانە و بەڵگە لەسەر بوون و دەسەلاَتی بێ سنوور و کار دروستی خوا، هەرکەس چاوی دڵ و ژیریی کوێر نەبێ بە کەمێك بیر کردنەوە دڵ و دەروونی پڕ ئەبێ لە بڕوا بەو خوایە. ئەوەی کە باسکرا بەڵگەیەکی روونە بۆ هەموو کەس بەلاَم هەر بیر کەرەوەکان سوود وەرئەگرن و بەهرەمەند ئەبن لەبەر ئەوە هەر باسی ئەمان ئەکات.

وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا
وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ
وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾

---

**٢- ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ پۆل و کۆمەڵێکی تر لە بەڵگە و نیشانەکان، ئەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ ژێر باری کردووە بۆتان شەو و ڕۆژ ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ﴾ خۆرو مانگ ﴿وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ﴾ ئەستێرەکان ژێر بار کراون بە فەرمانی خوا. بێگومان بوونی شەو و ڕۆژ و هاتنیان بەدوای یەکدا و چوونیان بەناو یەکدا، هەروەها بوونی خۆر و مانگ و جیاوازییان لە یەکتر و چەرخە و گەڕانیان بەو جۆر و شێوە ڕێك و پێکە، هەروەها ئەو هەموو ئەستێرە زۆر و فراوانە کە بۆ ئێمە نایەنە ژمارە و جیاوازییان لە دووری و نزیکی و ڕەنگ و شێوە و خولانەوە و گەردشیان بەو یاسا و ڕێك و نەگۆڕاوە... هەروەها بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکران بۆ هەموو ژیرێك، هەرچۆنێ هەموو چاکە و بەهرەیەکی گەورەن بۆ ئەم ئادەمییە کە ئەژی لەم بوونەوەرەدا و هەرکام لەو شتانە بەش و پارچەیەکن لێی و بە هەموو ئەوانە کاروبار ئەڕوا. کەواتە هەرکەس ژیرە با بەو نیشانە و بەڵگە ڕوونانە هەردەم بڕوای بەهێز و پتەو تر بێت، با هەمیشە چاولەبەری خوای میهرەبان بێت و هەرگیز لە ڕووی نەیە نافەرمانی بکات و هەرکات نافەرمانی کرد دەست بەجێ بگەڕێتەوە بۆ سایە و پەنای و ڕوو بکاتە قاپی یەکەی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بەڕاستی لەژێر بار کردنی ئەوانەدا کە باسکران چەند بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا هەیە بۆ ئەوانە کە ژیرن. بەڵێ بەڕاستی**

هەرکەسێك بێبەش نەبێ لە ژێری ئەزانێ ئەو کەسەی ئەوانەی ژێر بار کردووە تەنها خوایە، ئەی ئەگەر خوا نەبێ ئەبێ کێ بێت؟ ئایا خۆتان هەڵئەسن بەو کاروبارە؟ ئایا بە رێکەوت ئەو کاروبارە ئەڕوا بەڕێوە؟ بێگومان هیچ چار نییە ئەبێ هەر بڵێین: خوای پەروەردگار ئەم بوونەوەرەی داهێناوە و ژێر باری کردووە و هەموو کاری ئەبا بەڕێوە، ئینجا پۆلێکی تر ئەخاتە بەرچاو لە چاکە و نیعمەتەکانی خوا بەسەر ئەم ئادەمی یەوە کە لە هەمان کاتدا بەڵگە و نیشانەیەکی روون لەسەر تاك و تەنهایی و دەسەڵاتی بێ سنووری خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ ژێر باری کردووە هەرچی لە زەویدا و دروستی کردووە بۆ سوودی ئێوە لە گیان لەبەر و بێ گیان. لە کاتێکدا کە جۆر و بار و تیرەیان جیاوازە، یان رەنگەکانیان جیاوازە، بیر کردنەوە و سەرنج دانێك بۆلای ئەو شتە و ئەو هەموو هێز و وزە کە خوا لەم زەوییەدا دایناوە و پەیتا پەیتا و رۆژ لە دوای رۆژ دەرئەکەون و گەشە ئەدەن بە ژیان. بیر کردنەوە و سەرنج دانێك بۆلای ئەوانە بەسە بۆ هەر خاوەن هۆشێك کە خوای خۆی پێ بناسێ و سەری بەندەیی بۆ داخات وەك دەست نیشان ئەکات، کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باسکرا بەڵگە و نیشانەیەکی گرنگ هەیە بۆ ئەوانەی کە ئامۆژگاری وەرئەگرن و بەهۆی ئەوەوە تەمێ وەرئەگرن و رێگەی خوا ئەدەنەبەر. لەبارەی پەیوەندی سەری ئەم ئایەتەوە چەند رایەکی تر گوتراوە ئەوانەش هەر ئەگونجێن و خوا خۆی باش ئەزانێ.

٣- دەستەیەکی تر لە نیعمەت و بەڵگەکانی خوا لە دەریاکان دایە کە ئاوەکانیان لەبەر تفتی و تاڵی ناخورێتەوە و کەڵکی کشتوکاڵ و دارو درەختیان نییە، بەڵام چەند سوود و بەرهەمی تریان هەیە ئەیان خاتە بەرچاو کە ئەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ ئەو خوایە کەسێکە کە دەریای ژێر بار کردووە بۆ ئەوەی

گۆشتێکی تەڕ و تازەی لێ بخۆن ﴿وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَا﴾ بۆ ئەوەی دەربێنن لێی خشڵێك كە ئەیپۆشن بۆ رازاندنەوە و جوانی وەك سەدەف و لۆ لۆ و مەرجان و شتەكانی تر كە تا ئێستاش چەند گەل و كۆمەڵێك بەكاریان ئەهێنن و ئەیان پۆشن. ئەو خشڵانە ئافرەت ئەیان پۆشن، بەڵام بەرهەمەكانیان كە زینەت و ئارایشە، و ئەگەڕێتەوە بۆلای پیاوەكانیش، كەواتە هیچ گرێ و رەخنەیەك لەمەدا كە بە ڕواڵەت ئەیانكات بە پۆشراوی پیاوەكان و فەرموی ئێوە ئەیان پۆشن ﴿وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾ ئەبینی كەشتی یەكان بە گەڕۆك و لەتكەرانی ئاو لە دەریاكەدا كە ئەوە شتێكی شیرین و دڵڕفێنە، بێجگە لەوەی بارەبەرن و هۆی گەشت و گوزار و هەڵگری خەڵكی و شت و مەكەكانیانن و مایەی بازرگانی و دەستكەوتی رۆزی و سامانن، وەك ئاماژە ئەكات بۆ ئەوە كە ئەفەرموێ: ﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ واتە دەریای ژێربار كرد بۆ ئەوەی خشڵ و زیوەری لێدەربێنن، بۆ ئەوەی داوای هێندێ لە فەزڵ و رۆزی خوا بكەن و هێندێ لەوەتان دەستكەوت ببێ، بێگومان هەركەس سپلە نەبێت بەو چاكە و بەهرەیانە چاولەبەر ئەبێ بۆ خوا و سوپاسی خوا ئەكات وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی چاكەی خوا بكەن و چاولەبەری خوا بن و هەڵسن بە بەجێهێنانی مافی چاكەی خوا بە بڕواهێنان و گوێ رایەڵی و خۆگرتنەوە لە گوناهو نافەرمانی.(ئیبن و ئەنباری) ئەفەرموێ: ئەم فەرمودەیە پەیوەستە بە رستەیەكی لابراوەوە كە بریتییە لە(لتنفعوا) واتە ئەبینی كەشتی یەكان ئەگەڕێن بەناو دەریاكاندا و گوزەر ئەكەن و بۆ ئەوەی ئێوە سود بەخش بن، بۆ ئەوەی داوای هێندێ لە فەزڵ و دەستكەوتی خوا بكەن... هتد. بەم جۆرەش هەرچاكە و ئەگونجێ.

وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٍ
وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾

---

**ئینجا کۆتایی چاکە و بەهرەو بەڵگەکانی ئەهێنێ لێرەدا بەمانەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ﴾ خوا دایناوە لە زەویدا چەند کەژ و شاخێکی قورسی دامەزراو ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ بۆ ئەوەی تاسەو لەنگەرتان پێ نەکات، زانیاری تازە هۆی پەیدا بوونی ئەو شاخانە باس ئەکات بە چەند بۆچوون و نەزەری یاتێکی زۆر کە دژ و پێچەوانەی یەکترن، گرنگترینیان ئەمەیە: ناو سکی زەوی کە بڵێسە ئەکات لە گەرمیدا بەرە بەرە سارد ئەبێتەوە و بەهۆی ئەوەوە دێتە یەك و فراوانی یەکەی نامێنێ، بەهۆی ئەوەوە توێژەکەی و چینی سەرەکەی قرچ هەڵدێ و بەرزی و نزمی تێدا پەیدا ئەبێت و ئەیبەستێت تا ئەبێت بەو شاخە و چیایانە. بەڵام قورئان باسی ئەوە ناکات، بەڵکو باسی سود و بەرهەمەکەی ئەکات کە پاراستنی هاوکێشی یەکەیەتی تا بەوە بەرگری ئەکات لە تاسە و لەنگەرە ﴿وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا﴾ گێڕاویەتی و دایناوە لە زەویدا چەند رووبار و چەند رێگاوبان ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بەڵکو بەهۆی ئەو رێگایانەوە رێ دەرکەن بۆ شوێنێ کە نیازی ئەکەن و ون نەبن، یان بەڵکو رێنموونی وەرگرن و رێ ببەن بەخوا پەرستی و تاك و تەنهایی خوا بەهۆی بیر کردنەوە. لەو شتانەدا کە خوا بۆی دروستکردوون ﴿وَعَلَٰمَٰتٍ﴾ چەند نیشانەیەکی داناوە بۆ ئەوەی رێبوار سەری لێ نەشێوێ و رێی لێ تێك نەچێ لە گەڕان و سەفەرکردنیدا. ئیتر ئەو نیشانە شاخ و چیاو بەرزی بێت یان هەر شتێکی تر کە لە رۆژ یان لە شەودا رێگەیان پێ دەرئەکرێ ﴿وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ بە ئەستێرەیش خەڵکی رێ دەرئەکەن لەشەودا ئیتر چ لە دەریادا یان لەبەڕدا و وشکانی. ئەم شتانە زۆر گرنگن و بەڵام هەموو کەس نرخیان نازانێ، بە تایبەتی کەسێك نرخیان ئەزانێ کە بیر بکاتەوە لە نەبوونیان و داماوی و سەر لێ شێوانی کە پەیدا ئەبێ لە نەبوونی ئەو رێگە و نیشانانە، لەبەر ئەوە ئەوا قورئان سەرنج رائەکێشێ بۆیان تا هەرکەسێك ژیر بێت و بیر بکاتەوە لەچاکە و میهرەبانی خوا دەربارەی بەندەکانی.**

أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ
لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا
يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ
وَٰحِدٞۚ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٢٢﴾

---

لەپاش نیشاندان و سەرنج راکێشان بۆلای ئەو هەموو چاکە و بەهرە و بەڵگەیانەی کە خوای میهرەبان دروستی کردوون بۆ بەندەکانی، کەواتە ئەبێ هەموو سەری بەندەیی داخەن بۆ خوای تاك و تەنهایان، کەچی لەگەڵ ئەوەدا زۆربە خوا ناپەرستن و هاوبەشێکی بۆ رەوا ئەدەن کە بێ نرخە و توانای دروستکردنی هیچ شتێکی نییە، لەپاش ئەوە ئەوا پرسیارێك ئاراستە ئەکا بۆ سەرزەنشت و دەم کوت کردنی ئەو نەفامانە، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُ ﴾ دەی ئایا کەسێك دروست بکات و داهێنێ وەك کەسێك وایە کە دروست نەکات و دانەهێنێ. واتە خوا کە ئەوانەی دروستکردووە کە باسکران بە وێنەی ئەو بت و پەرستراوانەیە کە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن، کەواتە ئەی نەفامەکان چۆن ئەوانە ئەپەرستن و ئەیگێڕن بە وێنەی خوا؟! ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ دەی ماتوڵ ئەوانە بەو جۆرەن ئایا بیر ناکەنەوە و ئامۆژگاری وەرناگرن، واتە شتەکە ئەوەندە ئاشکرایە هیچی ناوێ بێجگە لە بیر کردنەوەیەك، کەواتە ئەبێ بزانن ئێوە گومڕان. لە پێشەوە ئەو هەموو چاکە و نیعمەتانەی خستە بەرچاو، ئینجا لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ﴾ واتە ئەگەر بتانەوێ نیعمەت و چاکەکانی خوا بژمێرن ناتوانن بیان ژمێرن و بۆتان ناژمێررێن چ جای هەڵسن بە ماف و سوپاسیان، زۆربەی چاکەکانی خوا بەندە نایان زانێ و بێ ئاگایە لێیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە، بەهۆی ئەوەوە ئەبورێ لە سپڵەیی و ناسوپاسیتان و پەلە ناکات لەسزا و تۆڵە دانتان. بەهۆی ئەوەوە چاکەی خۆی نابڕێ لێتان، بەش براوتان ناکات لەگەڵ ئەوەدا شایستەی ئەوەن ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ﴾ خوا کە داهێنەر و دروستکارە ئاگایە و ئەزانێ هەرچی ئێوە ئەیشارنەوە لە وتار و کردارتان و هەرچی دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن، کەواتە نەفامان چۆن خوا یەکسان ئەکەن لەگەڵ ئەو

بتە پڕو پووچانەدا ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ ئەو بتانەی کە ئەوانە ئەیان پەرستن و هاواریان لێ ئەکەن بێجگە لە خواو تێپەڕ ئەکەن لەخوا ﴿ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا ﴾ هیچ شتێك دروست ناکەن ﴿ وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾ لە کاتێك دا خۆیان دروستکراون، بەڵکو زیاد لەوەش ﴿ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖ ﴾ ئەو بتانە، واتە بەشێکیان دار و بەردێکی بێ گیان و نازیندوون، واتە هەرچۆنێ ئێستا بێ گیانن دەست نادەن بۆ زیندوویی و گیان بەبەرا کردن لە داهاتووشدا ﴿ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴾ هەست ناکەن کەی خەڵکی زیندوو ئەکرێنەوە، یان هەست ناکەن کەی هاوار لێ کەرو عابیدەکانیان زیندوو ئەکرێنەوە، ئا بەو جۆرە ئەو بت پەرستە نەفامانە ریسوا و دەم کوت ئەکاتەوە، بەم رەنگە هەموو سیفەت و نیشانەی خوایەتی دارنی لەو بتە پڕوو پوچانەی بەجۆرێ هەرکەس رێزی خۆی بەلاوە بێت هەر لە رووی نایەت ئەوانە بە بت سەیر بکات.

ئینجا هەمیتر دڵنیایی ئەکات لەسەر تاك و تەنهایی خوا و دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی بڕوا نەهێنانی ئەوانەی بڕوایان نییە بەو تاك و تەنهاییە،ئەفەرموێ: ﴿ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾ خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، ئەو هەموو بەڵگە و نیشانانە کە لەم سورەتەدا تێپەڕیان کرد سەرجەم ئەو تاك و تەنهایی یە روون ئەکاتەوە، ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ ئەوەی هۆی بڕوا نەبوون بەو تاك و تەنهاییە، بڕوا نەبوونە بە رۆژی دوایی و سەرپێچی و خۆ بەزل زانییە. ئەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴾ ئینجا ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بەرۆژی دوایی و بڕوایان نییە دڵەکانی ئەوانە بێ بڕوان بەو تاك و تەنهاییە لە کاتێکدا ئەوانە خۆ بەزل زانن لەوەی دان بنێن بەو تاك و تەنهایی و بەڵگە و نیشانەکانی تاك و تەنهایی، چونکە بڕوا نەبوون بەرۆژی دوایی تۆڵە و پاداشتی ئەو رۆژە ئەبێتە هۆی دڵ بەستن و چاو بڕین هەر بۆ ئەم دنیایە، ئەوەش ئەبێتە هۆی گوێ نەدان و بیر کردنەوە لە بەڵگە و نیشانەکانی تاك و تەنهایی خوا، بڕوا بە داد و بەڵێنی خوا، بە تۆڵە و پاداشتەکەی، بەڵام بڕوا بە رۆژی دوایی و تۆڵە و پاداشتەکانی ئەو رۆژە بێگومان پاڵدەر و هۆی بیر کردنەوەیە لە بەڵگە و نیشانەکانی تاك و تەنهایی خوا لە ترسی سزا و تۆڵەکەی و ئومێدی بەڵێن و پاداشتەکەی. بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە کە ئەمەیە: هۆی بڕوا نەهێنان بە تاك و تەنهایی کە بڕوا نەبوون بە رۆژی پارچە و بەشێکە لەو، ئەوەیە دڵی ئەوانە سەرکێش و لارە و خۆ بەزل زانە و بە بێ هۆ و بیانوویەك نایەوێ دان بنێ بە هەق و راستیدا و ملکەچ بکات بۆی. بەم جۆرەش هەرچاکە و ئەگونجێ، خوا خۆی باش ئەزانێ.

لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم
مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ
ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ

---

لەسەر هەر بار ئەوا ئەوانە ئەترسێنێ و هەڕەشەیان ئاڕاستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ شتێکی هەق و ڕاستە و بێگومان خوا ئاگایە و ئەزانێ ئەوەی کە ئەوانە نهێنی ئەکەن و دای ئەشارن و ئەوەی دەری ئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن. لەهەر کردار و ڕەفتار و هەر نیاز و بێ بڕوایی و خۆ بەزل زانی یەك ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ﴾ بەڕاستی خوا خۆ بەزل زانەکانی خۆش ناوێ. واتە خەشمی هەیە لێیان. ئەو خۆ بەزل زانە بێ بڕوایانە بەدوای هەق و ڕاستیدا ناگەڕێن، بەڵکو لا ئەدەن لە ڕێگای ڕاست و قسەی ناهەق و نادروست ئەکەن، وەك دەست نیشان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ کاتێ بگوترێ پێیان و پرسیاریان لێ بکرێ: ئایا پەروەردگارتان چی ناردووەتە خوارەوە و چ شتێکی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر محمد؟ کاتێ ئەو پرسیارەتان لێ بکرێ وەڵامێکی ڕاست و ڕەوا نادەنەوە، بەم جۆرە هێندێ لەو قورئانە بخوێنینەوە بەسەریاندا یان بە کورتی مەبەستەکەیان پێ بڵێن، تا بەهۆی ئەوەوە ناپاکی نەکەن و شتەکەیان بۆ باس بکەن ئیتر با بڕواشیان پێ نەبێ. بەڵکو لائەدەن لەبارە ڕاستەکە بەم جۆرە ﴿قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾: ئەڵێن قسە و باس و حیکایەتی پڕو پووچی پێشووەکانە. واتە لە وەڵامی ئەو پرسیار کەرانەدا ئەڵێن: ئەوەی محمد ڕاینەگەیەنێ بەناوی خواوە قسە و دەلەسەی گەلە پێشووەکانە، ئەم قورئانە گەورەیە کە چارەسەری هەموو شتێکی تێدایە، بەسەرهاتی ڕابوردوو ئێستا و داهاتووی ئادەمی ئەخاتە بەرچاو و بەو جۆرە بەدە ناوی ئەبەن و ئەیناسێنن بەخەڵکی، چونکە داستان و سەر گوزەشتەی گەل و نەتەوە پێشووەکانی ئەگێڕێتەوە. سەرەنجام و بەرهەمی ئەو کردەوە بەدەشیان ئەمە بوو باری گرانی گوناهی خۆیان هەڵگرن لەگەڵ هێندێ لەباری گوناهی ئەو کەسانەی کە ئەمان گومڕایان کردن و ئەیکەن وەك ئەفەرموێ: ﴿لِيَحْمِلُوٓا۟

أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ﴾ بۆ ئەمەی باری گرانی گوناهی خۆیان بە تێر و تەواوی هەڵگرن و بیگرنە ئەستۆ لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ هێندێ لەباری گرانی گوناهەکانی ئەوانەی کە ئەمان گومڕایان کردن و شوێنی ئەمان کەوتن بە بێ زانین و بەڵکو بە نەفامی و کوێرانە، ئەو گومڕا کەرانە گوناهی گومڕایی خۆیان بە تەواوی لە ئەستۆی خۆیانە و بەشداریشن لە گومڕا بوونەکەی ئەواندا. بەم ڕەنگە گومڕا بوونەکەی شوێن کەوتووەکان بە دوو شت پەیدا بووە فەرمان فەرمان و هاندانی گومڕا کەران، بە گوێ کردن و گوێ ڕایەڵی شوێن کەوتووەکان، کەواتە تۆڵەی هێندێ لە گوناهەکانی شوێن کەوتووەکانیشیان لە گەردنە کە ئەو هێندەش بە ئەندازەی گوناهی کردەوە و گوێ ڕایەڵی یەکەی خۆیانە وەك لە دەقی حەدیسێکدا هاتووە کە ئیمامی موسلیم هێناویەتی لە ئەبو هورەیرەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – ئەو حەدیسە دوو بەشە: بەشی یەکەم ﴿من دعا إلى هدى كان له من الأجر مثل اجور من تبعه لا ينقص ذلك من اجورهم شيئا﴾. بەشی دووەم: کە مەبەستی ئێمەیە لێرەدا: ﴿ومن دعا إلى ضلالة كان عليه من الإثم مثل آثام من تبعه لا ينقص ذلك من آثامهم شيئا﴾ هەرکەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ گومڕایی یەك لەسەریەتی گوناهو تۆڵەی ئەو کەسانەی کە شوێنی کەوتووە. بەبێ ئەوەی هیچ شتێك کەم بکات لە گوناهو تۆڵەی گوناهەکانی ئەوان، تەفسیری ئەم ئایەتە بەم شێوەی کە گوتمان ڕێك و پێك تر و بێ ئەرکە لەو دوو شێوەی تر کە گوتراوە، هەر ڕەخنەیەك کە گیراوە لەو دوو شێوەی تر لێرەدا جێگەی نییە، زانینی تەواو هەر لای خوایە. ئەو پرسیار لێکراوانە بەو جۆرە خۆیان دووچار کردو باری قورسی گوناهی خۆیان و بەشێك لە گوناهی شوێن کەوتووەکانیشیان هەڵئەگرن، ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾ بێدار بن زۆر بەدە ئەوەی کە هەڵی ئەگرن و ئەیگرنە گەردن و تۆڵەکەی زۆر سەخت و بەتینە.(ئیبن و ئەبی حاتەم) لە(سدی) یەوە ڕیوایەت ئەکات: قورەیش کۆ ئەبنەوە و ئەڵێن: محمد پیاوێکی قسە شیرینە، کاتێ کەسێك قسەی لەگەڵ بکات داگیری ئەکات و ژیریی لێ ئەستێنێ، کەواتە چەند کەسێك لە پیاوانی بەرز و ناسراو بنێرن لەهەر ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی مەککە هەر شەوی دا شەوێ، ئینجا هەر کەسێك لە دەرەوە هات بۆلای محمد بیگێڕنەوە با نەیبینێ. ئینجا ئەو کەسەی کە ئەنێررا لەلایەن گەلەکەیەوە بۆ

دینی محمد یەکێ لەو پیاوانە ئەچوو بەدەمی یەوە پێی ئەگوت من فلانی کوڕی فلانم و خۆی و نەژادی پێ ئەناساند و ئەیگوت: من هەواڵت پێ ئەدەم لەبارەی محمدەوە، بەڕاستی پیاوێکی درۆزنە و بێجگە لە بەندە و نەفام و بێ نرخان هیچ کەس دوای ناکەوێ و گەورە پیاو ماقوڵەکانی گەلەکەی لێی جوێ بوونەتەوە، بەهۆی ئەوەوە ئەو نێرراوە ئەگەڕایەوە، ئەمە مەبەستە بەو ئایەتە کە فەرموی: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾. ئەگەر ئەو نێرراوە ژیر بووبێ، ئینجا یەکێ ئەو قسە و وتە بەدانەی پێ بگوتایە و ژیر بوایە ئەیگوت: ئەگەر من رۆژە ڕێ یەك بێم و بگەڕێمەوە پێش ئەوەی ئەم پیاوە ببینم و بزانم چی ئەڵێ. ئەگەر وا بکەم بەڕاستی نێرراوێکی بەد ئەبم بۆ گەلەکەم کە منیان ناردووە، بەهۆی ئەوەوە نەئەگەڕایەوە بە قسەی خەڵکی و بەڵکو ئەهاتە مەککە و چاوی ئەکەوت بە بڕواداران و قسەی ئەوانی ئەبیست و ئەوانیش لە وەڵامدا ئەیانگوت: ئەوەی کە خوا هێناویەتییە خوارەوە شتێکی چاکە و بەڕاستی وەڵامیان ئەدانەوە. وەك ئەوە مەبەستە کە لە ئایەتی داهاتوودا دێت. بەڵێ بەو جۆرە قورەیش هەڵئەسان بە دەلەسەو پڕوپاگەندە بەو شێوە بەدە ئەیان ویست بەرگری ئایینەکەی خوا بکەن. هەروەها وێنەی قورەیش لە هەموو چەرخێکدا هەر بووە لەلایەن ستەمکارە خۆ بەزل زانەکان کە نەیان ویستووە دان بنێن بە هەق دا و ملکەچ بن بۆ راستی و بەڵگەی راست. کەواتە قورەیش یەکەم کەس نەبوون کە بڕوا نەهێنن و پیلان بازی بکەن. وەك ئەفەرموێ: ﴿قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە لە پێش ئەمان بوون پیلانیان کرد دەربارەی ئایین و پێغەمبەرەکانیان، بەڵام دوا رۆژ و چارەنووسیان ئەمە بوو لە دنیا و لە رۆژی دواییدا کە قورئان بە شێوەیەکی زۆر سەخت و سامناك نەخشەی ئەکێشێ و نیشانی ئەدات لە شێوەی کۆشك و خانوویەکدا کە خاوەنی پلە و پایە و سەربان و دیوار بێت، بەوە دەست نیشان ئەکات بۆ بەهێزی و زۆر گرنگی پیلانەکانیان، بەڵام لەگەل ئەوەدا خوا پیلانەکانیان لەکار ئەخات و بە تەواوی نایهێڵێ بە وێنەی وێران کردنی ئەو کۆشکە بە جۆرێ داری بەسەر بەردەوە نەهێڵێ و فێڵ بازو پیلان کەرەکان بە خۆیان و پیلان و فێڵەکانیانەوە تێدا بچن بە تەواوی.

فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ

---

**ئەفەرموێ: ﴿فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ﴾ واتە ئینجا مەیل و فەرمانی خوا هات بۆ وێران کردنی ئەو کۆشك و خانووە لە بناغە و پایەکانی یەوە لە ریشەی هێنان، ئینجا بانەکە رووخا بەسەریاندا لەلای سەرووریانەوە ﴿وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ سزایان بۆ هات لەلایەکەوە کە هەستی پێناکەن و بە خەیاڵیاندا نەئەهات و نایەت. ئا بەو جۆرە و بەو وێنە و شێوە نایابە لەکار خستن و لەناوبردن و نەهێشتن پیلان و کردەوە بەدەکانیان ئەخاتە بەرچاو، بەڕاستی وێنە و چیرۆکەکە هەر لە دەست قورئان دێت دارشتنی، زۆربەی زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە ئەوە شتێك و رووداوێکی راستەقینەیە و دەست نیشانە بۆ کۆشك و قەسرەکەی نەمرورد کە دروستی کرد بۆ ئەوەی بەرز ببێتەوە بۆ ئاسمان و ئاگادار ببێ بەسەر کاروباری ئاسمان و دانیشتوانی. ئینجا خوا بەو جۆرو شێوەیە وێرانی کرد. بەهەرحاڵ و لەسەر هەر بار بێ بڕوایان و دوژمنانی ئاین هەمیشە هەوڵ و تێکۆشانیان کردووە بە دژی ئایینی خوا و بڕواداران، خوایش پیلان و فێڵەکانی لەکار خستووە و ئایینی خوا و شوێن کەوتووانی سەرخستووە لە دونیادا و چارەنووس و دوا رۆژیان لە رۆژی دواییشدا بەم جۆرە ئەبێ کە ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ﴾ ئینجا لەپاش سزای ئەم دنیایە لە رۆژی دواییدا ریسوا و سەر شۆڕیان ئەکات بەرامبەر ئەو کەشخە و لوت بەرزی و خۆ بەزل زانی یەی کە لە دنیادا بەکاریان ئەهێنا، بەو سەرشۆڕی و ریسوایی یەوە ئەبرێن بۆ دادگای پەروەردگار و ئەویش بۆ دەم کوت کردن و ئابڕوو بردن و سەر زەنشت و تەریق کردنەوەیان ئەم شێوە پرسیارە ئاراستە ئەکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ﴾ ئینجا خوا ئەفەرموێ پێیان: ﴿أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ﴾ ئایا لە کوێن هاوبەشەکانی من؟ واتە ئەو شتانەی کە ئێوە ئەتان کردن بە هاوبەشی من کە دەمە دەمێ و بەر بەرەکانێی پێغەمبەرەکان و بڕوادارانتان ئەکرد لەبارەیانەوە و لاتان وابوو کە ئەگەر رۆژی دوایی راست بوو بەدی هات تکاتان بۆ ئەکەن؟ ئەوانە لە کوێن و با بێن لەم رۆژەدا بێن بە هاوارتانەوە، دیارە ئەوانە لەبەر ریسوایی و بیم و ترس بێدەنگ ئەبن و ناتوانن دوو لێوە بکەنەوە،**

قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ
ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾
فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾

---

ئەوانەی کە وتەیان ببێ و قسە بکەن ئەمانەن کە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ ئەوانەی کە زانینیان پێ بەخشراوە لە پێغەمبەران و شوێن کەوتووەکانیان یان مەلائیکە، ئەوانە ئەڵێن: ﴿إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ بەڕاستی ریسوایی و سەرشۆڕی و سزا ئەمڕۆ هەر لەسەر بێ بڕواکانە﴿ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەوانەی کە فریشتەکان ئەیان مرێنن و گیانیان ئەکێشن لە کاتێکدا بەردەوام بوون لەسەر ستەم لە خۆیان بەبێ بڕوایی و بت پەرستی ﴿فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ﴾ ئینجا ئەوانە کە یاخی بوون و دەمبازی و بەر بەرەکانێ یان ئەکرد لەوەو پێش لەو کاتەدا ملکەچی و گوێ رایەڵی نیشان ئەدەن نە ئاژاوە و نە بەربەرەکانی یان ئەمێنێ ﴿مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ﴾ ئەڵێن: ئێمە هیچ خراپەو کارێکی بەدمان نەکردووە، لەو کاتەدا ئەو درۆ زلە ئەکەن، ئەوانەی کە ئاگان بە کردەوە بەدەکانیان ئەیان خەنەوە بە درۆوە و ئەڵێن پێیان: ﴿بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ نەخێر درۆ ئەکەن، خوا ئاگادارە لەهەر کردەوەیەك کە ئێوە کردووتانە، کەواتە ناگونجێ بۆتان دەلەسە و دان نەنان بە خۆشاردنەوە لەوەی کردووتانە ﴿فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ﴾ کەواتە بچنە کون و کەلەبەرەکانی دۆزەخەوە یان مەبەست تەبەقەکانی دۆزەخە کە حەوتن وەك باسکرا. لەسەر هەر بار مەبەست ئەوەیە هەرکەس بۆ جێ و شوێنی شیاو و شایستەی خۆی کە بۆی دیاریی کراوە، بچنە ناویانەوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ بەجۆرێ بمێننەوە بە هەمیشەیی و ئێجگاری هەتا هەتایە ﴿فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ ئینجا زۆر بەدە جێ و شوێنی ئەوانەی خۆ بە گەورە و لوت بەرز ئەگرن لەئاستی هەق و دان نەنێرن بەهەق و راستیدا.

۞ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْۚ قَالُواْ خَيْرًاۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٞۚ وَلَدَارُ
ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٞۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٖ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ لَهُمْ فِيهَا مَا
يَشَآءُونَۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ
ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَۚ
كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ

---

**ئینجا بەرامبەر ئەو دەستە پرسیار لێکراوە بەدانە کە باسکران لەم ئایەتانەدا کە تێپەڕیان کرد، بەرامبەر ئەوانە دەستەی پرسیار لێکراوانی چاك و پاك ئەمێنێ و ئەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ﴾ گوترا بەو کەسانەی کە خۆیان پاراست لە بێ بڕوایی و ناهەقی: ﴿مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ ئایا چییە ئەوەی کە پەروەردگارتان هێنایە خوارەوە؟ ﴿قَالُواْ خَيْرًا﴾ لە وەڵامدا گوتیان: شتی چاکی هێناوەتە خوارەوە. ئەم دەستە چاك و پاکە زانی یان هەر فەرمان و جڵەوگیریی و تەمێ و یاسا و هەرشتێك کە لەم قورئانەدا هاتووە هەمووی پیرۆزە و خێرە و بەرەکەتە و دوورە لەهەر کەم و کوڕی و لاری و ناتەواوی، لەبەر ئەوە بە وتەیەکی کورتی پڕ لە چاکە وەڵامیان دایەوە و گوتیان ﴿خيرا﴾. ئینجا ئەندازەیە بە درێژیی ئەو خێرە روون ئەکاتەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٞ﴾ بۆ ئەوانەی کە کردەوەی چاکیان کردووە ئەجرو پاداشتی چاك و ژیانی چاك هەیە لەم دونیایەدا، ئیتر مەبەست زاڵ بوون و سەرکەوتن بێت یان رۆزی فراوان و ئارامی و خۆشی، یان هەر شتێکی تر کە هۆی خۆش بەختی و کامەرانی دڵە ﴿وَلَدَارُ ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٞ﴾ بێگومان ماڵی رۆژی دوایی و ئەجرو پاداشتی رۆژی دوایی کە پێیان ئەبەخشرێ چاکە. چاکترە لەوەی پێیان دراوە لە دنیادا، چاکترە لە هەموو بارو رووییەکەوە، چاکترە لە ژیانی دنیایە ﴿وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان زۆر چاکە ماڵ و جێ و شوێنی خۆپارێزەرە لەخوا ترسەکان.**

ئینجا ئەو جێ و ماڵی ئەوانە دیاریی ئەکات بەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ ﴾ ئەو ماڵی ئەوانە باغ و بەهەشتانێ نیشتەجێن و دروستکراون بۆ مانەوەو نیشتەجێیی تیایاندا کە ئەوانە تێی ئەچن لە کاتێکدا رووبارەکانی دێن و ئەچن بەژێر کۆشك و قەسر و درەختەکانیاندا ﴿لَهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ ﴾ بۆیان هەیە لەو بەهەشتانەدا ئەوەی بیانەوێ و ئارەزوی بکەن ﴿كَذَٰلِكَ يَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ بەو جۆر و شێوە گرنگە خوا پاداشتی خۆ پارێزەرە لەخوا ترسەکان ئەداتەوە ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَۙ ﴾ ئەوانە کەسانێکن مەلائیکە ئەیان مرێنن و گیانیان ئەکێشن بە پاکی و خاوێنی لە بێ بڕوایی و بت پەرستی و ستەم کردن لە خۆیان و لەکاتێکدا پاك و بێگەردن لەو چڵك و چەپەڵی یانە ﴿يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمُ ﴾ لەکاتێکدا فریشتەکان ئەڵێن پێیان: سەلامتان لێبێ بێ باك بن لە هەر بیم و ناخۆشی یەك، ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ بچنە بەهەشتەوە بەهۆی ئەوەی کە کردتان لەدنیادا، واتە بەهۆی ئەو لەخواترسی و گوێ رایەڵی یەی کە هەڵسان پێی لە دنیادا، بەرامبەر ئەوانە بچنە ناو ئەو بەهەشتانە ئینجا لەم کاتەدا کە دوو جۆر و شێوەی گیان دەرچوونی خستە بەرچاو، لەم کاتەدا پرسیارێك ئاراستە ئەکات لەبارەی بت پەرستەکانی قورەیشەوە کە ئایا بە تەمای چین و چاوەڕوانی چی ئەکەن؟ ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَۚ ﴾ ئایا بە تەما هەن بێجگە لەوەی فریشتە بێت گیانیان بکێشێ و بیانمرێنێ؟ یان فەرمانی خوا بێت بۆ زیندوو کردنەوەیان یان هاتنی سزای لە ریشە هێنانیان ! واتە بێگومان ئەوانە ئەو دوو رووداو و بەسەرهاتەیان بەسەر دێت، هەروەها سێ یەم بەپێی باوی خوا دەربارەی یاخی یەکان لە گەلە پێشووەکاندا، کەواتە با ئەمانە تەمێ خوار بن لە پێشووەکانیانەوە. ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ ﴾ بێ بڕواکانی گەلە پێشووەکان لە پێش ئەماندا بە وێنەی کردەوەی ئەمان کردەوەیان کرد تا خوا دووچاری کردن،

وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٣٣ فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ
بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٣٤ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ
نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ

---

**﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا ستەمی لێ نەکردن، واتە بە بێ تاوان و گوناه و هۆی سزادان سزای ئەوانەی نەدا ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ بەڵکو ئەوان ستەمیان لەخۆیان کرد بە بێ بڕوایی و گوناهو کردەوەی بەد ﴿فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ﴾ بەهۆی ئەوەوە سزا و تۆڵەی کردەوە بەدەکان کە کردیان و بەردەوام بوون لەسەریان بەسەریان هات و دووچاری بوون. ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ دەوری دان و هاتە سەریان و نووسا پێیانەوە ئەوەی کە ئەوان گاڵتە و لاقرتی یان پێ ئەکرد، واتە ئەو سزای کە هەڕەشەیان لێ ئەکرا و ئەترسێنران پێی. ئینجا باسی وتەیەك ئەکات لە وتەکانی بت پەرستەکان کە ئەیکەن بەهۆی بت پەرستی یەکەیان، ئینجا بەرپەرچی ئەداتەوەو وتەکەیان بە ناڕەوا دەرئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ﴾ ئەوانەی کە هاوبەشیان داناوە بۆ خوا، ئەوانە گوتیان و ئەڵێن: ﴿لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ ئەگەر خوا بیویستایە بێجگە لە خوا هیچ شتێکمان نەئەپەرست، نە ئێمە و نە باوك و باپیرمان﴿وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ﴾ حەرام و قەدەغەمان نەئەکرد و بەبێ ئەو و بێجگە لەوەی ئەو قەدەغەو حەرامی کردووە، واتە ئەم پەرستنی غەیری خوا و ئەو حەرام کردنی هێندێ شت، وەك بەحیرە و سائیبە لەلایەن ئێمەوە بە ویست و ئیرادەی خوایە، هەرچی ئەو بیەوێ ئەبێ هەر ببێ. مەبەستیان بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانە کە بەناوی خواوە قەدەغەی قەدەغە کراوەکانیان رائەگەیاند و بەناوی خواوە فەرمانیان دەرئەکرد، بەڵێ راستە هەموو شت بە ویست و ئیرادەی خوایە، بەڵام نەك بەو جۆرەی ئەوان ئەیان گوت و وایان دائەنا کە بەندە ناچارە و هیچ شتێکی بەدەست نییە،**

نەخێر ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە و خوای پەروەردگار ویستی ئەم ئادەمییە بە جۆرێ دروست بکات کە ئامادە بێت بۆ چاکە و خراپە، ویست و ئیرادەیەکی پێدا کە باوی هەر ڕێگە و بارێك بدات بەسەر ڕێگە و بارێکی تردا، بێگومان ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە زۆرانەش هەیە لەم بوونەوەرەدا کە هەرکەس فامدار بێت ڕێگەی ڕاست ئەداتە بەر، ئینجا سەرباقی ئەوەی کە باسکرا خوای میهرەبان بەندەکانی بەرەڵاّ نەکرد کە هەرکەس بە پێی ئارەزووی خۆی هەست و بۆچوونی خۆی بخاتە کار، بەڵکو پێغەمبەرانی بۆ ناردن بە شەریعەتێکەوە کە بیکەن بە ترازوویەکی ڕاست کە ژێریی پەنای پێ ببا لەهەر کارێك کە روون نەبێ بەلایەوە، ئەو پێغەمبەرانەشی نەگێڕا بە زۆردارێکی زاڵ بەسەر بەندەکانی یەوە، بەڵکو هەر ڕاگەیاندن و ئامۆژگاری دایە دەستیان. ئینجا ویست و ئیرادەی خوا هاتووە بە پێی ویست و ئیرادەو کردەوەی بەندە، ئەبێ بەو جۆرەی کە باسکرا تێ بگەین لە ویست و ئیرادەی خوا و زاڵی بەسەر هەموو شتێکدا لەگەڵ ئەوەدا بەندەیش ویست و مەیل و ئیرادەی هەیە و ناچار نییە لە کردەوەدا. ئەو قسە و بۆچوونە هەڵەی کە قورەیش بوویان تەنها قسە و بۆچوونی ئەمان نەبووە، بەڵکو نەفامانی پێش ئەوانیش هەر بەو جۆرە بوون، وەك ئەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ بەو جۆرەی کە قورەیش ئەیکەن لە بڕوا نەکردن بە پێغەمبەران و حەرام کردنی ئەوەی کە خوا حەلاّڵی کردووە، گەلەکانی پێشوو لە پێش ئەماندا هەر بەو جۆرەیان کرد. ﴿فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ دەی ئایا فروستادە و ڕەوانەکراوەکانی خوا بەرامبەر ئوممەتەکانیان هیچیان لەسەر بووە بێجگە لە ڕاگەیاندنێکی ڕووت؟ واتە نەخێر بێجگە لەوە هیچیان لەسەر نەبووە، و خەڵکەکەش ناچار نەبوون و بە ویست و ئارەزووی خۆیان بارێکیان هەڵبژاردووە بۆ خۆیان وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا ﴾ سوێند بەخوا ڕەوانەمان کردووە لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا نێرراو و فروستادەیەك ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ بەمەی خوا بپەرستن بە تەنها و خۆتان دوور خەنەوە لەپەرستنی هەرشتێ کەبانگ بکات بۆگومڕایی و پەرستنی هەر شتێ بێجگە لە خوا،

فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن
نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ

---

﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ﴾ ئینجا لەناو ئەو ئوممەتانەدا هێندێ هەبووە کە خوا ڕێنموونی کردبێ بۆ ڕێگەی ڕاست کە پەرستنی خوایە بە تەنها و بەبێ هیچ هاوبەشێك ﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ لەوانەدا هێندێکیش بووە کە گومڕایی لەسەر جێگیر و دامەزراو بووە لەو جۆرو شێوەی کە باسمان کرد لە ئایەتی پێشوودا. واتە هەرکام بە ویست و ئیرادەی خۆی بارێکی هەڵبژاردووە و خوایش بە پێی ئەو مەیل و ویستە ئیرادە و مەیلی هاتووە. کەواتە ئەو ناچار کردنەی کە ئەو بت پەرستانە دەست نیشانیان کرد و ئەیان گوت، ئیتر بە گاڵتە و لاقرتی یەوە یان هەر بۆچوونیشیان وا بووبێ. ئەو گومانەی ناچار و ناچار کردنە ناڕاست و بێ بنج و بنەوانە بە دەقی فەرمودەی قورئان، هەروەها زۆرکەس هەن لە گوناهکارانی بەناو بڕوادار ئەو قسە ناڕاست و ناڕەوایە ئەکات و ئەو بیانووە بێ جێیە ئەهێنێتەوە ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ ئینجا ئەی بت پەرستەکان: بڕۆن بگەڕێن بە وڵاتدا، ئینجا سەرنج بدەن ئایا چۆن بوو پاشەڕۆژی بێ بڕواکان؟ سەرنجی جێ و شوێنەواری عاد و سەمود و ئەوانی تر بدەن کە چۆن دووچاری سزای خوا بوون لەسەر تاوان و بڕوا نەهێنانیان. لە پێشەوگوتمان: مەیل و ئیرادەی خوا بەپێی مەیل و کردەوەی بەندە هاتووە، واتە خوا زانیویەتی بەندە بە مەیل و هەڵبژاردنی خۆی کام بار هەڵئەبژێرێ بۆ خۆی، خوایش لە ئەزەل دا مەیل و بڕیاری ئەو بارەی داوە، بۆ نموونە: خوا زانی ئەمانە ڕێگەی گومڕایی ئەدەنە بەر و هەڵی ئەبژێرن، کەواتە ئیرادەی ئەوەی کرد لێیانەوە و بڕیاری ئەوەی لەسەردان، کەواتە بێجگە لەوەی خۆیان مەیلیان کرد بەدی نایەت وەك وەرئەگیرێ لەم فەرمودەیەوە: ﴿إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەگەر زۆر سوور بیت لەسەر ڕێنموونی ئەوانە و زۆر مەبەستت بێت، بێگومان خوا ڕێنموونی هیچ کەسێك ناکات کە گومڕای ئەکات، چونکە نە گومڕا کردن و نە خستنە سەر ڕێگە بە

دەست پێغەمبەر نییە و کار و کردەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەیەوە هەر ڕێ نیشاندان و ڕاگەیاندنە، ئیتر پاش ئەوە گومڕایی و کەوتنە سەر ڕێگە بەدی دێن بە پێی باوی نەگۆڕاوی خوا، هەرکەس گومڕا بووبێ بەپێی ئەو باوی خوا، بێگومان خوا ڕێنموونی ناکات، چونکە خوا چەند باو و ڕەوشتی داناوە کە بەرهەم و سەرەنجامەکانیان ئەبێ بەدی بێت، کەواتە ئەوانەی کە شایستەی گومڕایین بەپێی ئەو باوی خوا ئەبێ هەر گومڕا بن و چارەسەر ناکرێن﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ نییە بۆیان هیچ جۆرە یارمەتی دەر و کۆمەکی کەران.

ئینجا دێتە سەر وتەیەکی تری ئەو بێ بڕوایانە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ﴾ ئەوانە سوێندیان ئەخوارد بە خوا و سوێند ئەخۆن لەکاتێکدا ئەچن بە تکا و تاسەوە و زەحمەت ئەکێشن لە سوێندەکانیاندا، بەهێز و توندی سوێند ئەخۆن ﴿لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ﴾ هەرکەس بمرێ خوا زیندووی ناکاتەوە، خوا پێغەمبەرانی ناردووە و خەڵکی یان ترساندووە بە هاتنی ڕۆژی دوایی و حیساب و پرسیار، و مەسەلەی زیندوو بوونەوە گرێ یەکی سەخت بووە لە دڵی زۆر لەگەل و کۆمەڵە نەفامەکاندا. جا هێندێ لەو نەفامانە بێ بڕواکانی قورەیشە کە بەو جۆرە سوێندیان ئەخوارد لەسەر زیندوو بوونەوەو بەلایانەوە شتێکی ناڕاست و نەگونجاو بووە، ئەو نەفامانە دانیان ئەنا بە بوونی خوا و سوێندیان پێ ئەخوارد، بەڵام لایان وابوو مردوو زیندوو ناکاتەوە، زیندوو کردنەوە لەپاش وشك بوونەوەی ڕزینی لەش زۆر بە سەخت و نەگونجاو سەیریان ئەکرد. ئەوانە بێ ئاگا بوون و بیریان نەئەکردەوە لە پەیدا بوونی یەکەم جاریان کە هەرچۆنێ لە یەکەم جارەوە پەیدا بوون بۆچی سەریان سوڕ بمێنێ لە دووەم جار... ئەوانە نەفام و بێ ئاگا بوون لە چۆنی یەتی دەسەڵات و توانای خوا، کە بەراورد ناکرێ لەگەڵ هیچ دەسەڵات و توانینێك دا، نەیان ئەزانی کە دروستکردنی هەر شتێ بۆ خوا هیچی تێناچێ و هیچی ناوێ جگە لەوە کە مەیل و ئیرادەی ڕووی تێ بکات، ئیتر ئەو شتە بێ دواکەوتن ئەبێت و فەراهەم دێت. ئەوانە نەفام و بێ ئاگا بوون لەو کار دروستییەی کە لە زیندوو کردنەوەدا هەیە و داد و دادپەروەری داخوازە بۆ زیندوو کردنەوە تا هەموو کەس بگات بە بەرهەم و سەرەنجامی کردەوەی خۆی، بیریان نەئەکردەوە کە چۆن ئەو هەموو تاوان و خراپەکاری یە هەر وا بڕوا بە بێ لێپرسینەوە و تۆڵەیان ئەو هەموو چاکە و چاکەکاری یە بێ سوود بڕوا!

بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ
وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن
فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ
أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا
رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ

جا لەبەر ئەوە ئەو بێ ئاگایانە دەم کوت ئەکات و بە درۆیان ئەخاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿بَلَىٰ﴾ نەخێر زیندووی ئەکاتەوە ﴿وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾ واتە ئەو زیندوو کردنەوە بەڵێنێکە لەلایەن خواوە دامەزراوە لەسەری و هەق و راستە و ئەبێ هەر ببێ. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن کارەکە بەو جۆرەیە، یان نایزانن و زانینیان نییە، ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی ئەو زیندوو کردنەوە، ئەفەرموێ: ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ﴾ واتە زیندوویان ئەکاتەوە بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی دووبەرەکین تیایدا، تا دەرکەوێ هەموو هەق و ناهەقی یەك کە لە دنیادا دووبەرەکین تیایدا ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ﴾ تا ئەوانەی کە بێ بڕوان و بڕوایان نەهێناوە بزانن کە درۆزنن و درۆیان کرد لەو بۆچوون و بیر و بڕوایەدا کە لەسەری بوون. ئینجا زیندوو کردنەوە شتێکی سووك و ئاسانە و بێجگە لە مەیل و ئیرادەی خوا ئیتر هیچی ناوێ وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ وتەی ئێمە بۆ هەر کاتێ بمانەوێ و ئیرادەی بکەین هەر ئەمەیە پێی ئەڵێین: ببە، ئیتر دەست بەجێ ئەبێ، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن مەبەست بەو گوتنە روو کردنی مەیل و ئیرادەی خوایە بۆ ئەو شتە.

ئینجا بەرامبەر ئەو تاقمە یاخی و خۆ بەزل زانانە، ئەو بڕوادارانە ئەهێنێ کە بڕواکەیان پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ واز هێنان لەماڵ و سامان و وڵات لە رێگەی خوادا و خوایش بەهرەمەندیان ئەکات بە بەرهەم و ئەجر و پاداشتی خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ

﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ﴾ ئەوانە کە کۆچیانکردووە لە ڕێی خوا و لەبەر ڕەزامەندی خوا و دوای ئەوەی ستەمیان لێکرا ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِی ٱلدُّنۡیَا حَسَنَةً﴾ نیشتەجێیان ئەکەین لە دنیادا بە نیشتەجێ کردنێکی جوان و شیرین، یان نیشتەجێ یان ئەکەین لە دنیادا لە شوێن و ولاّتێکی جوان و شیرین دا. لەسەر هەربار خوا ئەوانەی نیشتەجێ کرد لەو چەرخەدا لە مەدینەی منەوەرەدا و ئەو هەموو خێرو بەرەکەتەی ڕژاند بەسەریاندا. هەروەها لەپاش ئەوان ئەو کەسانەی کە ڕێگەی ئەو یەکەم چینەی دابێتە بەر خوا هەر لە دنیادا دەرووی خێری لێکردوونەتەوە خۆش بەخت و کامەرانی کردوون هەر لە دنیادا ﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأَخِرَةِ أَكۡبَرُ﴾ بێگومان ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دوایی گەورەترە لەوەی پێ‌یی بەخشیون لە دنیادا ﴿لَوۡ كَانُواْ یَعۡلَمُونَ﴾ ئەگەر بێ بڕواکان بیان زانیایە کارەکە بەو جۆرەیە یاخی نەئەبوون و ڕێگەی بڕوادارانیان ئەدایە بەر. یان ئەگەر بڕوادارە کۆچ کەرەکان بیان زانی یایە بە زانینێکی بەهێز تر، زیاتر تێکۆشانیان ئەکرد لە ڕێی ڕەزامەندی خوادا، بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ ئەگەر چی یەکەم لەدڵدا بەهێز ترە، ﴿ٱلَّذِینَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ یَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەوانە کەسانێك بوون کە خۆیان گرت، هەر پشتیان بە پەروەردگاریان بەست و بەردەوام بوون لەسەر ئەوە.

ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ باسی کار و پیشەی پێغەمبەران – سەلامی خوایان لێ بێت – ئەو باسەی کە لە پێشەوە دەم کوتی بێ بڕواکانی پێکرد لەبارەی ئەوەی کە گوتیان. بت پەرستی یەکەیان بە مەیل و ئیرادەی خوایە. لێرەدا ئەگەڕێتەوە کار و فرمانی دواترینیان باس ئەکات بۆ سەر خەڵکی بە گەورەترین نامە و بەرنامەی خواوە، ئەوەشی کرد بە سەرەتا بۆ هەڕەشە کردن و ترساندنی ئەوانەی بڕوا ناهێنن، لە هەمان کاتدا دەم کوتیان ئەکات لەوەی کە چۆن فروستادە ئادەمی بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالًا﴾ ڕەوانەمان نەکردووە لەپێش تۆ بێجگە لە چەند پیاوێك کە: ﴿نُّوحِیٓ إِلَیۡهِمۡ﴾ وەحیمان کردووە بۆلایان، واتە ئادەمیمان ڕەوانە کردووە بە پێغەمبەرێتی، نەك فریشتە یان تیرەیەکی تر، ڕاگەیاندنی ئایین و فەرمانی خۆمان حەواڵەی ئەوان کردووە، هەرچۆنێ ڕاگەیاندنمان حەواڵەی تۆ کرد،

فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ
مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ

---

**﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ﴾ دەی پرسیار بکەن لە زانایان، واتە نامەدارەکان(یەهود و نەسرانی یەکان) دەی پرسیار بکەن ئەی بێ بڕواکانی مەککە کە باوەڕتان وایە ئەوانە زانا و نامەدارن. پرسیاریان لێبکەن تا ئاگادارتان بکەن کە فروستادەی ئەوان هەر پیاو بووە، نەك فریشتە یان(جن) یا جۆرێکی تر﴿إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە ئەوە نازانن ﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ﴾ چەند رایەك هەیە لەبارەی پەیوەستی ئەم فەرمودەیەوە: بەهێز ترینیان ئەمەیە پەیوەستە بە وتەی: ﴿ارسلنا﴾ وە کە نەگوتراوە بە نیشانەی گوتنی لەسەری ئایەتەکەدا، واتە ئەو پیاوانەمان نارد بە چەند بەڵگە و موعجیزەی ئاشکرا و بە چەند نامەی جیا جیا، ئەو وتە لابراوە وەلآمی پرسیارێکی بڕیار دراوە لێرەدا، وەك گوترابێ ئایا ئەوانە بەچی رەوانە کراون لە وەلآمدا گوترا: بە چەند بەڵگەیەکی ئاشکرا... هتد. هەڵئەگرێ هەر پەیوەست بێت بە گوتراوەکەوە و ﴿فسئلوا اهل...﴾تێ هەڵکێش بێت. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر و فروستادە لە ئافرەتاندا نەبووە، هەروەها منداڵ. کەواتە عیسا(علیه السلام) هەروەها یەحیا هەر ئەبێ پێغەمبەر بووبن نەك لە یەکەم جارەوە نێرراو و فروستادەش. ئینجا ناوبردنی مەلائیکە بە فروستادە وەك ئەفەرموێ: ﴿جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾ مەبەست ئەوەیە نێرراو و فروستادەن بۆلای مەلائیکە و مەبەست بە فروستادە لەم ئایەتەدا فروستادەیە بۆلای ئادەمی، یان فروستادەیی ئەوان هەر بۆ سەر پێغەمبەران نەك بۆ سەر خەڵکی تریش، یان مەبەست بە فروستادەیی ئەوان ناردنی نییە بە پێغەمبەرێتی، بەڵکو ناردنە بۆ هێندێ کار و فرمانی تر. وەك ناردنیان بۆ سەر گەلەکەی لوط بۆ لەناوبردنیان و وێران کردنی ولآتەکەیان. ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ هێنامانە خوارەوە**

بۆلای تۆ پەند و ئامۆژگاری و بێدار کردنەوە، واتە قورئان کە هۆی پەند و ئامۆژگاری و بێدار کردنەوەیە لە خەوی بێ ئاگایی، تا رادەیەك وەك بوو بێ بە نەفسی ئامۆژگاری و بێدار کردنەوە. ئەم قورئانەمان هێنایە خوارەوە بۆ لات بۆ ئەوەی باس بکەیت بۆ هەموو ئادەمی بە روونی ئەوەی کە هێنراوەتە خوارەوە بۆلایان لەم قورئانەدا. واتە ئەم قورئانە کە دواترین نامەی خوایە بۆ سەر هەموان چ نامەدار و چ بێ نامە، ئەم قورئانەمان هێنایە خوارەوە بۆ سەر تۆ ئەی محمد لەبەر ئەوەی هەرچی لەم قورئانەدا هاتوە تۆ باسی بکەیت بە روونی بۆ هەموان ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ بەڵکو خەڵکی بیر بکەنەوە لە ئایەتەکانی خوا و ئایەتەکانی قورئان کە هەمیشە پاڵدەر و سەرنج راکێشن بۆ بیر کردنەوە، پاڵدەرن بۆ وریا بوونەوەو بێداری لە خەوی بێ ئاگایی. نامەدارەکان هەڵە و دووبەرەکی زۆر و بەدیان تێکەوت و تەنها ئەم قورئانە چارەسەر بوو بۆیان و هات و ئەوەی پێویست بوو بە روونی باسی کرد و هەتا هەتایە هەر ئەم چارەسەرە بۆ ئەوانیش و بۆ هەر کەسانێکی تر، جا ئیتر هەرکەس بەختەوەر بێت ئەوا شوێن ئەم قورئانە ئەکەوێت و ئەگات بە ئامانج و هەرکەس چارە رەش بێت دوور ئەکەوێتەوە لە روناکی ئەم قورئانە. خوا بە میهرەبانی خۆی بەختەوەر و بەهرەمەندمان بکات.

ئینجا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە دوو شت کە هەموو ویژدانێکی زیندوو بێدار ئەکاتەوە و دایئەچڵەکێنێ و سەرنجی رائەکێشێ بەرەو پەروەردگاریی خۆی. یەکەم ئەیترسێنێ لە پیلانی خوا و تۆڵەی کە هەمیشە لە کەمیندایە بۆ تاوانباران و خۆ بەزل زانەکان کە هەمیشە خەریکی پیلان و کردەوەی بەدن دەربارەی ئاینی خواو بڕواداران، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ﴾ دەی ئایا ئەوانەی کە پیلان و کردەوە بەدەکانیان ئەکەن و ناترسن و بێ باکن لەوەی خوا بیان بات بە ناخی زەویدا. واتە ئایا ئەو بەد کردارانەی کە ئەم قورئانەت پێ راگەیاندن و لەم قورئانەدا باسی رووداو و بەسەرهاتی سەختی گەلە بەد کردار و بێ بڕواکانی رابوردووت بۆ کردن. ئایا ئەوانە بیریان نەئەکردەوە و تەمێ خوار نەبوون بەهۆی ئەوەوە بێ باکن لەوەی خوا بیان بات بەناخی زەویدا بە وێنەی قارون،

أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ
يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ
عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾

---

﴿أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ یان سزای دیاریی کراویان بۆ بێت لەلایەکەوە کە هەستی پێناکەن، واتە لە ناکاو و بە کوت و پڕی وەك بەو جۆرەی هێنا بەسەر گەلەکەی لوط ﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ﴾ یان بیان گرێ و سزایان بدات لە گەڕان و هات و چۆ و سەفەر کردنیاندا بە بێ ترس و بیم ﴿فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ﴾ چونکە بێگومان ئەوانە لە دەستی خوا دەرناچن و یاخی نابن لێی و لەهەرکات و شوێن و بەهەر جۆر خوا زاڵ و توانایە بەسەریاندا. ﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ﴾ یان ئەیان گرێ بە ترس و بیمەوە و لە کاتێکدا بیم و ترسیان بۆ پەیدا بووە بەهۆی بەسەرهات و رووداوی سەخت و سزایەکەوە کە دیتویانە، ئینجا ئەیان گرێ و لەناویان ئەبات بەو بیم و ترسەوە وەك هێندێ ئەفەرمون. هێندێکی تر ئەفەرمون: ئەیان گرێ بەرە بەرە بە کەم و کوڕی کردن لەماڵ و سامان و خۆیاندا، ئینجا لە پاشان بە تەواوی لەناویان ئەبات. بە چەند جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە کە هەرکام لەم دوو تەفسیرە ئەگرێتەوە، واتە بێ باك نەبن لەو سزا جۆر بەجۆرانەی کە باسکران، ئەو سزایانە لە ئارادان و ئێوە شایستەن بۆ سزای خوا، بەڵام خوا پەلەتان لێناکات ﴿فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ چونکە بێگومان پەروەردگارتان میهرەبان و بەزەیی دارە، هێندێ ئەفەرمون: ئەم فەرمودەیە پەیوەستە هەر بە دوورترینەکەیانەوە و هۆی هەر ئەوە. واتە ئایا ئەوانە ناترسن لەوەی خوا بیان گرێ بەرە بەرە و بە ترس و بیمێکەوە بۆیان فەراهەم دێت لە دیتنی بەسەرهات و رووداوی سەختەوە،

هۆی ئەوەش کە دەست بەجێ و کوت و پڕ نایان گرێ و لەناویان نابات، بەڵکو بەرە بەرە ئەیان ترسێنێ هۆی ئەوەش ئەوەیە کە خوا میهرەبان و بەزەیی دارە و بەو جۆرە مۆڵەتیان ئەدات. دووەم شت کە باسەکەی پێ دوایی ئەهێنێ ئەمەیە ئەم بوونەوەرە سەرجەم خوای خۆی ئەپەرستێ و لەناو ئەم بوونەوەرەدا هەر هێندێ لە ئادەمی و(جن) یاخی یە و سەرپێچی ئەکات لە پەرستنی، ئەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾ ئایا ئەوانە ئەیان دیوە و ئاوڕێکیان ئەداوەتەوە بۆلای هەر شتێکی سێبەردار کە سێبەرەکانیان ﴿ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴾ ئەگەڕێنەوەو چەرخە ئەکەن لەلای ڕاست و لەلای چەپیانەوە بە سوژدە بردن و ملکەچی یەوە بۆ خوا لە کاتێکدا خاوەن سێبەرەکان ژێر بار و زەلیلن بۆ مەیل و ئیرادەی خوا، بەهەر جۆر مەیل و ئیرادە کرابێ. بەڕاستی شێوە و وێنەی سێبەر دارەکان کە لە بەیانیان و لە کاتی دەرکەوتنی تیشکی خۆردا ئەو سێبەرانە بەرەو ڕۆژ ئاوا ئەڕۆن بە ئەندازەی تایبەتی هەر سێبەر دارێك. ئینجا بەرە بەرە کەم ئەبنەوە و ئەگەڕێنەوە، تا لەکاتی نیوەڕۆ و لادانی خۆر لە ناوەڕاست، ئینجا بەرە بەرە درێژ ئەبنەوە بەرەو خۆرهەڵات تا کاتی ئاوا بوونی خۆر. ئەو شێوە و دیمەن و شێوەیە ئێجگار نایاب و بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر لێزانی و کاردروستی ئەو داهێنەرە پەروەردگارە کە ئەو بوونەوەرەی ڕاگیر و دامەزراو کردووە، بەڵام بەڵگە و نیشانە هەر ئەنداز گەورە و گرنگ بێت فەرامۆش ئەکرێ و لەبیر نامێنێ، زۆرتر لەبەر دەق پێوە گرتن. جا لەبەر ئەوە قورئان هەموو دڵ و دەروون بێدار ئەکاتەوە و دایان ئەچڵەکێنێ تا بێدار ببنەوە لەو خەوی بێ ئاگاییە و هاوبەشی ئەو هەموو دروستکراوانە بکەن لە پەرستن و ملکەچی بۆ خوای پەروەردگاریان،

سوژدەی پەرستنی بۆ ببەن وەك بە ناچاری هەموو شت سوژدەی ملکەچی و ژێر باری ئەبات وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ﴾ هەر بۆ خوا سوژدە ئەبات هەرچی وا لە ئاسمانەکان و هەرچی وا لە زەویدا لە گیان لەبەرانێ کە ئەگەڕێن و هات و چۆ ئەکەن تیایاندا، یان مەبەست ئەوەیە: هەرچی لە ئاسمانەکان دایە و هەرچی گیان لەبەرانێ کە لە زەویدا ئەگەڕێ. ئەوەش بە پێی ئەوە ﴿دابة﴾ ناوبێت بەس بۆ ئەوەی بەسەر زەویدا ئەگەڕێ. ئینجا بە تایبەتی باسی مەلائیکە ئەکات لەبەر پایە و پلەی بەرزیان لای خوا، ئەفەرموێ: ﴿وَالْمَلَائِكَةُ﴾ مەلائیکەش سوژدە هەر بۆ خوا ئەبات و ئەمان جیان لە ئادەمی و(جن) بەمەی هەموو سوژدە بەر و خواپەرست و ملکەچن و خۆ بەزل زان نین، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ لەکاتێکدا کە ئەوان خۆ بە گەورە دانانێن و سەرپێچی ناکەن لە هیچ فەرمانێکی پەروەردگاریان. بێگومان ئەم بوونەوەرە و هەرچی تێدایە سوژدەی ملکەچی و ژێر باری هەیە بۆ خوا بە گیان لەبەر و بێ گیانەوە بەلای هەموو موسڵمانێکەوە. ماوەتەوە سوژدەی پەرستن ئایا هەر بۆ مەلائیکە و هێندێ لە ئادەمی و(جن) هەیە، یان ئەویش بۆ هەموو شتێ هەیە بە گیاندار و بێ گیانەوە، بێجگە لە بێ بڕوا و یاخی یەکانی ئادەمی و(جن)؟ کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کە بێجگە لەو یاخی یانە ئیتر هەموو شتێ خوای خۆی ئەناسێ و ئەیپەرستێ بە جۆر و شێوەیەك کە ئێمە نایزانین، بەڵگەی بەهێزیشیان بە دەستەوە هەیە لە ئایەت و لە حەدیس وەك ئاماژەمان بۆ کرد لە چەند شوێنێ لەم تەفسیرەدا. ئەو مەلائیکەتانە کە سوژدە ئەبەن لەگەڵ ئەوەدا پایە بەرز و بێ گوناهن،

يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴿٥٠﴾ ۞ وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ

**﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ﴾ ئەترسن لە پەروەردگاریان، ئەترسن لە سزایەك كە بیدا بەسەریاندا لەلای سەروویانەوە، یان ئەترسن لە پەروەردگاریان كە زاڵە بەسەریاندا، ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ هەر فەرمانێكیان پێ بكرێ ئەیكەن و بەجێی ئەهێنن و بەردەوام ئەبن لەسەر ئەوە. هێندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن ئەو راناوەی كە لێرەدا هەن لە(هم) تا دوایی ئەم ئایەتە سەرجەم ئەگەڕێنەوە بۆ وتەی(ما) واتە هەر بۆ خوایە سوژدە ئەبات هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لە زەویدا لە كاتێكدا ئەوانە خۆیان بە گەورە نازانن و سەرپێچی ناكەن لە پەروەردگاریان، ئەترسن لێی و هەر فەرمانێكیان پێ بكرێ ئەیكەن. بەم جۆرەش هەر چاكە و ئەمە رێكە لەگەڵ ئەو رایە كە سوژدە و پەرستن دائەنێ بۆ هەموو شتێ بێجگە لە یاخی یەكانی ئادەمی و(جن) خوای خۆی باش ئەزانێ.**

**ئینجا لەم ئایەتانی داهاتووەدا دێتەوە سەر باسی خوایەتی و تاك و تەنهایی خوای پەرستراو، تەنهایی و خاوەنی هەمووان، تەنهایی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئینجا باسەكە دوایی ئەهێنێ بە دوو چیرۆك وەك ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ واتە خوا فەرموێ بە هەموو كەس لەسەر زمانی پێغەمبەرەكانی خواو پەرستراو بڕیار مەدەن واتە خوا بە پەرستراو بڕیار بدەن، بەڵام نەك دووان و زیاد لە یەك ﴿إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ خوا هەر یەك خوایە، ئا بەو جۆرە مەبەستەكە روون ئەكاتەوە و دووبارەی ئەكاتەوە، ئینجا بەدوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ كەواتە هەر لە من بترسن و بیم و دڵە لەرزەتان ببێ، نەك لە هیچ كەسێكی تر و شتێكی تر. بەو جۆرو شێوە تاك و تەنهایی خوا روون ئەكاتەوە، چونكە مەسەلەی تاك و تەنهایی بە بێ وێنە و هاوبەش زۆر دوور و ناسكە و بنەڕەت و یەكەم و سەر دەستەیە بۆ هەموو كار و كردەوەیەكی راستەقینە و راست و رەوا، هەموو بەند و بەشەكانی ئایینی خوا بەستراوە بەو تاك و تەنهایی یە پاك و خاوێنەوە. ئەوتاكە خوایە خاوەنە بۆ هەموو شتێ و لە راستیدا هیچ خاوەنێك نییە ئەو نەبێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ هەربۆ ئەوە و موڵكی ئەوە هەرچی وا لە ئاسمانەكان و هەرچی وا لە زەویدا.**

وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ
تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾

---

﴿وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ﴾ هەر بۆ ئەوە گوێ ڕایەڵی و ملکەچی و پەرستنی بەجۆرێ کە پێویستە و ئەبێ هەر وابێ، چونکە ئاشکرایە کە هەر ئەو خوایە، تەفسیری(واصب) بەم جۆرە لە(ئیبن و عەباس و حسن و مجاهد و ضحاك) و کۆمەڵێکەوە هاتووە، هێندێ ئەفەرمون: هەر بۆ ئەوە ئایین کە ئەرك و زەحمەتی تێدایە. هێندێکی تر ئەفەرمون: هەر بۆ ئەوە ئایین کە هەر وا هاتووە لە یەکەم جاری هاتنی ئایینەوە هەتا هەتایە، کەواتە ئایینهەر ئایینی ئەوە. لەسەر هەر بار بێ بڕواکان کە یەکەم چینی ئەم ئوممەتەن یەکەم و سەر دەستەن و شایستەیی ئەوەن کە ئەم بێزاری یەیان ئاراستە بکرێ لە شێوەی پرسیاردا: ﴿أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ واتە ئایا لەپاش ئەوەی کە دەرکەوت هەموو بوونەوەر سوژدە ئەبات بۆ خوا و هەموو موڵکی ئەون، خواش جڵەوگیریی کرد لە بڕیاردانی بێجگە لە یەك خوا. لەپاش ئەوە دەی ئایا خۆتان ئەپارێزن و ئەترسن لە هیچ شتێ بێجگە لە خوا؟ واتە ئەبێ خۆتان هەر لە خوا بپارێزن و هەر لەو بترسن.... ئینجا بەخشندە و خاوەنی هەموو چاکە و نیعمەتێك هەر خوایە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ﴾ هەرچاکە و نیعمەت و بەهرەیەك کە بە ئێوەوە هەبێ و لەگەڵتان بێت، هەمووی هەر لە خواوەیە. ئینجا لەکاتی تەنگی و ناڕەحەتیدا بە سروشت پەنا هەر بەو ئەبەن، بەهیچ ڕەنگ بت و بت پەرستیتان نامێنێ، کەواتە تەنها خوا بە فریاد ڕەس بزانن و ڕوو هەر لەو بکەن بەبێ هیچ هاوبەشێك وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ﴾ ئینجا کاتێ کە زیانێکتان لێکەوێ و دووچاری ناڕەحەتی یەك ببن پەناو هاوار هەر بۆلای خوا ئەبەن بۆ ڕزگار بوونتان و نەهێشتنی ئەو زیان و ناخۆشی یە. ئا بەو جۆرە دەرکەوت کە خوایەتی و خاوەنی ئایین و چاکە و نیعمەت و پەنا پێ بردن تایبەتی یەو هەر

بۆ خوا ئەبێت، سروشتی ئادەمی شایەتی ئەدات لەسەر ئەوانە لەکاتی تەنگانەدا، لەگەڵ ئەوەدا هێندێ لەخەڵکی لەپاش نەمانی تەنگی و ناڕەحەتییەکە ئەگەڕێنەوە سەر بت پەرستی و هاوبەش ڕەوا دانەکەیان، وەك ئەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە کاتێ خوا زیان و ناڕەحەتی یەکەی لێ لابردن و نەیهێشت ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ ئیتر دەست بەجێ دەستەیەك لە ئێوە هاوبەش بڕیار ئەدەن بۆ پەروەردگاریان، ڕەنگە ئەو ڕزگار کردن و نەهێشتنی زیان و ناخۆشی یە لە خواوە نەناسن و بەهێنی ئەوی دانانێن، بەڵکو بە هێنی کەسێکی تر یان شتێکی تری دائەنێن. ئەو نموونە لەناو ئادەمیدا زۆرە و چەند جار دووبارە ئەبنەوە، زۆرجار بینراوە و ئەبینرێ خەڵکی لە کاتی تەنگی و تێ گیران دا ڕوو ئەکەنە خوا و پەنای پێ ئەبەن، چونکە بە سروشت ئەزانن پەنادەر نییە بێجگە لەو، لە کاتی خۆشی و ڕزگاربووندا خەریك ئەبن بە ناز و نیعمەت و ڕابواردنەوە، بەهۆی ئەوەوە پەیوەندی دڵیان ئەپچڕێ لەخوا و بە چەند جۆر و شێوەیەك هێندێ بە بێ پێچ و پەنا هاوبەش بۆ خوا دائەنێ، هێندێ جار هەرچەند بەو شێوە ناڵێ و ئەو ناوەی لێنانێ، بەڵام لە ڕاستیدا هەر هاوبەش ڕەوادانەکە ئەگرێتەوە، چونکە شتێکی تر بێجگە لەخوا ئەهێنێتە کایە و لەوێ دەناسێ. هێندێ لەو لادان و ترازانە لە ڕێگای ڕاست ئەمەیە: هێندێ کەس لە کاتی سەختی و تەنگانەدا هاوار ناکاتە خوا و ناوی ئەو نابات، بەڵکو پەنا ئەبات و هاوار ئەکاتە بەندەیەك لە بەندەکانی خوا، بەناوی ئەوە کە ئەو بەندەیە نزیکە لەخواوە، هێندێ جار هەر فێر بووە و لای وایە کارەکان خوا داویەتییە دەست ئەو پیاو چاکە. بەڕاستی ئەمە دەردێکی زۆر سەخت و کوشندەیە و زۆرکەس دەردەدارە پێی، خوا پەنامان بدات. ئەو بت پەرستانە یەکەم جار کە لە کاتی تەنگانەدا ئەگەڕانەوە هەر بۆلای خوا، بەڵام لەپاش ڕزگار بوون ئەگەڕانەوە سەر بارە لارەکەی خۆیان،

سەرەنجام و بەرهەمی ئەو بارو کردەوە لارەیان سپڵەیی و دان نەنانە بە چاکە و نیعمەتەکانی خوادا وەك ئەفەرموێ: ﴿لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْۚ﴾ تا سپڵە بن و دان نەنێن بەوەی پێمان بەخشین. واتە بەو رزگار کردن و نەهێشتنی تەنگی و سەختییە، ئەو رێنموونییەی کە پێمان بەخشین، کەواتە زۆر شایستەن بۆ ئەم هەڕەشە سامناکە. ﴿فَتَمَتَّعُواْۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ کەواتە رابوێرن، ئینجا لەمەوپاش ئەزانن، ئەزانن چیتان بەسەر دێت، ئەزانن دوا رۆژ و چارەنووستان.

یەکێکی تر لە کردەوە و بۆچوونە بەدەکانیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْۗ﴾ بەڕیار ئەدەن بۆ ئەو بتانەی کە ئەیانپەرستن و نایانناسن و بێ ئاگان لێیان و وا گومان ئەبەن کە سودیان هەیە و بەرگری خراپەیان لێ ئەکەن، بڕیار ئەدەن بۆ ئەو بتانە بەشێك لەوەی کە ئێمە پێمان بەخشیون و کردمان بە رۆزیتان، وەك ئەو حوشتر و وڵاخانەی کە سواریی یان پێ نەئەکردن و لێیان نەئەخواردن، یان حەڵاڵیان ئەکرد بۆ نێرەکانیان و قەدەغەیان ئەکرد لەسەر مێینەکانیان – وەك لە سورەتی(الأنعام) دا باس کرا – ئەوەیان کرد بۆ ئەو بتانە و بەناوی ئەو بتانەوە لە کاتێکدا خوا ئەو شتانەی پێ بەخشوین. بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە: ئەو بت پەرستانە بەشێك لەوەی خوا پێی داون بڕیاری ئەدەن بۆ ئەو بتانە لە کاتێکدا ئەو بتانە بێ ئاگان و نازانن بەوەی کە بت پەرستەکان ئەیکەن، بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ. زۆر بەداخەوە ئەو بۆچوون و کردەوە بەدە کە لە چەرخی نەفامیدا هەبوو، لەوانەوە سەروازی کرد بۆ ناو موسڵمانەکان لەگەلێ وڵاتدا، بەم رەنگە هێندێ لەو حوشتر و ماڵاتانە بەرەڵا ئەکرێن بۆ یەکێ لە پیاو چاکان و قەدەغەیە هیچکەس دەستیان بۆ ببات و لەکاتی خۆیدا بەناوی ئەو پیاو چاکەوە سەرئەبڕێن و بێگومان ئەوە هیچ جیاوازی نییە لە کردەوەی ئەو بت پەرستانەی کۆن. ئەو وڵاخ و ماڵاتانە گۆشتەکەیان وەك مردارەوە بوو حەرامە،

تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَفۡتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا
بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ
أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾

---

﴿تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَفۡتَرُونَ﴾ سوێند بەخوا پرسیارتان لێ ئەکرێ لەو درۆ و دەست هەڵبەستەی کە کردووتانە لە دنیادا، لەسەر ناوبردن و بڕیار دانی ئەو بتە بێ نرخانە بە پەرستراو و هۆی نزیك کەوتنەوە لەخواو تکاکردنی ئەوانە لای خوا ! پرسیارتان لێ ئەکرێ بۆ تانە و تەشەر لێدان و سەر شۆڕ کردن و ئابڕوو بردن. یەکێکی تر لە بۆچوون و بڕیارە بەدەکانی ئەو نەفامانە ئەمە بوو منداڵ و ئەولادیان بۆ خوا ڕەوا ئەدا کە خوا پاك و بێگەردە لەوە، ئینجا کچیان بۆ ڕەوا ئەدا کە بۆ خۆیان ڕەوا نەئەدا و بە سەر شۆڕی یان ئەزانی و ئەگەر کچیان ببوایە نەیان ئەزانی چی لێ بکەن و چۆن لە کۆڵی خۆیانی بکەنەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ﴾ کچان بڕیار ئەدەن بۆ خوا وەك ئەڵێن: مەلائیکە کچی خوایە، پاك و بێگەردی بۆ خوا پاکە لەوە و بۆ خۆیان شتێ بڕیار ئەدەن کە ئارەزووی ئەکەن و پێیان خۆشە، واتە کوڕ ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ﴾ ئەگەر یەکێ لەوان هەواڵی پێ بدرێ بە پەیدا بوون و لە دایك بوونی کچ و مێینەیەك ڕووی ڕەش دائەگیرسا و لە بارەکەی خۆی ئەگۆڕا و ئەگەڕا بە ڕوویەکی ناشیرین و غەمبار لە کاتێکدا پڕە لە داخ و قین ﴿يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ﴾ خۆی دائەشارێ لە گەل و کۆمەڵەکەی لەبەر بەدی ئەو موژدەی پێی درا، لە کاتێك دا بیری لێ ئەکردەوە و دوو دڵ بوو ﴿أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِ﴾ ئایا ڕاگیری بکات و لەناوی نەبا و بەسەر شۆڕی یەوە ڕازی بێت بەو سەر شۆڕی یەی کە دووچاری بووە یان لەناوی بەرێ و بیشارێتەوە لەناو خاکدا ئیتر بە زیندوویی یان لەپاش کوشتنی؟ هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە ئایا ڕاگیری بکات بە ڕیسوایی و زەلیلی، بەم جۆرەش ئەگونجێ. لادان و ترازان لە عەقیدە و بیر و باوەڕی ڕاست کار ئەکات لە بارودۆخی ژیاندا هەرچۆنێ بۆچوون و بڕیار پەست ئەکات.

بەهۆی ئەو ترازان و بەد عەقیدەیی یە ئەو عەرەبە نەفامانە گەیشتنە ئەو رادەیە کچ زیندە بە چاڵ بکەن یان بە ریسوایی بیهێڵنەوە. بیرو باوەڕو عەقیدەی راست پەنایە لەو هەموو لاری و ناڕەوایی یە، بەهۆی ئەو عەقیدە پاك و خاوێنە ئەو عەرەبە نەفامانە گۆڕان لەو هەموو نالەباری یەوە و بوون بە کۆمەڵێکی بەختیاری کەس نەدیدە و بوون بە مامۆستای جیهان و ژیان. هەر لاری و نەفامی و پەستی یە کە ئەبینرێ لە جیهانی ئیسلامیدا، لە ناڕێکی و ناتەواوی یەك پەیدا بووە کە رووی کردە عەقیدەکەیان. بۆ نموونە دێتەوە سەر باسی ئافرەت کە رێزی خۆی پێ نادرێ لەناو زۆر لە گەلە بەناو موسڵمانەکانی ئەمڕۆدا کە ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ کەم و کوڕی یەك کە رووی کردووەتە عەقیدەکەیان. ئەگینا ئەگەر نەترازابن لەو عەقیدە پاکە ئەزانن ئافرەت بەخششی خوایە، وەك کوڕ و پیاو، بەبێ ئافرەت بە پێی باوی خوا پیاو پەیدا نابێ، ئافرەت بە بێ جیاوازی ئادەمییە و هەر بێ رێزی یەکی دەربارە بکرێ بێ رێزی یە بە تیرەی ئادەمی و زیندە بەچاڵ کردنی ئادەمییە.

خوا دەربارەی ئەو نەفامانە کە ئەو بۆچوون و بڕیارە لارانەیان هەبوو ئەو وتە سەخت و سامناکە ئاراستە ئەکات: ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾ بێدار و ئاگادار بن کە بەد و خراپە ئەو بڕیارانەی کە ئەو نەفامانە ئەیدەن کە بەڕاستی ئەو وتەیە زۆر سامناك و دڵ تەزێنە بۆ هەر کەسێك کە بێبەش نەبێ لە فام و ژیریی. کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمان ئاگادار بێت و خۆی بپارێزێ و خۆی پاك و خاوێن بکاتەوە لەهەر کردار و رەفتار و وتاری سەردەمی نەفامی، چ نەفامی کۆن و چ نەفامی تازە کە زۆر لەوانەی تازە پەست تر و بۆگەن ترە لەوانەی کۆن، بۆ وێنە با هەر بێینەوە سەر ئافرەتی داماوی بەش خوراو لە نەفامی تازەدا و بەراوردێکی بکەین لەگەڵ نەفامی کۆندا. لە نەفامی کۆندا ئافرەت زیندە بەچاڵ ئەکرا نەوەك دووچاری داوێن پیسی ببێ و بەجارێ ئابڕووی خۆی و کەس و کاری بچێ، بەڵام لە نەفامی تازەدا بە هەموو جۆر ئەیڕازێننەوە و بە رووتی بەرەڵای ئەکەن بە ئارەزووی خۆی و شەیتان و شوێن کەوتوەکانی شەیتان چۆن رەفتاریان لەگەڵ ئەکەن بیکەن، لە نەفامی کۆندا سەر و ملیان بەجۆرێ دائەپۆشت کە گوێچکە و گوێ دارەکانیان دەرنەکەوت ! بەڵام لە نەفامی تازەدا بە میکرۆجۆبیش رازی نین !!

لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ
ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا
يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ

**بۆچوون و بڕیار و کرداری نەفامی زۆر دوور و جیاوازە لە بۆچوون و بڕیار و کرداری ئیسلامی بە وێنەی جیاوازی سیفەت و ڕەوشتی بێ بڕواکان لەگەڵ سیفەتی بەرز و بێ وێنەی خوادا وەك ڕێنموونیمان ئەکات بەم فەرمودەیە: ﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ﴾ بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە سیفەت و نیشانەی بەد هەیە، سیفەت و نیشانەی بەد لە هەموو بار و ڕوویەکەوە: لە هەست و بۆچووندا، لە عەقیدە و بیرو باوەڕدا، لە ڕەوشت و کرداردا، لە ناتەواوی و کەم و کوڕی و بێ دەسەڵاتی و دەستە پاچەییدا ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ هەر بۆ خوا هەیە سیفەت و نیشانەی هەرە بەرز و بڵند کە بێ وێنە و بێ هاوتایە و لەگەڵ هیچکەس و هیچ شتێکدا بەراورد ناکرێ چ جای بێ بڕوایان کە بێ نرخ تر و پەست ترین گیان لەبەرن بەلای خواوە ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ لە کاتێکدا هەر ئەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا. زاڵی کاردروستە و هەموو کارو کردەوەی بەجێیە و لە شوێن و ڕادەی خۆیدایە، ئەو زاتە زاڵە ئەتوانێ بێ بڕوا و ستەم کاران بگرێ، ئەگەر بە گوێرەی بەدیی و خراپی ئەوان ڕەفتاری بکردایە لەگەڵیان بە تەواوی لەناوی ئەبردن و لە ڕیشەی ئەهێنان بە بێ تەفرە و دواخستن، بەڵام بە لێزانی و کاردروستی خۆی دوای خستن تا کاتی دیارییکراوی خۆی وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ ئەگەر خوا خەڵکی بگرتایە بەهۆی بێ بڕوایی و**

گوناهو تاوانیان لە هیچ گیان لەبەرێکی واز نەئەهێنا و هیچ گیان لەبەرێکی نەئەهێشت لەسەر زەویدا و سەرجەم لەناوی ئەبردن. واتە گوناهو تاوانی ئادەمی ئەبوو بەهۆی لەناوبردنی هەموو گیان لەبەران. نەك هەر ئادەمی ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ بەلاّم خوا بەو جۆرەی نەکرد و پەلەی نەکرد لە سزادان و لەناوبردندا، بەڵکو ئادەمیشی دواخست بۆ ماوەیەکی ناوبراوی دیارییکراو ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً﴾ ئینجا کاتیّ ماوەی دیاریی کراویان هات ئیتر دوا ناخرێن هیچ کات و ساتێك. ئینجا هەرچۆنیّ دوا ناکەون لە کاتی دیاریی کراویان هات ئیتر دوا ناخرێن هیچ کات و ساتێك. ئینجا هەرچۆنیّ دوا ناکەون لە کاتی دیاریی کراوی خۆیان و بەبیّ تەفرە و دواخستن دووچاری چارەنووسی خۆیان ئەبن، هەروەها پێشیش ناکەون لەو کات و ماوەی دیاریی کراوەیان، با ئەو گومانە نەبریّ وەك ئەفەرمویّ: ﴿وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ ئەوانە پێشیش ناکەون لەماوەی دیارییکراوی خۆیان. ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ شتێکی زۆر سەیر لەلایەن ئەو بت پەرستانەوە کە سەر سوڕ ئەمێنیّ لێی، ئەفەرمویّ: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ ﴾ بڕیار ئەدەن و ڕەوا ئەبینن بۆ خوا شتیّ کە خۆیان بێزارن لێی و نایانەویّ. وەك ڕەوا دانی کچیان چەند شتێکی تریش وەك هاوبەش لە سەرۆکایەتی و دەسەلاّتدا، قسەی بەد و ناو و ناتۆرە بە فروستادەکانی خوا کە بۆ خۆیانی ڕەوا نادەن، هەروەها چاکترین سامان و ماڵیان بۆ خۆیان و بتەکانیان و بیّ نرخ و پەست ترینیان بۆ خوا. جا لەسەر باری یەکەم دووبارە کردنەوەیە بۆ ئەوەی لە ئایەتی(٥٧) دا فەرموی. لەبەر زیادە تەشەر دان و ریسوا کردنیان،

وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾
تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ
وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾

---

بۆ ئەوەی ببێ بەسەرەتا بۆ ئەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ﴾ واتە ئەوانە بڕیار ئەدەن بۆ خوا بۆ ئەوەی کە بێزارن لێی و بۆ خۆیان پێیان ناخۆشە لە کاتێکدا زمانتان قسە و باسی درۆ ئەکات بەمەی ﴿أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ هەر بۆ ئەوان هەیە پاشەڕۆژی چاك و شیرین لای خوا. واتە ئەو تاوانە گەورەیە ئەکەن دەربارەی خوا لەگەڵ ئەوەدا ئەم لافە درۆیش لێ ئەدەن کە خوا ئەیان خاتەوە بە درۆوە و بەر پەرچیان ئەداتەوە بەم وتە سەختە: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ﴾ نەخێر ئەوەی کردیان ئەمەی بۆ فەراهەم هێنان کە بۆ ئەوان هەر ئاگر هەیە، ئەوانە بە پەلە ئەبرێن بۆ ئەو ئاگرە، وتەی ﴿لا جرم﴾ بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەهەرکام پاشە ڕۆژەکەیان ئەگێڕێ بە ئاگری دۆزەخ خوا پەنامان بدات لێی،(مجاهد) و چەند کەسێك ئەفەرمون: ئەوانە ئەهێڵرێنەوە لە ئاگردا و وازیان لێ ئەهێنرێ وەك لە بیرچووبن، واتە بەوە تەفسیری ئەکەنەوە.

ئینجا دڵنەوایی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەکات هەرچۆن هەرەشەش ئەکات لە بێ بڕواکان بەوەی کە تەنها ئەو پێ نەگیراوە بە دەست نەفامەکانەوە، بەڵکو لە پێش ئەو چەند فروستادانەی تریش ڕەوانە کراون بۆلای گەلانی تر و ئەوانیش دووچاری ئەرك و زەحمەت بوون بەدەست نەفامانەوە و ئەو نەفامانە دووچاری سزای خۆیان بوون، ئەفەرموێ: ﴿ تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخوا وا فروستادەمان ناردووە بۆلای چەند گەل و ئوممەتێك لە پێش تۆ ﴿فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ ئینجا شەیتان کردەوە بەدەکانی ئەو گەل و ئوممەتانەی جوان و شیرین کردووە بۆیان تا بەهۆی ئەوەوە وازیان نەهێنا لەو کردەوە بەدانە و گوێ ڕایەڵ نەبوون بۆ فەرمانی فروستادەکان، ﴿فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ﴾ کەواتە شەیتان دۆست و خاوەن و یارمەتی دەری ئەوانەیە ئەمڕۆ لە دنیادا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی سەختی ئازار دەر لە ڕۆژی دواییدا کە سزای دۆزەخە.

وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ

﴿٦٤﴾ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمۡ

فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ

---

﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ ﴾ **نامەیە کە قورئانە ئەمان هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ مەگەر لەبەر ئەوەی بە روونی باس بکەیت بۆ خەڵکی ئەوەی کە دوو بەرەکی بوون تێیدا لەکاروباری ئاین، ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ لەبەر ڕێنموونی و میهرەبانی کردن بۆ گەل و کۆمەڵێك کە بڕوایان هەیە و بڕوا ئەهێنن، کەواتە کار و پیشەی ئەم نامەیە بڕینەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی یە لە نێوان خاوەن نامەکانی پێشوو، جیا کردنەوەی هەقە لە ناهەق. هەق کە پەرستنی خوایە بە تاك و تەنها و بێ پێچ و هاوبەش و وێنە، لەم نامەیەدا بە روونی هاتووە، بێجگە لەوە ناڕاستە و ناهەقە، ئەم نامەیە هەرچۆنێ ڕوونکەرەوەی هەق و ناهەقە، هەروەها ڕێنموونی و میهرەبانی یە بەوانەی کە دڵیان ئامادەیە بۆ بڕوا هێنان و وەرگرتنی هەق و ڕاستی.**

**ئینجا دەست ئەکات بە هێنانی چەندبەڵگە و نیشانەیەکی روون لەم بوونەوەرەدا لەسەر خوایەتی و تاك و تەنهایی خوا، بەبۆنەی باسی هێنانە خوارەوەی نامەی خوا کە مایەی گیان و ژیانی رۆحە. بەو بۆنەیەوە بەڵگەی هێنانە خوارەوەی باران ئەهێنێ کە هۆی گیان و ژیانی لەشە، ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ خوا هێناویەتە خوارەوە لە ئاسمان و لای سەرەوە ئاوێك، واتە باران ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ﴾ ئینجا بەهۆی ئەو ئاوەوە زەوی زیندوو کردووەتەوە بەو هەموو گیا و دانەوێڵە و دارو درەختە لەپاش مردن و وشك بوون و نەبوونی ئەو شتانە دەی ئەو کەسەی کە مردن وەرئەگێڕێ بەگیان و ژیان هەر ئەوە ئەبێ خواو پەرستراو بێت. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ﴾ بەڕاستی لەوەی کە باسکرا بەڵگە و نیشانەیەکی روون هەیە لەسەر دەسەڵات و خوایەتی خوا بۆ کەسانێك کە ئەبیستن وەرگرتن و بیر کردنەوە، ئینجا دێتە سەر باس و بیر خستنەوەی بەڵگە و نیشانەیەکی زۆر نایاب، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ ﴾ بەڕاستی هەیە بۆ ئێوە لە حوشتر و وڵاخ و مەڕ و ماڵاتدا هۆی زانین و تێپەڕ کردن لە نەزانینەوە.**

نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ
وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾

واتە بەڵگە و نیشانەیەکی روون و ئاشکرا کە خوای خۆتانی پێ بناسن و نەفامی و نەزانیتان نەمێنێ وەك ئامارەی بۆ ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا﴾ دەرخواردتان ئەدەین شیرێکی پاڵفتە و خاوێن لەوەی لەناو سکی دایە لە نێوان سرِوان و خوێندا کە ﴿سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ خۆش گەوارە و بە ئاسانی لە گەرو ئەچێتە خوارەوە بۆ بخۆرەکانی. بەڕاستی کارو کردەوەکە زۆر نایاب و سەرسوڕهێنەرە،بەڵام لەبەر ئەوەی هەمیشەیی یە و دەقی پێوە گیراوە فەرامۆش ئەکرێ. با هەموو ژیرێك بیر بکاتەوە لەوەی بە پێش چاوەوە ئەو مەڕو ماڵاتە ئەو خۆراك و ئاڵفە ئەخۆن لەپاشان لەوە ئەو شیرە پاکە چۆن فەراهەم دێت و لە گوانەکانەوە ئەدۆشرێ و تڵفەکەشی ئەبێ بەو سروان و سەنێرە و لە شوێنی تایبەتی خۆیەوە دێتە دەرەوە و چەند کەڵکی تری لێ وەردەگیرێ؟! تەنها ئەو گۆڕان و گۆڕانکاری یە بەو شێوە سادەش کە ئەبینرێ شتێکی سەر سوڕهێنەرە و بەڵگەیەکی ئاشکرایە بێجگە لەوەی کە دەست نیشانی بۆ ئەکات و بە خەیاڵی هیچ کەسدا نەهاتووە، تا ئەم دوایی یە کە ئەو شیرە پاڵفتەیە لە نێوان خوێن و سرِوان دایە، پاڵفتەیە لەهەربەش و کەرەسەیەکی تر بێجگە لە سێڵی شیر. پاك و پاڵفتەیە لە تام و رەنگی خوێن و بۆنی سرِوان ! بەڕاستی گۆڕانی ئەو کەرەسە و سێڵە خۆراکی یانە لەلەشدا بە خوێن و خۆراکدانی هەر سێڵێ بەو کەرەسانەی کە پێویستن بۆی لەو خوێنەدا، ئەو گۆڕانکاری یە کردەوەیەکی سەر سوڕهێنەرە ! ئەوەی قورئان دەری خست کە ئەو شیرە پاك و خۆش گەوارە دەرئەچێ لە نێوان خوێن و سرِواندا شتێکی نەناسراو بووە و هیچکەس شتی وای بە خەیاڵدا نەهاتووە تا ئەم دواییە و لە قورئانیشەوە ئەو بۆچوونە پەیدا بووە تا لە رێ ی زانیاری تازەوە گەڕا بە شتێکی ئاشکرای هەست پێکراو، بەڕاستی دەرکەوتنی هەرکام لەو جۆرە نهێنی و

نەناسراوانە کە قورئان دەست نیشانیان بۆ ئەکات. دەرکەوتنی هەرکام لەوانە موعجیزەیەکی گەورەیە و هەرکەس ڕێزی ژیریی خۆی بەلاوە بێت ناتوانێ دان بەوەدا نەنێ و ئەبێ هەر ئەوەی بەس بێت بۆ بڕوا هێنان بە پەروەردگاری هەموو جیهانی یان. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ چەند خۆراك و خوراوەی تر کە خوا فەراهەمی هێناوە بۆ بەندەکانی، ئەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ﴾ دەرخواردتان ئەدەین لەبەر و میوەجاتی دارخورما و جۆرەکانی ترێ. ئینجا چۆنی یەتی ئەو دەرخوارد دانە روون ئەکاتەوە بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا﴾ فەراهەم ئەهێنن و دەستکەوتی ئەکەن لەوەی باسکرا، یان لە عەسیر و گوشراوەکەی خورما و ترێ و ئارەق، خۆراك و ڕۆزی یەکی چاك وەك سرکە و دۆشاوی خورما و مێوژ و شتەکانی تر کە زانراو و ناسراون. ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە پێش قەدەغە کردنی ئارەق و تا ئەو کاتە حەلاڵ بووە، کەواتە هیچ لەکە و گرێ یەك نییە لەباسی ئارەق و دەست نیشان کردن بە حەلاڵێتی و گێڕانی بەهۆی منەت نانی خوا بەسەر بەندەکانی یەوە، لەهەمان کاتدا بە خۆراك و ڕۆزی یەکی چاکی دانەناوە و دانی نەناوە بە رەوادان و حەلاڵیدا، بەڵکو بە جۆرێ هێناویەتی کە سەرەتا بێت بۆ قەدەغەکردنی، ئەم ئایەتە کراوە بە یەکەم قۆناغ بۆ حەرام کردنی وەك بە درێژیی لە سورەتی(المائدة) دا باسمانکرد. ئەم ئایەتە بە چەند شێوەیەکی تر تەفسیر کراوەتەوە کە هەر ئەمە ئەگرێتەوە کە گوترا، بەڵام ئەم شێوەیە لە دڵدا جێگیر ترە لەبەر ئەوە هەڵم بژارد. لەسەر هەربار ئەو درەخت و میوەجاتە بەڵگەیەکی روونن لەسەر خوایەتی خوا بۆ هەرکەسێك کە ژیر بێت، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا کە باسکرا بەڵگە و نیشانەیەکی روون هەیە بۆ کەسانێ کە ژیرن و ژیریی خۆیان بەکار ئەهێنن لە بیر کردنەوە و تێفکراندا. ئینجا ئامارژە ئەکات بۆ خۆراك و خوراوەیەکی تری زۆر بە نرخ کە دەستکەوت ئەبێ بەهۆی هێندێ لە گیان لەبەران کە بەڕاستی ئەوەش نیشانە و بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر ئەو دەستە قودرەتەی کە ئەوەی فەراهەم هێناوە بۆمان،

وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ
فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً
لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ﴾ ئەی پێغەمبەر پەروەردگارت رایگەیاند بە مێش هەنگ و خستی یە دەروون و سروشتی یەوە ﴿أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا﴾ بەمەی لەشاخ و چیاکان هێلانە و خانوو و ماڵ بۆ خۆت فەراهەم بێنە، ﴿وَمِنَ ٱلشَّجَرِ﴾ لە دارو درەختەکانیش ﴿وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ لەو جێ و شوێنانەی کە خەڵکی دروستی ئەکەن و ئامادەی ئەکەن بۆی کە هەنگوینی تێدا بکات ﴿ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ ئینجا بخۆ لە هەموو جۆرە بەرو میوەجاتێك ﴿فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا﴾ ئینجا رێگاکانی پەروەردگارت بدەرە بەر بە ملکەچی و ژێر بار کراوی، واتە ملکەچی و ژێر بار کراوی خۆتان، یان ژێر باری کراوی رێگاکان، رێگاکان لە گەڕان و چوون و هاتنەوەدا، یان رێگاکانی پێکهێنانی خۆراك و کار و پێکهێنانی هەنگوین، لەسەر هەر بار هەموو کاروبار و کردەوەکانی ئەو مێشە بە مەیل و فەراهەم هێنانی پەروەردگارە، ئەگینا ئەو مێشە لە کوێ و ئەو کارو کردەوە نایابە لە کوێ ! ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ﴾ دەرئەچێ و دێتە دەرەوە لە سکی ئەو مێشانە خوراوەیەك کە رەنگەکانی جیاوازن. هێندێ سپی و هێندێ زەرد و هێندێ رەش، ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾ شیفای تێدایە بۆ خەڵکی، ئیتر ئایا لە دەمیانەوە دێتە دەرەوە وەك زۆربە و جەماوەر ئەفەرمون، یان لە پاشیانەوە وەك لە ئیمامی عەلی یەوە ریوایەتکراوە. بەهەرحاڵ کردەوەکانی ئەو مێشە و چۆنییەتی پێکهێنانی هەنگوین پۆشیدەیە و هەر خوا ئەزانێ چۆنە. ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر سولەیمان، ئەسکەندەر و ئەرەسوو لە شوشە ماڵ و شوێنیان بۆ دروستکردووە تا بزانن ئەو هەنگوینە چۆن فەراهەم ئەهێنێ و لە کوێوە دێتە دەرەوە؟ بەڵام هەنگوینی نەکرد تا بە قوڕ جێگەی گومان و دوو دڵی

نییە و لە زانیاری تازەشدا بە تەواوی رووی بووەتەوە، ئیتر مەرج نییە بۆ هەموو دەرد و نەخۆشی یەك شیفا بێت و ئایەتەکە وا نیشان نادات کە بۆ هەموو کەسو هەموو دەردێك دەرمان و شیفا بێت. ئینجا لەبارەی یاسا و نیزامی سەربازی ڕێك خستن و سەربازی پێکهێنانی ماڵەکانیان و خانی شانەکانیان بە شەش گۆشە و تا بۆشایی نەمێنێتەوە لە نێوانیاندا و هەروەها چەند شتی تر زۆر لە نوسەران بە درێژیی لەوانە دووان لەباس و نامێلکەی تایبەتیدا، کەواتە لێرەدا ئێمە هیچ ناڵێین و بەڵکو هەر ئەمە ئەڵێین کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بەڕاستی لەوەدا کە باسکرا لەبارەی مێش هەنگەوە بەڵگەو نیشانەیەکی گەورە هەیە. بەڵگەی گەورەو گرنگ لەسەر دەسەڵات و کاردروستی پەروەردگار جل جلاله و عز سلطانه. لەپاش ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە گرنگانە ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ چەند بەسەرهاتێك کە پەیوەستن بەخودی ئادەمی یەوە کە ئەوانە بەکار ترن و هەست و هۆش باشتر بێدار ئەکەنەوە، ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ﴾ خوا ئێوەی دروستکرد ﴿ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ﴾ ئینجا ئەو ئەتان مرێنێ بە مەیل و ئیرادەی خۆی. ئەمە بەسەرهات و ڕووداوێکە ڕوونی ئەکاتەوە بۆ هەموو کەس، گیان و ژیان خۆشەویستە، بیر کردنەوە تێیدا لەوانەیە دڵە رەقەکان نەرم بکات، چاکە و دەسەڵاتی خوای بیر بخاتەوە، مەترسی لە مردن و نەمانی ژیان هۆیەکی بەهێزە بۆ گەڕانەوە بۆلای خوا و سام و بیم و خۆپارێزی لە خەشمی خوا و پەنا بردن بەو کەسەی ئەو گیانەی پێ بەخشی. ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ هێندێ لە ئێوە ژیانێ درێژی پێ ئەدرێ هەتا ئەگێڕێنرێتەوە بۆ پەست ترو لاواز ترین تەمەن ﴿لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا﴾ بۆ ئەوەی لەپاش ناسین و زانین هیچ شتێ نەناسێ و هۆش و گۆشی نەمێنێ، وەك منداڵی ساوا، واتە سەرەنجامی ئەو درێژە پێدانە ئەوەیە، بێگومان بیر کردنەوە لەوەو ئەو گۆڕانەی کە پەیدا ئەبێ هۆی بیر کردنەوە و گەڕانەوەیە لە خراپەکاری، مایەی کەم کردنەوەی خۆ بەزل زانی و هەڵخەڵەتان بێت کە روو ئەدات بەهۆی زانین و هێزو دەسەڵاتەوە،

إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي ٱلرِّزْقِ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزْقِهِمْ
عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ
أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی و بێگومان خوا زانای توانای بەدەسەڵاتە بە هەموو شتێ و بەسەر هەموو شتێکدا، زانینەکەی بێ سەرەتایە و هەمیشەییە، بێ بڕوانەوە و دواهاتن، توانین و دەسەڵاتەکەی تێرو تەواوە و بە تێپەڕکردنی هیچ کات و چەرخێك ناتەواوی و کەم و کوڕی ڕووی تێناکات. کۆتایی ئایەتەکەی بەم فەرمودەیە هێنا بۆ ئەوەی دڵ و دەروون بگەڕێتەوە بۆ لای ئەم بیرو باوەڕە ڕاستە لە هەموو کاتێکدا: ﴿وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي ٱلرِّزْقِ﴾ خوا باوی هێندێکتان ئەدا بەسەر هێندێکتاندا لە ڕۆزیدا، بەم ڕەنگە ئەوانەتان کە خاوەن و ئازادن ڕۆزیتان زۆرتر و چاکترە لەوانەی کە بەندە و موڵکتانن، ئەم وێنەیە ئەمێنێ بە پێی باوی ئەو گەلەی کە یەکەم جار ئەم قورئانەی پێ ڕاگەیەنرا کە لەناو ئەو گەلەدا ئەو دوو جۆرە هەبوو و ڕۆزی و سامان لە دەستی ئازاد و خاوەنەکاندا بوو ﴿فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ ئینجا بێگومان ئەوانەی کە باو دراو نین بە بەخشندەیی ڕۆزی یەکەیان بەسەر بەندەکانیاندا. واتە ڕۆزییەکەیان دابەش ناکەن بەسەر خۆیان و بەندەکانیاندا ﴿فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾ تا بەهۆی ئەوەوە ئەوان یەکسان بن لەگەڵ ئەمان لەو ڕۆزی یەدا، واتە ڕەوا نابینن ئەو بەندەیانە کە لە خۆیانن و ئادەمی یەکن وێنەی خۆیان، یەکسان بکەن لەگەڵ خۆیان و بیان هێننە ڕیزی خۆیان لەو ڕۆزی یەدا کە خوا پێی داون، دەی ئایا چۆن ڕەوا ئەدەن ڕەوا ئەبینن دروستکراوی خوا ئەکەن بە هاوبەشی خوا، واتە کار و بڕیارەکەتان زۆر بەدو ناڕاستە و سپڵەییە لەگەڵ خوادا وەك ئەفەرموێ: ﴿أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ دەی ئایا ئەوانە سپڵەن و دان نانێن بە چاکە و نیعمەتەکانی خوادا؟ ئایەتەکە فەرموێ: خوا باوی هێندێکی داوە لە ڕۆزی دا، باوێ لە باوەکانی خوا ئەو هەواڵ دانەیە

بەلاَم وا نەزانریٚ ئەوە شتێکە و هیچ هۆیەکی نییە، بەلْکو ئەوە بە پێی چەند هۆیەك بە پێی ئەو هۆیانە باوەکەی خوا هاتووە. ئەگەر ئەو هۆیانە بەدی هات ئەوا رۆزی فراوان ئەبیٚ ئیتر ئەو رۆزی دراوە چاك بێت یان خراپ، ژیر و زانا بێت یان نەفام و نەزان، چونکە خەلْکی جیاوازن لە توانا و هێز و لێزانیدا، زۆرتر جیاوازی لە رۆزی دا بەستراوە بەو جیاوازییەوە کە هەرکەس لە شتێکدا ئامادە و توانا و لێهاتووە، هینی وا هەیە لە بیر و ژیریی و زانین دا تێرو تەواوە، بەلاَم زۆر کەم و کوڕی هەیە لە پێکهێنانی رۆزی و دەستکەوت و گەشە پێدانی مالٚ و سامانەوە، وەك بە پێچەوانەوە هینی وا هەیە دەستی بالاَی هەیە لە پێکهێنانی رۆزی و سامانەوە بەلاَم زۆر ناتەواوە لە زانین و ژیریی و بۆچووندا. بە کورتی جیاوازی لە رۆزی دا زۆرتر بە پێی جیاوازی یە لە توانا و ئامادەیی و لێهاتن دا، هۆیەك بۆ ئەو جیاوازی یە بوونی رژێم و یاسایەکی ستەمکارە کە هێندیٚ بەشدار ئەکات و هێندیٚ بەش براو ئەکات وەك لە ئایەتەکەدا دەست نیشانی بۆ ئەکات لەو چەرخی نەفامییەدا کە ئادەمی ئەکرد بە دوو بەش. بەشیٚ ئاغا و خاوەن، و بەشیٚ بەندە و ژێر دەستەی بەش براو کە بە شێوەی چیرۆك هێنای بۆ دەم کوت کردنی ئەو بت پەرستە نەفامانە کە شتێکیان بۆ خوا رەوا ئەدا و بۆ خۆیان رەوایان نەئەدا و بێزار بوون لێی وەك باسمانکرد لە تەفسیری ئایەتەکەدا. بێدار کردنەوەی دلٚ و دەروون دەستکردنی سیٚ یەمە لەبارەی خودی ئادەمی و هاوسەر و منداڵ و نەوەکانیانەوە، ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجًا﴾ خوا گێراویەتی بۆتان لە تیرە و جۆری خۆتان حەلاَلٚ و هاوسەران کە بەش و پارچەیەکن لە خۆتان، نەك لە تیرە و جۆرێکی تری پەست تر لە خۆتان کە بە پەیدا بوونیان ریسوا و سەر شۆڕ ببن، بەهۆی ئەوەوە دلٚ ئارام ئەبن بە یەکتر و هەلْئەسن بە پێك هێنانی بەرژەوەندی یەکانتان، ئەولاد و نەوەکانتان بە وێنەی خۆتان دەرئەچن، وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرمویٚ ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً﴾ گێراویەتی لە ژن و هاوسەرەکانتان، واتە هەرکام لە ژن و هاوسەری خۆی ئەولاد و نەوە کە بوونی ئەوانە درێژە دانە بە بوون و ژیانی باوك و دایك،

أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾

---

**﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ ڕۆزی دان لە شتە پاك و خۆشەكان. خوای بەخشندە و میهرەبان ئەو نیعمەت و چاكانەی ئەڕێژێ بەسەر بەندەكانی دا، هەر پەرستراوێكی بێجگە لەخوا هیچ كەڵك و سوودێكی نییە و چاوەڕوانی هەر سوود و بەرهەمێك لێی ناڕاست و بێ جێیە، ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾ دەی ئایا ئەو بت پەرستە نەفامانە هەر بە شتی پڕو پووچ و بەتاڵ بڕوا ئەهێنن و بە چاكە و نیعمەتی خوا بڕوا ناهێنن و بەردەوامن لەسەر ئەو بار و بۆچوونە؟ واتە كارو كردەوە و بۆچوونەكانیان زۆر بەد و خراپە و جێگای سەرسوڕمانە. ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەم فەرموودەیە هەڵئەگرێ سەربەخۆ بێت و هەواڵدان بێت لێیان لەبارەی پووچەڵی و بەدی بت پەرستیەكەیانەوە، وەك ئەگونجێ پەیوەست بێت بە وتەی ﴿يَكْفُرُونَ﴾ ەوە و ڕاڤەو ڕوونكردنەوە بێت بۆ وتەی ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾ لەسەر هەركام ئەفەرمووێ: ئەو نەفامانە تێپەڕنەكەن لەخواو پەرستنی خوا، ﴿مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا﴾ شتێ ئەپەرستن كە خاوەنی ڕۆزی دانی هیچ شتێك نییە بۆیان نەلە ئاسمانەكان و نەلە زەویدا، هیچ شتێك ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ ناشتوانن ڕۆزیان بدەن یان ناتوانن خاوەن بن و توانایی خاوەنیشیان نییە. ﴿فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ﴾ كەواتە باسی وێنەكان مەكەن بۆخواوهیچ شتێك مەكەن بەوێنەبۆخواو هیچ هاوبەشێك ڕەوامەدەن بۆ خوا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی خوا ئەزانێ و بەدی و گەورەیی ئەو گوناهە گەورەی ئێوە ئەیكەن و تۆڵەتان لێ ئەسێنێ لەسەر ئەو كردەوە بەدە، ئێوە ئەوە نازانن بەهۆی ئەوەوە پاكاتن نییە لەو گوناهە گەورەیە. یان خوا ئەزانێ چۆ چیرۆك و وێنە بهێنێتەوە و ئێوە نازانن، یان وێنە بۆ خوا ڕەوا مەدەن، چونكە خوا ئەزانێ وێنەی نییە و ئێوە ئەوە نازانن. بەجۆرێكی تریش تەفسیركراوەتەوە بەڵام بەلاواز دانراوە. ئینجا وێنەو چیرۆك ئەهێنێتەوە تابەوە ڕوونی بكاتەوە كەخوا وێنەی نییە، بەهیچ جۆر ڕەوا نییە هیچ كەسێك بكرێ بەوێنەی خوا.**

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَـٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ
يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ
ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا
يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾
وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ

---

بۆ چیرۆکی یەکەم ئەفەرمێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ واتە خوا وێنەو چیرۆکێکی باسکردووە بەبەندەیەکی خاوەن دارو موڵك کەهیچ توانای نییە بەسەر هیچ شتێکدا. ﴿وَمَن رَّزَقْنَـٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا﴾ بەکەسێك کەئێمە ڕۆزیمان پێدابێت لەلایەن خۆمانەوە بەڕۆزی یەکی پاك‌و خاوێن. ﴿فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا﴾ ئینجا ئەو ڕۆزی یە دراوە بەنهێنی‌و بەئاشکرا لەو ڕۆزی خۆیە بەخت بکات‌و بەکاری بهێنێ بەئارەزووی خۆی. ﴿هَلْ يَسْتَوُۥنَ﴾ ئایا ئەو کەسانە یەکسانن‌و وەك یەك وان. واتە ئەوانە یەکسان نین‌و بەیەکسان سەرنج نادرێن، دەی ئایا چۆن ئەو نەفامانە یەکسانی ئەخەنە نێوان پەروەردگاری هەموو جیهانی یان‌و نێوان یەکێ تر یان شتێکی تر کەهەموو دروسکراوی خوان‌و ژێریان بۆ ئیرادەی خوا؟! بێگومان هەرکەس بێ‌بەش نەبێ لەهەموو فام‌و ژیرییەك هەرگیز ئەو یەکسانی یە ناڕاستە بەدڵیدا نایەت، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ هەموو سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خوایە، چونکە تەنها ئەو خاوەنی چاکەو هەموو نیغمەتێکە، کەواتە هەر ئەو خوایە شیاوی پەرستنە، یان هەموو سوپاس بۆ خوا لەسەر ئاشکرابوونی بەڵگەی بەهێز ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وازبێنە لەوەی باسکرا. ئەوانە هەموویان یان زۆربەیان نازانن کار بەو جۆرەیە بەهۆی ئەوەوە چاکەو نیعمەتەکانی لەخواوە ناناسن. بەهۆی ئەوەوە خوا ناپەرستن بەتاك‌و تەنها، یان نازانن ئەو

بەڵگەیە ئەوەندە بەهێزە بەهۆی ئەوەوە لەسەر باری ناڕاستی خۆیان ئەمێننەوە, بۆ وێنە چیرۆکی دووەم ئەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا﴾ خوا وێنەو چیرۆکێکی باسکردووەو هێناویەتی یەوە بە ﴿رَّجُلَيۡنِ﴾ دوو پیاو ﴿أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ﴾ یەکێکیان لاڵی مادەرزادەیە کە ﴿لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ﴾ کەتواناى نیەو دەسەڵاتی نییە بەسەر هیچ شتێکداو دەستەپاچەی تەواوە ﴿وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ﴾ ئەو پیاوە ئەرك و باری گرانە بەسەر خاوەنەکەیەوە ﴿أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ﴾ بەرەو هەرشوێنێ بینێرێ هیچ خێرو خۆشیەك ناهێنێتەوەو بەدەستی ناهێنێ ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ ئایا ئەو کەسە یەکسانە لەگەڵ کەسێك کەفەرمان بدات بە دادو بە ڕاستی لەکاتێکدا کەئەو لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستو ڕەوشتی چاكو ئاینێکی بەهێزبێت. بێگومان هیچ کەسێك ئەو دووانە یەکسان ناکات بەهیچ جۆر، کەواتە نەفامەکان ئایا چۆن ئەو بتو پەرستراوانە یەکسان ئەکەن لەگەڵ خوا؟! بەم دوو وێنەو چیرۆکە باسەکەی دوایی پێهێنا کەلەسەرەتاکەیەوە جڵەوگیریی کرد لەبڕیاردانی دوو خوا. ئینجا هەروەها هێندێکی تر لەبەڵگەو نیشانەکانی تاكو تەنهایی خوا ئەخاتە بەرچاوو لەیەکەم جارەوە دڵنیایی ئەکات لەسەر مەسەلەی زیندووبوونەوە کەخوایەتی خوا داخوازە بۆ بوونو بەدی هاتنی. ئەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ هەر بۆ خوایەو تایبەتیی یە بەخواوە نهێنیو پۆشیدەکانی ئاسمانەکانو زەوی کە یەکێ لەوانە زیندووبوونەوەیە کەلە هەموو چەرخێکداو لەگەڵ هەموو پێغەمبەرێکدا مایەی دەمە قاڵێو بەربەرەکانێ بووەو لەگەڵ ئەوەدا شتێکی سووكو ئاسانەو بۆ خوا هیچی تێناچێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ﴾ کاری ڕۆژی دوایی تەگبیری هاتنیو کاتی پێویست بۆ ئەوە هەر بەئەندازەی چاونوقانو چاو بەیەکدا نانێکەو گەڕانەوەی لەسەروی گلێنەوە بۆ خوارێ، یان نزیك تر لەوەو کەمتر لەوە. واتە بەوپەڕی چەسپانی بەدی دێت تاڕادەیەك ئەگەر پرسیاربکرێ لەئەندازەی لەوەڵامدا ئەگوترێ: لەو ڕادەدایە کەباسکرا،

إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ٧٧ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا
وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ
مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٧٩

---

**﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ﴾ بەڕاستی خوا توانا و دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا، کەواتە نابێ سەربکرێتەوەو سەر سوڕبمێنێ کەبەپێی باو و بۆچوونی ئێمە دووربێت. ئینجا وێنەو نموونەیەکی توانین و دەسەڵاتی خوا ئەخاتە بەرچاو کەبیر لێکردنەوەی ئەو شتانە نزیك و سووك و ئاسان ئەکات کەبەپێی بۆچوون و باوی ئێمە دوورو نەگونجاون. ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ﴾ خـوا ئێـوەی لەسـکی دایکتـان هێنایـە دەرەوەو ئەمێنێتـە دەرەوە لەکاتێکـــدا ﴿لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا﴾ هـــیچ شـــتێکتان نـــەزانیوەو نـــایزانن ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ﴾ گێڕاویەتی بۆتان گوێ و چاوو دڵ. واتە هۆی بیستن و بینین و هۆش وبیرو ژیریی. دەی ئایا لەچی و لەکوێ و چۆن فەراهەم هاتن کە ئەمانە ژیان بەستراوە پێیانـەوەو سەرچاوەی هـەموو چاکەو بەهرەیـەکن، کەواتـە ئـەبوو چاو لەبـەر بوونایـە وەك ئەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بۆئەوەی سوپاسی بکەن و چاولەبەری ئەو خـوای بەخشندەو میهرەبانەبن، کەچی زۆر سپڵەبوون. ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ بەرهـەمێکی تـری دەسـەڵاتی خـوا کەشێوەیەکی شیرین و دڵ ڕفێنـی هەیـە، بـەڵام لەبـەر زۆری و دەق گـرتن پێیـەوە لـەیاد ئەچــێ. ئەفــەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئایـا سـەرنجیان نـەداوەو ئاوڕیـــان نەداوەتـــەوە بـــۆ لای باڵنـــدەو پەلـــەوەر بـــەژێر بـــار کـــراوی بـــۆ فڕینـــی لەحـــەوادا. ﴿مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ڕاکیری نەکردوون و ڕگیریان ناکات لەکەوتنە خوارەوە هیچ کەسێك بێجگە لەخوا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ بەڕاستی لـەو ژێربار کردن و ڕاگیرکردنەدا چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەوانەی کەبڕوادارن و بڕوا ئەهێنن، هەرکەس بڕواداربێت ئەزانێ دەستی قودرەتی خـوا ئـەو کـارە ئـەبات بـەڕێوە، کەواتـە هەرئەوانـە سـوود وەرئـەگرن لـەو بەڵگەیانە، لەبەرئەوە تایبەتی کرد پێیانەوە.**

﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ٨٠﴾

ئینجا هەنگاوێکی تر ئەنێ لەبیرخستنەوەو وریاکردنەوە لەو چاکەو بەهرەیانە کە خوا فەراهەمی هێناون بۆ بەندەکانی لەژیانیاندا. ئەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا﴾ خوا گێڕاویەتیەوە بۆتان ئارامیو حەوانەوە لەماڵەکانو جێنیشتەجێ کانیاندا، بێگومان حەسانەوەو حوانەوە لەماڵو جێی نیشتەجێدا زۆر گرنگەو هەموو کەس ڕێزو نرخی ئازانێ بەتەواوی مەگەر ئەو کەسانەی کەئاوارەو دەرکراون لەجێو شوێنی خۆیان. جا لێرەدا پێویستە بیرلەوە بکەینەوە کە ئیسلام ئەیەوێ ماڵو جێی نیشتەجێی جێگی ئارامیو ئاشتی هەستو دەروون بێت. ئەیەوێ ئارام گایەك بێت کە دڵو دەروون تێیدا بحەوێتەوە، ئیتر بەهۆی چارەسەرکردنی پێویستیاتی ژیان یان بەهۆی خۆشیو بێ باکی دانیشتوانی ئەو ماڵە لەناو یەکدا، نەك شوێنی ئاژاوەو بەربەرەکانی بێت. جا لەبەرئەوە ئیسلام بەگرنگی ڕێزی داناوە بۆ خانەو ماڵو نابێ ڕێزەکەی بشکێنرێ. کەواتە نابێ بەبێ پرسو ڕەزامەندی خاوەن ماڵەکە خەڵکی تێی بچن تەنانەت با ئەو کەسەی کەپرس نەکات کاربەدەستو لێپرسراوی موسڵمانانیش بێت. نابێ هیچکەس سەرەتاتکێ بکات بۆ ناوی لەکون کەلەبەرەوە سەرنجی ناو ماڵ بدات لەبەر هەر هۆیەك، نابێ هیچکەس جاسوسی لەسەر بکات بەنهێنیو بێ ئاگایی خاوەن ماڵ تا بەهۆی ئەوەوە داچڵەکێو بێ ئارامی ڕووی تێ بکات. ئینجا بەو بۆنەی خانەو ماڵەوە باسی هەندێ لە دەستکەوتو پێویستیات ئەکات کە پەیوەندی یان بەماڵوخانەوە هەیە بەهۆی ماڵاتو چوارپێوە دەستکەوت ئەبن کەخۆشیان پەیوەندیان بەخانەو ماڵەوە هەیە. ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ﴾ خوا گێڕاویەتی پێکی هێناوە بۆتان لەپێستی مەڕو بزنو حوشترو وڵاخ ماڵو جێی نیشتەجێیەکی تر کەدەستتان دەکەوێ بەسوكو ئاسانی لەڕۆژی کۆچو بارکردنتانو لەڕۆژی مانەوەو نیشتەجێ بوونتان. ئەوەش وەك ئەو خێوەتو خێمانەی کە پێك ئەهێنرێن لە چەرمیان وەك دەواریش کەلە موورو خوری پێکدێت. وەك ئەو شتانەی تۆیش کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ﴾ گێڕاویەتی بۆتان لەخوریو کورگو مووەکانیان شتو مەکی ناو ماڵ کەسوودو قازانجی لێ وەرئەگرن لەکڕینو فرۆشتنو زستو گوزەرانتاندا. یان مەبەست بە ﴿وَمَتَٰعًا﴾ هۆی جوانیو ئارایشە، ئەوانەی گێڕاوە بۆتان تا کاتو ماوەیەك کە کاتو ماوەی تەواوبوونی پێویستیەکانتانە، یان ماوەی نەمانی ئەوشتانەیە. یان ماوەی نەمانو مردنیانە.

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٢﴾

---

**ئیجا چەند چاکەو بەهرەیەکی تر ئەخاتە بەرچاوو ئەفەرموێ:** ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا﴾ **خوا گێراویەتی لەوەی دروستی کردووە چەند شتێك کەئەیکەن بەسێبەر کە پەناتان ئەدات لەگەرما ئیتر مەبەست هەوربێت یان دارو درەخت، بەهەر کام سێبەر لەگەڵیٚ وولاتدا بەنرخە بەتایبەتی لەکاتی گەرمادا لەوولاتی گەرمەسێردا وەك وولاتی حیجاز کە جێ و شوێنی یەکەم گەلە کە یەکەمجار ئەم ئایەتە چووە بەگوێیدا** ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا﴾ **گێراویەتی لەشاخ و چیاکان چەند غارو ئەشکەوت کە خۆتانی تێدا ئەشارنەوە لەکاتی گەرماو سەرماو باران و هەر پێویستیەکی تردا، کە زۆرکەس پێویستی بەو جێگەی داشاردنەیە بەتایبەت فەقیرو بێنەواکان لەکاتی سەفەردا** ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ﴾ **گێراویەتی بۆتان چەند پۆشاکێك کە ئەتان پارێزێ لەگەرما** ﴿وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ﴾ **چەند پۆشاکێك کەئەتان پارێزێ لەسزاو ئازارێك کە دووچارتان ئەبێت لەجەنگدا وەك زرێ و تاس کڵاو ئەو شتانەی کەبەرگری ئەکەن لەزام و ئازار لەلایەن خەڵکی یەوە، بێگومان ئەمانەی کەباسکران چارەسەرن بۆ خەڵکی ئیتر بێ نەواو فەقیربن یان بێ پێویست و دەوڵەمەند و نیشتەجێبن یان سەفەری، کەواتە خوای بەخشندەو میهرەبان هیچی نەهێشتووەتەوە بۆ بەندەکانی و لەهەموو بارێکەوە چاکەو نیعمەتی ڕشتووە بەسەریاندا، وەك ئەفەرموێ:** ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ﴾ **بەو جۆرو شێوەیە خوا چاکەو نیعمەتی خۆی تەواو ئەکات بەسەرتانەوە** ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾ **بەڵکو موسڵمان بین و ملکەچ بن بۆ فەرمانەکانی خوا ئینجا ڕووی فەرموودە ئەکاتە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) و کارو پیشەی خۆی بۆ دیاری ئەکات لە نێوان ئەوەدا هەڕەشە ئاراستەی بێ ئەکات و ئەفەرموێ:** ﴿فَإِن تَوَلَّوْا۟﴾ **ئینجا ئەگەر ئەوان ڕوویان وەرگێڕاو موسڵمان نەبوون** ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ **ئەوا هەر ڕاگەیاندنی ڕوون لەسەر تۆیە. واتە هیچ زیانبار نابیت و هەر ئەوانە بەش براوو زیانبارئەبن و ئۆباڵی خۆیان لەسەر خۆیانە. ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ تاوان و بەدیی ئەوانە کەڕوو وەرگێڕانەکەیان لەڕووی نەزانینەوە نییە بەڵکو لەپاش زانین و ناسین ڕوو وەرئەگێڕن،**

يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا
يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ

**ئەفەرموێ: ﴿ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ﴾ ئەوانە نیعمەتەکەی خوا ئەزانن‌و ئەیناسن، واتە ئیسلام یان پێغەمبەر(ﷺ) یان ئەو چاکەو بەهرەیانە کەباسکران‌و ئەوانە بەدەم دانی پێدائەنێن‌و کەچی ﴿ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴾ لەپاش ئەوە بەکردەوە ئینکاری ئەکەن‌و دانی پێدانانێن‌و بەپێی فەرمان‌و بەرنامەی خوا ناجوڵێنەوە ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ زۆربەی ئەوانە هەر بێ بڕوان لەدڵەوە. بەچەند جۆرێکی تریش تەفسیرکراوەتەوە.**

**ئینجا چارەنوس‌و دوارۆژی ئەوانە ئەخاتە بەرچاو کە دووچاری ئەبن لە ڕۆژی دواییدا، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ڕۆژێك بکە کەئێمە لەهەموو گەل‌و میلەتێك شایەتێك زیندو ئەکەینەوەو ڕەوانەی ئەکەین کەشایەتی بدات بۆ چاك‌و بڕوا دارەکانیان، و شایەتی بدات بەدژی تاوانبارو بێباوەڕەکانیان ئەو شایەتەش بریتیەلە پێغەمبەر ئەو گەل‌و میللەتە، ﴿ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ ئینجا لەپاش ئەو شایەتی دانی ئەوانە ئیزن نادرێ بۆ ئەوانەی کەلە دنیادا باوەڕیان نەهێناوە بەرەو عوزرو بەهانە بێنەوەو هیچ قسەو بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نابێ ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴾ واتە داوایان لێناکرێ کە خوا لەخۆیان ڕازی بکەن چونکە ڕۆژی دوایی کاتی تۆبەو گەڕانەوە نییەو کاتی ئەوە ئەم دنیایە کەبەسەر ئەچێ. پەنا ئەگرین بەخوا لەسەختی‌و سامناکی ئەو ڕۆژە سەختە کەتاوانباران بەڕسوایی‌و شەرمەزاری یەوە ئەوەستن‌و پێغەمبەران شایەتیان لێ ئەدەن‌و ئەما ڕێ نادرێن کە وەڵامێك بدەنەوەو عوزرو بەهانەیەك بهێننەوە بۆ ڕابوردوویان، یان بەگەڕانەوەو کردەوەی چاك ڕابوردوویان بسڕنەوە!! ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ ﴾ کاتێ ئەوانەی کەستەمیانکرد لەخۆیان بەبڕوا نەهێنان‌و تاوان کردن. کاتێ ئەوانەی سزای دۆزەخ ئەبینن‌و ئەی چەژن ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ ﴾ ئیتر ئەوانە سزاکەیان لێ سووك ناکرێ ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾ ئەوانە دواناخرێن‌و مۆڵەت نادرێن ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ ﴾ ئەوانەی کە هاوبەشیان ڕەوادا لەدنیادا. کاتێ ئەوانە هاوبەشەکانی خۆیان لەڕۆژی دواییدا،**

قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ
لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾

**ئەوانەی کەبە نەفامی گێڕانیان بە هاوبەشی کاتێ ئەوانە ئەبینن ئەڵێن ﴿قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَ﴾ ئەی پەروەردگارمان ها ئەوانە هاوبەشەکانمانن کە ئێمە هاوارمان لێ ئەکردن و ئەمان پەرستن بێجگە لەتۆو لەتۆ تێپەڕمان ئەکرد. ئینجا مەبەستیان ئەوەیەکەسزاکەیان دابەش بکرێ بەسەر ئەوانیشدا یان مەبەستیان ئەوە بێ کەتاوانەکەیان بخەن بەمل ئەواندا ئەوان خەتاباربکەن. یان مەبەستیان ئەوە بێ کەدان بنێن بەتاوان و خراپەی خۆیاندا کەهەرکام لەو بارانە گوتراوە لەلایەن زانایانەوە. بەهەر جۆرو لەسەر هەر بار ﴿فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ ئینجا ئەو پت و پەرستراوانە ئەکەونە سام و بیم بەهۆی ئەوەوە وتەیان ئاڕاستەئەکەن بەم جۆرە ئەڵێن: بێگومان ئێوە درۆ ئەکەن لەوەدا کەئێمەتان بەهاوبەش ناو دەبرد یان درۆئەکەن لەمەدا ئێمە خەتابار ئەکەن. یان درۆئەکەن لەوەدا کەئێمەتان پەرستبێت، بەڵکو شەیتانتان پەرستووە و گوێ ڕایەڵی ئەو بوون، ﴿وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ﴾ ئەو بت پەرستان لەو ڕۆژەدا ملکەچی و گوێ ڕایەڵی ئاڕاستە ئەکەن بۆ لای خواو سەرپێچی و خۆبە زل زانی یەکەی دنیایان نامێنێ ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ ون ئەبێ لێیان و زایە ئەبێت ئەوەی کەلە دنیادا درۆو دەست هەڵبەستیان ئەکردو پشتیان پێ ئەبەست کە گوایا ئەو بتانە هاوبەشن بۆ خواو نزیکیان ئەخەنەوە لەخواوە و تکایان بۆ ئەکەن لای خوا. ئینجا هەڵوێستەکە دوایی ئەهێنێ بەبڕیاردانی دووبارەکردنەوەی سزا بۆ ئەوانەی کەخۆیان بێ بڕوان و هانی خەڵکیش ئەدەن لەسەر بێبڕوایی، ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کەلە دنیادا بڕوایان نەهێناوە و بەرگری خەڵکیشیان کردووە لە ڕێگەی خوانەیان هێشتووە بڕوا بێنن ﴿زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ﴾ لەڕۆژی دواییدا ئێمە ئەوانە زیاد ئەکەین بەسزا لەسەر سزایەك کەخۆیان شایستەن بۆی، زیادیان ئەکەین بەمەی هێزو تینی سزاکەیان دووقات بێت، یان بەجۆرە سزایەکی تر بێجگە لەسزای ئاگر، وەك لە حەدیسدا هاتووە کەمارو دووپشکی دۆزەخیان بەسەردا زاڵ ئەکرێ بۆ گەستن و پێوەدانیان ئەوەش ﴿بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەبێ کەئەوانە خراپەکاریان ئەکرد بەڕێگرتنی خەڵکی لەڕێی خواو بەردەوامیان لەسەر ئەوە.**

وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ

ئینجا بەشێوەی تایبەتی هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ گەل و ئوممەتەکەی نیشان ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ باسی ئەوکاتە بکە کەئێمە لەهەموو گەل و ئوممەتێك لەخۆیان ئەنێرین کەشایەتی یان لێبدات لەو هەڵوێستەی کەبوویان بەرامبەر ئەو شایەتە، واتە ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەوانە کرا بۆیان لەدنیادا ﴿وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ تۆش ئەی پێغەمبەر ئەهێنین بەشایەت لەسەر ئەوانە، واتە قورەیش و عەرەبەکان کەلەو کاتەدا بانگکران بۆ بڕواهێنان، یان هەموو ئوممەت بەتێکڕایی، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) هەرچۆنێ لەژیاندا ئاگاداربووە لەهەڵوێست و کردەوەیان، هەروەها لەپاش نەمانیش لەدنیادا ئاگادارکراوە لەسەر هەڵوێست و کردەوەی ئوممەتەکەی لەپاش خۆی، وەك لەچەند حەدیسێکدا هاتووە، یەکێك لەوانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: مردنم چاکە بۆتان، کردەوەکانتانم نیشان ئەدرێ، هەر کردەوەیەکی چاکتان ببینم سوپاسی خوای لەسەر ئەکەم، هەر خراپەیەکم بینی داوای لێبوردن ئەکەم بۆتان، یان مەبەست هەموو پێغەمبەرەکانی پێشووە کە پێغەمبەرمان(ﷺ) شایەتی ئەدات لەسەر ڕاستی ئەوان لەو شایەتییەی کە داویانە لەسەر ئوممەتەکانیان. ئینجا سەرنج ڕائەکێشێ بۆ ئەوەی ئەو نامە کە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونکەرەوەی هەر شتێکە کە پێویستە ڕوونکردنەوەی، کەواتە هیچکەس بڕوبیانووی بۆ نامێنێتەوە، ئەو نامەیە ڕێنموونی یەو میهرەبانییە هەموو موژدەیە بۆ موسڵمانان، ئەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ هێناومانەتە خوارەوە بۆسەر تۆ ئەی پێغەمبەر نامە، واتە نامەیەك کە ئەوەنە تێرو تەواوە وەك هەر ئەو شایستە بێت بۆ ناوبردن بە نامە، لەکاتێکدا ئەو نامەیە باس و ڕوونکەرەوەیە بۆ هەمووشتێ لە کاروباری ئایینی کە پێویست بێت بە باسکردن و دەق نان بەسەریدا، یان باس و ڕوونکەرەوەیە لە کاروباری ئاییندا بۆ هەمووشتێ ئیتر بە دەق بەسەردا نان یان

ئامـاژەو دەستنیـشان کـردن بـۆی لـەڕێی پێغەمبـەرەوە(ﷺ) کـە ئـەو کـراوە بـە بـاس‌و ڕوونکـەرەوەی قورئـان، هـەروەها دەستنیـشان کـردن لـەڕێگای -قیـاس- بـەراورد کردنـەوەو بڕیاری زانایان -اجماع- یان مەبەست ئەوەیە ئەو نامەیە باس‌و ڕوونکردنەوەیە لە خۆیدا بۆ هـەموو شتێ، ئیتر با هـەموو کـەس تێنـەگات‌و هـەموو شـتی لێ وەرنـاگرن، ئـەوەش بەوێنـەی ئـەوەی ئـەگوترێ: خـۆر لەخۆیـدا ڕووناکیـدەرە ئـیتر هەرچـەند ڕوونـاکی وەرگـرو سـەرنجدەر نـەبێ، زۆر لـە زانایـان چەندەها شتیان لـە قورئـان دەرهێنـاوە کـە لای خـەڵکانی تـر شـاراوەو پۆشیدە بوون، وەك دەست نیشان هەیە بۆ ئـەوە لـە حەدیسێکدا کە(ئیمـامی عـەلی) ئـەیهێنێ لەبارەی گـەورەیی قورئانـەوە کـە ئـەفـەرموێ: ﴿لا تنقضى عجائبه﴾شـتە نایابـەکانی قورئـان دوایـی نایـەن، واتـە لـە بەرەبەرەوە دەردەکـەون‌و دەزانـرێن. بـە هـەر جـۆر ئـەوە جێـی گومـان‌و دوودڵـی نیـە، ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ ڕێنمـوونی‌و میهرەبانیـە بـۆ هـەمووان، ئـیتر هەرچـەند هێنـدێ، بـەڵکو زۆربـەی بـەهۆی کـردەوەی خۆیـان بێبـەش بـن لـە بەرهـەمی ئـەو میهرەبانییـە ﴿وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ مـوژدەیـە بـە تایبـەتی بـۆ موسـڵمانان، هەڵنـەگرێ ڕێنمـوونی‌و میهرەبـانی یەکـەش وەك موژدەکـە تایبـەتی بکـرێن بـە موسـڵمانانەوە، بـەم جـۆرە مەبەسـت ڕێنمـوونی‌و میرەبانیی تەواو بێت. لە ئایەتی پێشوودا فـەرمووی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ وەك تەفسیرمان کردەوە، ئینجا لەم ئایەتانی داهـاتووەدا هێنـدێ لـەو شـتە گرنگانـە ئـەهێنێ کـە لـەم نامەیـەدا هاتووە کە ڕێنموونی‌و میهرەبانی یە بۆ هەمووان‌و موژدەیە بۆ موسڵمانان، لە یەکەم جارەوە ئایـەتێك ئـەهێنین کـە لـە هـەموو ئایـەتێك زیـاتر خێـرو شـەڕی کۆکردووەتـەوە، لەبەرئـەوە خەلیفـەی ڕاشـید(عمـری کـوڕی عبـدالعزیز) -خـوای لێ ڕازی بێـت- کـردی بـە بـاو کـە لـە خوتبـەکانی جمعـەدا بخـوێنرێ لـە جێگـای ئەفـەرموێ:و قسە بەدانـەی کـە بـەنی ئومەییـە ئەیانکرد دەربارەی(ئیمامی عەلی) -خوای لێ ڕازی بێت- لە خوتبەکانیانداو نەفرینی کرد لەو کەسانەی کە خەشمیان هەیە لەو ئیمامە بەرزەو قسەی پێئەڵێن. خوا لـە عومـەر ڕازی بێـت بەڕاسـتی ئـەو کـردەوەی لـە گـەورەترین کردەوەکانییـەتی، بەڕاسـتی ئـەم ئایەتـە کورتـە وەك چەند کەسێك گوتوویانە بەسە بۆ ئەوەی بکرێ بە ڕابەرو بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئـەم قورئانـە باس‌و ڕوون کەرەوەیە بۆ هـەموو شـتێ، کەواتـە با بێین بۆ ژێـر سایەی‌و دڵـی بۆبکەینـەوە

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ بەڕاستی هەمیشە خوا فەرمان ئەدات بە عەدل، ئەم ووشە پیرۆزە بە چەند جۆرێك تەفسیر كراوەتەوە، یەكێك لەوانە كە بەهێزترە لە دڵداو كۆكەرەوەی هەموو خێرو چاكەیەكە ئەمەیە: یەكسانیو میانەییو مامناوەندی لە هەموو كاروبارێكدا بەبێ هیچ زیادەڕەویو كەموكورتی، بەوێنەی ناوەڕاستی تەرازوویەكی ڕاست كە بەهەر بارێكدا بگۆڕێ لارو خێچ دەرنەچێ. هەركەسێكی زانا بیربكاتەوە بۆی دەردەكەوێ ئیسلام لە هەموو كارو برِیارێكیدا ئەو میانەییو مام ناوەندی یەی گرتووە، بۆ وێنە لەبارەی بیرو باوەڕەوە فەرمان ئەدات بە پەرستنی خوا بەتاكو تەنها كە میانەیە لەنێوان بڕوا نەبوون بە داهێنەرو هاوبەش ڕەوادان، فەرمان ئەدات بە خواپەرستی كە میانەیە لەنێوان بەتاڵیو ڕەهبانی یەتدا، فەرمان ئەدات بە سەخاوەتو دڵگوشادی كە میانەیە لەنێوان چرووكیو دەست بڵاویدا. شەجاعەتو چالاكی پەسەند ئەكات كە میانەیە لەنێوان دوڕندەییو ترسنۆكیو بێ ورەییدا، فەرمان ئەدات بە داوێن پاكی كە میانەیە لەنێوان بەرەڵاییو بێناموسیو وشكیو وازهێنان لەكاری ژنو مێردی. هەروەها هەموو كارەكانی لە هەموو بارو ڕوویەكەوە، جا لەبەرئەوە ئیسلام دەست نادات بۆبژارەو دەستكاری. ئەم ئیسلامە هات بۆئەوەی ئوممەتێك پێك بهێنێ، گەلو كۆمەڵێك ڕێك بخات. ئینجا لەپاش ئەوە عالەمو جیهانێك دابهێنێ بەیاساو بەرنامەو پێكەیاندنێكی تاقانەی بێ وێنە، هات بۆ ئەوەی ببێ بەبانگەوازێكی جیهانی گشتی كە هیچ جۆرە ڕەگەزایەتی تیانەبێ. ڕەگەزایەتی تیرەو بەرەو خاكو نیشتمان، هۆی پەیوەندیو پەیوەستی یەكەی هەر عەقیدەو بیرو باوەڕەكەی بێت. هەر ئەو بیروباوەڕەی نیشتمانو تیرەو نیشانەو دروشمی بێت. جا لەبەرئەوە بیروباوەڕو یاسایەكی هێنا كە مایەی یەكێتیو یەككگرتنو ئارامیو سەربەستی بێت بۆهەموو ئادەمی بە هەموو ئەندامو بەشو تیرەو بەرەكانی یەوە. دادو دادپەروەریو میانەیی هێنا لەهەموو كاروباریدا كە لەگەڵ هەواو ئارەزوودا نەگەڕێ، ڕقو خۆش ویستن كاری لێ نەكات، خزمایەتیو دئستیو دوژمنایەتی نەیگۆڕێو هێزو دەسەڵاتو دەوڵەمەندیو بێهێزیو هەژاری ناهەقی پێنەكات، بەڵكو بە یەك سەنگو تەرازوو مەن كێشانو پێوان بكات بۆ هەمووان.

وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ

---

﴿وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ ئەم ووتە پیرۆزەش بەچەند جۆرێك تەفسیرکراوەتەوە کەرێك و گونجاوە، یەکێ لەوانە ئەمەیەو لەحەدیسی سەحیحدا هاتووە کەبریتیەلە پەرستنی خوا بەووریایی و ملکەچی بەجۆرێك وەك خوا بەچاو ببینرێ. وە تەفسیریش کراوەتەوە بەهەر ووتارو کردارێکی چاك و پاك لەهەر کارو کردەوەو هاوکاریەکدا، بەم جۆرە هەموو بارو ڕووی ژیان ئەگرێتەوەو هەموو پەیوەندی پەیوەندی یەکانی بەند داگیر دەکات. پەیوەندی بەندە لەگەڵ خوای خۆیدا، پەیوەندی لەگەڵ ماڵی خێزاندا، پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵدا، پەیوەندی لەگەڵ بوونەوەرو هەرچی لەم بوونەوەرەدایە ﴿وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ خوا فەرمان ئەدات بە بەخشین و پێدانی هەموو مافی خزم و خوێش. بێگومان ئەمە بەشێکە لە ﴿وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ لەسەر تەفسیری دووەم بەڵام بەتایبەتیش باسی ئەکات لەبەر زۆر گرنگی و نرخ پێدانی. هەرچەند سۆزو بەزەیی خزمایەتی شتێکی سروشتی یەو زۆر بەجێیە ڕەچاوکردنی، بەڵام لێرەدا مەبەست بەکارهێنانی ڕەگەزایەتی و خانەوادەو خێزان نییە، بەڵکو ئەمە بەشێکە لەو دەستە بەرەیەی کۆمەڵایەتی گشتییە(التكافل الاجتماعی) کە ئیسلام زۆر بەگرنگی ڕەچاوی کردووەو بەگرنگی بەکاری هێناوەو بەرەبەرە پێکی ئەهێنێ لەم چوارچێوە بچووکەوە دەست پێ ئەکات و بەرزئەبێتەوە تا ئەگاتە چوارچێوە گشتی یەکەی. ئەوەش بەپێی ئەو ڕێکخستن و هۆنینەوەی کە داینــاوەو دیارییکردووە بۆ پێکهێنانی ئەو دەستە بەرەیی یە گشتییە. ﴿وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ﴾ خوا بەرگری و جڵەوگیری ئەکات لە گوناهە زۆر بەدو ناشیرینەکان وەك زینا و داوێن پیسی کە دەست درێژی یە بۆ سەر ناموس و پیاوەتی ﴿وَٱلۡمُنكَرِ﴾ لەهەر کارو کردەوەیەك کەبە سروشت بێزراوە لەبەرئەوە شەریعەتیش بەبێزراوی دائەنێ، زۆرجار سروشت لەبارە ڕاستەقینەکەی ئەترازێ و لائەدات، بەڵام شەریعەتی خوا هەر ئەمێنێتەوە لەسەر دامەزراوی خۆی و ئامارەئەکات بۆ سروشت پێش گۆڕان و لادانی ﴿وَٱلۡبَغۡيِ﴾

جڵەوگیری ئەکات لەستەمو دەست درێژیو ژێرپێکردنی هەقو داد، هەر گەلو کۆمەڵێك کەئەو کارو گوناهە بەدانەیان تێدا بڵاوبێتەوە هەرچەند بەدیمەن بەرزو بەدەسەڵات بێت، بێگومان بەرەبەرە بەرەو ڕخانو نەمان ئەڕوات. سروشتی ئادەمی هەڵئەسێو ڕائەپەڕێ بەدژی ئەو کارو گوناهانە، ئیتر زۆری پێبچێ یان کەم، هەرچەند سەرکێشانو تاوانباران هەوڵو تێکۆشان بکەن بۆ لادانو بەرگری کردنی سروشتی پاكو خاوێنی ئادەمی، ئەو هەموو شۆڕشو ڕاپەڕینانەی کە کراونو ئەکرێن بەدژی ئەو گوناهو تاوانە بەدانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو گوناهو تاوانانە شتێکی بێگانەو غەریبنو بێزراون لای سروشت، هۆی ئەو هەموو بێزاری دەربڕینو دژایەتیەی کەبە فراوانی ئەبینرێ ئەمڕۆ لەگۆڤارو نامەو ڕۆژنامە نوسەکانی ئەمریکاو ئەوروپا دەربارەی ئەو کردەوەو کردارە بەدانەی کە باسکران دژایەتیو نەگونجاوی ئەو گوناهانە لەگەڵ سروشتی پاکی ئادەمیدا. تەنها ئەو فەرمانو جڵەوگیریەی کەلەم ئایەتەدا ڕێكو ڕاستو گونجاوە لەگەڵ سروشتدا، لەبەرئەوە لەکۆتایی ئەو ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ خوا ئامۆژگاریتان ئەکاتو بێدارتان ئەکاتەوە بۆئەوەی پەند وەرگرنو بێداربېنەوە. یەکێکی تر لەو بیرو باوەڕانەی کەئەم نامەیە هێنایو مایەی یەکێتیو پەیوەستی خەڵکی یە، بریتیە لەپاراستنو هەڵسان بە بەڵێنو پەیمان لەبەرئەوە ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ﴾هەڵسن بە بەڵێنو پەیمانی خوا کاتێ کەبەڵێنو پەیمان ئەدەن، دیمەنو ڕواڵەتی فەرموودەکە گشتی نیشان ئەدات. هەموو بەڵێنو پەیمانێك ئەگرێتەوە کە شەرعی بێتو خوا پێی ڕازی بێت، لەسەر ئەوانەوەیە ئەو بەڵێنو پەیمانەی کە باوەڕدارەکان دایان بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، بێگومان هەڵسان بە بەڵێنو پەیمانو پاراستن مایەی متمانەو دڵنیاییە لەنێوان موسڵماناندا و بەبێ ئەوە گەلو کۆمەڵ هیچو پوچەو ئادەمێتی نییە. ئینجا هانی موسڵمانان ئەدات لەسەر پاراستنی ئەو بەڵێنو پەیمانەو ڕسواو خەجاڵەتی ئەهێنێ بەسەریدا لەسەر شکاندنو هەڵنەسان بەو پەیمانە شەرعیەی کە ئەدرێ.

وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَـٰثًا

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا﴾ بەڵێن و پەیمانەکانتان هەڵ مەوەشێننەوەو مەیان شکێنن لە پاش بەمێزکردن و بەتین کردنیان بەسوێند خواردن لەسەریان لە کاتێکدا خواتان گێراوەو ئەیکەن بەشایەت و چاودێر لەسەر خۆتان کەئەو بەڵێن و پەیمانە بەجێ ئەهێنن و ئەیبەنەسەر. مەبەست لەم دوو وتەیە سەرزەنشت کردن و تەریق کردنەوەیە بەمەی پەیمان هەڵوەشاندنەوە لە پاش بەتین کردن و خوا گرتن بەشایەت لەسەر بەجێهێنان و هەڵنەسان پێیان کارێکی زۆر ناڕاست و بەدەو هەڕەشە ئەکات لەسەری بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ بەڕاستی هەرچی ئەکەن خوا ئەزانێ و ئاگایە پێی. ئینجا تەنها بەوەوە ناوەستێ، بەڵکو ئەو شکاندن و هەڵوەشاندنەوە بێزارو ناشیرین ئەکات بەچیرۆکێکی دڵتەزێن و ئابڕوو بەر ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَـٰثًا﴾ لە هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن و پەیمانەکاندا مەبن بەوێنەی ئافرەتێکی نەفام لە ڕێسراوەکەی خاوئەکردەوەو هەڵی ئەوەشاندەوە لەپاش بادان و ڕستن و شەتەك دانی، هەڵی ئەوەشاندەوەو ئەیگێڕا بە چەند کۆمەڵێکی خاوکراوەو هەڵوەشاوە، واتە تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن و پەیمانەکانتان بەوێنەی کاری ئەو ئافرەتە نەفامەیە. بەڕاستی وێنەو چیرۆکێکی زۆر ڕیسواکەرو دڵتەزێنەو جڵەوگیری هەموو ژیرێك ئەکات لەبێ پەیمانی و بێ باری کە لەکەو عەیبێکی زۆر گەورەیەو دژی مەردی و مرۆڤایەتییە. ئیتر ئایا مەبەست بەو ئافرەتە ئافرەتێکی نادیاری یە، یان مەبەست ئافرەتێکی دیاری ناسراوە لای ئەوکەسانەی کە یەکەمجار ئەم ئایەتەیان ئاڕاستەکرا. وەك(کەلەبی و موقاتیل) ئەفەرموون: ئەوە ئافرەتێك بوو لە قورەیش ناوی(ربطـە ی کچی سعد) بوو نەفام و شێت بوو، کارو پیشەی ئەوەبوو خۆی و کارەکەرەکانی بەیانی تا نیوەڕۆ تەشی یان ئەڕست، ئینجا فەرمانی ئەدا بەخاوکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی ڕێسراوەکەیان! هێندێ لەوانەی پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ) و پاشگەزبوونەوە بیانویان ئەمە بوو کە پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵی بوون دەستەیەکی کەمن و قورەیش زۆر بەهێزن.

تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ ۚ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ ۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً

ئینجا خوا بەرپەرچی دانەوەو تەمێی کردن کە ئەوە نابێ بەهۆی شکاندنی پەیمانو پاشگەزبوونەوەو فەرمووی: ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ﴾ واتە بەڵێنو پەیمانەکانتان هەڵئەوەشێننەوەو پاشگەز ئەبنەوە لەکاتێکدا پەیمانەکانتان ئەگێڕن بەهۆی ناپاکی لەناوتانداو بەفڕو فێڵ خۆتانی لێدەرئەهێنن، لەبەرئەوەی دەستەو کۆمەڵێك ژمارەی زۆرترەو بەهێزترە لەدەستەو تاقمێکی تر، واتە ئەوە نەکەن بەهۆی ئەو پاشگەزبوونەوەو بەدوای ئەودا بگەڕێن کەئەو بەپێی باوی ئێستا لەم نەفامی تازەدا پێی ئەگوترێ: پێکهێنانی بەرژەوەندی گشتیو دەوڵەت(المصلحة العامة ومصلحة الدولة)، ئیسلام هەرگیز بەوە ڕازی نییەو بەفێڵو ناپاکی دائەنێ، چونکە ئیسلام هەموو کاروباری لەسەر ڕاستو پاکی دائەمەزرێنێو لەهەموو شتێکدا چاکەو لەخوا ترسان ڕەچاو ئەکات. قورئان لێرەدا جڵەوگیری ئەکات لەو ناپاکیو فڕو فێڵەو خەڵکی بێدار ئەکاتەوە بەوەی بوونی ئەو گەلو کۆمەڵە زۆرە تاقیکردنەوەی تێایەو باپەیمان دەرەکان خۆیان بگرنو ئەو پەیمانەی کە بەستویانە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە کەمەدا نەیشکێنێو پارێزگاری بکەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ﴾ خوا هەر تاقیتان ئەکاتەوە بەبوونی ئەو کۆمەڵەی ژمارەیان زۆرترە. یان تاقیتان ئەکاتەوە بەفەرماندان بەپارێزگاری پەیمانو جڵەوگیری لە شکاندنو پاشگەزبوونەوە، ئینجا کاری دووبەرەکی نێوان خەڵکی حەواڵەی خوا ئەکات تا لەڕۆژی دوایدا ئاژاوەو ووبەرەکیەکەتان ببڕێتەوەو بڕیاری ڕاستو ڕەوای خۆی لەسەر دەربکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ سوێند بەخوا بەڕوونی باس ئەکات بۆتان لەڕۆژی دوایدا ئەوەی کە ئێوە لە دنیادا تیایدا دووبەرەکی بوونو بەپێی کردەوەکانتان بەهەقیانەت تۆڵەو پاداشتتان ئەداتەوە. بە فەرموودەیە هانی خەڵکی ئەدات لەسەر ڕاگیرکردنو بەجێهێنانی پەیمان تەنانەت لەگەڵ ئەوانەش کە دژو پێچەوانەن لەڕاو عەقیدەدا ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی ئەگێڕا ئەی ئادەمی سەرجەم بەیەك میللەت بەبێ ئاژاوەو دووبەرەکیو بەتێکڕایی هەموو موسڵمانان ئەبوون لەسەر یەك بارو یەك سروشت بەوێنەی مەلائیکە، بەڵام بەپێی کاردروستی بەو جۆرەی نەکرد، بەڵکو بەجۆرێکی دروستکردن کە دەیت بدەن بۆ ڕێنموونیو گومڕایی، بە ئارەزوو هەڵبژاردنی خۆتان، بەپێی ئەوەش خوا ڕێنموونی هەر کەسێك ئەکات کە ڕێنموونی هەڵبژێرێ، و گومڕا ئەکات هەرکەسێك کە گومڕایی بۆ خۆی هەڵبژێرێ. واتە ڕێنموونیو گومڕاکردنەکەی خوا بەپێی هەڵبژاردنی بەندەکەی،

وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

**بەو جۆرە مەبەستە کە ئەفەرموێ:** ﴿وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾ **بەڵام خوا گومڕا ئەکات هەر کەسێك بیەوێ و مەیلی گومڕاکردنی بکات. ڕێنموونی هەرکەسێك ئەکات کەخوا بیەوێ و مەیلی ڕێنموونی بکات** ﴿وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ **سوێند بەخوا پرسیارتان لێ ئەکات لەهەرچی کەئێوە لەدنیادا کردبێتتان. کەواتە پاداشتی چاکان ئەداتەوە لەسەر چاکەکانیان، تۆڵە ئەستێنێ لە خراپەکاران یان لێیان ئەبوورێ. ئینجا هەمیتر ئەدوێ لەبارەی هەڵسان بەڕاگیرکردنی پەیمان و پاراستنی لەشکاندن و هەڵوەشاندنەوەی، زۆر بەگرنگی لەوە ئەدوێ و هەڕەشە ئەکات لەوانەی کەئەیشکێنێ و مژدە ئەدات بە پارێزەران، ئەفەرموێ:** ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ﴾ **پەیمانەکانتان مەگێڕن بەهۆی غەدرو ناپاکی و خراپەکاری لەنێوانتاندا** ﴿فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا﴾ **تا بەهۆی ئەوەوە پێ یەك هەڵخلیسکێ لە پاش جێگیربوون و دامەزرانی ئەم ووتەیە چیرۆکە بۆ هەر کەسێك کەلە پاش خۆشی و شادمانی بکەوێتە ناخۆشی و غەم و پەژارە، یان لە پاش کامەرانی بکەوێتە ڕووداو و بەسەرهاتی بەد. واتە ئەی ئادەمی کەبە هۆی پەیمان دانتان بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتنە سەر ڕێگەی ڕاست و جێگیربوون لەسەری، پەیمانەکانتان مەشکێنن تا بەهۆی ئەوەوە لەڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام هەڵخلیسکێن و بترازێن لێی کەئەوە مایەی بەدبەختی هەردوو جیهانە.(زەمەخشەری) ئەفەرموێ: پێی بەتاك و نادیاری فەرموو، واتە هەر پێ یەك تا دەست نیشان بێت بەسەختی و سامناکی ئەو ترازانە. بێگومان پەیمان بەستن بەنیازی فێڵ و خەڵەتاندن عەقیدە و باوەڕ تێك ئەدات و ئەیخاتە لەرزە، شێوەی ناشیرین و بەد ئەکات لەدەروونی خەڵکی تردا، چونکە ئەو کەسەی کە سوێندو پەیمان ئەدات و لەکاتێکدا ئەزانێ فێڵ ئەکات هەرگیز عەقیدە و باوەڕی دامەزراو نابێ و لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی جێگیرنابێ. بەهیچ جۆر نرخی نامێنێ لای خەڵکی** ﴿وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ **تا سزاو ناڕەحەتی بچەژن بەهۆی ڕێگرتن و بەرگری کردنتان لەڕێی خوا، چونکە ئەو پەیمان شکانەیان ئەبێ بەهۆی شکاندنی کەسانی تریش و لەوانەوە خەڵکی تریش فێری شکاندن ئەبن، کەواتە وەك بەرگری یان کردبن لەڕێی خوا، یان مەبەست لادان و بەرگری خۆیانە لەڕێی خوا کەبە هۆی ئەو شکاندنی پەیمانەوە دووچاری ئەبن،**

وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ
تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا
كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ

ئەوانە لەدنیادا دووچاری سزای کوشتن و بڕین و ئاوارەکردن و بەدیل گرتن ئەبن و لەڕۆژی دوایشدا چارەنوسیان ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بۆتان هەیە سزای زۆر گەورە کە سزای دۆزەخە. خوا پەنامان بدات چەندەها گەل و کۆمەڵ هاتنە ژێر سایەی ئیسلام بەهۆی ئەوەی دیتیان لە موسڵمانەکانەوە هەڵسانیان بە هەر پەیمانێك کە ئەیان بەست لەگەڵ خەڵکیدا، ڕاستی یان لە بەڵێنەکانیاندا، بەهۆی پاکییان لە کارو کردەوەکانیان. کەواتە دەستکەوتیان زۆر گەورەو گرنگ تر بوو لەهەر ژیانێکی کاتی کەڕووی تێدەکردن لە ڕێگای دامەزراوی یان لەسەر بەڵێن و پەیمانەکانیان و هەڵسانیان بە پاك و خاوێنی بڕیارەکانیان و گوێ نەدانیان بەهێندێ سوودو بەرژەوەندی ڕواڵەتی کاتێ کە بەرچاو ئەکەوت و سەرنجی ڕادەکێشا. بەڕاستی قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) بەرهەمێکی گەورەو بەهێزی بەجێهێشت لەدڵ و دەروونی موسڵماناندا، شێوەیەکی گشتی فەراهەم هێنا لەناو موسڵماناندا، لەو بارەیەوە چ بۆ یەکە یەکەو چ بۆ کۆمەڵ و دەوڵەت، ئەگێڕنەوە کەلە نێوان معاویەو پادشای ڕۆمدا پەیمانێك بەسترابوو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، ئینجا معاویەش دوای هاتنی ماوەکە لەشکری بردە نزیك سنورو ئینجا لەگەڵ ماوە دوایی هات پەلاماری دان لەکاتێکدا کە ئەوان بێئاگابوون، ئینجا عومەری کوڕی عوتبە پێی گوت: الله اکبر ئەی معاویە ئەبێ غەدر نەکەیت و پێویستە لە پاش تەواوبوونی ماوە ئاگاداریان کەیت و لەناکاودا نەدەیت بەسەریاندا، ئینجا معاویە گەڕایەوە بەلەشکرەکەیەوە. ئەم قورئانە ئەو شێوە شیرینەی فەراهەم هێنا بە هاندان و موژدە پێدان و بەجڵەوگیریی و هەڕەشەکرد، ئەو پەیمان و

بەڵێنەی نیشان دا بەڵێنو پەیمانی خوا، ئەو سوودو بەرهەمەی کەلە پاشگەزبوونەوەدا دەستکەوت ئەبێ نیشانی دا بەشتێکی کەمی بێ نرخ، فەرمووی: ﴿ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ واتە بەڵێنو پەیمانەکەی خوا مەگۆڕنەوە بەدەست کەوتێکی کەم کە بەدەستی بێنن لە پاشگەزبوونەوەدا. ئەو ئەجرو پاداشتەی کەلای خوا دەستکەوتیان ئەبێ لەسەر ڕاگیرکردنی بەڵێنەکە خۆشەویست ئەکاتو بەچاکتر نیشانی ئەداتو ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ هەر ئەوەی کەلای خوا هەیە چاکترە بۆتان لەو دەستکەوتە کەمەی کە بەدەستی بهێنن بەهۆی شکاندنی پەیمانەکەتان. هەر ئەوە چاکە بۆتان، واتەپەیمانی خوا مەگۆڕنەوە، چونکە ئەوەی لای خوا هەیە چاکترە بۆتان ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەگەر ئێوە بزانن‌و لەوانەبن‌و کە خاوەنی زانینن، بێگومان ئەوە دەزانن، یان ئەگەر ئێوە زانان ئەو گۆڕینەوە مەکەن، ئینجا ئامارە ئەکات بۆ هۆی چاکێتی یەکەو ئەفەرموێ: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ هەرچی لای ئێوە هەیە لەسوودو خۆشی ئەم دنیایە ئەڕواتو نامێنێو دوایی دێت. ئەوەی لای خوایە ماوەیەو هەر ئەوە ئەمێنێتەوە. ئینجا دڵ بەهێزو دامەزراو ئەکات لەسەر خۆگریو دامەزراوی لەسەر هەڵسان بەو بەڵێنو پەیمانە کە شێکی قورسو گرانە لەسەر دڵ. ئەفەرموێ: ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ سوێند بەخوا ئەوانەی کەبە ئارانم بوونو خۆیان گرتووەو پاداشتیان ئەدەینەوە بەچاکترو جوانتر لەوەی کەئەوانە کردوویانە، یان پاداشتیان ئەدەینەوە بەئەجرو پاداشتی چاکترین کردەوەیان کە خۆگریەکەیانە، خۆگری سەری هەموو کردەوەکانە، چونکە هەموو کردەوە چاکەکان پێویستیان بەخۆگری، یان پاداشتیان ئەدەینەوە بەپێی چاکترین کردەوەکانیان واتە هەموو کردەوە چاکەکانیان بەچاکترین کردەوە دائەنێینو ئەجرو پاداشتی چاکترین کردەوەکانیانی بۆ دائەنێین،

﴿٩٦﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ
أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ
﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾

**ئینجا بەبۆنەی باسی کردەوەو پاداشتەوە یاسایەکی گشتی ئەهێنێ و ئەفەرموێ:**
﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ **هەر کەسێ لە نێر یان مێ کردەوەی چاكو باشی کردبێ لەکاتێکدا ئەو کەسە بڕواداربێ، چونکە بێبڕوا هیچ چاکەیەکی لێ وەرناگیرێ** ﴿فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ **ئەو کەسە ئەژیەنین بە ژیانێکی پاكو خاوێن کە ئەوەیە هیچ ناخۆشی و کەمو کوڕی ڕووی تێناکاتو هەرگیز دوایی نەیەتو بێگومان ئەوەش هەر لە بەهەشتدایە لەبەرئەوە زۆر لەزانایان تەفسیریان بەوەکردووە، چەند لەزانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست ژیانی ئەم دنیایە، بێگومان ژیانی ئەو کەسەی کەبڕواداری تەواوبێتو خاوەنی کردەوەی چاك بێت زۆر ژیانێکی خۆشو پاكو خاوێنە، چونکە خۆشی و کامەرانی بریتیە لە خۆشی و کامەرانی دڵ، دڵی بڕواداری خاوەن کردەوەی چاك پڕە لەئارامی و ئاشتی و ڕەوزامەندی و قەناعەت بەو بەشەی کە خوا پێیداوە ئیتر با کەمو کوڕی تێدابێتو خۆشی و کامەرانی هەڵسانی بەکردەوە چاکەکانی و ئومێدو چاوەڕوانی ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دواییشی بەتەواوی ژیانەکەی خۆشترو شیرین تر ئەکات. لەبەرئەوە تەفسیری بەم ژیانە لەدڵدا بەهێزترو دڵ زۆرتر بە ئارامە پێی، هەرچۆنێ ئەم بەڵێنی ترەش کە دێ بەدوایدا گونجاوترو ڕێكو پێك ترە لە گەڵی کە ئەفەرموێ:** ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ **سوێند بەخوا ئەجرو پاداشتی ئەوانە ئەدەینەوە بەجوانترو چاکتر کردەوەیەك کەلە دنیادا کردوویانە، لەسەر هەرکام لەو تەفسیرانەی کە لە ئایەتی گوتمان بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە، گوتمان ئەم بەڵێنی دووەمە ڕێکترو گونجاوترە، چونکە ئەوەی کە دڵ بەچەسپان تر بۆی بڕوا ئەمەیە کە کاتو جێ و شوێنی ئەم دوو بەڵێنە جیاوازن لەیەکتر بەم جۆرە یەکەمیان**

لەدنیادایەو دووەم لەڕۆژی دواییدا. هەروەها دڵ بۆ ئەوە چەسپان ترە کە ئەم دوو بەڵێنە جیاوازن لەیەکتری، دەی لەسەر تەفسیری یەکەم دووەم بەشێك ئەبێ لەیەکەم، خوا خۆی باشتر ئەزانێ.

ئینجا باسی هەندێ لە ئاداب و بەرهەم و شتە تایبەتی یەکانی ئەم قورئانە باس ئەکات کە سەرچاوەو ڕێنیشاندەری ئەم ئایین و ئوممەتەیە، ئەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ ئینجا ئەی پێغەمبەر کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا ببە بە خواو داوای لێ بکە پەنات بدات لەشەیتانی دەرکراوو نەفرین لێکراو، واتە بڵێ(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)تا نەتوانێ هیچ خەتەرەو وەسوەسەیەك بخاتە دڵت، دیارە لەجێیە پێغەمبەر(ﷺ) پێویستی هەبێ بەو پەنابردنە، ئەبێ کەسانی تر باشتر پێویستی یان پێی هەبێت. ئینجا ئایا ئەو پەنابردنە فەرزە یان سوننەتە؟ ئایا فەرمانە بۆ هەموو کات و نوێژیش ئەگرێتەوە چ فەرز بێ و چ سوننەت؟ یان نوێژ ناگرێتەوە چ فەرزبێت یان سوننەت؟ یا هەر نوێژی سوننەت ئەگرێتەوە؟ ئایا بۆ هەموو ڕکاتەکانی نوێژە یان هەر بۆ یەکەم ڕکاتە؟ بۆ هەر کام لەم ڕایانە هێندێ لەزانایان هەیە، هەرکەس ئەیەوێ باسەرنجی کتێبە(فقه)ی یەکان بدات. هەروەها ئایا ئەو پەنا بردنە لە پێش خوێندنی قورئاندایە وەك کۆڕو جەماوەر ئەفەرموون یان بۆ پاش خوێندنەکەیە وەك هێندێك ئەفەرموون. بێگومان ڕای کۆڕو جەماوەر بەهێزترو چاکترەو لەدڵدا جێگیرترەو کردەوەی خەڵکیش هەر بەوجۆرە هاتووە، ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ بەڕاستی بۆ شەیتان نییە دەسەڵات و زۆر بەسەر ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە، کارو باریان هەر حەواڵەی پەروەردگاریان ئەکەن، واتە پەنا ببە، چونکە لەپاش ئەو پەنا بردن و پەنادانەت هیچ زۆرو دەسەڵاتێکی نابێت. بێگومان ئەو پەنابردن و داوای پەنا بەگوتنی ڕووت نابێ، بەڵکو پەنا بردن لەیەکەمجارەوە ئەبێ لەبڕواوە هەڵقوڵێ و لەپاشان پشت بەستن و حەواڵەکردنەکەی ئەوێ،

إِنَّمَا سُلْطَـٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً
مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾
قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ
لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ
أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾

**﴿إِنَّمَا سُلْطَـٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ﴾ بەڵکو زۆرو دەسەڵاتی هەر بەسەر ئەوانەدا هەیە کە شەیتان ئەکەن بەکاربەدەست بەسەر خۆیانداو گوێڕایەڵی ئەکەن ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ﴾ ئەوانەی کە بەهۆی شەیتانەوە هاوبەش ڕەوادەرن بۆ خوا، یان بەهۆی گێڕانی شەیتان بەهاوبەشی بۆ خوا ئەبن بە هاوبەش ڕەوادەری خوا. ئینجا بەبۆنەی باسی هاوبەش ڕەوادەرانەوە هێندێ ووتەی دەمبازی ئەوان دەهێنێ کە ئەیکەن سەبارەت بەقورئان، ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ﴾ کاتێك کە ئێمە ئایەتێك لە قورئان ئەهێنینە خوارەوە لە شوێنی ئایەتێکی تردا، بەم ڕەنگە بەدووەم یەکەم بسڕینەوە ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾ لەکاتێکدا خوا زاناترەو ئەو پەری ڕادە زانایە بەوەی کە ئەهێنێتە خوارەوە، کاتێك کەئەوە ئەکەین بەپێی کاردروستیو لێزانی خۆمان، بەپێی داخوازیو بەرژەوەندی یەك کە ئێمە ئەیزانین، کاتێ ئەوە ئەکەین ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ﴾ئەو بێبڕوایانە ئەڵێن بەتۆ ئەی پێغەمبەر: تۆ هەر درۆ هەڵبەستی بەدەم خواوە، بەم جۆرە شتێ ئەڵێیتو فەرمان ئەدەیت بەکاریو لەپاشان پەشیمان ئەبیتەوە لێیو پێچەوانەی ئەوەت بۆ دەرئەکەوێ. ئینجا بەدرۆیان ئەخاتەوەو دەمکوتیان ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿بَلْ﴾ نەخێر تۆ بەدرۆ قسەناکەیتو دەست هەڵبەست ناکەیت، بەڵکو ﴿أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانە هەموو یان زۆربەیان هیچ نازانن و زانانین بەهۆی ئەوەوە ئەو ووتە بەدە ئەڵێن. یان نازانن لەو گۆڕینو سڕینەوەدا بەرژەوەندیو کاردروستی گەورەی تێدایە. بەڵێ ئەو نەفامانە نەیان ئەزانی کاروپیشەی ئەم قورئانە چییەو بۆچی هاتووە؟ نەیان ئەزانی ئەم قورئانە هاتووە بۆ پێکهێنانی گەلو کۆمەڵێکی**

گشتی و جیهانی و هەتاهەتایی، پێکهێنانی گەل و ئوممەتێك کەببن بەپێشەوا و کاربەدەست بۆ ئەو گەلە جیهانی و هەتاهەتاییە، ئەیان ئەزانی ئەم قورئانە دواترین پەیامەو ئیتر لەئاسمانەوە پەیامێکی تر نایەتە خوارەوە، ئەو خوایە کەئەم ئادەمییەی دروستکردووە خۆی ئەزانێ بەرژەوەندی و کاردروستی لەچی دایە، کام بەرنامەو بیروباوەڕو یاسا شیاوو شایستەیە بۆیان، کەواتە هەرکاتێ ئایەتێکی گۆڕی ئەبێ ماوەکەی دوایی هاتبێ و مەبەست و ئامانجەکانی بەدی هاتبێ و نۆبەی ئایەتێکی تر هاتبێ کەشیاوو شایستەتربێت بۆ ژیانێکی تازە کە ئوممەت بەرەوڕووی ئەڕوات. بەڵێ نەفامەکان ئەوەیان نەئەزانی بەهۆی ئەوەوە ئەم دەم بازیان ئەکرد دەربارەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە(ﷺ) کە هەرگیز درۆو ناپاکی لێ نەبینرابوو. خوای میهرەبان ئەوانەی بە درۆ خستەوەو ئینجا بەرپەرچی دانەوە بەوەی فەرمووی بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)، ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ﴾ بڵێ پێیان ئەو قورئانەی هێناوەتە خوارەوە جوبرەئیل لەلایەن پەروەردگارتەوە بە هەقیانەت و بەڕاستی و بەلێزانی و کاردروستی ئیتر ئەوەی سڕراوەتەوەو ئەوەی کە هاتووەتە شوێنی، جوبرەئیل ناوبراوە بە(روح القدس) واتە ڕۆح و حەقیقەتی پاکی، چونکە لەلایەن خواوە شتێ ئەهێنێ کە ئەوپەڕی ڕادە پاك و خاوێنەو دڵ و دەروون پاك ئەکاتەوە لەهەر چڵك و چەپەڵیەك، ئەو شتەش بریتیە لە قورئان و حیکمەت و فەڕو بەرەکەتی خوایی. یان ناونراوە بەوە چونکە پاك و خاوێنە لەهەموو چڵك و چەپەڵی یەکی ئادەمی. جوبرەئیل ئەو قورئانەی هێناوەتە خوارەوە ﴿لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ بۆئەوەی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە جێگیرو دامەزراویان بکات لەسەر بڕواو بیرو باوەڕەکەیان بەهۆی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕوون و ئاشکرایانەی کە قورئان ئەیانخاتە بەرچاو، یان بەهۆی ئەو بەرژەوەندی و کاردروستی یەی کە بۆیان دەرئەکەوێ دڵ و دەروونیان دامەزراو ئەبێ لەسەر باوەڕ بەوەی فەرموودەی خوایەو لەلایەن خواوە هاتووە ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ هێناویەتە خوارەوە لەبەر ڕێنموونی و موژدە دان بۆ موسڵمانەکان، واتە باوەڕدارەکان و بەمەش ناوی بردن لەبەر وەسف دانیان بەم دوو وتە پیرۆزە. ئینجا باسی درۆو دەست هەڵبەستێکی تریان ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ﴾ سوێند بەخوا ئێمە ئەزانین ئەو بێبڕواو نەفامانە

ئەڵێن: هەر ئادەمی ئەو قورئانەی فێری محمد کردووە، چەند ڕیوایەتێك هاتووە دەربارەی ئەو ئادەمییەو ناوەکەی، لەسەر هەر بار ئەو ئادەمییە پیاوێکی عەرەب نەبووەو عەرەبی زان نەبووە، کەواتە شتێکی ئاشکرایەو هەموو چیرێك ئەزانێ کە ووتەکەیان دەلەسەیەکی ڕووتە، چونکە چۆن عەرەبی نەزان ئەتوانێ ئەم قورئانەی فێربکات کە هەموو عەرەب و غەیری عەرەب داماو و دەستەپاچەن لەئاستی ناتوانن وێنەی ئەندازەی کەمترین سوورەتیشی بڵێن، لەبەرئەوە بەسووك و ئاسان بە درۆی خستنەوەو دەمکوتی کرن و فەرمووی: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ قسەو زمانی ئەو کەسەی ئەو نەفامانە بەناهەقی و ناڕاستی دەست نیشانی بۆ ئەکەن غەیرە عەرەبییەو ئەم قورئانە ووتەو زمانێکی عەرەبی ڕوونە، کەواتە چۆن ئەگونجێ کە غەیرە عەرەبێك ئەم قورئانەی فێربکات؟ بە ڕاستی وا دەرئەکەوێ مەبەستیان لەو ووتە ناڕاستەدا هەر پیلان و پڕوپاگەندە بووبێ و نەك بەڕاستی ئەوەیان گووتبێ، ئەگینا چۆن ئەوە ئەڵێن لەکاتێکدا خۆیان ئەیان زانی نرخی ئەم قورئانەو هەموو دەستەپاچەبوون لەئاستی؟! ئەمڕۆ لەپاش ئەو پێشکەوتنە گرنگەی کە پەیدابوو لەبارەی زانینی دانانی ئەو هەموو گۆڤارو نامەو کتێبە گرنگانەی کەلەبەردەستدان، لەپاش ئەو هەموو یاساو بەرنامەی کە کەوتوونەتە جیهان، هەر خاوەن فام و تێگەیشتوو بێت بۆی دەرکەوتووە ئەم قورئانە دەستکردی هیچ کەس نییە بێجگە لەخوای گەورە. تەنانەت مادیییە بێبڕواکان لەڕووسیادا لەکۆنگرەی ساڵی ١٩٥٤دا کاتێ ویستیان تانەوتەشەر بدەن لە ئیسلام بڕیارياندا کەبەهیچ جۆر ناگونجێ ئەم قورئانە دانراوی تەنها کەسێك بێت، بەڵکو بەچەند کەسێك زۆر دانراوە، وە ناگونجێ لەنیوە دوورگەی عەرەبدا نوسرابێت، بەڵکو ئەبێ چەند بەشێکی لەدەرەوەی نیوە دوورگەدا نوسرابێت!!! ئەوانە ماددی بوون و بڕوایان نەبوو بەخواو قورئانەکەش ئەوەندە گەورەو گرنگەو بەرزترە لەدەسەڵات و توانای کەسێك یان تەنها گەل و ئوممەتێك لەبەرئەوە ئەو بڕیارەیان یدا، ئەوەی کە ژێری بڕوای پێی هەبوو ئەیان گووت کەئەمە دانراوی پەروەردگاری جیهانە، چونکە باوەڕیان بەوە نەبوو! کەواتە چۆن ئەو نەفامانە ئەو ووتە ناڕاستەیان ئەگووت کە پیاوێکی عەرەبی نەزان ئەم قورئانەی فێرکردبێ؟!

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾

**ئینجا قورئان ئاماژە ئەكات بۆ هۆی ئەو قسەو بڕیارە ناڕاستەی ئەوان، فەرمووی:**

**﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ بەڕاستی ئەوانەی كە باوەڕیان بە ئایەتەكانی خوا نییە، خوا ڕێنموونیان ناكات بۆ ئەوانە هەیە سزایەكی ئێش و ئازاردەر. واتە ئەوانە ماتوڵ بیرناكەنەوە لەهۆی باوەڕهێنان و خۆیان فێرئەكەن لەبەڵگەو نیشانە ئاشكراكانی باوەڕو باوەڕ ناهێنن، خواش ڕێنموونی ئەوانە ناكات بۆئەوەی ڕاست و بەجێیە لەبارەی قورئانەوە، بەڵكو ڕێنموونیان ناكات بۆ هیچ شتێكی ڕاست و ڕەوا، بە چەند جۆرێكی تریش ئەم ئایەتە تەفسیركراوەتەوە. لەپاش ئەوە دەمكوتی كردن و قسەو ووتەكەی پوچەڵكردن و پاكی پێغەمبەری دەرخست(ﷺ) لەتەشەری دەست هەڵبەست كردن، ئینجا دەست نیشان ئەكات بۆئەوەی ئەو نەفامانە درۆو دەلەسەكەن و ووتە بەدەكەیان وەرئەگێڕێتەوە بۆسەر خۆیان و ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ هەر ئەوانەی كەبڕوایان نییە بەئایەتەكانی خواو بڕوا ناهێنن درۆ دەست هەڵبەست ئەكەن بەدەم خواوە، واتە نەك تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) كەئەو نەفامانە پێت ئەڵێن: تۆ درۆ دەست هەڵبەستكەری بەدەم خواوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾ هەر ئەوانە درۆ ئەكەن و درۆزنن، واتە درۆكردن هەر شیاوی كەسانێكە كە باوەڕیان نییە، چونكە مەترسی ناكەن لەتۆڵەو سزای خوا، قورەیشیش هەر بەوجۆرە، كەواتە هەر ئەوان درۆزنی ڕاستەقینەن. بەجۆرێكی تریش ئەم ئایەتە تەفسیركراوەتەوەو بەو جۆرەیش هەر چاكە، وەك لە كتێبی تەفسیردا هاتووە.**

مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ
بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ
ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾

---

**ئینجا ئەو باسە بەجێ ئەهێڵێ و ئەگوێزێتەوە بۆ باسی حوكمی ئەوانەی كەلەپاش باوەڕهێنان بێباوەڕی دەرئەبڕن، ئەفەرموێ: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ﴾ واتە ئەو كەسەی كەوتە بێباوەڕی بەخواو بێباوەڕی دەربڕی لەپاش بڕواهێنانو دەربڕینی ووتەی باوەڕ، ئەو كەسە خەشمی بەتین و گەورەی خوای لەسەرە وەك لەمەو پاش دێت. ﴿إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ مەگەر كەسێك كە زۆری پێهێنرابێ و دڵی بەئارامو دامەزراوبێت بەباوەڕ، ئەو كەسەزۆرپێهێنراوەو لێبوراوەو هیچی لەسەر نییە ﴿وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا﴾ بەڵام كەسێك دڵی خۆشنودو شادمان بێت بەبێباوەڕی ﴿فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ئەو كەسە خەشمو قینی بەتین لەلایەن خواوە دامەزراوە لەسەری ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ بۆئەوانە هەیە سزایەكی زۆر گەورە، خوا پەنامان بدات لە خەشمو سزای خۆی. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەو هەڕشە سەختو سامناكە بەهۆی ئەوەیە ئەوانە باوی ژیانی دونیایان داوە بەسەر ژیانی ڕۆژی دواییداو ئەمیان بەخۆشی و پێخۆشبوونەوە هەڵبژاردووە، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە كە خوا ڕێنموونی كەسانێك ناكات كە بێباوەڕن و ماتوڵ خۆیان بێباوەڕی هەڵئەبژێرن بەئارەزوی خۆیان ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ﴾ ئەوانە كەسانێكن كە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێچكەو چاوەكانیاندا ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾ هەر ئەوانە بێئاگای ڕاستەقینەو تێرو تەواون، بێئاگان لەو سزایەی كەبۆیان ئامادەكراوە لە ڕۆژی دواییدا،**

﴿لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ بەڕاستی هەر ئەوانە زیانبارن لە ڕۆژی دواییدا، چونکە ئەوانە دەستمایەکەی خۆیان کە بڕواکەیانە زایەیان کردووە. بێگومان موسڵمانانی یەکەم جێن لەمەککەدا دووچاری سزاو ئەشکەنجە بوون لەلایەن بێباوەڕەکانی قوڕەیشەوە بەجۆرێك کەس خۆی پێنەئەگیرا، مەگەر ئەوانەی کەبەتەواوی لێبڕابن بۆ خواو ژیانی ڕۆژی دواییان بۆ خۆیان هەڵبژاردبێ و ڕازی بووبێ بەهەرجۆرە سزایەکی ئەم دنیایە لەپێناوی ئایینەکەیاندا. دەقی ئایەتەکە گوناهو تاوانی پاشگەزبوونەوەکەی زۆر بەگەورە نیشانداو ئەو توندو تیژیەی لەسەر کرد، چونکە کابرای سیاچارە باوەڕی ناسیوەو تامەکەی چەشتووەو لەپاشان وازی لێهێناوەو باوی ژیانی دنیای داوە بەسەر ژیانی ڕۆژی دواییدا، لەبەرئەوە خستیە بەر خەشمی خواو سزای گەورەو بێبەشی کرد لە ڕێنموونی، لەکەداری کرد بەبێ ئاگایی و کوێربوونی بینایی دڵو بڕیاری لەسەردا بەزیانباری ڕۆژی دوایی. بەڵێ بەڕاستی عەقیدەو باوەڕ شتێ نییە هیچ شتێکی تر هاوتای بێت و نابێ بگۆڕرێتەوە بەهیچ شتێکی تر، لەناو ئەوانەی کە ووتە بێ باوەڕی بەدەمدا هات، ئەوانەی دەرکرد کە زۆر پێهێنراوبێت و بەدەم ووتەی بێباوەڕیان دەربڕیبێ و بەڵام دڵیان دامەزراوو بەئارام بێت لەسەر باوەڕ. وەك ڕیوایەتکراوە کەئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە دەربارەی عەمماری کوڕی یاسر -خوایان لێ ڕازی بێت-(ئیبن و جەریر) لە(محمدی کوڕی عەممار)ەوە ئەگێڕنەوە کە ئەڵێ بت پەرستەکان عەمماریان گرت و سزایان دا هەتا نزیکیان کەوتەوە لە هێندێ لەوەی نیازیان کرد لێی، ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و دادی کرد لەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: دڵی خۆت چۆن ئەبینی؟ ئەویش گووتی: بەئارامو دامەزراو لەسەر باوەڕ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئەوانە سزایان دووبارە کردوە تۆش ئەوەیان بۆ دووبارە بکەرەوە. کەواتە ئەوە ڕووخسەت و ڕێدانە لەو جۆرە کاتانەدا. هێندێ لە باوەڕداران سەرپێچیان کرد لەوەو مردنیان باودا بەسەر ئەوەدا، سومەییە -خوای لێ ڕازی بێت- ئەوەی هەڵبژارد لەکاتێکدا شمشێریان کرد بەعەیبی دا هەتا لەدنیا دەرچوو، هەروەها یاسریش مردنی هەڵبژارد -خوای لێ ڕازی بێت- و بلال -خوای لێ ڕازی بێت- بەچەند جۆر سزادرا تا ئەو ڕادەیەی بەردی گەورەیان نا بەسەر سنگی دا لەکاتێ گەرمای بەتینی مەککەدا، داوای پاشگەزبوونەوەیان لێکردو، ئەویش سەرپێچی لێکردن و ئەیگووت:(احد، احد) خوا تاك و تەنهایە، ئەیگووت: سوێند بەخوا ئەگەر ووتەیەکی ترم بزانیایە کە ئێوە زیاتر پێتان ناخۆش ترە ئەوەم پێ ئەگوتن. هەروەها(حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاری) -

خوای لیٚ ڕازی بیٚت- کاتێ (موسەیلەمەی کذاب) پێی ئەگوت: ئایا تۆ شایەتی ئەدەیت کە محمد پێغەمبەری خوایە؟ ئەیگوت: بەڵێ. ئینجا پێی ئەگوت: ئایا شایەتی ئەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟ ئەیگوت: نابیستم. ئینجا وازی لێ نەهێنا تا پارەپارەی کردو ئەویش هەر ئەوە قسەی بوو.(ئیبن و عەساکیر) لەبارەی(عەبدوڵای کوڕی حوزەیفە)وە ئەفەرموێ: ڕۆم بە دیل گرتی و لەپاشان بردیان بۆلای پاشاکەیان، ئەویش گوتی پێی ببە بە نەسرانی و منیش ئەتکەم بە هاوبەشی خۆم لە پادشایەتی یەکەمداو کچی خۆمت لێ مارە ئەکەم، ئینجا پێی فەرموو: ئەگەر هەموو موڵکی خۆت و هەموو موڵکی عەرەب بدەی بە من لەسەر ئەوەی بگەڕێمەوە لە ئایینی محمد(ﷺ) بە ئەندازەی چاونوقانێك هەرگیز نایکەم. ئینجا ئەویش گوتی: کەواتە ئەتکوژم، ئەویش فەرمووی: چۆن ئەکەی بیکە. ئینجا ئەویش فەرمانیدا کە هەڵواسرێ، ئینجا فەرمانیدا بە سەربازەکانی تیری تێ تەقێنن لەنزیکی دەستی و قاچی و لەوکاتەدا بانگ بکرێ بۆ نەسرانی و ئەویش سەرپێچی کردو گوێی پێ نەدان، ئینجا فەرمانیدا کە داگیرێ و ئینجا فەرمانیدا کە مەنجەڵێکیان تاودا لەمسی تواوە، دوو دیلی موسڵمانیان هێناو بە بەرچاوی یەوە تێیان خستن و توانەوە تیای داو هەر ئێسکەکەیان مایەوە، ئینجا پێیان گوت کە ببە بە نەسرانی و ئەویش هەر گوێی پێ نەدان. ئینجا ئەویشیان بەرزکردەوە تا بیخەنە ناوی ئەویش لەو کاتەدا گریا، ئینجا ئومێدیان پەیدا کرد کە بەگوێیان بکات و بانگی کرد، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: من هەر لەبەر ئەوە ئەگریم کە تەنها گیانێکم هەیەو ئەمخەنە ناو ئەو مەنجەڵە، من پێم خۆش بوو بە ئەندازەی هەموو مووی لەشم گیانم ببوایەو لەڕێی خوادا بەو جۆرە سزا بدرامایە. لەڕیوایەتێکی تردا ئەڵێ: ئینجا بەند کراو چەند ڕۆژێك بەرگری ئاو و خۆراکی لێکراو لە پاشان ئارەق و گۆشتی بەرازیان بۆ ناردو ئەویش نزیکیان نەکەوتەوە، گوتی ئێستا ئەوە حەڵاڵە بۆمن بەڵام هەر نایانخۆم تا دڵی تۆ خۆش نەکەم و شاوەکامیم پێ نەبەی، ئینجا پادشاکە پێی گوت: سەرم ماچ کە بەرەڵات ئەکەم، ئەمیش فەرمووی: هەموو دیلەکانی تریش لەگەڵم بەرەڵا ئەکەیت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ. ئەویش سەری ماچ کردو ئەویش هەمووی بەرەڵاکردن. ئینجا کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە حەزرەتی عومەر -خوای لێ ڕازی بێت- فەرمووی: هەقە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە سەری عەبدوڵا ماچ بکات، من یەکەم کەسم ماچی ئەکەم و ماچی کرد -خوا لێیان ڕازی بێت-،(ئیبن و کەسیر) لە تەفسیرەکەی دا ئەمەی هێناوە. عەقیدەو باوەڕ ئەبێ بەو جۆرە ڕاگیر بکرێ و بەهیچ جۆر وازی لێ نەهێنرێ لای ئەو کەسانەی کە خوا پێداون!

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ ۞ يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١١١﴾

---

﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ﴾ ئەم ئايەتە بە دوو جۆر تەفسیر کراوەتەوەو مەبەست بەوانە کێن و دەربارەی کێ هاتووەتە خوارەوە:

١- هاتووەتە خوارەوە دەربارەی ئەو موسڵمانانەی کە سزا دراون و زۆریان پێهێنرا تا ناچار بوون ووتەی بەدیان بەدەمدا هات وەك لە ئایەتی پێشوودا ئاماژەی بۆ کردن و بەری ئەو سزاو هەڕەشە سامناکانەی نەخستن، جا لێرەدا بە وتەی(ثم) دەست نیشان ئەکات بۆ پلەو پایەی بەرزتر کە پێیان ئەبەخشێ بەمەرجی تێکۆشان و ئارامی و خۆگری یان و کۆچکردنیان بۆ وڵاتی ئیسلام، ئەمە لە دڵدا بەهێزە.

٢- هاتووەتە خوارەوە دەربارەی ئەوانەی کە پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام بەهۆی لادان و زەلەیی کردنی شەیتان و شوێن کەوتنیان بۆ شەیتان، واتە مەبەست بە(فُتِنوا) ئەوانەیە، واتە لەلایەن شەیتانەوە لادران و خەڵەتێنران. ئینجا بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە:

أ- رستەی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ رستەیەکی تەواوە، واتە بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەوانەیەو خاوەن و کاربەدەست و یارمەتی دەریانە، دژیان نیە وەك ڕووکەش و دیمەنی کردەوەکەیان داخوازە بۆ ئەوە.

ب- ئەو ووتەیە بەتەنها تەواو نیە، بەڵکو تەواوکەرەکەی ئەمەیە کە خوا لێبوردەی میهرەبانە بۆ ئەوانە، ئیتر ئەم ووتە تەواوکەرە نەگوتراوەو بڕیار ئەدرێ بە نیشانەی ئەوەی لە پاشان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ یان هەر ئەوە کە گوتراوە تەواوکەرەکەیەتی.

لەسەر هەر بار: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ﴾ واتە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر لێبوردەی میهرەبانە ﴿لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ﴾ بۆ ئەوانەی کۆچیان کردووە بۆ وڵاتی ئیسلام لە پاش ئەوەی سزادران ﴿ثُمَّ جَٰهَدُواْ﴾ئینجا لەپاش ئەوە تێکۆشانیان کرد

لەڕێی خوادا ﴿وَصَبَرُوٓاْ﴾ خۆیان گرت لەسەر ئەرك و ناڕەحەتی یەك كە دووچاریان بوو ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت لەپاش ئەوانەی كە باسكرا لێبوردەی میهرەبانە، لێبوردەیە لەوەی كە لەوەوبەر كردوویانە، بەخشندەو میهرەبانە پێیان ﴿يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا﴾ لەڕۆژێكدا كە هەموو كەسێك دێت بەرگری ئەكات لە خۆی و تێكۆشان ئەكات بۆ ڕزگاركردنی خۆی و گوێی لەكەسی تر نییە، واتە ڕۆژەكە ئەوەندە سەخت و سامناكە لەهێندێ كات و هەڵوێست دا كەس بیری كەسی پێوە نییە، ﴿وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ﴾ هەموو نەفسێك پاداشتی هەر كردەوەیەك كە كردبێتی لەدنیادا بەتێرو تەواوی پێی ئەدرێ. ﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ لەكاتێكدا ئەوانەی ستەمیان لێناكرێ بەزیادە سزا یان سزادان بەبێ گوناهو تاوان. هەرچۆنێ كەم و كوڕی ناكرێ لەئەجرو پاداشتیاندا، لەبارەی سەخت و سامناكی ئەو ڕۆژەوە(ئیمامی ئەحمەد)و چەند كەسێك لە كەعبەوە ئەگێڕنەوە كە ئەفەرموێ: لای(ئیمامی عومەر) بووم و پێی فەرمووم: ئەی كەعب بمانترسێنە، ئەویش گووتی: ئەی سەرۆكی موسڵمانان ئایا نامەی خواو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نییە لەناوتاندا؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ هەیە، بەڵام بمانترسێنە. ئەڵێ منیش گوتم: ئەی گەورەی باوەڕداران ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا بە كردەوەی حەفتا پێغەمبەرەوە بچیتە حوزور كردەوەكەت بێنرخە لەبەر چاوت بەهۆی سەختیی ئەو ڕۆژەی كە ئەیبینی، ئینجا فەرمووی: هەمیتر بمانترسێنە. منیش گوتم: ئەی گەورەی باوەڕداران دۆزەخ لەڕۆژی دواییدا یەك ناڵەو نەعرەتە ئەپێكێ هیچ فریشتەیەكی نزیك لەخواو هیچ پێغەمبەرێكی فروستادە نامێنێ مەگەر ئەكەوێ بەسەر ئەژنۆداو خۆی بۆ ناگیرێ. تەنانەت ئیبراهیمی خەلیل ئەكەوێ بەسەر ئەژنۆداو ئەڵێ: ئەی خوایە هەر خۆم ڕزگار بكەو ئیتر هەقم بەسەر كەسەوە نییەو ئەمڕۆ داوای هیچ كەست لێناكەم. ئینجا ئیمامی عومەر سەردائەخات و بێدەنگ بە ماتەمینی یەوە، ئینجا منیش گوتم: ئایا لە قورئان ئەمەت دەست ناكەوێ؟ فەرمووی: چۆن؟ منیش گوتم: ئەوە نییە خوا ئەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا﴾ پەنا ئەگرین بەخواو داواكارین كە بەمیهرەبانی خۆی فریامان كەوێ.

وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ
فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾
وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾

**لەمەوپێش لەم سورەتەدا خوا دوو چیرۆکی هێنایەوە بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەك لە مەسەلەکانی عەقیدە، لێرەدا چیرۆکێك ئەهێنێ بۆ نەخشەکێشانی حاڵی مەککەو دانیشتوانی کە چاکەو ڕێنموونی خوایان گۆڕی یەوە بەکوفرو سپڵەیی و بێباوەڕی، تا بیر بکەنەوەو تەمێ‌خوار ببن‌و بترسن لە دواڕۆژو چارەنووسی خۆیان، ئەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً﴾ خوا شارێکی بێباکی ئاسوودەی دڵنیای گێڕاوە بەوێنەو چیرۆك کە ﴿يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ﴾ کە ڕۆزی‌و خۆراکی خۆی بۆ بێت لەهەموو شوێن‌و لایەکەوە ﴿فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ﴾ ئینجا ئەو شارە واتە دانیشتوانی ناسوپاسی‌و سپڵەیی بەکاربێنن بەرامبەر چاکەو بەهرەکانی خوا ﴿فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ﴾ بەهۆی ئەوەوە خوا پۆشاکی برسێتی‌و ترسی کرد بەبەریدا، واتە برسێتی‌و ترسیدا بەسەریدا بەجۆری داگیری کرد بەوێنەی داگیرکردنی پۆشاك، ئەوەش ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ بەهۆی ئەو ناسوپاسی‌و سپڵەییەی کە کردیان‌و بەردەوام بوون لەسەری. بەڵێ بەڕاستی ئەمەی کە ئەم ئایەتە فەرمووی وێنەو شێوەیەکی تێرو تەواوە بۆ مەککە، ئەوەتا خوا ماڵی خۆی لەوێ دانا، گێڕای بەشارێکی بەرێزی بێباك‌و ئەو کەسەی کە نیشتەجێیە تێیدا بە ئارام‌و بێباکە تەنانەت پیاوکوژیش بێت هیچکەس ناتوانێ ئازاری بدات ماتوڵ لەپەنای ئەو ماڵە پیرۆزەدایە، هەروەها ڕۆزی‌و خۆراکیان بەئاسانی‌و فراوانی هەمیشە هەیە، لەگەڵ ئەوەدا لە شێوێکی ووشکی بێ‌ئاوو شینایی‌و کتوکاڵدایە، هەر بەوجۆرە هاتووە لەکاتێکەوە ئیبراهیمی**

خەلیل ئەو نزای بۆ کردووە. ئینجا خوا پێغەمبەرێکی لەخۆیان بۆناردن، کە ئەیناسن بەکەسێکی ڕاستو ڕاستگۆیی پاکو دوور لە هەر لەکەو ڕەخنەیەك، خوا ڕەوانەی کرد بەئایینێکی ڕاستو ڕەوا کە ئایینی ئیبراهیمی دروستکەری خوایە کەلە پەنایدا بەکامەرانی ژیان بەسەر ئەبەن، ئایینەکەی میهرەبانیە بۆ هەموو جیهانیان، کەچی ئەو دانیشتوانە بوون بەدوژمنیو ئەو هەموو ناپیاوییەیان لەگەڵ کردو باوەڕیان پێنەهێنا تا بەهۆی ئەوەوە دووچاری سزابوون وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ﴾ بەڕاستی بۆیان هات فروستادەیەك لە خۆیان: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ کەچی باوەڕیان پێنەهێنا بەهۆی ئەوە سزا گرتنیو داگیری کردن لەکاتێکدا ستەمکاربوون بە باوەڕ نەهێنانو بە سپڵەییو ناسوپاسی. سزای ترس کە برسێتیو قاتو قڕی کە دای بەسەریاندا ماوەی حەوت ساڵو لەپاش ئەوە سزای کوشتنو لەناوچوونی ئەو بێباوەڕانە لەجەنگی بەدرو جەنگەکانی تردا تا بەبێ بڕوایی چوون بەسەر سزای قەبرو ڕۆژی دوایی نەبڕاوەوە. بەڵێ بەڕاستی ئەو چیرۆکە زۆر وێنەیەکی تێرو تەواوبوو بۆ ئەو بێباوەڕانەی مەککە. ئەوەی کە گوترا کە مەبەست بەو شارە مەککەیە لەڕای(ئیبنو عەباس و موجاهیدو قەتادە)و جەماوەردا، هێندێ ئەفەرموون: مەبەست شارێکی ترە بەو نیشانانەی کە باسکرا ئیتر ئەو شارە بووبێ لەگەڵە پێشووەکاندا یان نەبووبێو بەچیرۆك بڕیار ئەدرێ، ئینجا لەم کاتەدا لەچیرۆکەکەدا خۆشیو ڕۆزیو خۆراکی بەلێشاوی خستە بەرچاو، وەك ناخۆشیو بەش بڕاوی خستە بەرچاو، لەم کاتەدا فەرمان ئەدات بەخواردنی ئەو ڕۆزیو خۆراکە پاكو خاوێنانەی کە حەڵاڵی کردووە بۆ بەندەکانی، فەرمان ئەدات بەسوپاسو بەندەیی بۆخوا بەبێ هیچ هاوبەش،

فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾

---

**ئەفەرموێ: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾ بخۆن لەوەی خوا پێی داون و کردوویەتی بە ڕۆزیتان بەحەلاڵی و پاك و خاوێنی ﴿وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ سوپاسی چاکەو نیعمەتی خوا بکەن ئەگەر ئێوە ئەو ئەپەرستن، و وازبێنن لەوەی حەرام و قەدەغەیە لەسەرتان و لەقەدەغەکردنی هەرشتێ لەسەر خۆتان، مافی چاکەو نیعمەتەکانی خوا بناسن و ناسوپاسی نەکەن و سپڵەیی بەکارمەهێنن تا خوا بتان پارێزێ لەوەی دووچاری ئەوانە بوو کەلەم چیرۆکەدا باسکران. واتە ماتوڵ بۆتان دەرکەوت حاڵی ئەوانەی کە باسکران، کەواتە ئێوە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بن و سوپاسگوزار بن بۆ خواو گوێڕایەڵی بن. ئینجا خۆراکە حەرامەکان دیاری ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ خوا ئەوەی کە حەرامی کردبێ لەسەرتان هەر مردارەبووەو خوێنەو –واتە خوێنێ کە ئەڕواو جاری ئەبێ نەك ئەوەی کەوا نەبێ وەك جگەرو سپڵ و شتەکانی تر–، و گۆشتی بەرازو ئەوەی ناوی خوای لێ نەنرابێ و بەناوی غەیری خواوە سەربڕابێ و سەربڕەکەی بەناوێکی ترەوە سەری بڕیبێ وەك بەدرێژی لەشوێنی تردا باسکرا. کورت هەڵهێنانی حەرام لەم چوارەدا یان بەنەزەر ئەو شتانەیە کە نەفامەکان خۆیان حەرامیان ئەکردن لەسەر خۆیان وەك ئەو چوارەی کەلە سورەتی(المائدة)دا باسیکردن. واتە هەر ئەمانە حەرامن نەك ئەوانەی کە ئێوە لەخۆتانەوە حەرامتان کردوون، یان کورت هەڵهێنانەکە بەپێی ئەو کاتەیە کەئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە، نەك لە داهاتوو لەهەموو کاتدا، کەواتە حەرامکردنی گیانلەبەرەکانی تر کەلە پاشان حەرامکران بەحەدیس دژو پێچەوانەی ئەم کورت هەڵهێنانە نین، وەك حەڵاڵ کردنی ئەم چوارەش لەهێندێ کاتدا دژو پێچەوانە نییە کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ﴾ ئینجا هەرکەسێك ناچارکرا بۆ خواردنی ئەو حەرامانە لەکاتێکدا دەست درێژی کەر نەبێ بەسەر ناچارکراوێکی تردا، و زیادەڕەویکەر نەبێ لەئەندازەی پێویست ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە. واتە خوا لێی ناگرێ و تاوانباری ناکات. هەر ئەوەیە سنوری حەرام و حەڵاڵ لەخۆراکدا کە خوا بڕیاری لەسەر داوە، کەواتە نابێ هیچکەس لەخۆیەوە شت حەرام یان حەڵاڵ بکات،**

وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا مَا
قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ
عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾

**وەك ئەفەرموێ:** ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ﴾ **واتە لەخۆتانەوە نەڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە کە ئەوە قسەیەکی درۆیە و بەدەمتاندا دێتو زامنتان ئەیلێت. ئەوە نەڵێن:** ﴿لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ **بۆئەوەی درۆ هەڵبەستن بەدەم خواوە، چونکە حەڵاڵکردنو حەرام کردن هەر بەدەست خوایە. بێجگە لەوەش هێندێ لەو نەفامانە بەدەم خواوە ئەو درۆیان کردو ئەیان گووت:** ﴿وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ **خوا فەرمانی پێداوین بەوە. ئینجا هەڕەشە ئەکات لەوانەو ئەفەرموێ:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾ **بەڕاستی ئەوانەی کە درۆ هەڵبەستن بەدەم خواوەو درۆکەی خۆیان ئەسەپێنن بەسەر خوادا ناگەن بەئامانج** ﴿مَتَٰعٌ قَلِيلٌ﴾ **ئەوەی کە دەستکەوتیان ئەبێ لەو درۆو هەڵبەستنەدا، یان ئەوەی کەلەم دنیادا دەستیان ئەکەوێ، خۆشیو مەبەستێکی کەمە** ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ **بۆیان هەیە سزایەکی سەختی ئێشو ئازاردەر لەپاش ئەم دنیایە. پەنا بەخوا ئەم مەسەلەی یاساو قانونو بەرنامە دانانە تائەو ڕادە گوناهو تاوانێکی گەورەو سامناکە، لەگەڵ ئەوەدا خەڵکی بەبێ بیرکردنەوەو مەترسی ئەو یاساو بەرنامە دائەنێن بەبێ ئەوەی دەقێکی شەریعیان بەدەستەوە بێت یان لەئایینی خوا وەریان گرتبێ، تەنانەت ئەوانەش کە خۆیان بە موسڵمان دائەنێن!! لەپێشەوە فەرمووی: خوا هەر ئەو چوارەی حەرامکردووە، بێگومان هێندێ شتی تریش حەرامکراوە**

لەسەر ئیسرائیلی یەکان، جا لێرەدا ئاماژە ئەکات بۆ ئەوەو دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەوە لە پێشەوە حەڵاڵ بوون‌و پاشان حەرام کراون بەتایبەتی لەسەر ئەوان لەتۆڵەی خراپی خۆیاندا حەرام کراون لەسەریان. ئەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ﴾ هەر لەسەر ئەوانەی کە یەهودی بوون حەراممان کرد ئەوەی کە باسمان کرد بۆت لەپێش هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەدا. یان لەپێش حەرام کردنی ئەوەی کە حەرام کرا لەسەر ئەم ئوممەتە ﴿ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ئێمە ستەممان لێ نەکردن، بەڵکو ئەوان ستەمیان لەخۆیان کرد، بەم جۆرە کردەوەی بەدیان کردو لەتۆڵەی ئەوەدا ئەو شتانە حەرام کران لەسەریان‌و هەر تایبەتی بوو بەوانەوە. ئینجا قاپی تۆبەو گەڕانەوە ئەخاتە سەر پشت بۆ ئەوانەی تاوانبارن‌و ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆلای خواو خۆیان چاك ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ﴾ ئینجا پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کە کردەوەی بەدیانکردووە بەنەفامی ﴿ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓاْ ﴾ئینجا لەپاش ئەوە گەڕاونەتەوەو تۆبەیان کردووە. کردەوەکانی خۆیانیان چاك کردووە ﴿ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت لەپاش ئەو تۆبەو گەڕانەوە لێبوردەی میهرەبانە. ئینجا بەبۆنەی ئەم حەرام کردنە لەسەر یەهودو بەبۆنەی ئەوەی کە قورەیش لافی ئەوەیان لێ ئەدا کە لەسەر میللەت‌و ئایینی ئیبراهیمن‌و بەپێی ئایینی ئیبراهیم ئەو شتانەیان لەسەر خۆیان حەرام کردووە. بەو بۆنەیەوە ئەوا باسی ئیبراهیم ئەکات‌و ئایینەکەی ڕوون ئەکاتەوەو پەیوەندی‌و یەکێتی ئەو دوو ئایینە ڕوون ئەکاتەوە لەگەڵ تایبەتێتی حەرام کردنی ئەو شتانەی کە حەرام کران لەسەر یەهودو لەچەرخی ئیبراهیم دا حەڵاڵ بوون،

إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَٰهُ
وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾
ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ
ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟
فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ﴾ بەڕاستی ئیبراهیم ئوممەتێکی گوێ ڕایەڵ بووە بۆ خوا ﴿حَنِيفًا﴾ لادەر بووە لەهەموو ئایینێکی ناهەق، بۆلای تەنها ئایینی هەق کەئایینی خوایە، بەتاکو تەنها ﴿وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ هەرگیز لە هاوبەش ڕەوا دەران نەبووە بۆ خوا لە هیچ بارو ڕوویەکەوە ﴿ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ﴾ سوپاس گوزار بووە بۆ چاکەو نیعمەتەکانی خوا ﴿ٱجْتَبَٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ خوا هەڵی بژاردو پاکو خاوێنی کردو ڕێنموونی کرد بۆ ڕێی ڕاست کە ئایینی ئیسلامە ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ پێمان بەخشی لەدنیادا سیرەتو ڕەوشتێکی چاکو تا ئەو ڕادەی خۆشەویست بوو لای هەموو ئەهلی ئایینەکانی پاش خۆیو هەموو سوپاسو سەناو سەلامی لێ ئەکەن وەك لە(قەتادە)و چەند کەسێکی ترەوە ئەفەرمون. ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بێگومان لەڕۆژی دواییشدا لەچینی چاکانو پێغەمبەراندایەو لەگەڵ ئەوانە لەڕادەو پلەی پایەکانی بەهەشت دا. ئیبراهیمی ناوبرد بە ئوممەت لەبەرئەوەی خێرو فەڕو بەرەکەتو گوێڕایەڵی تێدا بووە بە ئەندازەی کۆمەڵێکی زۆرو هاوتای کردون لەوەدا وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ -خوای لێ ڕازی بێت- یان لەبەرئەوەی ماوەیەك تەنها کەسێك بووە کە باوەڕدارو خواپەرست بووە لەدنیادا، یان لەبەرئەوەی پێشەوایەك بووە کە پەیڕەوی کراوە لەناو ئوممەتانی پاش خۆیو بەشدارە لەهەموو خێرو ئەجری ئەوانەی کە پەیڕەویان کردووە، خوا بەوجۆرە ئیبراهیمی نیشانداو باسیکرد،ئینجا ئەفەرموێ بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە سروشمانکردە لای تۆ ﴿أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بەمەی پەیڕەوی بکەو

شوێنی ئاینو میللەتی ئیبراهیم بکەوە کە ئایینی خواپەرستی یە بەتەنهاو ئایینی ئیسلامە، لەکاتێکدا کە ئیبراهیم لادەربووە لە هەموو ئایینێك بۆلای ئایینی ئیسلام بەهیچ لە هاوبەش ڕەوادەران نەبووە.(زەمەخشەری) ئەفەرموێ: ووتەی ﴿ثُمَّ﴾ بۆ گەیاندنی ئەوەیە ئەم بەهرەو سیفەتە بەرزە بەهرەیەکە خوا بەخشی بە ئیبراهیم کەلەو ڕادەیەدایە خوا فەرمانیدا پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی ئاینو میللەتی ئیبراهیم بکەوێو پەیڕەوی ئەو بکات، بەڕاستی بۆچوونو فەرموودەکەی بەهێزەو وە لەدڵدا زۆر جێگیرە جولەکە لافیان لێ ئەدا کە لەسەر ئاینو میللەتی ئیبراهیمنو ڕێزگرتنی ڕۆژی شەممە بەشێکە لەو ئایینە، کەواتە لەم ئایینی ئیسلامەشدا ئەبوایە ئەو ڕێزگرتنە هەبوایە چونکە فەرمان دراوە بە پەیڕەوکردنی میللەتی ئیبراهیم. جابۆ نەهێشتنو پووچەڵکردنی ئەو لافو قسەیە، وەڵامی قورئان ئاگادارمان ئەکات بەهۆی ئەو ڕێزگرتنی ڕۆژی شەممە بەشێك نییە لەئایینی ئیبراهیم، بەڵکو ئەو لەپاشان پێویستکرا لەسەر ئیسرائیلەیەکان بەتایبەتی کاتێ لەسەرپێچیو دووبەرەکیان کرد لەکاتی ئەو ڕۆژەدا، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ ڕۆژی شەممە لەسەر ئەوانە بڕیاردا کە دووبەرەکیان کرد تیایدا. واتە ئیسرائیلیەکان کە بەچەند چەرخ لەپاش ئیبراهیم پەیدابوونو هاتنە کایە، کەواتە ئەو مەسەلەیە لە شەریعەتی ئیبراهیم دا نەبووە، بەهۆی ئەوەوە لەم شەریعەتەشدا نییە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان خوا بڕیار ئەداتو حومکڕانی ئەکات لە ڕۆژی دوایدا لەوەی کە ئەوانە دووبەرەکیان کرد تیایدا، بە تۆڵەو سزادانی ئەوانە، یان بڕیار ئەداتو حوکمڕانی ئەکات لەنێوان ئەوانەدا کە ئاژاوەو دووبەرەکیان کرد لەوەدا بەدەرخستنی هەقو ناهەقو پاداشت دانەوەی هەرکام بەپێی ڕاو کردەوەی خۆی.(ئیمامی شافیعی) لەکتێبی(الأم)داو(ئیمامی بوخاریو موسلیم) لەصەحیحەکانیان دا لە(ئەبو هورەیرە)وە حەدیسێك ئەهێنن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێمە ئەوانەین کەلە دوایدا هاتینو لە ڕۆژی دوایشدا پێشکەوتووەکانین، چونکە پێشکەوتووەکانی ئێمە نامەیان پێبەخشرا لەپێش ئێمەدا، ئینجا ئەوان دووبەرەکیان تێدا کرد. و ئێمە لە پاش ئەوان نامەمان پێبەخشرا ئینجا ڕۆژی جومعە ڕۆژی ئەوان بوو سەرپێچیو دووبەرەکیان تیایدا کردو ئێمە خوا ڕێنموونی کردین... هتد. لە(ئیبنو عەباس)یشەوە وێنەی ئەوە هاتووە -خوا لێیان ڕازی بێت-.

لەپاش ئەوەی ئاماژەی کرد بۆ ڕاستو ڕەوایی ئایینی ئیبراهیمو پاكو خاوێنی ئەو ئایینەو تەواوبوونو گەیشتنی بە پایان لەم دواترین پەیامەدا کە حەزرەتی محمد(ﷺ) هێنای، لەپاش ئەوە فەرمان ئەدات کە ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) ڕێگا ڕاستەکەی خۆی بداتە بەرو بانگی خەڵکی بکات بۆ سەر ئەو ڕێگا ڕاستە بە لێزانیو کار دروستیو ئامۆژگاری شیرین، لەگەڵ ئەوانە کە نەفامو بێباوەڕن بەجوانترین شێوە دەمەقاڵێو موجادەلە بکات. ئینجا ئەگەر ئەوانە دەست درێژیان کردە سەر خۆیو موسڵمانان تۆڵەیان لێ بستێنێ بەوێنەو ئەندازەی دەست درێژیەکەی ئەوان، مەگەر خۆی بگرێو لێیان ببورێ، لەکاتێکدا دڵ ئارام بێ بەوەی دوا ڕۆژی سەرکەوتنو بەختەوەری هەر بۆ خوا پارێزو چاکەکە کارانە، با غەمبارو دڵتەنگ نەبێ بە پیلانو کردەوە بەدەکانیان. ئەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ﴾ ئەی پێغەمبەر خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بەلێزانیو کاردوستیو بە پەندو ئامۆژگاری شیرینو بەم ڕەنگە بەووتەو قسەیەکی دڵنیاکەرو بەپێی حاڵو باری خەڵك بێت، و بەجۆرێ بێت کە بزانێ مەبەست ئامۆژگاریە، بە نەرمو نیانی، نەك بەتورەییو گرژیو دڵ شکاندن. ئەم ئایەتە کورتە بەرنامەیەکی تێرو تەواو نیشان ئەدات بۆ بانگکردن بۆلای خوا:

١- بانگکردنەکە بۆ ڕێگەی خواو بۆلای خوا بێت، نەك بۆلای ئەو کەسەی کە بانگەکە ئەکات، یان بۆ هەر مەبەستێکی تر بێجگە لەنیازی خوا. کەواتە ئەو کەسەی کە بانگەکە ئەکات ئەبێ مەبەستی هەر بەجێهێنانی فەرمانەکەی خوابێتو هیچ منەتێکی نییە بەسەر هیچ کەسێکەوە، بەڵکو واجبی سەرشانی خۆی بەجێئەهێنێ. لەپاش ئەوە ئەجرو پاداشتی هەر بۆلای خوایە.

٢- بانگکردنەکەی بەو لێزانینو کار دروستیەبێت کە خەڵکی ڕاکێشی بۆلای خوا نەك بیتارێنێ یان یاخی بکات، بەجۆرێ بێ کە دڵخۆشودڵئارامی بکات نەك بە تێخوڕینو تانەو تەشەر لێدانو تەریق کردنەوە، مەگەر لە هێندێ کاتدا کە ئەو شێوەیە بەکارتر بێت، بەکورتی ئەبێت تەماشای حاڵو باری بانگکراوەکە بکرێت، چونکە هەر کەسێك سروشتو بۆچوونو تێگەیشتنی تایبەتی خۆی هەیەو بۆ جۆرو ووتەو قسەیەك دەست ئەداتو پێویستە حاڵو باری ڕەچاوبکرێ.

وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾

وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ

---

﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ لێکۆڵینەوەو دەمەقاڵێ بکە لەگەڵیان بەجۆرو شێوەیەك کە جوانترو شیرین تر بێت بەم ڕەنگە ڕەوشتێك بەکاربهێنرێ کە تێبگات مەبەست شکاندن‌و بێ‌نرخ کردنی نییە، بەڵکو مەبەست دەرکەوتن‌و ڕوونکردنەوەی حەقیقەت‌و ڕاستی یە ڕێنمـوونی کردنـه بـۆی تـەنها لـەڕێی خـواو لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوا ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت هەر ئەو زاناترەو ئەوپەڕی زانینی هەیە بەهەر کەسێك کەون‌و گومڕایەو لایداوە لە ڕێگاکەی، ئەو زاناترە بەو کەسانەی کە ڕێنموونی وەرئەگرن‌و ڕێی خوایان داوەتە بەرو ئەیدەنە بەر، واتە بەو جۆرو شێوەیە کەباسکرا بانگ بکە بۆ ڕێگای خوا، چونکە تۆ هەر ئەوەت لەسەرە، ئیتر گومڕابوون‌و ڕێنموونی وەرگرتن بەدەست تۆ نییەو تۆ لێپرسراو نیت لەوەو ئەوە هەر بەدەست خوایەو هەرکەس شیاو وشایستەی هەرکام لەو دوو بارە بێت خوا ئەوەی بۆ ئەکات بەو پێیە پاداشت‌و تۆڵەی خۆی دەستکەوت ئەبێ. بێگومان بەم فەرموودەیە ئەبێ حەماسەت‌و ڕاپەڕینی بانگکارانی ڕێگەی خوا کەم ببێتەوە یان هەر نەمێنێ، چونکە ماتوڵ ئەمان هەر ئەوەیان لەسەرەو پرسیاریان لێناکرێ لەهیچی تر، ئیتر چ پێویست هەیە بە تێپەڕکردن لەسنوری کارو پیشەی خۆیان خۆنەگرتن‌و بێ‌ئارامی‌و داخ‌و مەراق خواردن؟ ئەوە کەباسکرا بەرنامەو دەستوری بانگکردنە لەسنوری زمان‌و قسەو لێکۆڵینەوەدا، ئینجا کاتێ لەوە تێپەڕی کردو کار گەیشتە دەست درێژی دەربارەی بانگکەران، ئەو کاتە بەپێی دەسەڵات‌و توانێ بەرنامە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾ واتە ئەگەر ویستان تۆڵە بسێنن لە دەست درێژی کەر ئەوا بەوێنەی ئەو کردەوە بەدەی کە پێتان کراوە تۆڵە بسێنن، بێ‌گومان بەرگری کردن لەبانگەوازەکە لەسنوری دادو هەقیانەتدا شتێکی ڕاستەو پارێزگاری ڕێزو بەرزی ئەو بانگ‌و بانگەوازە ئەکات، کەواتە بێ‌نرخ نابێ لەدەروونی خەڵکیدا، بێگومان شتی بێ‌نرخ‌و ڕێز خەڵکی دوای ناکەوێ. ئینجا ئاشکرایشە ئەگەر بەرگری نەکرێ بەدان‌و دەست درێژی کەران هەرگیز ماوەی بانگکەران نادەن، کەواتە زۆر ڕاست‌و بەجێیە ئەو بەرگریکردن‌و تۆڵەسەندنە یاسایەکی ڕاست‌و ڕەوایە،

﴿وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ١٢٧﴾

﴿وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ خۆ ئەگەر ئارام بگرن، ئەوە باشترە بۆ ئارامگران. لەگەڵ ئەوەدا قورئان خۆگرتن‌و لێبوردنی بەلاوە چاکترە بۆ خۆگران، واتە بۆ ئێوە بەڵام بەو جۆرەی فەرموو لەبەر وەصف‌و سەناکردنیان بەو سیفەتە شیرینە: ﴿الصابرين﴾ هەروەها بەو شێوەی کە قورئان فەرمووی دەست نیشانە بۆئەوەی کە خۆگری -کە سیفەتێکی بەرزە-باوو دابی ئەوانە. بەڵێ خۆگری چاکترە، چونکە هۆی زاڵبوونە بەسەر نەفسداو جڵەوگرتنەوەیە لەدەست درێژی‌و کاری ناڕەوا، بێجگە لەوەش ئەو خۆگریە تەمێ دادان‌و پەندو ئامۆژگاریە بۆ ئەو دەست درێژیی کەرەو کەسانی تریش، بەڵێ ئەو خۆڕاگرییە چاکترە بەمەرجێ نەبێ بەهۆی سووك کردن وبێ نرخی بانگ و بانگەوازەکە، دیارە لەو کاتەدا لێبوردن و خۆڕاگرییەکە بەرژەوەندی بانگ‌و بانگەوازەکەی تێدا نییە هەرچەندە چاك بێت‌و بەرژەوەندی بێت بۆ بانگ کەران. تەعبیرو دەستەواژەکەش وا نیشان ئەدات کە ئەفەرموێ: چاکترە بۆ خۆڕاگران‌و بە ڕواڵەت تایبەتی ئەکات بەوانەوە، نەیفەرمو: ئەوە چاکە کە ئەوانیش‌و بانگەوازەکەش بگرێتەوە، بەهەر حاڵ خۆگری‌و جڵەوگرتنەوە نەفس زۆر سەخت‌و گرانە لەبەرئەوە هەرچۆنێ دواڕۆژو سەرەنجامەکەی جوان‌و شیرین کرد هەروەها ئاماژەی کرد بۆ ئەو سەختی‌و قورسیەش کە ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ﴾ خۆت بگرەو خۆگربە لەسەر ئەوشتانەی کە دووچارت ئەبن ﴿وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ﴾ خۆگرتن هەر بە خوایەو بەکۆمەکی‌و یارمەتی‌و تەوفیقی خوایەو هیچ هۆیەکی تری نییە. ئینجا وەسیەت ئەکات بۆ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەوەی غەمبارو دڵتەنگ نەبێت لەسەر بڕوا نەهێنانی بێباوەڕان‌و پیلانیان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ غەمبار مەبە لەسەر ئەوانەو بڕوانەهێنان‌و سەرکێشی‌و نالەبارییان ﴿وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ﴾ مەکەوە، تەنگی‌و دڵتەنگ مەبە لە پیلان‌و کردەوە بەدەکانیان‌و باکت نەبێ لێیان، ئەم وەسیەتە بۆ هەموو بانگ کەرانی ڕێگەی خوایە لە پاش پێغەمبەرو پێشەوای جیهانیان. بەڵێ سزاو ئەشکەنجەو ئازار ئەبێ لەبەر تاقیکردنەوەی خۆگری بێت، سەرکەوتن‌و زاڵبوون دوائەکەوێ‌و لەسەرخۆو بەسستی دێت بۆ دەرکەوتنی بڕوا بەخوا، بەڵام پاشەڕۆژی بەختەوەری‌و سەرکەوتن مسۆگەرە،

چونکه بانگکەرانی ڕێگەی خوا خۆپارێزو چاکەکاران کە پێشەوای هەمووان پێغەمبەری ئازیزە(ﷺ) خواش لەگەڵ ئەوانەیە وەك بەتوندی ئەو بەڵێنە ئەدات و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە لەهۆی خەشم و ناڕەزایی خوا، لەگەڵ ئەوانەیە کە چاکەکارن و بەردەوامن لەسەر ئەوە، خوا لەگەڵ ئەوانەیە بەکۆمەك و یارمەتیدان، خوا دۆستیانە و هەرکەسیش بەوجۆرە خوای لەگەڵ بێت ئەبێ دڵشادو شادمان بێت، ئەبێ دڵ فراوان و بێ باك بێت لەهەرشتێك. داواکارین خوا بەمیهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو فەیزو فەڕەداو لەڕیزی ئەوانەدا وەرمان بگرێ ئامین هەزارجار ئەڵێین:

سوپاس بۆ خوا لەتەفسیری سورەتی(النحل) بوومەوە کە تەواوکەری جزمی چواردەهەمی قورئانە لە ڕۆژی شەممە ١٤١٢/١٢/٦ کۆچی بەرامبەر ١٩٩٢/٦/٧ زاینی لە بارەگای سەرکردایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، لەدێی بێتواتە، خوا فەڕو پیتی قورئانەکەی بڕژێ بەسەر خۆمان و بزوتنەوەکەمان و وڵاتەکەمان و بەتایبەتیش دێی بێتواتەو دانیشتوانی. آمین

آمين والحمد لله أولاً وآخيراً و صلى الله وسلم على سيدنا و مولانا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

# سورەتی(الإسراء)
# مەککەیی یە و(١١٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە مەککەیی یە بەلای زۆر کەسەوە، هێندێ ئەفەرمون بێجگە لە چەند ئایەتێکی، ئایەتەکانی(١١٠) ئایەتن بەلای بەسری یەکانەوە و(١١١) ئایەتە بەلای کوفی یەکانەوە. ئەم سورەتە دەست پێ ئەکات بە تەسبیحی خوا و کۆتایی ئەهێنێ بە حەمدی خواو ئەدوێ لەچەند مەبەستێکی جیاواز و زۆربەی لەبارەی عەقیدەوەیە، هێندێ لە مەبەستەکانی تری چەند ئاداب و رەوشتی فەردی و کۆمەلآیەتی یە کە بنەڕەت و بناغەکەی عەقیدەیە، بێجگە لەوانەش لەسەرەتاوە بەشێك لە داستانی ئیسرائیلی یەکان ئەهێنێ کە پەیوەندی هەیە بە مزگەوتی ئەقساوە کە شەو رەوی یەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوێ بوو، ئەدوێ لە هێندێ لە داستانی ئادەم و شەیتان و رێز گرتن و رێزدان بە ئادەمی. لەناو ئەو هەموو مەبەستانەدا مەبەستێك کە هەموو مەبەستەکانی تر ئەخولێتەوە بە دەوری دا شەخسی پێغەمبەری ئازیزە(ﷺ) و هەڵوێستی ئەو گەلە لە گەڵی لە مەککەدا وەك بۆمان روون ئەبێتەوە لە ئایەتەکانی سورەتەکەدا.

چەند ریوایەتێك هاتووە لەبارەی داستان و رووداوی ئەم شەو رەوی پێغەمبەرە(ﷺ) بۆ مزگەوتی ئەقسا و ئینجا بەرز بوونەوەی لەوێوە بۆ ئاسمانەکان و(سدرة المنتهی)، دووبەرەکی هەیە لەبارەی ئەو شوێنەی کە ئەو رووداوە دەستی پێ کرا کە ئایا مزگەوتی پیرۆزی مەککە بووە وەك رواڵەتی ئایەتەکە ئەیگەیەنێ یان ماڵی(أم هانیء) بووە وەك لە ریوایەتێك دا هاتووە، هەروەها دووبەرەکی هەیە کە ئایا ئەو رووداوە لەکاتی بێداری دا بووە و بە لەش و بە گیان بووە یان لە خەودا بووە و هەر بە رۆحیش بووە ئەوەش بە پێی چەند ریوایەتێك کە هاتون لەبارەی ئەو رووداوەوە؟ بەهێزترین راو ریوایەت ئەمەیە کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەماڵی(أم هانیء) ی ئامۆزای هەڵسا و جێ و بانەکەی بەجێ هێشت و بەرەو مزگەوتی پیرۆز رۆیشت ئینجا کە گەیشتە حیجر لەوێدا ئەو شەو رەوی یەی پێ کرا لە کاتێك دا لە بەینی خەو و بێداری دا بوو. ئینجا گەڕایەوە بۆ جێگا و بانەکەی پێش ئەوەی سارد بووبێتەوە. بەڕاستی هەرکەسێك ئەندازەیە بیر بکاتەوە لەم بوونەوەرە گرنگە و لەو هەموو ئەستێرە و مانگ و خۆر و زەوی و گەردش و خولانەوەیان بەو قەبارە گەورە و بەو

چەسپانی یە. هەرکەسێك بیرێك بکاتەوە لەوانە شایستە نی یە بۆی سەری سوڕ بمێنێ و سەربکاتەوە لەوەی دەستی قودرەتی بێ سنووری خوا بێتە کایەوە و ئەو رووداو و شەو رەوی یە بەدی بێنێ و ئەو گەردش و چوون و هاتنەوە پێك بێنێ بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بە گیان و بە لەشە پیرۆزەکەی، ئەو کەسەی کە بیر بکاتەوە لە گەیشتنی دەنگ و هەناسە بۆ ئەم پەڕو ئەو پەڕی دنیا بەهۆی تەلەفۆن و لاسلکی یەوە، یەك سەر و سەربەخۆ و بەبێ جیاوازی دووری و نزیکی، هەرکەسێك بیر بکاتەوە لە پەیوەندی و قسە کردن لە زەوی یەوە، لەگەڵ ئەوانەی چوونە سەر مانگ، پەیوەندی لەگەڵیان لە رێوە یەکسەر بە وێنەی کەسێك لە پاڵ و تەنیشت دا بێت، هەرکەسێك ئاوڕێك بداتەوە بۆلای ئەو جۆرە شتانە کە بەشێکن لە بەرهەمی دەسەڵات و هێزی بێ سنوری خوا، هەرگیز نابێ سەری سوڕ بمێنێ لە گەشت و چوون و هاتنەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو کەسێك بڕوای هەبێ بە پێغەمبەرێتی یەکەی و پەیوەندی یەکەی بە کۆمەڵی هەرە بەرزەوە و گەیشتنی هەواڵ و فەرمان پێ ی لە سەرووی هەموو ئاسمانەوە، هەرکەسێك ئەو باوەڕەی هەبێ هەرگیز سەری سوڕ نامێنێ لەو رووداوە، یاری غار – خوا لێ ی رازی بێت – کە ئەو باوەڕەی هەبوو کاتێ بێ باوەڕەکان هاتن و بە سەر سوڕمانەوە هەواڵی ئەو شەو رەوی یەیان پێدا و ئەیان ویست بەوە باوەڕەکەی لەق و لاواز بکەن، کاتێ ئەو هەواڵەیان پێدا و بە شتێکی نەگونجاویان دائەنا، یاری غار بە هەموو ئارامی و دڵنیایی یەکەوە بەرپەرچی دانەوە و فەرموی: من باوەڕم پێ ی هەیە و بە زیاتر و دوور تر لەوە، باوەڕم پێ ی هەیە بە هەواڵی ئاسمان و کە بۆم ئەهێنی و پێم ئەدات! بەڵێ ئەم راو ریوایەتە بەهێزە بە هەموو باوەڕ و دڵنیایی و ئارامی یەوە وەری ئەگرین، بەڵام بە پێ ی یاسای ئیسلام ئەو هەواڵ و حەدیسانەی کە بە رواڵەت دژی یەکترن تا بگونجێ ئەبێ دەستە مل بکرێن و دژایەتی یەکەیان نەمێلرێ، بە پێ ی ئەو یاسایە چاك وایە ئەو حەدیسانە رێك و دەستە مل بکەین لەگەڵ ئەو حەدیسە سەحیحانە و لەگەڵ رواڵەتی ئایەتەکەدا بەوەی ئەو شەو رەوی یە دووجار بەدی هاتووە: جالای یەکەم: لەخەودا بووە لە پێش پێغەمبەرێتی و شەو رەوی هەر بە رۆحە پیرۆزەکەی بووە لەبەر ئامادە کردنی بۆ جاری دووەم و ئەو یەکەمە ببێ بە سەرەتا. جاری دووەم: لە پاش پێغەمبەرێتی شەو رەویی کرا و بە لەشە پیرۆزەکەشی لەکاتی بێداری دا بە راستی ئەم رایە زۆر بەهێز و دامەزراوە لەدڵ دا، ئەمە رای دەستەیەکە لە پێشەوا و زانایان کە یەکێ لەوانە(قازی ئەبوبەکر) ە و(ئیمامی بەغەوی) و خاوەنی(کشاف) ە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾

---

ئینجا با بینینەژێر سایەی ئایەتەکە، ئەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ * سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ بە پاك و بێگەرد رائەگرین و پاك و بێگەردە لە هەموو لەکە و ناتەواوی کەسێك کە شەو رەوی کرد لە شەوێك دا بە بەندەی خۆی، واتە محمد(ﷺ) لە مزگەوتی بەرێز و پیرۆزەوە بۆ مزگەوتی دوور کە دەورو بەریمان پیرۆز و فەڕ دار کردووە. ئەو شەو رەوی یەمان پێ کرد بۆ ئەوەی هێندێ لە بەڵگە و نیشانە روونەکانی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی ئەو کەسەی ئەو شەو رەوی یەی پێ کرد هەر ئەو بیسەر و بینایە، واتە لەبەر ئەوەی خوا بیسەری وتەی ئەو بەندەیە و بینایە بە کردەوەکانی و ئەزانێ شایستەیە بۆ ئەو بەهرە و نزیك خستنەوە، لەبەر ئەوە ئەو شەو رەوی یەی پێ کرد و ئەو بەڵگە و نیشانە روونانەی نیشان دا، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بە بەندەی خۆی ناوبرد لەبەر لە پلە پێدانی بەوەی بەندەی تایبەتی خۆیەتی، لەبەر ئەوە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەو ناز ناوەی زۆر بە پەسەند و خۆشەویست داناوە بۆ خۆی. لە لایەکی ترەوە ناوبردنی بە بەندە لە کاتێك دا کە گەیشتە بەرزترین پلە و رادەیەك کە بۆ هیچ کەسێکی تر رووی نەداوە. ئەو ناوبردنە لەو کاتەدا سیفەتی بەندەیی بەهێز و دامەزراو ئەکات بەجۆرێ هەمیشە لەیاد ئەبێ و فەرامۆش ناکرێ و هەرگیز نزیك ناکرێتەوە لە سنووری خوایەتی و تێکەڵی ناکرێ، هەرچۆنێ لە بیرو باوەڕی مەسیحێتی دا ئەو کارە ناڕاست و ناڕەوایە روو بدات. بەهۆی ئەوەو بیر و باوەڕی ئیسلامی لەم ئوممەتەدا بە پاك و خاوێنی مایەوەو ئەو پەستی و ناڕاستی یەی بەسەر نەهات کە بەسەر بیرو باوەڕی چەوتی مەسیحێتی هات و شەریعەتەکەی خوا دەست کاری کرا و تێك درا. بێگومان وتەی ﴿اسرى﴾ واتە شەو رەوی پێ کرد. کاتەکەی ئەگەیەنێ کە شەوە، واتە هێنانی ﴿ليلا﴾ بە دوایی دا یا لەبەر گەیاندنی کورتی و کەمێتی ماوەکەیەتی کە لە شەوێك

دا پێك هاتووە و هەموو شەوەکەی داگیر نەکردووە، ئەوەش بە پێی زمانی عەرەبی یە، کە هەر کاتێك بە مەعریفەیی ئەو کاتانە گوتران گشتی کاتەکە ئەگەیەنن، ئەگەر بە نەکیرەیی گوتران گشتی ناگەیەنن، یان لەبەر زیادە دڵنیا کردن و تەئکیدە لەسەر کاتەکە وەك هێندێ ئەفەرمون. یان لەبەر نەخشە کێشان و نیشاندانی کاتەکەیە وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. ئەو گەشت و شەو رەوی یە لەم مزگەوتەوە بۆ ئەو مزگەوت و پەیوەندی و یەکێتی هەموو بیر و باوەڕەکانی خواپەرستی بە تاك و تەنیا نیشانی ئەدات لە ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە تا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) پەیوەندی نێوان شوێنە پیرۆزەکانی ئەو بیرو باوەڕە پیرۆزانە ئەخاتە بەرچاو وەك ئەوەش نیشان ئەدات کە پەیامەکەی پێغەمبەرمان(ﷺ) جێگیر و جێنشینی پەیامەکانی پێش خۆیەتی. لەباتی ﴿بارکناه﴾ فەرموی ﴿بارکنا حوله﴾ تا نیشان بدات کە فەڕ و بەرەکەت دەوری داوە و لافاوی کردووە بەسەری دا و بە تەواوی داگیری کردووە، ئەو پیت و فەڕەش لە هەموو بارێکەوە دابارێوە بەسەری دا، فەڕ و بەرەکەتی مەعنەوی کە گێڕای بە رووگە و جێ و شوێنی خواپەرستی پێغەمبەران، فەڕ و بەرەکەتی ماددی کە ئاو و رووبار و دار و درەخت و میوەجاتی زۆر و فراوانی تێدا دروست کردووە. ئەو شەو رەوی و گەردشە دەستی پێ کرد لە مزگەوتی مەککەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا کە خوا ئیسرائیلی یەکانی نیشتەجێ کرد تیای دا و لە پاشان دەری کردن لێ ی، جا بەو بۆنەیەوە دێتە سەر باسی هێندێ لە رووداو و بەسەرهاتی موسا و ئیسرائیلی یەکان، لێرەدا ئەڵقەیەك ئەهێنێ کە هەر لەم سورەتەدا هاتووە، لەم ئەڵقەدا ئامارە ئەکات بەهۆی نەمانی دەسەڵات و دەوڵەتی ئیسرائیلی یەکان کە بریتی بوو لە بڵاو بوونەوەی بەد کرداری و خراپەکاری ئەوانە کە بە پێی باوی خوا هۆی نەمانی دەسەڵات و دەوڵەتی ئیسرائیلی یەکان کە بریتی بوو لە بڵاو بوونەوەی بەد کرداری و خراپەکاری ئەوانە کە بە پێی باوی خوا هۆی نەمانی دەسەڵات و رووخانی گەل و وڵاتە. لە یەکەم جارەوە باسی نامەکەی موسا دەکات کە ترساندنی ئیسرائیلی یەکانی تێدا بوو، باسی باپیرە گەورەیان ئەکات کە نوحە و بەندەیەکی سوپاس گوزاری خوا بوو بەهۆی خراپەکاری گەلەکەیەوە خوا لەناوی بردن بێجگە لەو باوەڕ دارانەی کە لەگەڵ نوح دا خوا رزگاری کردن لە کەشتی یە رزگاری یەکەیان دا.

وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾
ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ
لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا

---

**ئەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ بەخشیمان بە موسا نامە، واتە تەورات ﴿وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ ئەو نامەیەمان گێڕا بە ڕێنموونی و ڕێ نیشاندەرێکی گەورە بۆ نەوەی ئیسرائیلی یەکان ﴿أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴾ واتە پێمان گوتن بڕیار مەدەن بێجگە لە من هیچ کەسێك کە کاروباری خۆتانی هەواڵە بکەن، واتە هەر پشت بەخوا ببەستن و هەموو کاروبارتان هەر لەو بناسن و تەنها ڕوو بکەنە ئەو ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴾ ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نوح هەڵمان گرتن لە کەشتی یەکەدا، خوا بەناوی ئەو ڕزگار کراوانەوە قسەی لەگەڵ کردن تا بیریان بخاتەوە کە ئەو باوك و باپیرەیان بەندەیەکی پاك و پاڵێوراوبوون، لەگەڵ نوح بوون کە بەندەیەکی زۆر سوپاس گوزاری خوا بووە وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴾ بەڕاستی نوح بەندەیەکی زۆر سوپاس گوزار بووە، بەو جۆرە و بەو نەژادە پاکە بانگیان لێ دەکات و قسەیان لەگەڵ ئەکات تا بیر بکەنەوە و ڕێگە ڕاستەکەی ئەوانە بدەنەبەر.**

**لەو نامەی موسادا هەواڵی دا بەو ئیسرائیلی یانە کە بەهۆی خراپەکاریی و بەد کرداری خۆیان دووچار ولاتیان وێران ئەکات و زۆرداریان بەسەردا زاڵ ئەکات. ئەیان ترسێنێ بە وێنەی ئەو سزا و ئازارە کە هەرکاتێ بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو خراپەکاریی یە، ئەوەش بە پێی باوی خوا کە هەر بەوجۆرە هاتووە، ئەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ ﴾ ئیسرائیلی یەکانمان ئاگادار کردوو و وەحیمان کرد بۆلایان و هەواڵمان پێدان لە نامەکەیان دا ﴿لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ﴾ سوێند بەخوا کە ئێوە تێکدان و خراپەکاری ئەکەن لە خاك و ولاتی شام و قودسدا بە گوناهو تاوان دوجار ﴿وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴾ بەرز ئەبنەوە و زاڵ ئەبن بەسەر خەڵکی دا بە بەرز بوونەوە و زاڵ بوونێکی زۆر گەورە و زیاد لە سنوور، واتە ئەو زۆر و هێز و دەسەلاتەی کە خوا پێتان ئەدات ئێوە بەکاری ئەهێنن لە دەست درێژیی و تاوان و خراپەکاری دا، بەهۆی ئەوەوە خوا تۆڵەتان لێ ئەسێنێ ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا﴾ ئینجا کاتێ دێتە پێشەوە کاتی سزا و تۆڵەی یەکەمی ئەو دووجارە کە بەڵێنی پێ دراوە.**

بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا ﴿٥﴾ ثُمَّ
رَدَدۡنَا لَكُمُ ٱلۡكَرَّةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَمۡدَدۡنَٰكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ أَكۡثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ
أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ
كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يَرۡحَمَكُمۡۚ

---

**﴿ بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ﴾ رەوانە ئەكەینە سەرتان چەند بەندەیەكی خۆمان كە خاوەنی هێز و دەست وەشاندنێكی بەتینن لە جەنگ دا ﴿ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ﴾ ئینجا ئەوانە ئەگەڕێن بەناو وڵاتەكەتان دا، واتە زاڵ ئەبن و وڵاتەكەتان داگیر ئەكەن و ئەگەڕێن بەناوی دا بە ئارەزووی خۆیان و بە دواتان دا ئەگەڕێن ﴿ وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا﴾ ئەوەی كە باس كرا بەڵێن و بڕیارێكی كراو و بەدی هێنراو بوو و لادان نەبوو لێ ی لە زانینی خوادا ﴿ ثُمَّ رَدَدۡنَا لَكُمُ ٱلۡكَرَّةَ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە لەپاش ئەو رووداو بەسەر هاتەتان ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆتان دەسەڵات و زاڵ بوونتان بەسەر ئەوانەی كە باس كران و ئەوەیان كرد پێتان كە كردیان، ئەوەش لەپاش تۆبە و گەڕانەوەتان لەو تاوان و كردەوانەی كە بوو بەهۆی رووداو و بەسەرهاتە سەختەكەمان ﴿ وَأَمۡدَدۡنَٰكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ﴾ یارمەتیتان ئەدەین بە ماڵ و سامانی زۆر و كوڕ و ئەولادی زۆر ﴿ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ أَكۡثَرَ نَفِيرًا﴾ ئەتان گێڕین بە زۆرتر لە بارەی لەشكر و ئەوانەی لەگەڵتان دەرئەچن و رائەپەڕن. زۆرتر لەوە لە پێشەوە بۆتان یان زۆرتر لە دوژمنەكەتان، ئەو كردەوە و هەواڵانەی كە لەم دوو ئایەتەدان بە وتەی رابوردوو نیشانی دان، بەڵام واتاكەیان داهاتووە، لەبەر ئەوە بە داهاتوو تەفسیرم كردنەوە. بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەمەیە: ئەوانە چەند هەواڵێك بوون ئاراستەی ئیسرائیلی یەكان كرا لە تەورات دا پێش روودانیان، هەواڵە داهاتووەكانی خوا ئەوەندە راست و بێگومانن وەك رابوردوو وان.**

**ئینجا پێش ئەوەی هەواڵ و رووداوەكە دوایی بێنێ یاسای كردەوەو پاداشت باس ئەكات بە تێهەڵكێش و ئەفەرموێ: ﴿ إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ﴾ ئەگەر ئێوە چاكە بكەن و كردەوەكانتان چاك بكەن ئەوا بۆ خۆتانی چاك ئەكەن و سوود و بەرهەمەكانیان بۆ خۆتانە**

﴿وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا﴾ ئەگەر خراپە بکەن و بە پێچەوانەی فەرمانی خوا کردەوە بکەن ئەوا بۆ نەفسی خۆتانە و تایبەتی یە پێ یەوە و تۆڵەکەی تێپەڕ ناکات بۆ هیچ کەسێکی تر، لەبەر ئەوەی(ئیمامی عەلی) – خوای لێ رازی بێت – ئەفەرموێ: (نە چاکەم کردووە دەربارەی هیچ کەس و نە خراپە و ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە). ئەو یاسایە زۆر تێرو تەواوە لە هەردوو دنیادا، مەردوم ئەگێڕێ بە لێپرسراوی خۆی ئەگەر چاکەی کرد بۆ خۆی ئەکات و ئەگەر خراپەی کرد ئەگەڕێتەوە سەر خۆی و ئەبێ هەر لۆمەی خۆی بکات. ئینجا لەپاش باسی ئەو یاسایە هەواڵەکە تەواو ئەکات.

ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ﴾ ئینجا کاتێ دێتە پێشەوە کاتی سزا و تۆڵەی دووەم ئەو دوو جارە ﴿لِيَسُوءُوا وُجُوهَكُمْ﴾ واتە رەوانە ئەکەینە سەرتان ئەوانە بۆ ئەوەی روو و دەم و چاوتان غەمبار و نارەحەت بکات، واتە کارێکی واتان بەسەر بێنێ کە غەم و پەژارە و ریسوایی لە رووتان دا دەرکەوێ، ﴿وَلِيَدْخُلُوا الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ بۆ ئەوەی بێنەوە ناو مزگەوتی قودس بە داگیر کردن و وێران کردن، هەرچۆنێ چوونە ناوی یەوە لە جاری یەکەم دا ﴿وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيرًا﴾ بۆ ئەوەی بڕوخێنن و وێرانی بکەن لەناوی بەرن ئەوەی کە زاڵ بوون بەسەری دا بە وێران کردن و لەناو بردنێکی سەخت و گەورە. ئەو بەڵێن و هەواڵە بەدی هات، بەم جۆرە خوا لە یەکەم جارەوە ئەو کۆمەڵەی زاڵ کرد بەسەر ئیسرائیلی یەکان دا، ئینجا گەڕانەوە بۆلای خوا تا خوا رزگاری کردن و زاڵی کردن بەسەر دوژمنەکانیان دا، ئینجا لەپاش ئەوە ئیسرائیلی یەکان دووبارە دەستیان کردەوە بە تاوان و خراپەکاری، بەهۆی ئەوەوە بە پێی باوی خوا بۆ جاری دووەمیش دوژمنی زاڵ کردەوە بەسەریان دا تا ئاوارەیان کردن لە وڵاتەکەی خۆیان دا و دەوڵەت و دەسەڵاتەکەی لێ سەندنەوە، ئینجا بەڵێنی پێ دانەوە بە دەروو لێ کردنەوە و میهرەبانی کردن پێ یان ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای خوا و فەرمانی پێ یان: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَنْ يَرْحَمَكُمْ﴾ ئومێد وایە پەروەردگارتان میهرەبانیتان پێ ئەکات ئەگەر تەمێ خوار بن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا. بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ سەر تاوان و خراپەکاری ئەوا خواش ئەگەڕێتەوە سەر تۆڵە و سزادان،

﴿وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾﴾

وەك ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا﴾ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ سەر تاوان و خراپەکاری ئێمەش ئەگەڕێینەوە بۆ سزادان و تۆڵە سەندن لێتان. بەڵێ جوولەکە دەستی کردەوە بە خراپەکاری و بێ باوەڕیی تا خوا موسڵمانانی زاڵ کرد بەسەریان دا بە تەواوی دەریان کردن لە نیوە دورگە، دەستیان کردەوە بە خراپەکاری و خوایش بەندەیانی خۆی زاڵ کرد بەسەریان دا، هەتا ئەم چەرخی دوایی یە هیتلەری زاڵ کرد تا بەو جۆرەی بەسەر هێنان. ئینجا ئەوا نیو چەرخە لە شێوەی دەوڵەتی ئیسرائیل دا بە هەموو هێز وان لە تاوان و خراپەکاریی لە فەلەستین دا، بێگومان خواش بەندەیانی خۆی زاڵ ئەکاتەوە بەسەریان دا و هەقی بەر و دوایان لێ ئەکاتەوە بە پێی ئەم بەڵێنە راست و رەوای کە لەم ئایەتەدا فەرموی. من دڵنیام ئەم حەدیسە سەحیحە دەست نیشانە بۆ ئەم جاری دوایی یە کە ئەفەرموێ ﴿لا تقوم الساعة حتى تقاتل المسلمين اليهود، فيختبيء اليهود من وراء الحجر و الشجر فيقول الحجر و الشجر: يا مسلم يا عبدالله هذا يهودى ورائى فاقتله إلا الغرقد فإنه شجر اليهود﴾ غەرقەد تەفسیر کراوەتەوە بەمەی درەختێکە کە دڕکی هەیە و لەخاکی بيت المقدس دا ئەڕوێ. داوا کارین خوا موسڵمانان زاڵ بکات و ئەوە بە چاوی خۆمان ببینین.

ئینجا ئایەتە کە دوایی ئەهێنێ بە چارەنووس و دوا رۆژی بێ باوەڕان و ئەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا﴾ گێراومانە دۆزەخ بە سجن و بەندیخانە بۆ ئەو بێ باوەڕانە وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ – خوا لێ یان رازی بێت – یان بە داگیر کەر و دەور دەریان بە جۆرێ هیچ کەسێکیان بۆ قوتار نابێ لێ ی و فراوانە بۆیان.

لەپاش باسی ئیسرائیلی یەکان و نامەکەیان کە خوا بۆی ناردن بۆ رێنموونی یان کەچی رێنموونیان لێ وەرنەگرت، گومڕا بوون بەهۆی ئەوەوە لەناو بران و تێدا چوون، لە پاش ئەوە دێتە سەر باسی ئەم قورئانەی کە رێنموونی ئەکات بۆ ئایینێك کە رێك و راسترینە، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە رێنموونی ئەکات بۆ رێباز و بەرنامەیەك کە راست ترینە، ئەفەرموێ: رێنموونی ئەکات بۆ راسترین بە بەرەلایی و بەبێ

بەستنەوەی بە هیچ کەس و هیچ دەستەیەکەوە، بێ دیاریی کردن و بەستنەوەی بە هیچ ڕێگە و ڕێبازێکی تایبەتی و دیاریی کراوێکەوە، کەواتە ڕێنموونی کراوەکان هەموو کەس و هەموو دەستە و هەموو چینێك ئەگرێتەوە لەهەرکات و هەر چەرخ و هەر وڵات و شوێنێك دا، هەروەها هەموو ڕێگە و ڕێباز و هەموو بەرنامەیەك ئەگرێتەوە کە خەڵکی ڕێنموونی لێ وەرگرن لەهەرکات و لەهەر چەرخ و لەهەرشوێنێك دا.

ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لە هەست و دەروون دا، بەهۆی عەقیدە و بیر و باوەڕێکی روون و سووك و ئاسان بە بێ هیچ گرێ و گیر و گرفتێك، ڕۆح بەرەلا ئەکات لە باری گرانی دوو دڵی و شتی پڕ و پووچ، هێزو وزە چاك و شایستەکانی بەرەلا ئەکات بۆ هەموو کردەوە چاك و بەنرخەکان.

ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لە ڕێکخستنی نێوانی ناوەوە و دەرەوەی مەردوم، نێوان هەست و رەوشتی، نێوان عەقیدە و کردەوەی، بە جۆرێ هەموو ئەوانە بەستراون پێکەوە بە بێ دژایەتی و یەك نەکەوتن، هەموو کارو کردەوەکان ئەبن بە عیبادەت و خواپەرستی ئەگەر بە نیازی خوا و بە پێی بەرنامەی خوا بکرێن، تەنانەت ئەو شتانەش کە خۆشی و لەزەتی و رابواردنی ژیانی دنیایان تێدایە.

ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لەبارەی عیبادەت و خواپەرستی یەوە، بەم جۆرە ئەرکەکانی بەپێی توانایە و میانەیە و شتێکی پێویست نەکردووە کە مەردوم تەنگەتاو بکات، ئەوەندەش مەرەخەس و بەر بەرەڵای نەکردووە تا زۆر بە گرنگ نەگیرێ. ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لە پەیوەندی یەکانی نێوان ئادەمی دا، لەسەر بنەڕەت و بناغەیەکی زۆر بەهێز و دامەزراو دایمەزراندووە بە جۆرێ حەز و ئارەزووی نەفس و کینە و رق کاری لێ ناکات و ئەم دیو و ئەو دیوی پێ ناکات.

ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لەبارەی ئایینە ئاسمانی یەکانەوە، بەم رەنگە باوەڕی بە هەمووان هەیە و باوەڕی هەیە کە لە یەك سەرچاوەوە هاتوون و یەك زنجیرەن و دواترین ئەڵقەی ئەو زنجیرەیە کە تەواوکەری هەموو ئەڵقەکانە و جێگر و جێنشینی هەموویان ئەمەیە کە لەم قورئانەدا هات. ئەم قورئانە ڕێنموونی ئەکات بۆ راست ترین لە هەموو بار و روویەکەوە ﴿ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا ٱلَّيۡلِ﴾ موژدە ئەدات بەو باوەڕ دارانەی کە کردەوە چاکەکان ئەکەن بەمەی کە هەر بۆ ئەوان هەیە ئەجرو پاداشتێکی گەورە.

وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ
ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً

---

**﴿وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ واتە موژدەیان ئەدات بەوەی سزایەکی سەختی ئێش و ئازار دەر هەیە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان نی یە بە ڕۆژی دوایی، نامەدارەکان هەرچەند خۆیان بە باوەڕ دار دائەنێن، کەواتە هیچ ڕەخنەیەك ناگیرێ و جێگەی قسە و باس نی یە دانانی سزای بێ باوەڕان بە موژدە لەم بارەیەوە کە سزای دوژمنی بێ باوەڕ نیعمەت و چاکەیە بۆ باوەڕدار، یان ئەڵێن: ﴿یبشر﴾ هەر هەواڵ دانە. ئەم قورئانە بەو جۆرە ڕێنموونی ئەکات بۆ ڕاست ترین ڕێگە و بەرنامە، کەواتە شوێن کەوتووەکانی ڕێك و ڕاست ترین کەسن، هەرکەسێ پەیڕەوی نەکات گومڕا و سەرگەردانە، بەند کراو و بەندەی هەوا و نەفسی خۆیەتی و بەم جۆرەیە کە دەربارەیان ئەفەرموێ: ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ﴾ ئادەمی نزا و هاوار و بانگ ئەکات بۆ شەڕ و خراپە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ناتەواو و نەزانە و سەرەنجام و دوا ڕۆژی کارو کردەوە نازانێ، زۆرجار کردەوە و کاری بەد ئەکات و داوای ئەکات و پەلەی پێ ئەنێتەوە بۆ خۆی لەبەر ئەوەی نەفام و نەزانە، یان ئەزانێ بەڵام سەرکێشە و جڵەوی خۆی پێ ناگیرێ و ئەو داوا و نزایە ئەکات ئەکات بۆ ئەو سزا و خراپەیە بە وێنەی داوا و نزای بۆ خێرو چاکە و خۆشی، وەك قورئان بۆمان باس ئەکات لەلایەن بێ باوەڕەکانی گەلە پێشووەکانەوە کە ئەیان گوت بە پێغەمبەرەکانیان: ئەو هەڕەشە و سزایەی کە ئەمان ترسێنی پێی بۆمان بێنە ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەیت، یان ئەوەی لەم ئوممەتەدا ئەیان گوت: ئەی خوایە ئەگەر ئەم ئایینەی کە محمد هێنای هەق و ڕاستە، دەی بەردە بارانمان بکە لە ئاسمان و لای سەروومانەوە، یان سزایەکی سەختی ترمان بۆ بێنە. یان وەك زۆر کەس کە باوەڕ داریش بێت لەکاتی ڕق هەڵسان دا نزای شەڕ ئەکات لە خۆی یان هەر کەسێکی تریش، بەهەر حاڵ ئەوە لادانە لە ڕێگە ڕاستەکەی قورئان و ئەو خێرو ڕێگە ڕاستە نی یە کە قورئان ڕێنموونی بۆ ئەکات و هۆکەشی ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا﴾ ئادەمی هەر وا**

هاتووه باوی ئەوەیە زۆر پەلە کەرە و پەلە ئەنێتەوە، بێگومان ئەوەی کە راست ترە و قورئان فەرمانی پێ ئەدات پەلە نەکردنە مەگەر لەکاری خێرو چاکەدا. بەهەرحاڵ مەبەست ئەوە نی یە هەموو کەس و هەر یەکێ لە ئادەمی بەو جۆرەیە، بەڵکو هێندێ لە ئادەمی بەو جۆرەیە، شتێکی باوە و زۆر بەکار ئەهێنرێ روو کردن و دانانی کردەوەی هێندێ لەهەر گەل و کۆمەڵێك بە کردەوەی هەمووان. بە کورتی قورئان بەو جۆرەیە کە باس کراوە و ئادەمیش بەم جۆرەیە کە باس کرا. بەڕاستی دوو رێگە و رێبازی جیاواز و دوورن لە یەکتر. خوا بە میهرەبانی خۆی دامەزراومان بکات لەسەر ئەو رێگە و رێبازەکەی قورئان. لەپاش ئاماژە کردن و دەست نیشان بۆ ئەو بەڵگە روونانەی کە لەو شەو رەوی یە پیرۆزەدا بووە، دەست نیشان ئەکات بۆ داستانی نوح و ئەوانەی لەگەڵی بوون، هەروەها داستانی ئیسرائیلی یەکان، هەروەها ئاماژە بۆ ئەم نامە دوایی یە کە رێنموونی ئەکات بۆ راست ترین ئاین و بەرنامە. ئینجا لەو ئاماژە و دەست نیشان کردنەوە دێتە سەر باسی بەڵگە و نیشانەی بوونەوەری، بەڵگە و نیشانەیەك کە چەند چاکە و نیعمەتی دنیایی تێدایە، هەرچۆنێ قورئانەکە ئەو هەموو بەهرە و نیشانە چاکانەی تێدایە، ئەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ﴾ شەو و رۆژمان گێڕاوە بە دوو نیشانەی روون و ئاشکرا لەسەر خوایەتی و دەسەڵاتمان، ئیتر مەبەست نەفسی شەو رۆژەکە بێت وەك هێندێ ئەفەرمون، یان مەبەست مانگ و خۆر بێت وەك هێندێکی تر ئەفەرمون. بە هەرکام مەبەست بێت بەڕاستی دوو نیشانە و بەڵگەی روون و ئاشکران و سەر سوڕهێنەرن. بەڵام بەهۆی دەق پێوە گرتنەوە گرنگی و نایابی یەکەیان فەراموش ئەکرێ، ﴿ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾ لەسەر رای یەکەم واتە شەو و رۆژمان داهێناو گێڕامان بە دوو بەڵگەی روون و ئاشکرا لەسەر خوایەتی و دەسەڵاتمان، واتە بەڵگە و رابەرێ کە شەوە تاریکمان کرد و بەڵگە و نیشانەیە کە رۆژە گێڕامان بە رووناك و بینەر و هۆی بەدی کردن. لەسەر رای دووەم: واتە بەڵگە و رابەری یەکەم کە مانگە گێڕامان بە تاریك و بەو جۆرە دروستمان کرد کە خۆی لەخۆی دا رووناك نەبێ، رابەر و بەڵگەی رۆژ کە خۆرە بە رووناك و هۆی دیتن و بەدی کردن و بەو جۆرە دروستمان کرد.

لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ﴿١٢﴾
وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ
كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴿١٤﴾

---

**لەسەر هەر بار هۆی ئەو گێڕان و دروست کردنە ئەمەیە کە فەرموی: ﴿لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ بۆ ئەوەی نیاز بکەن و داوای رۆزی و دەست کەوت بکەن لەلایەن پەروەردگارتانەوە ﴿وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ﴾ بۆ ئەوەی ئەندازە و ژمارەی ساڵەکان و حیسابی مانگ و شەوو رۆژەکان بزانن کە زانینیان پێویستە بۆ کاروباری دین و دنیا، بەڵێ شەو پێویستە بۆ ئارامی و رەحەتی و نەمانی ماندوویی، رۆژیش پێویستە بۆ تێکۆشان و کار و هەڵس و کەوت، بەهۆی جیاوازی شەو و رۆژیشەوە ژمارەی ساڵ و مانگ و رۆژ ئەزانرێ، هەروەها ماوەی بەڵێن و پەیمان و مامەڵە و وەرزەکان ئەزانرێ ﴿وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا﴾ هەموو شتێ کە پێویستمان هەبێ پێ ی باسمان کردووە بۆتان بە باس کردنێکی روون و رەوان. کەواتە هیچ شتێ و هیچ کارێ لەم بوونەوەرەدا بە رێکەوت و بێ هودە و بە گزاف نی یە، ئەو نیزام و وردەکاری یەی بەکارهێنراوە لەم شەو و رۆژ و بوونەوەرەدا بە ئاشکرا هاوار ئەکات و ددان ئەنێ بەو وردی و وردەکاری یەی بەکار هێنراوە لەم بوون و بوونەوەرەدا، شایەت و بەڵگەی روونن لەسەری، بەپێ ی ئەو راستی و دروستی و وردەکاریی یە کردەوەو پاداشت هاتووە و رێک خراوە، وەك وەرئەگیرێ لەم فەرمودەیەدا: ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا﴾ دەرئەکەین بۆی لە رۆژی دوایی دا نامەیەك کە پێ ی ئەگات بە کراوەیی و هەموو کردەوەکانی لەو نامەیەدا نووسراوە و خۆی دەیخوێنێتەوە و دەزانێ بە بێ پێویست بە شایەت و موحاسەبە کردن، لەبەر ئەوە پێ ی دەگوترێ: ﴿ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ﴾ نامەکەت بخوێنەرەوە و ﴿كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا﴾ ئەمڕۆ بەسە خۆت بە حیساب کەر بەسەر خۆتەوە، موحاسەبەی خۆت بە خۆت بکەیت، هەر بەو شێوە رێك و رەوا و بەو وردەکاری یە یاسای کردەوە و پاداشت پێك هاتووە،**

﴿مَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾

**وەك ئەفەرموێ: ﴿مَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ﴾ هەركەس ڕێنموونی وەرگرتبێ لە قورئانەوە هەر بۆخۆی وەری گرتووە و سوود و بەهرەكەی هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ هەركەس ون و گومڕا بووبێ، ئەو كەسە هەر بە دژی خۆی ون و گومڕا بووە و سزا و زیانەكەی هەر بۆ سەر خۆی ئەگەڕێتەوە ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هیچ نەفسێكی گوناهكار گوناهی نەفسێكی تر هەڵ ناگرێ و باری سووك ناكات و هەركەس پرسیاری لێ ئەكرێ لە كردەوەی خۆی. بێگومان ئەم بوونەوەرە بەهەموو بەش و پارچەكانی یەوە بەڵگە و نیشانەیەكی روونن لەسەر خوایەتی خوا، بێجگە لەو پەیمانە سروشتی یەی كە خوا لە ئادەمی وەرگرتووە، وەك باس كرا لە سورەتی(الأعراف) دا، لەگەڵ ئەوەدا خوای میهرەبان بەوە وازی نەهێنا بەڵكو پێغەمبەرانیشی بۆ ناردن بە موعجیزە و بەڵگەی روون و ئاشكراوە، ئینجا سزای ئەوانەی داوە كە یاخی بوون و گوێ رایەڵی یان نەكردبێ وەك ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ ئێمە سزا دەری بەندەیان نەبووین و باوی ئێمە سزادان نەبووە هەتا فروستادە و نێرراومان رەوانە كردووە و بانگ و بانگەوازەكەی ئێمەیان پێ گەیشتووە و ئینجا ئەوان هەر یاخی بوون و گوێ رایەڵ نەبووبن. دیارە ئەوە ئەو پەڕی میهرەبانی یە سوپاسی بێ پایان بۆ ئەو خوایە. لەم شوێنەدا قسە و باس و لێكۆڵینەوە زۆر هەیە و كراوە و هۆی دژایەتی و دووبەرەكی بووە لەناو موسڵمانان دا، بەڵام بە پێویستم نەزانی لەو بارەیەوە هیچ بڵێم، ئینجا ئاماژە ئەكات بۆ چۆنێتی بەدی هاتنی سزادان لە دنیادا لەپاش رەوانە كردنی پێغەمبەران،**

وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾

ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا﴾ لە تەفسیری ئەم ئایەتە و مەبەست بە وتەی ﴿امرنا﴾ دا سێ را هەیە:

١- فەرمان ئەدەین بە گوێ رایەڵی.

٢- فەرمان ئەدەین بە تاوان و دەرچوون لە گوێ رایەڵی.

٣- زۆردار و خاوەن ناز و نیعمەتی فراوان زۆر ئەکەین.

لەسەر رای یەکەم کە لە(ئیبن و عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیر) ەوە ریوایەت کراوە: کاتێ بمانەوێ دانیشتوانی شار و ولاتێ لەناو بەرین و کاتی ئەوە نزیك ببێتەوە فەرمان ئەدەین بە زۆردار و پیاو خراپەکانیان کە ناز و نیعمەتی فراوانیان پێ دراوە تا رادەیەك خۆیان لێ گۆڕاوە و فیز و کەشخە ئەکەن بەسەر خەڵکی دا. فەرمان ئەدەین بەوانە یان بە گوێ رایەڵی و کردەوەی چاك ﴿فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾ کەچی ئەوان یاخی ئەبن و لە فەرمانمان دەرئەچن. لەسەر رای دووەم فەرمان ئەدەین بەوانەیان کە یاخی بوون و دەرچوون لە گوێ رایەڵی، واتە بەرگری یان ناکەین و جڵەویان بۆ شل ئەکەین تا رادەیەك وەك فەرمانمان پێ دابن بەوە، ئینجا ئەوانیش یاخی دەبن و خراپەکاریی بلاو ئەکەنەوە لە ولات و شارەکان دا. لەسەر رای سێ یەم: ئەو یاخی و دەسەلات دار و خراپەکارانە زۆر ئەکەین ئینجا ئەوانەش خراپەکاری و تاوان بلاو ئەکەنەوە. لەسەر هەر بار ﴿فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ﴾ بەهۆی ئەوەوە دائەمەزرێ و جێگیر ئەبێ بەسەر ئەو شارو ولاتەدا بڕیاری سزادان و تۆڵەیان ﴿فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا﴾ ئینجا ئەو شار و ولاتانە وێران ئەکەین بە وێران کردنێکی تەواو و لە ریشەیان ئەمێنین. ئەو وتەیە خوێنراوەتەوە ﴿أَمَّرۡنَا﴾ واتە ئەو پیاو خراپانە ئەکەین بە فەرمان دەر و کار بەدەست بەسەریانەوە و ئینجا ئەوانیش خراپەکاری ئەکەن لەو شارانەدا... هتد. ئەم ئایەتە باوڕێك لە باوەکانی خوا نیشان ئەدات کە هەر کاتێ دانیشتوانی ولاتێك پیاو خراپ و بەدانی تیا پەیدا بوو ئەوانیش هەوڵ نەدەن بۆ بەرگری و نەهێشتنی ئەو خراپە و خراپەکارانە، خوا ئەوانە زاڵ ئەکات و خراپە و خراپەکاری ولاتەکە داگیر ئەکات، ئەو کاتە خوایش تۆڵە ئەسێنێ لێ یان بە سزادان و وێران کردنی ئەو ولاتە.

وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿١٧﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ
ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾
وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾

---

**ئەو باوی خوا بەدی هات و تێپەڕی کرد لەپاش نوح و چەرخ لەدوای چەرخ وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ﴾ زۆر لە گەل و میللەتمان لەناو برد لەپاش نوح و چەرخەکانی پاش نوح. باسی پێشی نووحی نەکرد(ﷺ)، چونکە نوح یەکەم نێرراو و فروستادەیە کە گەلەکەی سزایان داو خواش ئەوانی لەناو برد، حاڵی گەلەکەی ناسراو و بەناوبانگە، کەواتە پێویست نەبوو باسی ئەوان، ئەوانە کە لەناوبران تاوانبار و خراپەکار بوون ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا﴾ خوا بەسە کە خەبەر دار و بینایە بە گوناهەکانی بەندەکانی، بەسە خوا لەبارەی خەبەرداری و بینایی و خۆی ئەزانێ کێ و کام شایستەیە بۆ هەر شتێ. ئینجا حاڵ و باری بەندەکانی باس ئەکات کە هەرکەس شایستەیە بۆچی. ئەفەرموێ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾ واتە هەرکەسێك مەبەستی هەر ئەم ژیانی دنیایە و هەر ئەم ژیانەی ئەوێ پێش ئەخەین بۆی لەم دنیایەدا ئەوەی کە ئێمە ئەمانەوێ بۆ هەرکەسێك کە مەیلی ئەکەین. واتە ئەندازەیەکی پێ ئەدەین کە ئێمە ئەمانەوێ نەك ئەوەی کە ئەو مەیلی ئەکات ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا﴾ ئینجا لەپاش ئەو بەشەی دنیای دۆزەخمان بۆ بڕیار داوە لە کاتێك دا ئەچێتە ناوی بە تەواوی بە لۆمە و رەخنە لێ گیراوی و دەرکراوی و دوور خراوەیی لە بەزەیی و میهرەبانی خوا ﴿وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ هەرکەسێك نیاز و مەبەستی رۆژی دوایی بووبێ ﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا﴾ تێکۆشانی بۆ کردبێ بە تێکۆشانێك کە شایستەیە بۆی ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ لەکاتێك دا کە باوەڕدارێکی راست و راستەقینە بێت ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا﴾ ئەوانە کردەوە و تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە لای خوا و ئەجرو پاداشت ئەدرێنەوە. کردەوە و تێکۆشان بۆ رۆژی دوایی خاوەنەکەی بێبەش ناکات لەخۆشی ئەم دنیایە، بەڵکو چاوی هەڵئەخات بۆ ئاسۆی هەرە بەرز، کردەوەو تێکۆشان هەر بۆ ژیانی ئەم دنیایە خاوەنەکەی پەست و بێ نرخ ئەکات و ئەیکات بە هاوسەر و بەشدار لەگەڵ ئەو هەموو گیان لەبەرانەی کە وان لەم زەوی یەدا. ئەم ئایەتە بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە، بەڵام ئەمەی کە گوتم لەدڵم دا بەهێزتر بوو.**

كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا
بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ﴿٢١﴾ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ
مَذۡمُومٗا مَّخۡذُولٗا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا

---

﴿كُلًّا نُّمِدُّ﴾ واتە هەردوو تاقمەكە ﴿هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئا ئەوانەی كە هەر دنیایان ئەوێ، و ئا ئەوانەی كە ڕۆژی دوایی یان ئەوێ بەشیان ئەدەین هەموو بەجارێ ﴿مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ﴾ لە ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر لەم دنیایەدا بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی بە بێ جیاوازی لە نێوان چاك و خراپ دا، هەركام بە پێی شایستەیی و شیاوی خۆی ﴿وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا﴾ هەرگیز ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت قەدەغە كراو نەبووە لە هەر كەسێك كە خوا مەیلی كردبێ. واتە لەم دنیایەدا ڕۆزی و بەخشینی خوا نەبەستراوە بە چاكی و خراپی یەوە. ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ﴾ ئەی پێغەمبەر بەچاوی ئیعتبار سەرنج بدە چۆن لە دنیادا باوی هێندێ لەوانەمان داوە بەسەر هێندێكی تریان دا ﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا﴾ بێگومان ڕۆژی دوایی گەورەترە لەم دنیایە لەبارەی ڕادە و پلەوە. گەورەترە لەبارەی باودانەوە، واتە جیاوازی ڕادە و پلە و باودانی خەڵكی لەم دنیایەدا شتێكی ئاشكرایە لە كاتێك دا هەموو دنیا شتێكی كەم و بێ نرخە لەچاو ڕۆژی دوایی دا هیچ شتێك چاو نادات. دەی ئەبێ ڕادە و پلە و باودانی ڕۆژی دوایی كە شتێكی بێ سنوور و هەتا هەتایی یە ئەبێ چۆن بێت؟ كەواتە هەق ڕایە خەڵكی هەوڵدان و تێكۆشانیان بۆ پلە بەرزەكانی ڕۆژی دوایی بەهێزتر و بەتین تر بێت لە هەوڵ دان و تێكۆشان بۆ ڕادە و پلەی ئەم دنیایە. بەڕاستی ئەم فەرمودەیە پاڵدەر و هاندەرێكی زۆر بەهێز و بەتینە بۆ هەركەسێك كە داناو ژیر بێت. لەبارەی زۆری و جیاوازی ڕادە و پلەكانی بەهەشتەوە چەند حەدیسێك هاتووە كە سەر سوڕهێنەرو سەرنج ڕاكێشن. خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بكات لەو ڕادە و پایە بەرزانەدا. آمین، آمین. لەمەو پێش فەرموی: ئەم قورئانە ڕێنموونی ئەكات بۆ ڕاست ترین بەرنامە و ئینجا فەرموی: هەر شتێ كە پێویست بێت بە ڕوونی باسیمان كردووە لەم قورئانەدا. جا ئەوا هێندێ لە فەرمان و جڵەو گیریی یەكانی ئەم قورئانە دێنێ كە ڕاست ترینە لە یاسای ژیان دا. لە یەكەم جارەوە دەست پێ ئەكات بە جڵەو گیریی لە هاوبەش

ڕەوادان و بڕیاری پەرستن تەنها بۆ خوا کە هەموو فەرمان و جڵەوگیریی یەکانی تر لەم یەکەمەوە پەیدا ئەبێ و لەپاش ئەم دەستەیەك لەوانە دێنێ بە دوایدا. ئەفەرموێ: ﴿لَّا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا﴾ ئەی ئادەمی ئەی ئەو کەسەی کە شایستەی بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵ بکرێ هیچ پەرستراو و خوایەکی تر بڕیار مەدە لەگەڵ خوایەك کە ناوی ﴿الله﴾ یە و هیچ شتێکی تر مەکە بە هاوبەشی ئەو تا بەهۆی ئەوەوە ببی و بگەڕێ ی بە لۆمە کراوێکی یارمەتی نەدراوی کۆمەك نەکراو. یان بەهۆی ئەوەوە پەك کەوتە و دەستە پاچە ببی بە لۆمە کراوی و کۆمەك نەکراوی. لۆمە کراو لەلایەن خواو مەلائیکە و باوەڕ دارانەوە، یان لەلایەن هەموو ژیرێکەوە لەسەر ئەو باوەڕ و کردەوە بەدە، چونکە هەرکەس شتی بێ دەسەلآت و بێ سوود و بێ نرخ بکات بە هاوبەشی خوای پەروەردگاری، خاوەنی هەموو شتێ بێگومان ئەو کەسە جێی هەموو تانە و تەشەر و لۆمەیەکە. هەروەها ئەو کەسە بێ کۆمەك و بێ یارمەتی دەرە، چونکە ئەو لەلایەن خواوە یارمەتی دراو نابێ و هەرکەسیش خوا یارمەتی دەری نەبێ یارمەتی دراو نابێ. هەرچەند بە دیمەن و رواڵەت هەموو کەسی لەگەڵ بێت. لەپاش جڵەو گیریی لە هاوبەش ڕەوا دان ئینجا فەرمان ئەدات بە پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا، ئەو فەرمانە ئەدات لە شێوەی بڕیارێکی توند و بەهێز کە بە هیچ جۆر لانەدرێ لێ ی. ئەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ﴾ پەروەردگارت بڕیارو فرمانی قەتعی داوە کە هیچ کەس و هیچ شتێ ناپەرستن بێجگە لە ئەو و تەنها گوێ ڕایەڵی و فەرمان بەری ئەو ئەبن. واتە نەپەرستن و گوێ ڕایەڵ نەبن بێجگە لە ئەو، بەڵام لە شێوەی هەواڵ دان فەرموی لەبەر زیادە هاندان و دڵنایی لەسەر کردن. یان هەر لە ڕێوە بۆ جڵەوگیریی یە. واتە پەروەردگارت بڕیار و فەرمانی داوە بەوەی نەپەرستن... هتد. بەهەرحاڵ پەرستن و عیبادەت ئەبێ هەر بۆ خوا بێت چونکە پەرستن و عیبادەت ئەوپەڕی رادەیە لە ڕێز و بە گەورە گرتن دا، بە جۆرێ هیچ وتە و وشەیەکی تر نابێ بە جێگیر و واتای. دەی ئەوەش ئەبێ بۆ کەسێك بێت کە ئەوپەڕی رادە و پلەی هەبێ لە گەورەیی و ڕێز پێدان دا، ئاشکرایە ئەو کەسەش تەنها خوایە. لەپاش دانانی بناغە و بنەڕەت کە عیبادەت و پەرستنی خوایە، ئینجا باسی فەرمان و جڵەو گیریی یەکانی تر ئەکات لە نێوان هەمووان دا پەیوەندی و پەیوەستنی باوکو دایك و ماڵ و خێزان یەکەم سەردەستەیە لەبەر ئەوە بەدوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ واتە پەروەردگارت فەرمان و بڕیاری داوە بەوەی چاکە بکەیت لەگەڵ باوك و دایك و سۆز و بەزەیی و فەرمان بەریت ببێ بۆیان.

إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا
كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾
رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا
ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ

---

**تا ئەو رادەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ ئەگەر یەکێ لە باوك و دایکت یان هەردووکیان گەیشتنە پیری و پەك کەوتەیی لای تۆ و لە ژێر چاودێریی تۆدا بوون بە ئەرك بەسەرتەوە هەرگیز نەڵێیت پێ یان: ئۆف. واتە دەنگ و وتەی بێزاریت لێوە دەرنەکەوێ دەربارەیان. ﴿وَلَا تَنْهَرْهُمَا﴾ وە تێ نەخوڕی و جڵەو گیریی یان نەکەیت لەکارو کردەوەیەك کە ئەوان بیکەن و بەلاتەوە چاك نەبێ و پێت خۆش نەبێ، بەرپەرچی قسەیان مەدەرەوە. مەبەست لە یەکەم وەك(خازن) ئەفەرموێ: جڵەوگیریی لە دەربڕینی بێزاری لە زۆر و لە کەم. مەبەست بە دووەم جڵەوگیریی یە لە دەربڕینی بەرپەرچ دانەوەی قسەیان، کەواتە یەکەم دووەم ناگرێتەوە ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ وتەی پەرۆز و نەرم و شیرینیان لەگەڵ دا بەکار بێنە و بە خۆشی و شیرینی بچۆ بە دەمیانەوە ﴿وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ﴾ رابخە بۆیان باڵی زەلیلی لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێ یان ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ بڵێ ئەی پەروەردگارم بەزەیی و میهرەبانی بکە پێ یان، هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردەکرد و پێ یان گەیاندم بە بچووکی و بە منداڵی. ئا بەم وتە نەرم و ناسك و بەم شێوە شیرینە قورئان دەروون و ویژدانی چاکە و بەزەیی ئەهێنێتە جۆش لە دڵی ئەولاددا، لە چەند شوێن دا قورئان سەرنجی ئەولاد رائەکێشێ و فەرمان و وەسیەتیان بۆ ئەکات لەبارەی دایك و باوکەوە، هەروەها حەدیسی زۆر لەو بارەوە هاتووە. بەڵام سەبارەت بە باوك و دایك دەربارەی ئەولادیان بەوجۆرە بە گرنگ پیشان نەدراوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە مەردوم بە سروشت گیان و ماڵی خۆی بەلاوە خۆشەویست ترە، ئەولادیش درێژە دانە بە گیان و ژیانی خۆی، کەواتە بە سروشت چاو ئەبڕێتە بەردەمی خۆی و زۆر کەم لائەکاتەوە بۆ دواوە و بۆ ژیانی رابوردوو بۆ کۆمەڵی تێپەڕیو. کەواتە باوك و دایك بە بێ پەروا پەلاماریان ئەدەن و ئامادەن بۆ بەخت کردنی هەموو توانایان لە پێناوی ئەولادیان بە بێ پێویست بە**

فەرمان دان و پاڵ پێوەنان. دەستەواژە و تەعبیری قورئان ئێجگار بەکار و کاریگەرە لە دەروون دا. سۆز و بەزەیی دەربارەی باوك و دایك ئەهێنێتە جۆش تا رادەیەك بە زەلیلی نیشانی ئەدات کە هۆی ئەوپەڕی فەرمانبەری و گوێ رایەڵی یە. ئینجا زەلیلی یەکەش وا نیشان ئەدات کە باڵی هەیە و رای ئەخات تا نیشانە بێت بێت لەسەر مل کەچی بە ئاشتی و ئارامی! ئینجا لەبەر ئەوەی کارو فەرمانەکانی پەیوەست کردووە بە عەقیدەوە.

هەر لە سەرەتاوە ئەوا هەموو کارەکان ئەگێڕێتەوە بۆلای خوا کە ئاگای لە هەموو نیاز و وتەو مەبەستێك هەیە کە ئەفەرموێ: ﴿رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡ﴾ پەروەردگارتان زاناترە و زانینی تەواوی هەیە بە هەرچی هەیە لە دڵ و دەروونتان دایە، ئەم فەرمودەیە موژدە و بەڵێنە و بەو کەسانەی کە بە نیاز و نیەتێکی پاکەوە هەڵ ئەسن بەم فەرمانە وەك ترساندن و هەڕەشەیە لەوانەی کە نیاز و نیەتی پاکیان نی یە. بەڵام باری یەکەم نیشان ئەدات، چونکە باسەکە لە ئەسڵ دا بۆ ئەوە و ئەفەرموێ: ﴿إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا﴾ ئەگەر ئێوە چاك بن و نیازی چاکەتان ببێ بێگومان باوی خوا وا هاتووە و وا بووە کە زۆر لێ بوردە و بە چاوپۆشی یە لەو کەسانەی کە زۆر ئەگەڕێنەوە و تۆبەکارن بۆلای خوا لە هەڵە و گوناهێك کە لێ یانەوە دەرئەچێ. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەوە دڵ نەوایی کەسانێکە کە لە رووی باوك و دایکیان دا قسەی ناڕەوا ئەکەن بەڵام مەبەستیان خێرە. لەپێش ئەوەی فەرمانەکان دوایی بێنێ، ئەم فەرمودەیەی هێنا تا ئەمە بکرێ بە یاسا و لە هەموو وتە و کردەوەیەك دا ئەم فەرمودەیە رەچاو بکرێ و قاپی تۆبە و میهرەبانی بکرێتەوە لەسەر هەرکەسێك کە هەڵە یان قوسورێك بکات، لەپاش ئەوە تۆبە بکات لە هەڵە و قسورەکەی، وتەی(اواب) بە کەسێك ئەگوترێ کە هەرکاتێ هەڵەی کرد بگەڕێتەوە بۆلای خوا بە تۆبە و داوای لێ بوردن.

لەپاش باوك و دایك، ئینجا دێتە سەر هەموو خزم و کەس و کارەکانی تر لەگەڵ هەژار و رێبوار و سەفەری یەکان دا کە هەموو کۆ ئەبنەوە لە ژێر سایەی پەیوەندی ئادەمێتی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ﴾ ببەخشە بە خزمەت مافی خۆی، ئەو مافەی کە خوا بۆی داناوە لە خۆشەویستی و سەر لێدان و چاکە لەگەڵ کردن و ژیانی خۆش بەسەر بردن لەگەڵی و یارمەتی دان و قۆڵ گرتن و هەموو چاکەکانی تر، هێندێ ئەفەرمون: ئەگەر فەقیر و بێ نەوا بوو فەرزە لەسەری گوزەرانی بدات و بیژییەنێ.

وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿٣٠﴾

---

**﴿وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ مافی هەژار و ڕێبواریش بدە. ئەمانیش مافی چاکە کردن لەگەڵیان بە هەر جۆر و شێوە. وا دەرئەکەوێ لەپاش واجب کردنی زەکات دا، بەهەرحاڵ مافی ماڵیشیان هەر بووە و فەرزە پێدانیان بەبێ منەت نان و پیاوەتی ﴿وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا﴾ بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە، باشترینیان بریتی یە لە ماڵ سەرف کردن بە ناهەق و بە بێ جێ، ئیتر زۆربێ یان کەم وەك(ئیبن و عەباس و ئیبن و مەسعود) ئەفەرمون.(موجاهید) ئەفەرموێ: ئەگەر کەسێك هەموو ماڵی خۆی بەخت بکات لە شتی چاك و لە هەق دا ئەو کەسە نابێ بە(مبذر) و ئەگەر مشتێ لە ناهەق دا سەرف بکات ئەو کەسە ئەبێ بە(مبذر). ئینجا ئەو کردەوە ناشیرین ئەکات و دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی جلەوگیری یەکە و ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ﴾ بەڕاستی(مبذر) ەکان برادەر و دۆست و وێنەی شەیتانەکانن لە خراپی و بەدی دا ﴿وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا﴾ شەیتان زۆر سپڵەیە بۆ پەروەردگاری و باوی هەر ئەوە بووە و چاو لەبەری چاکەی خوا نەبووە، کەواتە دۆست و وێنەکانیشی ئەبێ وابن، بەڕاستی ئەم فەرمودەیە بەسە بۆ گەڕانەوەو دوور کەوتنەوە لە سیفەتی(تبذیر). پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەهەموو کەس بەخشندەتر بووە و لە هەمان کات دا لە هەموو کەس بە شەرم تر بووە، جا لەبەر ئەوە ئەگەر ئەوانەی داوای ماڵ و ڕۆزی یەکیان لێ کردبێ و هیچی لە دەست دا نەبووبێ لە شەرم دا ڕووی پیرۆزی وەرگێڕاوە و بێ دەنگ بووە. جا ئەوا لێرەدا چارەسەری ئەو گرێ یەی بۆ کرد بەمەی بە قسەی خۆش ئەوانە دڵخۆش و شادمان بکات، ئەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا﴾ واتە ئەگەر ڕووت وەرگێڕا لەوانە لە شەرم دا لەبەر ئەوەی بێ دەست بوویت و بە نیاز و چاوەڕوانی ڕۆزی یەك بوویت بێت لەلایەن**

پەروەردگارتەوە: ﴿فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا﴾ ئەوا قسەیان لەگەڵ بکە بە وتە و قسەیەکی نەرم و شیرین و بەڵێن پێ دانیان لە کاتی بوون دا. ئینجا بە بۆنەی جڵەوگیریی لە(تبذیر) و ماڵ بە بێ جێ سەرف کردن جڵەوگیریی ئەکات لە چرووکی و چنگ قوچراوی، کەواتە ئەوەی کە چاك رەوایە بریتی یە لە ناوەندی و میانەیی لە نێوان ئەو دووبارە ناڕەوادا، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾ دەستت مەگێڕە بە کۆت کراو بۆلای گەردنت ﴿وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ﴾ شۆڕ و بەرەڵاشی مەکە بە تەواوی بە جۆرێ هەرچیت هەیە ببەخشی ﴿فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا﴾ تا بەهۆی ئەوە بگەڕێ و ببێ بە کەسێکی لۆمەکراوی غەمبار، یان پەك کەوتووی لە خەڵکی بڕاوی بەجێماو. جڵەوگیریی و سەرەنجامەکەی بە شێوەی چیرۆك راگەیاند کە چیرۆك زۆر بەکارو بەهێزە لە گەیاندن و دامەزراندنی مەبەست دا. ئەوەتا چرووکی لە شێوەی کەسێك دا نیشان دا کە دەست کۆت کرابێ و بەسترابێ بە گەردنی یەوە، ئەوی تری نیشان دا لە شێوەی کەسێك دا کە دەست کراوە بێت و هیچ راگیر نەکات و بەرهەم و سەرەنجامەکەشی لە شێوەی دەستە پاچە و پەك کەوتوو بە وێنەی وڵاغێك کە لەبەر لاوازی و دەستەپاچەیی نەتوانێ بگەڕێ، دەی چرووك چرووکی یەکەی ئەیوەستێنێ، موسریفیش ئیسرافەکەی ئەیگێڕێ بە داماوێکی غەمبار، لە هەردوو بارەکەدا ئەو لۆمە کراوە ئینجا بەدوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ بەڕاستی پەروەردگارت رزق و رۆزی فراوان ئەکات بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ و کەم و تەنگ و کورتی ئەکات بۆ هەرکەس مەیلی ببێ، ئەوەش بە پێی زانین و بینینی خوایە وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا﴾ بەڕاستی هەمیشە ئاگا و بینایە بە بەندەکانی، کەواتە هەرچی ئەو کردبێتی و بیکات هەر ئەوە راست و رێك و رەوایە، ئەم قورئانە لە هەموو بارو رووبەکەوە رێ نیشاندەرە بۆ راست ترین رێگە.

هێندێ لە نەفامانی ئەو سەردەمە کچەکانیان ئەکوشت لە ترسی فەقیری و نەبوونی، جا لێرەدا زۆر جێی خۆیەتی جڵەوگیریی لەو کارە بەدە بهێنێ بە دوای ئایەتی پێشوودا کە فەرموی: زۆری و کەم و کورتی رۆزی هەیە بە مەیل و ئیرادەی خوایە، دیارە ئەو مەیل و ئیرادەش بەستراوە بە کردەوەی بەندەوە، کەواتە زۆری و کەم و کورِی رۆزی پەیوەندی نی یە بە زۆری و کەمی و جۆری ئەولادەوە، لەبەر ئەوە لێرەدا جڵەوگیریی ئەکات لەو کردەوە بەدە،

وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا (٣١) وَلَا
تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا (٣٢) وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن
قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا

---

**سەرزەنشت و بێزاری یەکی بەتینی ئاراستەی ئەو خاوەن کردەوانە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ﴾ رۆڵەکانتان مەکوژن لە ترسی فەقیری و بێ نەوایی ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ﴾ ئێمە رۆزی ئەوانیش و ئێوەش ئەدەین، کەواتە مەترسی فەقیری و نەبوونی یەکەتان ناڕاست و بێ جێ یە. بێجگە لەوەش ﴿إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا﴾ بەڕاستی کوشتنی ئەوانە گوناهو تاوانێکی گەورەیە، بەڵێ بەڕاستی زۆر گەورەیە و موچرکە بە لەش دا دێت لەبیر لێ کردنەوەشی چ جای کردنی. هەر بە قورئان ئەکەوێ بدوێ و فەرمودە بفەرموێ و هەر قورئان هەموو وتە و وشەیەکی لە جێی خۆیدایە و دەست نادات بۆ بژارە و دەست کاری، بۆ نموونە لێرەدا پێم خۆشە شتێك بخەمە بەرچاو: لێرەدا ئەفەرموێ: ئێمە رۆزی ئەوان و ئێوەیش ئەدەین. لە سورەتی(الأنعام) دا ئەفەرموێ: ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ﴾ ئێمە رۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین، هۆی ئەوەش ئەوەیە: لێرەدا ئەفەرموێ: مەیان کوژن لەبەر مەترسی نەبوونی و فەقیری کە دووچارتان ببێ بەهۆی ئەوانەوە، کەواتە پێش خستنی رۆزی ئەوان رێك ترە، واتە مەیان کوژن لەبەر ئەوەی لەوانەیە بەهۆی ئەوانەوە فەقیر ببن، چونکە ئێمە رۆزی ئەوان و ئێوە ئەدەین و غەمی ئەوەتان نەبێ. لە سورەتی(الأنعام) دا ئەفەرموێ: مەیان کوژن لەبەر فەقیری یەك کە هەتانە، چونکە ئێمە ئێوە و ئەوانیش رۆزی ئەدەین واتە غەمی فەقیریی یەکەی خۆتان نەبێ، هەموو پاکی و گەورەیی بۆ ئەو خوایە کە ئەم قورئانەی نارد. لەپاش جڵەوگیریی لە کوشتنی رۆڵە و ئەولاد، ئینجا جڵەوگیریی ئەکات لە داوێن و شەرواڵ پیسی کە ئەو کردەوە بەدە مایەی کوشتنی ئەولادە لە چەند بارو روویەکەوە:**

**١- ئەو کردەوە پیسە هۆی رشتن و زایە کردنی کەرەسەی ژیانە لە غەیری شوێنی خۆیدا، زۆرتریش ئەبێتە هۆی کوشتنی بێچوو و ئەو کەرەسەی کە ئەبێ بە بێچوو و منداڵ. ئەگەر نەکوژرێ و بیش مێنێ دووچاری ژیانێکی بەدو خراپ ئەبێ کە هەر ئەوەش جۆرێکە لە کوشتن، ئەو منداڵە سیاچارە کە لە دایك بوو توورِ ئەدرێتە کوڵان و**

شارەوانی بە بێ ناز و ڕێز بەخێوی ئەکات و ئەگەر ماو گەورە بوو لەناو گەل و کۆمەڵ دا بە غەریبی ژیان ئەباتە سەر بە بێ خزم و کەس و کار.

٢- ئەو کردەوە بەدە ئەگەر بەرگری نەکرێ ئەبێ بەهۆی کوشتنی گەل و کۆمەڵ، چونکە نەسەب و نەژاد نامێنێ، پەیوەندی نێوانیان نابێ و ئەپچڕێ، گومان و بێ باوەڕی پەیدا ئەبێ لە نامووس و ئەولاد و خێزان دا کە لە راستی دا ئەوە وەك کوشتن وایە بۆ گەل و کۆمەڵ.

٣- ئەو کردەوە بەدە ژیانی ژن و مێردی و ماڵ و خێزان نامێڵێ و ئەیگێڕێ بە مەبەستێکی دووەم، یەکەم و سەرەکی هەر بریتی ئەبێ لە بەجێ هێنانی ئەو ئارەزووە کاتی یە، بێگومان ماڵ و خێزانیش پەروەردگاری راستەقینەیە بۆ بێچوو و منداڵ، تێك دان و رووخاندنی ئەوە کوشتن و رووخاندنە بۆ گەل و کۆمەڵ.

ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ﴾ نزیکی زینا مەکەونەوە، قورئان جڵەوگیریی ئەکات لە نزیك کەوتنەوەی ئەو کارە بەدە چ جای کردنی، چونکە ئارەزووی ئەو کارە زۆر بەتینە و نزیك کەوتنەوەشی زۆر مایەی مەترسی یە لە دووچار بوون پێ ی، جا لەبەر ئەوە بە هەموو جۆرێ رێ ی لێ ئەگرێ و ئەو شتانەش کە ئەبێ بە هۆی قەدەغە کردن وەك تێکەڵ و پێکەڵی بە بێ ناچاریی، هەروەها کۆبوونەوەی پیاو و ئافرەتی بێگانە لە چۆڵی دا، هەروەها دەرخستنی زینەت و ئارایش کردن هان ئەدات لەسەر شوو کردن و ژن هێنان. هانی موسڵمانان ئەدات لەسەر ئاسان کردنی ژن هێنان و شوو کردن. تۆڵەی سەختی داناوە لەسەر ئەو کردەوە بەدە، هەروەها تۆڵەی سەختی داناوە لەسەر بوختان کردن و لەکەدار کردن بەو کردەوە پیسە مەگەر ئیسپات بکرێ بەو جۆرەی شەرع دایناوە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾ بەڕاستی ئەو کردەوە هەمیشە کردەوەیەکی زۆر ناشیرینە، ڕێگەیەکی زۆر بەدە، وەك ئاماژەمان کرد بۆ هۆی بەدی و خراپی یەکەی. ئینجا لەپاش جڵەوگیریی لە کوشتنی ئەولاد و داوێن پیسی کە ئەویش کوشتنە وەك باسمان کرد، لەپاش ئەوە جڵەوگیریی ئەکات لە کوشتن بە شێوەی گشتی مەگەر بە جۆرێ ئەو کوشتنە هەق و رەوا بێت وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ مەکوژن ئەو نەفسەی کە خوا کوشتنی حەرام کردووە و بە هیچ جۆر رەوای نەداوە مەگەر بە هەقیانەت و لەبەر هۆیەکی راست و رەوا. ئیسلام ئایینی ژیانە و ئایینی ئاشتی یە، کەواتە کوشتنی بەلاوە گوناهێکی گەورەیە و دێت بەدوای هاوبەش رەوادان دا، چونکە خوا خاوەن و بەخشندەی گیانە، هیچ کەس رێ ی نی یە بێجگە

له خوا نەیهێڵێ و لەناوی بەرێ مەگەر بە ئیزنی خوا و لە سنوورێك دا كە خوا نەخشەی كێشاوە، وەك لە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە كە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ئەفەرموێ: خوێنی هیچ موسڵمانێك كە شایەتومان بهێنێ حەڵاڵ نی یە مەگەر لەبەر یەكێ لەم سێ هۆیە:

١- كەسێكی بە ناهەق كوشتبێ.

٢- كەسێكی ژن هاوەر یان شووكردوو كە زینای كردبێ.

٣- كەسێك كە پاشگەز بووبێتەوە لە ئیسلام و لە كۆمەڵی موسڵمانان جیا بووبێتەوە، بێگومان چەند شتێكی تریش هەیە كە كوشتنی موسڵمانان رەوا ئەدات وەك كوشتنی كەسێك كە پەلامار بدات بە ناهەق موسڵمانێك بكوژێ و هەروەها چەند هۆیەكی تریش، كەواتە چاك وایە كورت هەڵهێنان لەم سیانەدا نەكەین بە كورت هەڵهێنانی حەقیقی بەڵكو ئیزافی بێت.

ئەو سێ هۆیە كە لە حەدیسەكەدا هاتووە شتێكی راست و رێكە. یەكەم قیساسە و هەق سەندنە كە دادپەروەری یە. دووەم بەرگری خراپەیە كە لە راستی دا كوشندەیە و هۆی كوشتنە لە چەند بارێكەوە، وەك باسمان كرد. سێ یەمیش بەرگری خراپەیەكی رۆحی و دەروونی یە و هۆی تێك چوون و فەوزایە لەناو گەل دا كە ئارامی و ئاشتی ناهێڵێ و دووچاری دووبەرەكی و تەفرەقەی ئەكات كە هۆی كوشتن و نەمانی ئاشتی یە. بەهۆی هەر هۆیەك كەباس كرا كوشتن رەوایە و خاوەن كوژراوەكە رێگەی هیچ شتێكی تری نی یە، چونكە كوشتنی ئەو كوژراوە هەق و رەوایە، بەڵام ئەگەر كوشتنی كوژراوەكە ناهەق بێت ئەوە خاوەن كوژراوەكە خاوەن مافە وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا﴾ هەركەسێك كوژرا بێت بە ناهەق و ستەم لێ كراوی ﴿ فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَـٰنًا﴾ ئەوا بڕیارمان داوە بۆ خاوەنەكەی دەسەڵات بەسەر بكوژەكەدا بە كوشتن یان بە خوێن لێ سەندن یان بە عەفوو و لێ بووردن. كام هەڵئەبژێرێ لەو سیانە بە ئارەزووی خۆی ئەگەر كوشتنە ناهەقەكە بە دەست قەست بووبێ، ئەگەر بە دەست قەست نەبووبێ ئەوا ماف یەكێ لەم دووانەی هەیە:(خوێن یان لێ بووردن)، ئیتر ئەو خاوەنە نزیك ترین خزم كە میرات بەر بێت و پیاویش بێت بەلای كوڕ و جەماوەرەوە، هێندێ لەسەر ئەوەن ئەگەر ئافرەت بێت هەر ئەو مافەی هەیە، ئەگەر خزم نەبوو ئەوا كاربەدەست و دەوڵەت خاوەن مافە. لەم مەسەلەیەدا با سەرنجی كتێبەكانی زانایان بدرێ. هێندێ ئەفەرمون: ئەو دەسەڵاتە هەر كوشتنە.

فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ
أَشُدَّهُۥ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ
ٱلْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾

---

ئەو مافەی کە دیاریی کراوە نابێ لیێ ی تێپەڕ بکرێ وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ﴾ ئینجا ئەو خاوەنە با زیادە ڕەوی نەکات لە کوشتن دا، بەم ڕەنگە کەسێکی تر بکوژێت لە باتی بکوژەکەدا، یان لەباتی کەسێك دا دوو یان چەند کەسێك بکوژێ وەك باو بووە لە سەردەمی نەفامی دا. یان بەمەی زیاد لە کوشتنی بکوژەکە لوت و گوێچکە و ئەندامیشی ببڕێ. یان شتێکی تر کە سەخت تر بێت لەوەی کوژراوەکەی خۆی پیێ کوژراوە. واتە بە هیچ جۆر زیادە ڕەوی نەکات ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾ بەڕاستی ئەو خاوەنە سەرخراو و یارمەتی دراوە لەلایەن خواوە بە ڕەوادانی ئەو هەق سەندنە، بە کۆمەکی کردنی دەوڵەتی ئیسلامی بۆی لەو تۆڵە و هەق سەندنەدا. هێندێ ئەفەرمون: ئەو یارمەتی دراوە بریتی یە لە کوژراوەکە کە لە دنیادا هەقی ئەسێنرێ و لە ڕۆژی دواییش دا ئەجرو پاداشتی هەیە، بەهەرحاڵ ئەو خاوەنە هەق نی یە زیادە ڕەوی بکات.

لەپاش جڵەوگیریی کردن لە ڕێز شکاندنی ناموس و نەفس، ئینجا جڵەوگیریی ئەکات لە شکاندنی ڕێزی ماڵی هەتیو بە تایبەتی، چونکە هەتیو داماو و لاوازە لە تەگبیری ماڵەکەی و بەرگری لیێ کردنی. کۆمەڵی موسڵمانان ئەکات بە لێپرسراو لە چاودێریی خۆی و ماڵەکەی هەتا ئەگاتە هێزو دەسەڵاتی خۆی، لێرەش دا وەك مەسەلەی داوێن پیسی توندی بەکار ئەهێنێ و جڵەوگیریی ئەکات لە نزیك کەوتنەوەی ماڵی هەتیو بە ناهەق چ جای خواردن و زایەکردنی، ئەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە بە هیچ جۆر و لە هیچ بارو ڕوویەکەوە مەگەر بە جۆر و شێوەیەك کە چاکتر و جوانترە کە بریتی یە لە پاراستن و بەرهەم هێنانی، ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ ئیتر بە هیچ جۆرێ نزیکی مەکەونەوە هەتا ئەو هەتیوە ئەگاتە کەماڵی ژیریی و لێزانی بە جۆرێك بتوانێ هەڵسێ بە بەرژەوەندی ماڵەکەی. لەبەر ئەوەی چاودێریی و سەرپەرشتی ماڵی هەتیو یەکێکە لەو شتانەی کە لەسەر

شانی گەل و کۆمەڵە و پەیمانە لەسەری و ئەبێ هەڵسێ پێی. لەبەر ئەوەو بە بۆنەی ئەوەوە ئەم فەرمانە ئەهێنێ بەدوای دا، فەرمان بە هەڵسان بە عەهد و پەیمان بە شێوەی گشتی و ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ﴾ هەڵسن بە عەهد و پەیمانێك كە لە گەردنتاندایە و بە رێكی بەجێی بێنن و رەفتاری پێ بکەن، ئیتر عەهد و پەیمانی خوا كە لەسەرتانە یان عەهد و پەیمانی خەڵکی، عەهد و پەیمان لەگەڵ یەکە یەکەیان لەگەڵ کۆمەڵ، عەهد و پەیمان لەگەڵ دەوڵەت و کاربەدەست یان لەگەڵ رەعیەت و ژێر دەستە. لە سورەتی(الأنعام) دا بە درێژیی ئەم باسەمان کرد با سەرنج بدرێ. هەڵسان بە عەهد و پەیمان بەڵگە و نیشانەیە لەسەر دەروون پاکی و دامەزراوی و رێك و راستی مەردوم. هۆی ئارامی و دڵنیایی و بێ باکی یە لە نێوان گەل و ئەندامی گەل دا، لەبەر ئەوە ئیسلام زۆر بە گرنگ گرتوویەتی و بە توندی فەرمانی پێداوە، جا لەبەر ئەوە موسڵمانان هەنگاوی زۆر بەرزیان ناوە لەو بارەیەوە كە مێژووی ئادەمی نەیدیتووە لە ژێر سایەی ئیسلام دا نەبێ.

ئینجا فەرمانەکە بەهێز تر ئەکات كە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾ بەڕاستی عەهد و پەیمان پرسیار لێ کراوە و لە بڕیار و ئایینی خوادا بەو جۆرە هاتووە. ئینجا لە فەرمان دان بە هەڵسان بە عەهد و پەیمانەوە ئەڕوات بۆ فەرماندان بە رێك و پێکی کێشان و پێوان كە ئەوەش بەشێکە لە سپاردە كە پەیمانی لەسەرە، ئەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ تَقْرَبُوا﴾ پێوان بە تێرو تەواوی بەجێ بێنن كاتێ كە پێوان ئەکەن بۆ خەڵکی و شتیان پێ ئەفرۆشن ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ تَقْرَبُوا﴾ کێشان بکەن بە تەرازوویەکی راست، واتە كاتێ شت ئەفرۆشن بە پێوان یان بە کێشان بە رێك و راستی پێوان و کێشانەکە بکەن بە بێ مەن گۆڕی و تەرازوو بازی ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ ئەو رێك و راستی پێوان و کێشانە چاکە لە دنیادا، چونکە هۆی روون کردن و مەیلی خەڵکی یە بۆ کڕین و فرۆشتن و مامەڵەی زۆر لەگەڵ ئەوانەی كە راستن لە پێوان و کێشان دا، مایەی وەسف و سەناو ناوبانگی چاکە بۆیان، هەرچۆنێ چاکە و شیرینە لە دوا رۆژدا. چونکە مایەی رەزامەندی خوا و ئەجرو پاداشتی رۆژی دوایی یە. فەرمانەکەی بەست بە كاتی پێوان و کێشانەکەوە، چونکە مەن گۆڕی و تەرازوو بازی ئەو كاتە روو ئەدا، باسی ئەو كاتەی نەکرد كە شت بە پێوان و کێشان ئەکڕن لە خەڵکی، چونکە خەڵکی بە سروشت بۆ خۆیان باشی تێ ئەگەن و پێویست بە گوتن ناكات.

ئەو ڕێك و ڕاستی یە لە پێوان و کێشان دا ئەمانەت و سپاردەیە لە گەردن دا لە کاتی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەدا، مایەی پاکی دڵە لە مامەڵەی گەل و کۆمەڵ دا، هۆی باوەڕ و دڵنیایی نێوانیانە، خۆشی و فەڕی ژیانیش بەوە تەواو ئەبێ هەرچۆنێ مەن گۆڕی و تەرازوو بازی و ناپاکی لە مامەڵەدا شتێکی بەدو قیزەونە و بە سروشت پێویستە خەڵکی خۆیانی لێ پاك بکەنەوە و خۆیانی لێ بە دوور بگرن لەبەر ئەوە قورئان ئەو ڕاستی و پاکی مامەڵە یەی بە گرنگ گرت و بە تایبەتی فەرمانی پێدا، بێگومان هەر کارێکی خێرو چاك کاتێ بە عەقیدە و فەرمانبەری خوا بکرێ زۆر جیاوازە لەوەی کە بە ئارەزوو و سروشت و پیاوەتی بەجێ بهێنرێ، چونکە مەبەستەکە بەجێ ئەهێنێ و زیاد لەوەش چاوەڕوانی ئاسۆی بەرزتر لەم زەوی یەی لەگەڵ دایە.

ئینجا لە چەند وتەیەکی کورت دا بەرنامەیەکی تێرو تەواو دائەنێ بۆ دڵ و بۆ ژیریی، ئەو بەرنامەی زانین و زانیاری یە تازە ئەگرێتەوە کە ئادەمی ڕۆی پێ برد لەم چەرخ و سەردەمە تازەدا، زیاد لەوەش ڕێك و ڕاستی دڵ و چاودێری خوایشی ئەخاتە پاڵ، کە هەر لە ئیسلام دا ئەوە هەیە و لە بەرنامەی ژیریی یەکانی تردا نی یە، بێجگە لەوەش ئەو ئەمانەت و سپاردەیە کە لە گەردنی دڵ و ژیریی و ئەندامەکانی ئادەمی دایە ئەیخاتە بەرچاو، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾ مەکەوە شوێنی شتێ کە نایزانی و زانینت پێی نی یە دڵ ئارام نیت لەسەری، واتە لە خۆتەوە و کوێرانە و بە بێ بەڵگە مەکەوە شوێنی هیچ بیرو باوەڕ و وتار و کردار و بڕیارێك. بەڕاستی ئەمە بەرنامەیەکی زۆر ڕێك و ڕاست و گرنگە هەرکاتێ پەیڕەوی بکرێ هیچ هەڵەیەك ڕوو نادات، نە لە بارەی بیرو باوەڕ و عەقیدەوە، نە لە بارەی حوکم و بڕیارەوە. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، کە چەندەها بڕیار کە بە پێی ڕوکەش و ڕواڵەت ئەدرێن و هیچ کام زانینی تەواو نی یە پێی، بۆ نموونە: بڕیار دانی پاکی یان حەڵاڵی لەسەر لەسەر هەر شتێك کە بە پێی ڕووکەش و ڕواڵەت ئەو بڕیارە ئەدرێ، هەروەها هەر بڕیارێك کە بە پێی(إجتهاد) بدرێ کە هەرکام لەوانە زانینیان لەگەڵ دا نی یە،

لەگەڵ ئەوەدا ئەو بڕیارانە و ڕەفتار کردن پێ یان ڕاست و دروستە؟ لە وەڵام دا دەڵێین: ئەوەی کە قەدەغەیە و جڵەوگیریی لێ کراوە شوێن کەوتنێکی کوێرانەیە بە بێ بەڵگە و نیشانە، وەك دەست نیشانمان بۆ کرد، دەی ئەو بڕیار و کردەوانەی کە لە پرسیارەکەدا باس کران هەموو بەڵگە و نیشانەیان لەگەڵە و شەرع ئیزنی داوە بە بڕیار لەسەردان و ڕەفتار پێ کردنیان. ئەو ئیزنی شەرعە بەڵگە و نیشانەیە و شوێن کەوتنی ئەوانە کوێرانە نی یە، بەڵکو بەڵگە لەسەریان هەیە کە ئیزنەکەی شەرعە. شەرع ئیزنی داوە کە بە پێی ڕووکەش و ڕواڵەت بدرێ. شەرع ئیزنی داوە کە بە(اجتهاد) ڕەفتار بکرێ. بەهۆی ئەو ئیزنی شەرعەوە ئەو شتە ئەبێ بە زانراو. بەڕاستی ئەم وەڵامە زۆر ڕێك و پەسەندە و بێ گرێ یە و پێویست نی یە بەو وەڵامانەی تر کە لە تەفسیرەکان دا باس کراون، زانینی ڕاست هەر لای خوایە. خوای میهرەبان هۆی ناسین و زانینی بەخشیوە بە بەندەکانی وەك هێزی بیستن و بینین و ژیریی، کەواتە ئەتوانێ ئەو هۆیانە بەکار بێنێ تا دووچاری هەڵە نەبێ و هەرکات بەو جۆرەی نەکرد تاوانبار و بەرپرسیارە لەوانە، بەڵکو هەر خوودی هۆیەکان بەرپرسیارن وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا﴾ بەڕاستی گوێچکە و هێزی بیستن و بینایی و هێزی بینین و دڵ و هێزی ژیریی یە، هەموو ئەوانە پرسیار لێ کراون کە ئایا خاوەنەکەت بەکاری هێناى لە شتێك دا کە بۆی دروست کراوی، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە خاوەنەکانیان پرسیار لێ کراون کە ئایا ئەم ئەندامانەت لە چیدا بەکار هێنا.

ئینجا کۆتایی ئەو فەرمان و جڵەوگیریی یانە کە پەیوەندی یان هەیە بە باوەڕی تاك و تەنیایی خواوە کۆتایی یان ئەهێنێ بە جڵەوگیریی لە کەشخە و خۆ بەزل زانی و لە خۆگۆڕان، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًا﴾ مەگەڕێ لە زەوی دا بە کەشخە و شانازی یەوە. مەردوم هەرکاتێ دڵی بۆش و خاڵی بێت لە هەست کردن بە خوا کە هەموو کاروبارێك هەر بە دەست ئەوە و بەندە هەر بەهرەیەکی هەبێ خوا پێی داوە، هەرکاتێ ئاوا لە خۆگۆڕا و بێت و کەشخە و شانازی و لە خۆگۆڕان داگیری ئەکات. بەڵام ئەگەر خۆی ناسی و زانی کە هەموو کارەکانی بەدەست خوایە، ئەو کاتە خۆی لێ ناگۆڕێ و سەری بەندەیی دائەخات بۆ خوای خۆی.

إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾
ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾
أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا
ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾

---

جا قورئان لێرەدا ئەو بەندە نەفامە ئەباتەوە بە خۆی دا و تێی ئەگەیەنێ کە دەستە پاچە و بێ نرخە و بەشێوەی لاقرتی پێ کردنی پێی ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ﴾ بەڕاستی هەرگیز تۆ زەوی کون ناکەیت ﴿وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ هەرگیز ناگەیتە شاخەکان لە درێژیی دا، واتە کەشخە و خۆ بەزل زانی یەکەت زۆر ناڕاست و بێ جێ یە و هیچ سوودێکی لێ وەرناگیرێ، کەواتە خۆت بناسە و لە خۆت مەگۆڕێ. کەشخە و خۆ بەزل زانی یان بەهۆی هێز و دەسەڵاتی زۆرە یان بەهۆی گەورەیی و درێژیی و قەبارەی لەشە، دەی تۆ هیچ کامت نی یە، لەسەر هەر بار بەڕاستی لاقرتی پێ کردنەکە زۆر بەتین و دڵ تەزێنە، ئەو کەسەی کە فیز و کەشخە ئەکات و خۆی بەزل ئەزانێ خوا نایەوێ، چونکە سپڵە و لەخۆگۆڕاوە و خەڵکیش نایەوێ، چونکە بافیش ئەکاتە خۆی بە نەفامی. ئینجا کۆتایی فەرمان و جڵەوگیریی یەکان ئەهێنێ کە زۆربەیان جڵەوگیریی یە لە کردەوە و سیفەتە بەدەکان، کۆتایی یان ئەهێنێ بە جاڕی نەویستن و بێزاری خوا لێ یان و ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ هەموو ئەوەی کە گوترا بە دوو خراپەکەی لای پەروەردگارت بێزراوە، کەواتە هۆی جڵەوگیریی یەکان ئەو نەویستن و بێزاری خوایە.

تێبینی یەك لە فەرمان و جڵەوگیریی یەکان دا:

هەرکام داوا کرابێ لە هەموو کەسێك بە تایبەتی بە وتەی تاك و فەرمان و جڵەوگیریی یەکە هاتووە، هەرکام پەیوەندی بە گەل و کۆمەڵەوە بێت وتەی فەرمان و جڵەوگیریی یەکە بە

وتەی کۆ هاتووە. لە یەکەم جارەوە فەرمان و جڵەوگیریی یەکانی پەیوەست کرد بە خوا و بیر و باوەڕی تاك و تەنیایی خواو دوور کەوتنەوە لە بیرو باوەڕی هاوبەش ڕەوادان، ئینجا ئەوە دووبارە ئەکاتەوە لە کۆتایی دا و ئەفەرموێ: ئەوە هێندێکە لەو لێزانی و کار دروستی یەی کە خوا وەحی کرد بۆلای پێغەمبەری ئازیز لەم قورئانەدا، ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەم هەژدە ئایەتەی کە دەست پێ ئەکات بە ﴿لا تجعل مع الله إلها آخر﴾ تا ئێرە وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ: لەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت وەحی کرد بۆ لات، واتە ئەو بڕیارانەی کە لە هەموو شەریعەتەکان دا هاتووە و دەست نادەن بۆ سڕینەوە و هەموو ژیریی یەك وەریان ئەگرێ. ئینجا هەرچۆنێ لە یەکەم جار و سەرەتاوە دەستی پێکرد بە جڵەوگیریی لە ڕەوادانی هاوبەش بۆ خوا، هەروەها کۆتایی ئەو ئایەتەش ئەهێنێ بەو جڵەوگیریی یە، چونکە باوەڕی تاك و تەنیایی خوا سەری هەموو حیکمەتێکە و مایەی دەست کەوتنی هەموو خێرێکە، ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ هیچ خواو پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا بڕیار مەدە ﴿فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدۡحُورًا﴾ تا بەهۆی ئەوەوە توور بدرێیتە ناو دۆزەخ بە لۆمە کراوێکی دوور خراوە لە میهرەبانی خوا. لە یەکەم جارەوە سەرەنجامی هاوبەش ڕەوادانەکەی کرد بە تۆڵەیەکی دنیایی، لێرەدا ئەیگێڕێ بە تۆڵە و سەرەنجامی ڕۆژی دوایی، کەواتە دوارۆژ و سەرەنجام زیانباری هەردوو دنیایە لە یەکەم جارەوە دووچاری سزا و تۆڵەی یەکەم ئەبێ. خوا بە میهرەبانی خۆی بمانپارێزێ لە خەشم و نارەزایی خۆی. لە ئایەتەکانی رابوردوودا هاوبەش ڕەوادانی پووچەڵ کرد و بێزاری دەربڕی لەو باوەڕە پووچەڵە، ئینجا لێرەدا باوەڕی ڕەوا دانی ئەولاد پووچەڵ ئەکات و بێزاری لێ دەرئەبڕێ کە ئەو باوەڕە بەدە لە سەرەمی نەفامی دا باو بووە بە شێوەیەکی زۆر بەد و ناشیرین کە بۆ خۆیان پێی نارازی بوون و بێزاری یان لێ دەرئەبڕی، ئەو نەفامانە مەلائیکەیان دائەنا بە کچی خوا و خۆیان نیگەران ئەبوون کاتێ کچیان ببوایە، ئەفەرموێ: ﴿ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا﴾ ئینجا ئایا پەروەردگارتان ئێوەی هەڵبژاردووە و

تایبەتی کردوون بە کوڕان و کیژاویەتی بۆ خۆی لە مەلائیکە ئافرەتان و کردوونی بە کچ بۆ خۆی؟ واتە نەخێر باوەڕ و بڕیارەکەتان زۆر بەد و ناڕەوایە، تاوان و بێ باوەڕی یەکەتان لە دووبارەوەیە:

١- گێڕانی مەلائیکە بە مێینە و ئافرەت.

٢- گێڕانیان بە کچی خوا لە کاتێك دا خۆیان بێزار و ناڕازی بوون بەوەی کچیان هەبێ.

ئەو شێوە پرسیارە لەلایەکەوە بۆ بێزاری دەربڕینە لەلایەن خواوە دەربارەی ئەو نەفامانە، لە هەمان کات دا ریسوا و بێ ئابڕوویان ئەکات و لاقرتی یان پێ ئەکات بەمەی کە ماتووڵ کوڕ و کچ خوا ئەیان دا ئیتر ئەبێ چۆن بێ نرخەکەیان بۆ خۆی دابنێ؟ بەڕاستی وتە و باوەڕێکی زۆر پەست و بەدە لەبەر ئەوە بەم شێوە سەختە بەرپەرچیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ پێ یان: ﴿إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾ بەڕاستی و بێگومان ئێوە وتەیەکی زۆر گەورە ئەڵێن، زۆر گەورەیە لە ناڕاستی و ناشیرینی دا، زۆر گەورەیە لە بێ شەرمی و بێ حەیایی دا، زۆر گەورەیە لە درۆ و دەست هەڵبەست کردن دا. بەڕاستی بەسە لە لەکەدار کردن و ئابڕوو بردن دا. خوای میهرەبان مەسەلەی تاك و تەنیایی خۆی و پاك و بێگەردی یەکەی لە هەموو وێنە و هاوسەر و رۆڵە، لە چەند شوێنێك لە قورئان دا ئەهێنێ و بە چەند جۆر و شێوەیەك روونی ئەکاتەوە تا ئەو نەفامانە بیرێك بکەنەوە و واز بێنن لە نەفامی یەکەیان. لەگەڵ ئەوەدا زۆربەیان زیاتر یاخی ئەبن وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِيَذَّكَّرُوا﴾ سوێند بەخوا ئەم مەبەستەمان بە چەند جۆر و شێوەیەك هێناوە لەم قورئانەدا، بۆ ئەوەی ئەوانە بیر بکەنەوە و ئامۆژگاری وەرگرن ﴿وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ ئەو باسە جۆر بەجۆرانە ئەوانە زیاد ناکات بێجگە لە تارین و دوور کەوتنەوە لەو شتە راستە و روو وەرگێڕانیان لەو گوێرەی بۆچوون و تێگەیشتنی ئەوان لەگەڵیان کۆڵی یەوە و باوەڕەکەیان بە ناڕاست و ناڕەوا دەرکرد. هەروەها جارێکی تریش بەو جۆرە لەگەڵیان ئەدوێ لە مەسەلەی رەوادانی پەرستراو و بتەکان دا.

﴿قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ٤٢ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ٤٣ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿قُل﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ﴿لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ﴾ ئەگەر لە مەرجێك دا لەگەڵ خوادا پەرستراوان ببوایە وەك ئەو نەفامانە ئەڵێن و ئەو لافە ناڕەوا لێ ئەدەن ﴿إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ ئەو كاتە داوایان ئەكرد و بە دوای ڕێگایەك دا ئەگەڕان بۆلای خاوەنی عەرش كە خوای تاك و تەنیایە، بۆیە بەر بەرەكانی و مل ملانێ یان لەگەڵ ئەكرد بە پێی باوی پادشاكانی دنیا. دیارە ئەوەش ئەبوو بەهۆی نەمان و تێك چوونی ئەم بوونەوەرە. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست ئەوەیە ڕێگایەكیان ئەدایە بەر بۆلای نزیك كەوتنەوە لێ ی و گوێ ڕایەڵ كردن بۆی، چونكە باش ئەیان ناسی و ئاگادار ئەبوون بە دەسەڵات و گەورەیی یەكەی. بەم جۆرەش هەر ئەگونجێ بەڵام زۆر لە زاناكان باری یەكەمیان هەڵبژاردووە.

لەسەر هەر بار بەرامبەر ئەو باوەڕە ناڕاستەی ئەوان ئەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا﴾ واتە خوا پاك و بێگەردە و بەرز و بڵندە لەوەی كە ئەو نەفامانە ئەیڵێن دەربارەی خوا بە بەرز و بڵندی یەكی زۆر گەورە. ئینجا هەموو بوونەوەر نیشان ئەدات بە شایەت لەسەر ئەو پاكی و بێگەردی یە، ئەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ﴾ حەوت ئاسمانەكە و زەوی و هەركەس وا لەناوی یان دا خوا بە پاك و بێ لەكە ڕائەگرن و دای ئەنێن و تەسبیح و یادی ئەكەن و ناوی ئەبەن. بەڕاستی دڵ و دەروونی وریا بەم فەرمودەیە ئەكەوێتە لەرزە و سام و بیم ئەیگرێ. چۆن وای بەسەر نەیەت كاتێ بیر بكاتەوە لەم بوونەوەرە گەورە و پان و فراوانە كە بێجگە لە خوا هیچ كەس نازانێ و خەیاڵیشی پێدا ناكات بە ئەندازەی ئەو گەورەیی و گرنگی یە. ئەم بوونەوەرە بەجارێ و یەكسەر تەسبیح و یادی خوای خۆی دەكات و بەندەیی خۆی پێشكەش دەكات!!

وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾

﴿وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ﴾ هیچ شتێك نی یه مه‌گه‌ر ته‌سبیحی خوا ئه‌كات به سوپاسی یه‌وه،(سدی) ئه‌فه‌رموێ: مه‌گه‌ر ئه‌ڵێ: ﴿سبحان الله و بحمده﴾ ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ﴾ به‌ڵام ئێوه نازانن و تێ ناگه‌ن له ته‌سبیحه‌كه‌یان. ئه‌م باسی ته‌سبیحی هه‌موو شتێ له چه‌ند جێگایه‌ك دا هێناومه له‌مه‌وپێش و پێم خۆشه لێره‌ش دا هێندێ لێ دوان و لێكۆڵینه‌وه بكه‌م: بێگومان ته‌سبیح كردنی هه‌موو شتێ به تێكرایی و به زمانی حاڵ و ده‌ست نیشان كردنی نابێ جێگای لێكۆڵینه‌وه و قسه و باس بێت بۆ هیچ باوه‌ڕدارێك، هه‌موو باوه‌ڕدارێك ئه‌زانێ ئه‌م بوونه‌وه‌ره گرنگه به‌هه‌موو به‌ش و پارچه‌كانی یه‌وه به‌ڵگه و نیشانه‌یه‌كی روونه له‌سه‌ر بوون و تاك و ته‌نیایی خوا. به‌ڵام دووبه‌ره‌كی هه‌یه ئایا هه‌موو شتێ به گوتنیش ته‌سبیح و سه‌نای هه‌یه و هه‌موو بێ زمانه‌كانیش زمان و وتنی تایبه‌تی خۆیان هه‌یه و به‌و زمان و وتنه ته‌سبیح و باسی خوا خۆیان ئه‌كه‌ن؟ گه‌لێك له زانایان له‌سه‌ر ئه‌وه‌ن كه شتی گیانله‌به‌ر و بێ گیان به وته و زمانی تایبه‌تی خۆی ته‌سبیح و یاد و باسی خوا ئه‌كات بێجگه له بێ باوه‌ڕانی جنۆكه و ئاده‌می. رووكه‌ش و رواڵه‌تی ئایه‌ت و حه‌دیس قوڵ گیری ئه‌م رایه‌یه، و بێگومان له رۆژی دوایی دا زۆر شتی بێ زمان شایه‌تی ئه‌ده‌ن ده‌ی ئه‌و تایبه‌تی نه‌كرێت به‌و رۆژه‌وه و با باوه‌ڕ وابێ لێره‌ش و له‌م دنیادا ئه‌و گوتن و زمانه تایبه‌تی یه هه‌ر هه‌بێ. هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر فه‌رموده‌ی: ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ﴾ هه‌ر ئاراسته‌ی بڕواداران كرابێ به‌ڵگه‌یه‌كی روونه له‌سه‌ر ئه‌و گوتن و قسه كردنه، چونكه بڕواداران تێ ئه‌گه‌ن له زمان حاڵ و ده‌ست نیشانی هه‌موو شتێ. له‌سه‌ر هه‌ر بار كۆتایی ئایه‌ته ئه‌مێنێ به‌م فه‌رموده‌یه: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾ به‌ڕاستی خوا هه‌میشه په‌له نه‌كه‌ره له تۆڵه‌سه‌ندن دا، داشارده‌ر و سڕه‌وه‌ی گوناهه. واته بوونه‌وه‌ر و هه‌موو شتێ ته‌سبیحی خوا ئه‌كات، له‌ناو ئه‌و هه‌موو دروست كراوانه‌دا ئاده‌می و جن كه موكه‌له‌فیش باشتر ئه‌بوو سوپاس گوزاری گوێ ڕایه‌ڵ بوونایه، كه‌چی به پێچه‌وانه‌وه ئه‌و هه‌موو تاوان و خراپه‌كاریی و بێ بڕوایی یه له‌وانه‌وه په‌یدا ئه‌بێ، كه‌واته ئه‌گه‌ر خوا ئه‌و دوو سیفه‌ته‌ی نه‌بووایه ئه‌بوو به خێرایی سزا و تۆڵه‌ی بدانایه، به‌ڵام به‌هۆی ئه‌و دوو سیفه‌ته‌وه مۆڵه‌تیان ئه‌دات و ئامۆژگاری یان ئه‌كات و ئه‌یانترسێنێ و له زۆر تاوان و گوناهه‌كانیشیان ئه‌بووری.

وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا
عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِمْ
نُفُورًا ﴿٤٦﴾

گەورەکانی قورەیش گوێ یان ئەگرت لەم قورئانە، بەڵام بە هەموو جۆر هەوڵیان ئەدا کە دڵیان نەرم نەبێ و کاریان لێ نەکات بەهۆی ئەوەوە خواش قاری لێ گرتن و دڵی مۆر کردن و وەك پەردەیەك بەسەر دڵ و گوێچکەیانەوە بێت بەهۆی ئەوەوە سوودیان وەرنەگرت لە رووناکی و رێنموونی ئەم قورئانە، وەك دەست نیشان ئەکات بەم چیرۆکە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا﴾ ئەی پێغەمبەر کاتێ تۆ قورئان دەخوێنی بەسەریان دا ئەگێڕین لەنێوان تۆ و ئەوان دا کە باوەڕیان نی یە و باوەڕ ناهێنن بە رۆژی دوایی، دەگێڕین لە نێوان تۆ و ئەوان دا پەردە و بەرگری کەرێکی داشاردەر و داپۆشەر. یان داشاردراو کە بە چاو نابینرێ. واتە بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوە کارێکی وایان بەسەر دێنین کە تۆ نەناسن و هەست نەکەن بەو بەڵگە و نیشانانەی کە لە تۆدا هەیە و راستی پێغەمبەری تۆ روون ئەکەنەوە. ﴿وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ﴾ ئەگێڕین بەسەر دڵەکانیانەوە چەند پەردەیەکی زۆر ئەستوور بۆ ئەوەی تێ ی نەگەن و وەری نەگرن ﴿وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ ئەگێڕین لە گوێچکەکانیان دا کەڕی و گوێ گرانی یەکی بەتین و گەورە کە بەرگری یان بکات لە بیستنێ کە سوودیان پێ بگەیەنێ.(ئیبن و ئیسحاق) لە سیرەتەکەی دا هەواڵێ ئەهێنێ کە کۆمەڵێ لەو سەرۆکانە و هەرکەس لەماڵی خۆیەوە دێت بۆ ئەوەی گوێ بگرێ لەو قورئانەی کە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لەناو نوێژدا دەیخوێند لەماڵی خۆی دا، هەرکام لەوانە لە شوێنێك دا دائەنیشێ بە بێ ئەوەی ئەوی تریان ئاگای لێ بێ، شەو تا بەیانی دائەنیشن و گوێ ی لێ ئەگرن و هەرکام دەڕۆنەوە بۆ شوێنێ خۆیان و لە رێگەدا ئەگەن بە یەك ئینجا ئەکەونە لۆمەی یەکتر و دەڵێن: جارێکی تر کاری وا نەکەن، ئەگەر گەنج و نەفامەکان شتی واتان لێ ببیستن دەکەونە گومان لە ئایینەکەیان دا. ئینجا خۆیان پێ ناگیرێ لە شەوی دووەمیش دا هەمان کار دەکەنەوە و هەمان قسە و بڕیار دەدەن بۆ شەوی سێ یەمیش دەردەچن و هەمان کار دەکەن، ئینجا لەم شەوی دوایی دا پەیمان دەدەن کە

جارێکی تر ئەو کارە نەکەن، ئینجا لە بەیانی دا(ئەخنەسی کوڕی شورەیف) دەچێ بۆ ماڵی ئەبو سوفیان و پێی دەڵێ: پێم بڵێ: رای تۆ چی یە دەربارەی ئەوەی کە بیستت لە محمد؟ ئەویش دەڵێ: بەڕاستی هێندێ شتم ئەبیست تێی ئەگەیشتم و ئەمزانی مەبەستت چی یە، هێندێکم دەبیست تێی نەئەگەیشتم و نەم دەزانی مەبەستی چی یە.(ئەخنەس) یش دەڵێ: بەڕاستی منیش هەروا بووم، ئینجا لای هەڵدەستێ و دەچێ بۆ ماڵی(ئەبو جەهل) و هەمان پرسیار لەویش دەکات، ئەویش دەڵێ: ئایا چیم لێ بیستووە؟ ئێمە و خێڵی عەبدولمەناف بەربەرەکانیمان هەر بووە لە شەرەف و پیاوەتی دا. میوانداری خەڵکی یان کرد و ئێمەش کردمان، ولاغی سواریان دا بە خەڵکی ئێمەش دامان، دەست گیرۆیی و بەخشینیان کرد ئێمەش کردمان، تا رێك وەك ئەوانمان لێ هات. ئینجا ئێستا ئەوان دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرێکمان هەیە کە لە ئاسمانەوە هەواڵ و وەحی بۆ دێت. دەی کەی ئێمە ئەگەینە ئەوە؟ سوێند بەخوا هەرگیز بڕوای پێ ناهێنین. ئینجا(ئەخنەس) هەڵدەستێ و بەجێی دێڵێ.

ئەو گەلە بەو جۆرە قورئان کاری ئەکرد لە سروشتیان، بەلام ئەوان بەرگریان ئەکرد و خۆیان لێ ئەتاراند! ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو ئەو بیر و باوەڕی تاك و تەنیایی یەی کە بۆیان هات ئەو پایە و پلەی کۆمەلایەتی و ئابووری یەی کە بە ناڕەوا بۆیان فەراهەم هاتبوو نەدەما، گەورەیی و فیز و خۆ بەزل زانی یەکەیان تێدا دەچوو لەبەر ئەوە دەتاران و بێزار بوون لەم قورئانە. وەك دەست نیشان ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ﴾ کاتێ کە باسی پەروەردگارت دەکەیت لە قورئان دا بە تاك وتەنیا و ئەڵێیت ﴿لا إله إلا الله﴾ ﴿وَلَّوْا عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا﴾ پاشەڵپاش وەرئەگەڕێنەوە لەبەر بێزاری یان لە وتەی تاك و تەنیایی خوا، کە ئەدا لە بەرژەوەندی و پایە و پلەی دنیایی یان، ئەگینا ئەو سەرۆکانە ئەوەندە نەفام و کەودەن نەبوون، نەزانن بە پڕوپووچی ئاینی و باوەڕەکەیان و راست و رێکی ئیسلام، ئەوانە ئەوەبوون کە خۆیان بۆ نەئەگیرا و ئەچوون بە سەرسامی یەوە گوێ یان لە قورئانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگرت، وەك لەو ریوایەتەدا باسمان کرد، و بێ ئاگا نەبوون لە دەسەلات و گەورەیی و کار کردنەکەی قورئان، لەبەر ئەوە بە هەموو جۆر بەرگری یان ئەکرد و ئەیان ویست خەڵکی گوێی لێ نەگرێ و نەیبیستێ! ئەو گەورە و سەرۆکانە سروشتەکەیان پاڵی پێوە ئەنان بۆ گوێ گرتن و باوەڕهێنان،

نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا
مَّسۡحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾

خۆ بەزل زانی و مەترسی نەمانی پلە و پایەیان بەرگری ئەکردن لە مل کەچی و باوەڕ هێنانیان ئەبەر ئەوە هەردەمە بە جۆرێ پێغەمبەری ئازیزیان(ﷺ) لەکەدار ئەکرد تا ئەوە بکەن بە بیانوو و بەرگری کەر بۆ سەرپێچی و باوەڕ نەهێنانیان وەك لەم ئایەتی داهاتووەدا دەست نیشان ئەکات بۆ هێندێ لەو لەکە و بیانووانە و لەسەرەتاوە ئەم هەڕەشەیان ئاراستە ئەکات و ئەفەرموێ: ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ﴾ ئێمە باش ئەزانین و زاناترین بەو بار و شێوەی کە ئەوانە گوێی پێ ئەگرن ﴿إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ﴾ کاتێ کە گوێ ئەگرن لە تۆ ئەی پێغەمبەر، واتە بە شێوەی لاقرتی و تەشەر دان گوێ ئەگرن لێت کاتێ قورئان ئەخوێنی ﴿وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ﴾ زانا ترین بەوەی ئەوانە بە نهێنی ئەیلێن لە نێوانی خۆیان دا دەربارەی تۆ و قورئان ﴿إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا﴾ ئەو کاتەی کە بێ باوەڕە ستەمکارەکان ئەلێن: ئێوە هەر شوێنی پیاوێکی جادو لێ کراو ئەکەون بەهۆی ئەوەوە شێت بووە، یان پیاوێکی جادو بازە کە بە جادو خەلکی ئەخەلەتێنێ، واتە ئەگەر ئێوە شوێنی محمد بکەون شوێنی پیاوێکی بەو جۆرە دەکەون. هەر لە وتەکەیانەوە دەرئەکەوێ کە قورئان دایچلەکاندوون و کاری لێ کردوون بەجۆرێ بە وتە و وتارێکی ئاسایی یان دانەناوە، ئەشگونجابارەراستەقینەکەبلێن و بەوەحی و فەرمودەی خوای دابنێن، کەواتە ئەبێ بلێن: جادووە ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ سەرنج بدە بە سەرسوڕمانەوە چۆن ئەوانە چەند وێنە و سیفەتی جۆر بە جۆرت بۆ باس ئەکەن و کردوویانە: جادو بازە، شاعیرە، کاهینە، شێتە... ﴿فَضَلُّواْ﴾ ئینجا لە هەموو ئەوانەدا گومڕا بوون ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا﴾ کەواتە دەسەلات و توانای ڕێگایەکیان نی یە بۆ لەکەدار کردنی تۆ کە لێ یان ببیستری و لێ یان وەرگیرێ، کەواتە بە سەرگەردانی ئەمێننەوە، بە وێنەی ئەوانەی کە لە چۆل و بیابانێك دا بن بە بێ ڕێگە و نیشانەی ڕزگار بوون، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بە ون بوونە لە ڕێگای هەق

وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا ﴿٤٩﴾ ۞ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ
خَلۡقًا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ
رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ
بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾

---

**ئەوەبوو قسەو باسیان لەبارەی قورئان، و لەبارەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەکاتێك دا ئەیخوێندەوە بەسەریان دا، لەبارەی زیندوو بوونەوەیشەوە بەم جۆرە بوون کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوٓاْ﴾ ئەوانە ئەیان گوت: ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا﴾ ئایا کاتێ ئێمە ببین بە چەند پارچە ئێسکی رزاو و پووکاو، ئایا بێگومان ئێمە زیندوو کراوە ئەبین بە دروست کراوێکی تازە، واتە لەپاش ئەوەی بمرین و ببین بە ئێسك و بە خۆڵ تازە زیندوو ئەکرێینەوە و ئەکرێین بە دروست کراوێکی تازە؟ واتە نەخێر شتی وا نابێ و نەگونجاوە. مەسەلەی زیندوو بوونەوە مایەی دەمە قاڵێ و دەمە دەمەیەکی دوور و درێژ بوو لە نێوان پێغەمبەر(ص) و لەگەڵ بت پەرستەکان دا، قورئان لە چەند شوێنێك دا باسی ئەو دەمە قاڵێ‌ی هێناوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو مەسەلەی زیندوو بوونەوە شتێکی زۆر روون و ئاسانە، بەڵام ئەو نەفامانە بیریان نەئەکردەوە لەوەی کە خۆیان لە پێشەوە نەبوون و لە پاشان بە زیندوویی کەوتنە ئەم دنیایەوە، دووبارە کردنەوە هیچ جیاوازی یەکی نی یە لە زیندوویی یەکەم جار، بەڵکو ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە بۆ خوا هەموو شتێ یەکسانە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ ئەبێ دووبارە کردنەوە بە ئاسانتر دابنرێ. جا لەبەر ئەوە بەریان لێ ئەبڕێتەوە و وەڵام و بەرپەرچ دانەوەکەیان بەشێکە کە لە بۆچوون و تێگەیشتنی ئەوان دا زۆر دوور و نەگونجاو ترە و ئەفەرموێ: ﴿قُلۡ﴾ ئەی پێغەمبەر پێ یان بڵێ: ﴿كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا * أَوۡ خَلۡقًا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ﴾ بڕۆن بەرد بن و ببن بە بەرد یان ئاسن، یان دروست کراوێکی تر لەوەی کە لە دڵتان دا گەورەتر و گرنگ ترە و دوور ترە لەوەی دەست بدا بۆ گیان بە بەردا کردن. واتە ئەگەر ئێوە ببن بە هەر شتێ نەك ئێسك و رزاو کە بۆنێکی گیانیان لێ دێ و گیان بەسەریان دا گوزەری کردووە، خوا هەر زیندووتان ئەکاتەوە. بێگومان ئەوانە دەسەڵات و توانای ئەوەیان نەبووە ببن بە هەر شتێ بەڵام مەبەست وەك گوترا بەر لێ بڕینەوەیە، بێجگە لەوەش**

بۆنی ریسوا کردن و سەرزەنشت کردنی تێدایە بەوەی ئەوانە بێ هەست و هۆشن بە وێنەی بەرد و ئاسن! ﴿ فَسَيَقُولُونَ ﴾ ئینجا بێگومان ئەوانە ئەڵێن: ﴿مَن يُعِيدُنَا﴾ ئایا کێ ئێمە دووبارە ئەکاتەوە؟ ﴿قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ بڵێ پێ یان: ئەو کەسە زیندووتان ئەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە لە نەبون دروستی کردن و دایهێنان. بەڕاستی وەڵامێکی راست و سووك و ئاسانە و هەق نی یە هیچ کەس دەمە دەمێ ی تێدا بکات، بەڵام ئەوانە نەفامن و ژیریی یان لەکار کەوتووە لەبەر ئەوە ئەو وەڵامە راست و رەوایان وەرنەگرت و لاقرتی یان پێ ئەکرد وەك دەست نیشان ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ ﴾ ئینجا ئەوانە بە لاقرتی یەوە سەر ئەلەقێنن لێت و سەریان بەرز ئەکەنەوە و دای ئەنەوێنن لێت، ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ﴾ ئەڵێن: ئەوە کەی ئەبێت و بەدی دێت؟ ﴿قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴾ بڵێ چاوەڕوانی ئەکرێ ئەوە نزیك بێت و لەماوەیەکی نزیك دا بەدی بێت. ئەو هاتنەی بە نزیك دانا، چونکە هەرشتێ گومان نەبێ لە هاتنی دا هاتنەکەی نزیکە، بێجگە لەوەش ئەوەی کە ماوە لە تەمەنی دنیا زۆر کەم و نزیکە لەچاو ئەوەی تێپەڕی کردووە.

زانینی کاتی هاتنی رۆژی دوایی یەکێکە لەو شتانەی کە تایبەتین بەخواوە، ئینجا هاتنی ئەو رۆژە ئەخاتە بەرچاو بە شێوەیەکی سووك و چەسپان، ئەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ﴾ واتە ئەو هاتنە نزیکە لە رۆژێك دا، یان باسی ئەو کاتە بکە کە خوا بانگتان ئەکات لە گۆڕەکانتانەوە، ئینجا دەست بەجێ ئێوەش دێن بەدەم بانگ کردنەکەوە بە سوپاس و سەنا کردنەوە، هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەو بانگ کراوانە باوەڕدارانە بە بەڵگەی سوپاس و سەناکەیانەوە، بەڵام رووکەش و رواڵەتەکەی گشتی یە، بەڵکو هەر بێ بڕواکان لێرەدا مەبەستە، چونکە شوێن و باسەکە هینی ئەوانە. لەسەر هەر بار وەڵام و بەدەمەوە چوونی بانگەکە زۆر نایاب و سەر سوڕهێنەرە لەلایەن بێ باوەڕەکانەوە کە لە دنیادا یاخی و بێ باوەڕ بوون و کەچی لەو رۆژەدا دەمیان وا بە سوپاس و سەناوە! ﴿وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ گومان ئەبەن کە ئێوە نەماونەتەوە لە دنیادا یان لە گۆڕەکانتان دا بێجگە لەماوەیەکی کەم. واتە ئەوەی تێپەڕی کردووە لە پێش چاو نامێنێ و ون ئەبێ، کەواتە ئەم ژیانی دنیایە شتێکی بێ نرخە و هەق نی یە پشتی پێ ببەسترێ.

وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا
﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾
وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّۦنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾
قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾

**ئینجا واز ئەهێنێ لەو بێ باوەڕە لاقرتی کەرانە و لایەك ئەکاتەوە بۆلای بەندە باوەڕدارەکان بۆ ئەوەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) پەند و تەمێی چاکیان ئاراستە بکات و هەمیشە وتەی پاك بەدەمیان دا بێت، ئەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: بە بەندەکانم، واتە باوەڕ دارەکان وتەیەك بڵێن کە جوانتر و شیرین ترە و شێوەیەك بەکار بێنن لە وتار و گوفت و گۆ کردن دا کە باشترین بێت لەبەر ئەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ﴾ بەڕاستی شەیتان ناکۆکی و ئاژاوە و کینە ئەخاتە ناویان و هەمیشە ئەیەوێ بەینیان تێك بدات، دەی وتە و شێوەی شیرین ئەبێ بە بەربەست بۆ مەبەستە بەدەکەی شەیتان یان هیچ نەبێ سووك و خاوی ئەکاتەوە، بە پێچەوانەی وتەی زبر و ڕەق ئەبێ بە یاریدەدەر و ئاگرەکەی بەتین تر ئەکات. ئەو شەیتانە بەدەی کە هەمیشە کارو پیشەی هەڵگیرسانی ئاگری ناکۆکی و دوژمنایەتی یە لە نێوان بەندەکان دا، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ بەڕاستی شەیتان هەمیشە دوژمنێکی روون و ئاشکرایە بۆ ئادەمی و هەمیشە بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێ کون و کەلەبەرێك بدۆزێتەوە بۆ هاویشتنی تیرە ژاراوی یەکەی، ئینجا با بزانرێ مەبەست لەو فەرمان و پەند و تەمێ یە ئەوە نی یە چاوپۆشی بکرێ لە ناهەق و وازبهێنرێ لە جڵەوگیریی لە خراپە لەبەر دڵی خراپەکاران. نەخێر، نەخێر پێویستە بەپێی توانا بەرگری خراپە و گوناه بکرێ، بەڵام بە ئوسلوبێکی**

راست و ڕەوا کە خراپەکار نەتارێنرێ و بێزاری نەکرێ لە ئیسلام، کات و شوێنی قسە و وتەی تایبەتی خۆی هەیە و پیاوی دانای لەخوا ترس ئەزانێ و ئەیناسێ.

لەپاش ئەو پەندە پیرۆزە، ئینجا ئەفەرموێ: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ﴾ هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بەم فەرمودەیە باس و ڕوون کردنەوەی دوا ڕۆژ و چارەنووسی ئەو بانگ کراوانەیە کە دێن بەدەم بانگەکەوە بە سوپاس و سەنای خواوە. واتە باسی ئەو ڕۆژە بکە کە خوا بانگتان لێ ئەکات و ئینجا ئێوەش دێن بە دەم ئەو بانگ کردنەوە بە سوپاسی خواوە، چارەنووستان هەر بە دەست خوایە بەم ڕەنگە کە ئەو زاناترە بە ئێوە ئەگەر بیەوێ میهرەبانیتان پێ ئەکات یان ئەگەر بیەوێ سزاتان ئەدات، دەستەیەکی تر ئەفەرمون: ئەم فەرمودەیە تەفسیر و ڕوون کەرەوەیە بۆ فەرمودەکەی پێشوو: ﴿وقل لعبادی یقولوا التی هی احسن﴾ واتە بەم جۆرە پێ یان بڵێن: خوا زاناترە پێتان ئەگەر مەیلی ببێ میهرەبانیتان پێ ئەکات یان ئەگەر بیەوێ سزاتان ئەدات، واتە ئەم وتەیان ئاراستە بکەن نەک پێ یان بڵێن: ئێوە دۆزەخین و هەرگیز ڕزگار نابن، هەروەها هەر وتەیەکی تر کە ڕقیان هەڵسێنێ و بیان تارێنێ لە ئیسلام، لەسەر ئەم ڕایە وتەی: ﴿إن الشیطان...﴾ تێ هەڵکێشە. بەڕاستی ئەم ڕایە لەدڵ دا بەهێزترە و فەرمودەی دوایی پەیوەستی بەتین ترە ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴾ تۆمان ڕەوانە نەکردووە بە کاربەدەست بەسەر ئەوانەوە و کاروباریان نەدراوەتە دەست تۆ تا بە زۆر موسڵمانیان بکەیت، بەڵکو تۆ موژدە دەر و ترسێنەری ئەوانی.

﴿ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ پەروەردگارت زاناترە لە هەموو کەس بە هەرکەس کە لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە، واتە ئەو باش ئەزانێ کێ شیاو و شایستەیە بۆ پێغەمبەرێتی یان بۆ باوەڕهێنان، خوا ئەزانێ کە بیلال و صهیب و خەباب شایستەن بۆ ئیسلام، بەڵام ئەبوجەهل و وێنەکانی شایانی ئەوە نین بین بە هەڵگری ئاڵای ئیسلام. هەر بە پێی ئەو زانینە تێرو تەواو و ڕاستەقینەیە هێندێ لە پێغەمبەرانیشی باو داوە بەسەر

هێندێکی تریان دا وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ﴾ بەڕاستی باوی هێندێ لە پێغەمبەرەکانمان داوە بەسەر هێندێکی تریان دا وەك لەسەرەتای جزمی سێ یەم دا بە درێژ تر و بە روون تر باسی کرد. خۆی ئەزانێ هۆی ئەو باودانە چی یە؟ ئینجا نموونەیەك لەو باودانە ئەخاتە بەرچاو و باسی ئەکات. ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾ زەبورمان بەخشی بە داود، زەبور نامەیەکە لە نامەکانی خوا کە ئەهاتە خوارەوە لەپاش مووسا – سەلامی خوایان لێ بێ – بێگومان ئەو بەهرە و بەخشینە گەورەترین چاکەی خوا بووە بەسەریەوە نەك پادشایەتی و سەڵتەنەتەکەی کە لە دنیادا بە پایە و پلەی گەورە تەماشا ئەکرێ، کەواتە ئەو بەخشینی زەبورە شیاوی باسە، بێجگە لەوەش بەخشینی زەبور دەست نیشانی تێدایە بە باودانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەسەر هەموان دا، هەروەها باودانی ئوممەتەکەی بەسەر هەموو ئوممەتان دا، چونکە بەو جۆرە هاتووە وەك ریوایەت کراوە لە سورەتی(الأنبیاء) یش دا دەست نیشان ئەکات بەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ ...﴾.

لەم ئایەتانی رابوردوەدا بیروباوەڕی هاوبەش و ئەولاد بۆ خوای پووچەڵ و بێ بنەڕەت کرد. ئینجا لەکۆتایی دا باسەکە دوایی ئەهێنێ بە بەر لێ برینەوەی ئەو نەفامانە کە ئەو بیرو باوەڕە بەد و پووچەڵەیان هەیە، ئەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ﴾ بڵێ بە نەفامە بێ باوەڕەکان: داوا بکەن و هاوار بکەنە ئەوانەی لاف خوایەتی یان بۆ لێ ئەدەن و لاتان وایە خوان و شایانی پەرستن و هاوار لێ کردنن بێجگە لە خوا، بڵێ: هاوار و نزا بکەن لەوانە بۆ نەهێشتنی زیان لێتان دەی هاواریان لێ بکەن. ئەگەر ئەوە بکەن نایەن بە هاوارتانەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا﴾ ئینجا ئەوانە ناتوانن و خاوەنی ئەوە نین نە زیانتان لێ لا ببەن و نەیهێڵن و نە ئەتوانن بە گواستنەوەی بۆ لایەکی تر و کەسێکی تر، بەڵکو ئەوە هەر بەدەست خوایە. هێندێ لەو نەفامانە(عوزەیر) یان بە کوڕی خوا دائەنا و ئەیان پەرست و هاواریان لێ ئەکرد، هێندێ هاوار و نزایان لە عیسا ئەکرد، هێندێ تر مەلائیکەیان بە کچی خوا ئەزانی و هاوار و نزایان لێ ئەکەن، هێندێ تر کەسانی تر،

أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ
عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرۡيَةٍ إِلَّا نَحۡنُ مُهۡلِكُوهَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ
أَوۡ مُعَذِّبُوهَا عَذَابٗا شَدِيدٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٥٨﴾ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن
كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ

---

**خواش دەم کوتیان ئەکات بەمەی ئەفەرموێ: ﴿أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ﴾ ئەوانەی کە ئەو نەفامانە نزا و هاواریان لێ ئەکەن و بە فریاد رەسیان دەزانن، ﴿يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ﴾ ئەوانە خۆیان داوای نزیك بوونەوە و پلە و پایە ئەکەن لەخواوە و ئەیانەوێ بە هەر جۆر خۆیان نزیك بکەنەوە لە خوا، بە پەرستن و گوێ رایەڵی، کامیان نزیك ترە لە خواوە پلەوپایەی بەرزترە، داوای ئەوە ئەکات، ﴿وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾ چاوەڕوانی میهرەبانی خوان و دەترسن لەسزای خوا، کەواتە لەجێ یە ئەوانە بەو جۆرەن لەگەڵ پەروەردگاریان دەبێ خەڵکی تر و ئێوەی نەفام باشتر هەوڵی نزیك بوونەوە بدەن بە پەرستن و گوێ رایەڵی، چۆن ئەوانە دەپەرستن و خوا ناپەرستن؟ بە جۆرێکی تریش تەفسیر کراوەتەوە بەڵام هەر ئەمە ئەگرێتەوە. ئینجا ئاماژە ئەکات بۆ هۆی مەترسی ئەوانە لەسزای خوا و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا﴾ بەڕاستی سزای پەروەردگارت هەمیشە مەترسی لێ کراو و خۆ لێ پارێزراوە و شایانە بۆ مەترسی لێ کردن و خۆپارێزی لێ ی، لەم ئایەتانی رابوردووەدا باسی کرد کە تەنیا خواو بەدەست نیشانی خوایە کاروباری بەندەکانی و چارەنوس و دوا رۆژیان، ئەگەر مەیلی ببێ میهرەبانی یان پێ ئەکات. ئەگەر بیەوێ سزایان ئەدات، هەموو بت و هاوار لێ کراوەکانی تر ناتوانن بەرگری هیچ سزایەك بکەن و نەیهێڵن یا بیگوێزنەوە بۆ یەکێکی تر. لەپاش ئەوە و بەو بۆنەوە دێتە سەر باسی چارەنووس و دوا رۆژی هەموو ئادەمی بە پێی قەزا و قەدەری خوا و زانینی خوا، ئەو چارەنووسەش ئەوەیە خوا هەموو شار و دێهات و وڵاتەکان ناهێڵێ لە پێش هاتنی رۆژی دوایی دا و هەموو لەناو ئەچن ئیتر بە مردنی سەرجێگە یان کوشتن و بەڵاو دەردەکانی تر، ئەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن قَرۡيَةٍ إِلَّا نَحۡنُ مُهۡلِكُوهَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَوۡ مُعَذِّبُوهَا عَذَابٗا شَدِيدٗا﴾ هیچ شار و دێ یەك نی یە لەسەر زەوی دا مەگەر ئێمە لەناوی ئەبەین و وێرانی دەکەین بە مراندنی دانیشتووەکانی لە پێش**

هاتنی رۆژی دوایی دا، یان ئێمە سزای دەدەین بە سزایەکی بەتین بە کوشتن و دەرد و بەڵاکانی تر، وەك لە(مقاتل) ەوە ریوایەت کراوە، هەروەها لە(موجاهید) و دەستەیەکی ترەوە، لە(مقاتل) ەوە ئەمەش هاتووە کە مراندنەکە بۆ چاکانە و سزادانەکە بۆ خراپانە. ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا﴾ ئەوەی کە باس کرا لە مراندن و سزادان نووسراوە لە(لوح المحفوظ) دا یان لە زانینی خوادا تێپەڕی کردووە. پەیامەکانی خوا کە هاتوون موعجیزەیان لەگەڵ بووە بۆ دەرکەوتنی راستی پێغەمبەرەکان – سەلامی خوایان لێ بێت – بەڵام باوەڕیان نەهێنا بێجگە لەوانەی کە دڵیان ئامادە بوو بۆ باوەڕهێنان، ئیتر ئەوانی تر هەر یاخی بوون و ئەو موعجیزانە کاری لێ نەکردن و بەهۆی ئەوەوە خوا لەناوی ئەبردن و لە ریشەی ئەهێنان. بۆ نموونە وەك گەلەکەی صالح(علیه السلام) کە لێرەدا باسەکەی هاتووە، کەواتە ئەگەر بە پێی پەڵپ و داوای نەفامەکانی ئەم ئوممەتە ئەو جۆرە موعجیزانە ببوایە ئەمانیش هەر بڕوایان نەئەهێنا و ئەبوو لەناو ببرانایە وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾ هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەکردووە لە ناردن و بەدی هێنانی ئەو موعجیزانەی کە قورەیش پەڵپیان پێ ئەگرن، بێجگە لە بڕوا نەهێنانی گەلە پێشووەکان لە پاش بەدی هێنانی پەڵپ و داواکانیان ئینجا بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لەناومان بردن. واتە ئەگەر ئێمە پەڵپ و داواکانی ئەمانمان بەدی بهێنایە ئەمانیش وەك ئەوان بڕوایان نەئەهێنا و ئەو کاتەش بە پێی باوی خۆمان ئەبوو لەناومان ببردنایە، ئێمەش ئەوەمان نەویست، چونکە ئەم پەیامە هەمیشەیی و هەتا هەتایی یە و ئەگەر دەستەی یەکەم بڕوا نەهێنێ دەستەی دووەم و پاش ئەو بڕوای هێنا، هەروەها خالید لەپاش وەلید... ئینجا بۆ نموونە موعجیزەی صالح پێغەمبەر(ﷺ) ئەهێنێ کە خۆی و گەلەکەشی عەرەب بوون و بەناوبانگ بوون لای قورەیش و عەرەبەکان، ئەو موعجیزەی پێدان لەسەر پەڵپی خۆیان، ئینجا بڕوایان نەهێنا و خواش لەناوی بردن و لە ریشەی هێنان، ئەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً﴾ بەخشیمان بە تائیفەی سەموود حوشترەکە کە بەناوبانگە، لەکاتێك دا ئەو حوشترە خاوەنی بینین بوو بە چاو و بە ژیریی، واتە بەچاوی سەر ئەبینرا و ژیریش وەری ئەگرت و تێی ئەگەیشت، یان خەڵکی ئەگێڕا بە خاوەن فام و چاوی دڵی ئەکردنەوە، ﴿فَظَلَمُوا۟ بِهَا﴾ ئینجا ئەو تائیفە باوەڕیان نەهێنا پێی و دانیان نەنا بەوەی کە لەلایەن خواوە هاتووە، یان باوەڕیان نەهێنا و ستەمیان لێ کرد بەوەی سەریان بڕی، یان ستەمیان لە خۆیان کرد بەوەی خۆیان دووچاری خەشم و سزای خوا کرد.

وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ
أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ وَنُخَوِّفُهُمۡ فَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا طُغۡيَٰنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٠﴾
وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾

---

**﴿وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا﴾ ئێمە موعجیزە پەڵپ پێ گیراوەکان ڕەوانە ناکەین و بەدی ناهێنین مەگەر هەر لەبەر ترساندنی ئەوانەی کە داوایان کردووە و بیانوویان پێ گرتووە. ترساندن بە سزایەك کە لەناویان بەرێ ئەگەر باوەڕیان نەهێنا، ئەوەش بە پێی باوی خوا کە بەو جۆرە هاتووە. بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە بەڵام ئەوەی کە گوتمان بەهێزترە و خوا خۆی باش ئەزانێ، بێگومان پەیامەکانی پێش دواترین پەیام کاتی بوون و بۆ ماوەیەکی دیاریی کراو هاتن، لەبەر ئەوە موعجیزەکانیان شتێکی ماددی بوون، بە پێچەوانەی باو و ناسراو، بەڵگە و نیشانە بوون لەسەر ڕاستی پەیام و پێغەمبەرەکە بۆ ئەوانەی کە بەچاو دیتبوویان، یان بە تەواتوور زانراون، بەڵام دواترین پەیام کە هەمیشەیی و هەتا هەتایی یە ئەبێ موعجیزەیەکی هەمیشەیی و هەتا هەتایی ئەبێ، لەبەر ئەوە ئەم قورئانە موعجیزەی ئەم پەیامەیە کە بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرایە و لە هەموو کات و شوێنێك دا، و هەتا دنیا دنیایە و هەتا بێت بەڵگە و نیشانە نهێنی و پۆشیدەکانی دەرئەکەون و بە گوێرەی پێش کەوتنی ژیریی و زانیاریی بەڵگە و رابەرە بەهێزەکانی دەرئەکەون و خەڵکی دوای ئەکەوێ. بەڵێ پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) موعجیزەی زۆر و فراوانی تری هەبووە، بەڵام ئەوانە زیادە ڕێز گرتنێك بوون و گەورەیی ئەمی پێ دەرکەوتووە نەك نیشانەی ڕاستی پەیامەکەی بن، بۆ نموونە: شەو ڕەوی و بەرز بوونەوەی بۆ سەرووی ئاسمانەکان نەکراوە بە بەڵگەی ڕاستی پەیامەکەی، بەڵکو ڕێزی ئەوی پێ گیراوە و تاقی کردنەوە بووە بۆ خەڵکی وەك وەرئەگیرێ لەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە گوتمان پێت: بەڕاستی پەروەردگارت بە زانین و ئاگاداری و دەسەڵات دەوری خەڵکی و هەموو کەسی داوە، کەواتە هەموو کاروبار و بەسەرهاتیان، لەمەوپێش و ئێستا و لە داهاتوودا زانراوە لای خوا**

و بەدەست ئەوە، کەواتە هیچیان پێ ناکرێ بەرامبەر تۆ و ئێمە کۆمەك و پارێزەری تۆین هیچ باکت نەبێ لێ یان. ئەو دیتن و بینینەی کە پیشانی تۆمان دا لەو شەو رەوی یەدا، ئەو هەموو شتە گەورە و گرنگانە هەر لەبەر تاقی کردنەوەی خەڵکی بوو، ئەو شەو رەوی کردنە بە تۆ و هەواڵ دانی تۆ بەوانە هەر لەبەر تاقی کردنەوە بوو تا دەرکەوێ کێ دامەزراوە و باوەڕی بەهێز تر ئەبێ، و کێ بەو جۆرە نی یە و پاشگەز ئەبێتەوە وەك هێندێ لەوانەی کە باوەڕیان لاواز بوو پاشگەز بوونەوە.

﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ﴾ ئەو درەختە نەفرین لێ کراوەش کە لە قورئان دا باسمان کردووە، درەختی زەقنەموت هەر لەبەر تاقی کردنەوەی خەڵکی باسمان کردووە، کە دەرکەوێ کێ باوەڕی ئەبێ پێ ی و بەهۆی ئەوەوە بیم و ترس لەخوا داگیری ئەکات، و کێ باوەڕی پێ ناکات و لاقرتی پێ ئەکات، وەك ئەگێڕنەوە لە(ئەبو جەهل) موە کە گوتی: محمد هەڕەشەتان لێ ئەکات بە ئاگرێك کە بەرد ئەسوتێنێ، ئینجا ئەڵێ درەختی تێدا ئەڕوێ، ئێمە زەقووم ناناسین بێجگە لەوەی خورمایە لەگەڵ کەرە، فەرمانی دا بە کارەکەرەکەی کەرەو خورما بێنێ و گوتی بە هاوڕێکانی: وەرن زەقووم بخۆن، بەو قسەی ئەوە هێندێ لە نەفامان هەڵخەڵەتان و بە تەواوی گومڕا بوون. ئەو نەفامانە بیریکیان نەئەکردەوە لەوەی بەچاوی خۆیان شتی وا ئەبینن کە سەریان سوڕ ئەمێنێ لەوەی لەناو ئاگردا جۆرە درەختێك بڕوێ کە بگونجێ لەگەڵ ئاگردا، بۆ وێنە ئەبینین حوشتر مرغ پشکۆ و پارچە ئاسنی گەرم ئەخوات و هیچی لێ نایەت و لە موی سەمەندەل قوماش دروست ئەکرێ و هەرکات چڵکن ببێ ئەخرێتە ناو ئاگر و ناسووتێ و بەس چڵکەکەی ئەڕوات. هەروەها ئەبینن درەختی مەرخ و عیفار ئەدرێن لەیەك و ئاگریان لێ پەیدا ئەبێ. ﴿وَنُخَوِّفُهُمْ﴾ ئێمە بەو جۆرە بەڵگە و موعجیزانە ئەوانە ئەترسێنین، واتە قورەیش، واتە بە هەڕەشەکانی خوا و ئەو هەواڵانەی کە لەو شەو رەوی یەدا پێ ی دان، هەروەها ئەو درەختە، ﴿فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا﴾ کەچی ئەو ترساندنە هەر سەرکێش و لە سنوور دەرچوونێکی گەورەیان پێ زیاد ئەکات، لەباتی ﴿خوفناهم، زادهم﴾ کە بۆ رابوردون، فەرموی ﴿نخوفهم، يزيدهم﴾ کە بۆ ئێستا و داهاتوون، لەبەر گەیاندنی ئەوەی کە ئەوە یەك جار و دوو جار نەبووە!! بەڵکو هەموو جارێ هەر وابووە. ئەو درەختەی ناوبرد بە نەفرین لێ کراو لەبەر ئەوەی کە بخۆرەکانی نەفرین لێ

کراون. یان لەبەر ئەوەیە دوور خراوەیە لە میهرەبانی خوا، چونکە لە بێخی دۆزەخ دەردەچێ کە شوێنی خەشمی خوایە، یان لەبەر ئەوەیە قورئان بە وێنەی شەیتان نیشانی ئەدات، ئەو ناوبردنە بە پێی باوی عەرەبە کە هەر خۆراکێ بێزراو و زیان دەر بێت پێی ئەڵێن:(ملعون).
زۆربەی زانایان ئەفەرمون: ئەم ئایەتە بۆ دڵنەوایی و دڵخۆش کردنی پێغەمبەرە(ﷺ) لەوەی کە غەم و پەژارە رووی تێ نەکات بەهۆی ئەو موعجیزە و پەڵپ و بیانووانە کە قورەیش داوایان ئەکرد و خوا بەدی نەهێنان و بەگوێی نەکردن، چونکە بەرژەوەندی و کاردروستی تێدا نەبوو، پاڵفتەی باسەکە ئەمەیە: خوا بڕیارێکی نەدا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەو جۆرە موعجیزانە رەوانە بکات کە قورەیش داوایان کرد، چونکە خوا بڕیاری ئەوەی دابوو ئەگەر لەپاش بەدی هێنان باوەڕ نەهێنن لە ریشەیان بێنێ وەك گەلە پێشووەکان، دەی ئەم ئوممەتە کە بە بڕیاری خوا دواترینە تا رۆژی دوایی ئەبێ لەناو نەچن بەو جۆرە سزایە، بەڵکو بمێنێتەوەو ئەگەر یەکەم چین باوەڕ نەهێنێ چینی دواتر باوەڕ ئەهێنێ وەك گوتمان، لەبەر ئەوە موعجیزەی ئەم پەیام و ئوممەتە هەر ئەم قورئانەیە کە بە درێژایی چەرخ و کات رێنموونی لێ وەرئەگیرێ و چرایەکی رووناکە بۆ رێ پیشان دان تا دنیا دنیایە.
ئینجا لەم کاتەدا کە کۆتایی ئایەتی پێشووی هێنا بەباسی ئەو درەختە نەفرین لێ کراوە کە ئەبێ خۆراکی شوێن کەوتووەکانی شەیتان، لەم کاتەدا باسی شەیتان ئەهێنێ کە هەڕەشە ئەکات بە گومڕا کردنی شوێن کەوتووەکانی، ئەفەرمویێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە گوتمان بە مەلائیکە: سوژدە بەرن بۆ ئادەم. سوژدەی رێزی و قەدر پێدان. ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾ ئینجا دەست بەجێ ئەوانیش سوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس کە حەسادەتی برد بە ئادەم و خۆی بە شایستە تر دانا و ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ ئایا من سوژدە بەرم بۆ کەسێك کە دروستت کردووە لە کاتێك دا ئەو قوڕە؟ حەسادەت چاوی کوێر کرد لەوە سەرنجی بەشە بەرز و پیرۆزەکەی بدا کە رۆحەکەیەتی و هەرباسی بەشە پەستەکەی کرد کە قوڕ و خاکەکەیەتی کە لێ ی دروست کراوە، لەبەر ئەوە بە سەرسوڕمانەوە ئەو پرسیارە ناڕاستەی کرد. هەر بەوەوە نەوەستا بەڵکو دەست نیشانی کرد بۆ لاوازی و ئامادەیی بۆ گومڕا بوون و ترازان لە رێگەی راست،

قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا
قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ
ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ

**لەبەر ئەوە بە کەشخە و بێ شەرمی یەوە: ﴿ قَالَ ﴾ گوتی: ﴿أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾ پێم بڵێ و هەواڵم بدەرێ لەبارەی ئا ئەمەی کە رێز و باوت داوە بەسەر من دا، ئایا لەبەرچی باوت داوە لە کاتێك دا من لەو بەرز و بەرێز ترم؟ ﴿لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر دوام بخەیت تا رۆژی دوایی، واتە ئەگەر مۆڵەتم بدەیت و نەم مرێنی تا ئەو کاتە ﴿لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴾ بەڕاستی رۆڵە و نەوەکانی لە ریشە ئەهێنم بە گومڕا کردن و زاڵ ئەبم بەسەریان دا، یان لەغاو و رەشۆ ئەخەمە دەم و ملاژووی خواریان و رایان ئەکێشم چۆن بمەوێ. هەموو ئەوانە بەو جۆرەیان پێ ئەکەم مەگەر کەمێك لەوان کە بەندە تایبەتی یەکانی خوان کە دەربارەیان لە ئایەتی داهاتوودا، ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ﴾ شەیتان بێ ئاگا بوو لەوەی ئەم ئادەمی یە خاوەنی مەیل و ئیرادەیە و ژیرە دەست ئەدات بۆ خێرو چاکە و ناتوانێ هەموویان لە رێگە لابدات. بەڵێ مەیل و خواهیشی خوا وابوو کە رێ نەگرێ لە شەیتان و جڵەوی بۆ شل نەکات، بە ئارەزووی خۆی هەوڵ بدات بۆ گومڕا کردنی هەرکەس بێت بەدەم شەیتانەوە لەبەر ئەوە ﴿ قَالَ ﴾ فەرموی بە شەیتان ﴿ٱذْهَبْ﴾ برۆ بەدەم کاری خۆتەوە، واتە رێت لێ ناگیرێ لە گومڕا کردنیان، ئەوان خۆیان ئەتوانن شوێنت بکەون یان رووت لێ وەرگێڕن ﴿فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ ﴾ ئینجا هەرکەس لەوان شوێنی تۆ کەوت و گومڕایی بۆخۆی هەڵبژارد و گوێی نەدا بە بانگ کردنی پەروەردگاری خۆی و بە گوێی دوژمنی خۆی کرد و بیری نەکردەوە لەو هەموو بەڵگە و نیشانە روونانەی کە خوا لەم بوونەوەرەدا بۆی داناوە هەرکەس لەوان بەو جۆرە بوو ﴿فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ﴾ بەڕاستی دۆزەخ جەزا و پاداشتتانە ﴿جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴾ جەزا ئەدرێنەوە پێی بە جەزا و پاداشتێکی فراوان و تێر و تەواوکرد ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ ﴾ واتە هەرکەس لەوانە کە دەیتوانی بیپچڕە و رایکێشە بۆلای خۆت بە دەنگت و بانگ کردنیان. واتە بە وەسوەسە و هاندانیان بۆ بێ**

باوەڕیی و خراپەکاریی، یان بە گۆرانی و جوزەلە لێدان و شتی لەهو و لەعب ﴿وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ واتە بدە بەسەریان دا و تیَ یان خوڕە بە سوارە و پیادەی لەشکرەکەتەوە، یان کۆبکەرەوە لەسەریان سوارە و پیادەی لەشکرەکەت. ئیتر ئایا مەبەست بەو لەشکرە ئەوانەبن لە جن و ئادەمی کە گوێ رایەڵ و کۆمەکن بۆ شەیتان و بە پێی ئارەزوو و خواستی ئەو ئەجوڵێنەوە، وەك لە(ئیبن و عەباس و موجاهید و قتادة) ەوە ریوایەت کراوە، یان مەبەست کۆمەك و ژێر دەستەکانی یەتی هەر لە تیرەی جن. لەسەر هەربار مەبەست لەو شێوە فەرمانە هەڕەشە کردنە لە شەیتان نەك فەرمان دان، چونکە خوا فەرمان نادات بە شتی بەد و خراپ. هێندێ لە زانایان ئەفەرمون: ئەمە وێنە و چیرۆکە بۆ بەکارهێنانی هەموو گومڕاکردن و زاڵ بوون و داگیر کردنی هەست و هۆش و دڵ و ژیریی، واتە ئەی شەیتان بڕۆ چیت لە دەست دێت بەکاری بێنە، سەرەنجام و پاداشتی کردەوەکەت ئەوەیە، دۆزەخ جێ و شوێنی خۆت و شوێن کەوتووەکانتە. ﴿وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ﴾ هاوبەشی یان بکە و ببە بە هاوبەشیان لەماڵ و سامان و ئەولادیان دا، ئەو هاوبەشی یە لەماڵ و سامان دا بەوەی لە چەرخی نەفامی دا بەشێ لە ماڵەکەیان دائەنا بۆ بتەکانیان کە لە راستی دا بۆ شەیتانە، هەروەها کۆکردنەوە و بەخت کردنی ماڵ بە ناهەق و لە گوناهدا هاوبەشی یە لەگەڵ شەیتان، هاوبەشی یان لە ئەولاددا بەمەی نەزریان ئەکردن بۆ بتەکانیان و ئەیان کردن بە خاوەنی بتەکان، بە بەندەی ئەو ناویان ئەبردن، وەك:(عبد العزا و عبدالمنات) کە ئەوەش هەر بۆ شەیتان ئەگەڕێتەوە وەك هێندێ لە رێوە بە بەندەی شەیتان ناویان ئەبرد وەك(عبدالحارث) هەروەها بەشداری لە ئەولاددا بەمەی لە حەرام و بێ شەرعی پەیدا بن. هەروەها بەهەر جۆرێکی تر کە گوناهو بێ شەرعی بێت. شەیتان رێی بەرەڵا کرا کە بە ئارەزووی خۆی هەوڵ بدات بۆ گومڕا کردنی ئادەمی، یەکێ لە هۆی گومڕاکردن بەڵێن دانە بەو شتانە کە خەڵەتێنەرن بۆ نەفامان، وەك ئومێدی رزگاربوون لە تۆڵە و هەق لێ سەندن بەرامبەر ئەو گوناهانەی کە تۆڵە و هەق لێ سەندنی بۆ دیاریی کراوە، ئومێدی سامان زۆری و دەوڵەمەندی بەهۆی مامەڵە و کردەوەی بەد و حەرامەوە، رەنگە بەهێز تر بن بۆ گومڕا کردن، ئومێدی لێ بوردنی خوا و فراوانی بەزەیی و میهرەبانی خوا بێ بۆ کەسانێ کە ترسێکیان هەیە لەخوا، بەڵام شەیتان ئەیان خەڵەتێنێ بەو فراوانی و بەزەیی و میهرەبانی یە، یان هەر بەڵێن و ئومێدێکی تر وەك ئەفەرموێ: ﴿وَعِدۡهُمۡ﴾ بەڵێنیان پێ بدە، ئیتر بەهەر جۆر و شێوەیەك،

وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ
وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ
بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٦٦﴾

---

بێگومان بەڵێنی ئەو ئەبێ هەر بە درۆ بێت و هەر بۆ هەڵخەڵەتاندنە وەك بە تێهەڵكێش لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾ شەیتان بەڵێنیان پێ نادات مەگەر لەبەر خەڵەتاندن، یان مەگەر بە بەڵێنی هەڵخەڵەتاندن. خوا بەو جۆرە شەیتانی بەرەڵا کرد کە بە ئارەزووی خۆی هەوڵ بدات بۆ گومڕا کردن، بەڵام پێی ڕاگەیاند کە دەسەڵاتی نی یە بەسەر گومڕاکردنی بەندە ڕاستەقینەکانی خوادا و فەرموی: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞ﴾ بێگومان بەندەکانی من واتە ئەوانەی تایبەتی و خاوێن کراون بۆ من، وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ. ئەو بەندانەی من بۆ تۆ نی یە دەسەڵات بەسەریان دا و تۆ ناتوانی گومڕایان بکەیت، داوا ئەکەین بە میهرەبانی خۆی بمانخاتە ڕیزی ئەمانە ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا﴾ بەسە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر، یان ئەی ئادەمی بە پارێزەر و وەکیل و کار بەدەست و کار پێ سپێرراو، بەسە بۆ ئەوەی هەر پشت بەو ببەستن و چاوەڕوانی ئەو بکەن. خوای میهرەبان بەو جۆرە نیازی بەدی شەیتانی ئاشکرا کرد، کەچی لەگەڵ ئەوەدا هێندێ لە ئادەمی هەر شوێنی ئەو شەیتانە ئەکەون و گوێ لەو ئەگرن و پشت ئەکەنە خوا و گوێ ناگرن لە بانگ کردنەکەی خوا، خوا هێشتا میهرەبان و بەخشندەیە پێ یان و ئەچێ بەدەم هاواریانەوە لەکاتی زیان و تەنگی دا، کەچی هەر ئەوانە سپڵە و ناسوپاسن وەك ئەفەرموێ: ﴿رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي ٱلۡبَحۡرِ﴾ پەروەردگاری ئێوە کەسێکە کە ئەگێڕێ و هاتوچۆ ئەکات بە کەشتی بۆ ئێوە لە دەریادا، ﴿لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾ بۆ ئەوەی داوا بکەن و بگەڕێن بەدوای هێندێ لە ڕۆزی کە خوا بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی پێتان ئەدات ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ بەڕاستی ئەو خوایە بە هەمیشەیی و بە بەزەیی بوو پێتان، ئەگەر ئەو بەزەیی و میهرەبانی یە نەبووایە بەو جۆرە کاروباری ژیانی بۆ فەراهەم نەئەهێنان. بەم سەرەتایە هێندێ لە چاکەی خۆی بیرخستەوە، ئینجا ئەمەش ئەدات بەناو چاویان دا کە لەکاتی تەنگی دا هەر پەنا بەو ئەبەن، کەچی ئەوەندە سپڵەن کاتێ کەوتنە خۆشی ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵوێستە بەدەکەی جاران یان،

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا
﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا
﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ۙ ثُمَّ
لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ﴾ کاتێ زیانتان لێ کەوێ لە دەریادا بە مەترسی خنکان و نقوم بوون ﴿ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ ئەڕوا و ون ئەبێ لە خەیاڵتان دا هەرکەس کە ئێوە نزا و هاواری لێ ئەکەن بێجگە لە خوا و هەر نزا و هاوار ئەکەنە خوا بۆ رزگار کردنتان ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾ ئینجا کاتێ کە رزگاری کردن لەو ترس و بیمە و گەیاندنی بۆ بەڕ و وشکی روو وەرئەگێڕنەوە لە یاد و سوپاسی خوا لەپاش ئەوەی کە لەکاتی تەنگی دا هەر ئەوتان لەیاد بوو، یان لە تاك و تەنیایی خوا و سوپاسی ئەو بە تەنیا ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾ ئادەمی هەمیشە هەر زۆر سپڵە و ناسوپاس بووە، واتە بەهۆی ئەو سیفەتە بدەی بەو جۆرەیە باس کرا. واتە مەگەر ئەوانەیان کە دڵیان پەیوەستە بەخوای خۆیانەوە و بەهۆی ئەوەوە لە هەموو بەسەرهاتێك دا هەر روو لەخوای خۆیانن، ئینجا دەروون و ویژدانی ئەوانە دائەچڵەکێنێ کە بەهۆی ئەو رزگار بوونە ئارام و بێ باکی رووی تێ کردن، دایان ئەچڵەکێنێ بەمەی بەچی ئەزانن لەبەڕ و وشکی دا دووچاری هیچ نابن، یان بەمەی جارێکی تر ناچنەوە ناو دەریا و دووچاری مەترسی و سام و بیمەکەی جاری پێشوو نابنەوە؟ کەواتە بێ باکی یەکەتان زۆر ناڕاستە هۆی بێزاری لێ دەربڕینە، ئەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ﴾ ئینجا ئەی ئەوانەی کە لەپاش رزگار کردنتان روو وەرئەگێڕن لە یاد و باس و سوپاسی خوا ئایا ئێوە ناترسن و بێ باکن لەوەی بەش و تەرەفی بەڕ و وشکی یەکە بیبا بە ناخی زەوی دا بە ئێوەوە، واتە ئەو بەڕ و وشکی یەی کە ئێوە بە شوێنی ئارامی و بێ باکی دائەنێن، ئەوەی بەسەر بێنێ بە ئێوەیشەوە ﴿أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا﴾ یان رەوانە بکات و بیبارێنێ بەسەرتان دا بارانێك کە رێز و وردە بەردتان لێ بدات. هێندێ ئەفەرمون: مەبەست بایەکی بەتینە کە وردە بەرد و زیخ ئەهێنێ و ئەیبارێنێ، ئایا بێ باکن لەوە ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا﴾ ئینجا

لەپاش ئەوە دەستتان ناکەویٚ بۆ خۆتان کەسێك کە کاروباری خۆتانی بدەنە دەست تا بتان پارێزێ؟ ﴿أَمۡ أَمِنتُمۡ أَن يُعِيدَكُمۡ فِيهِ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ ئەی ئایا بێ باکن لەوەی دووبارە بتانکاتەوە ناو دەریا بۆ جارێکی تر وەك جاری پێشوو، ﴿فَيُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ قَاصِفٗا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغۡرِقَكُم بِمَا كَفَرۡتُمۡ﴾ بنێرێتە سەرتان بایەکی توند و تیژی وێران کەر کە هەرچی یەکی بکەوێتە بەر ئەیشکێنێ و وێرانی ئەکات، ئینجا بەو هۆیەوە نقومتان بکات لە دەریاکەدا بەهۆی بێ باوەڕی و سپڵەیی پێشووتان لەپاش رزگار کردنتان، یان بەهۆی بێ باوەڕی و سپڵەییتان کە هەمیشەیین لەسەری ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ عَلَيۡنَا بِهِۦ تَبِيعٗا﴾ واتە ئایا بێ باکن ئەوەتان بەسەر بێنین، ئینجا لەپاش ئەوە دەستتان ناکەوێ بۆ خۆتان کەسێك کە بێتە سەرمان و داواکار بێت لێمان بەوەی بەسەرمان هێنان، کە بەڕاستی داخ و ئێشی ئەوە زۆر سەختە، کاری ئاوات بەسەر بهێنرێ و هیچ کەسیش نەبێ پرسیاری لێ بکات بۆت، بەڵێ بەڕاستی نەزانی و نەفامی یە کە بەندە بەو جۆرە بێ باك و بێ هۆش بێت لەگەڵ ئەوەدا وا لەناو قەبزەی قودرەتی خوادا و هەمیشە جێگای ئەوە بێت خوا تۆڵەی تاوانەکانی لێ بسێنێ.

ئادەمی کار و کردەوەی بەو جۆرەیە و بەو جۆرە بێ باك و بێ ئاگایە لە کاتێك دا خوا رێزی داوە بەسەر زۆر لە دروست کراوەکانی دا، رێز گرتنەکەی لەچەند بار و روویەکەوەیە. رێزی پێداوە بە دروست کردنی لەسەر ئەو شێوە تایبەتی یە، بەو سروشتەی کە پێك هاتووە لە قوڕ و رۆح، کە بەوە زەوی و ئاسمانی تێدا دەستە مل کردووە.

رێزی پێداوە بەو لێهاتن و ئامادەیی یە بۆ خێرو چاکە و شەڕ و خراپە. بەجۆرێ دەستی داوە بۆ جێنشینی لەم زەوی یەدا. بە جۆرێ ئەتوانێ ئەو هەموو دەست کاری و گۆڕانکاری یە بکات. بەچەند جۆرو بار رووی ژیان و جیهان بگۆڕێ. رێزی پێداوە بەوەی ئەو هەموو هێزو وزەی بۆ ژێر بار کردووە لەم بوونەوەرەدا و هەست و ژیریی پێداوە، رێزی پێداوە بەوەی فەرمانی دا بە مەلائیکە سوژدەی بۆ بەرن.

رێزداری کرد بەوەی جاڕی دا بەو رێز پێدانە لەم قورئانە گەورەدا کە گەورەترین و جێگیر ترینی هەموو نامەکانی خوایە و هەمیشەیی یە و ئەمێنێتەوە تا دنیا دنیایە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ سوێند بەخوا ئادەمی و نەوەکانی ئادەمیمان رێزدار کردووە وەك دەست نیشانمان کرد بۆی لەسەرەتای ئایەتەکەدا.

وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ ۖ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ

﴿وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ هەڵمان گرتوون لە بەڕو وشكی دەریادا، واتە هۆی هات و چۆ و گەڕانمان فەراهەم هێناوە بۆیان لەهەر دووكیان دا كە بەڕاستی ئەوەش چاكە و بەهرەیەكی زۆر گەورە و گرنگە ﴿وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ رۆزی و هۆی ژیانمان پێ داون لەو هەموو شتە پاك و خاوێنانە، ئیتر لە خۆراك و پۆشاك و پێخەف و جل و بەرگ و شتەكانی تر، بەم شێوە گشتی یە تەفسیر كراوەتەوە، هەرچۆنێ تایبەتیش كراوە هەر بە خۆراك و خواردەمەنی یەوە، لەبەر ئەوەی شێوە گشتی یەكەم بەلاوە باشتربوو كردم بە تەفسیر بۆی، خوا باش ئەزانێ، ﴿وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ باومان داوون بەسەر زۆریان بەسەر هەموو لەو شتانەی كە دروستمان كردوون بە باودانێكی گەورە. لە یەكەم جارەوە فەرموی: ئەوەكانی ئادەممان رێزدار كردووە و لێرەش دا فەرمووی باومان داون، ئایا مەبەست لەو دووانە هەر یەك شتە، واتە باودانەكە بەو رێز گرتنەیە یان جیاوازن و باودانەكە بە شتێكی ترە؟ هێندێ لەسەر رای یەكەمن، هێندێ لەسەر رای دووەمن، بەم رەنگە مەبەست بە رێز گرتن ئەوە بێت كە باسمان كرد، مەبەست بە باودان ئەوە بێت كە كراوە بە جێنشین لە زەوی دا، یان باودانەكەی بەوە بێت كە خۆی توانایە بۆ دۆزینەوە و دانەبەری رێی راست و بیرو باوەڕی پاك، یان بە هەر جۆرێكی تر كە زانایان فەرموویانە. بەهەر حاڵ و لەسەر هەر بار ئادەمی بەهرەمەند كراوە بەوەی كە خۆی كراوە بە چاودێر و كار بەدەستی خۆی، بەپێی ئەوە سەرەنجام و بەرهەمی كردەوەو بیروباوەڕی هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە و لە گەردنی خۆی دایە وەك لەچەند ئایەت دا ئاگادارمان ئەكاتەوە بەوە و یەكێ لەو ئایەتانەی كە ئاماژە و دەست نیشان ئەكات بۆ ئەوە ئەمەیە كە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ﴾ باسی ئەو كاتە بكە كە ئێمە هەموو ئادەمی یەك بانگ ئەكەین بە پێشەواكەیانەوە، واتە دەفتەر و نامەی كردەوەكانیان یان بەرنامەكانیان. یان ئەو فروستادە و پێغەمبەرە كە باوەڕیان پێی بووە. یان ئەوەی كە كردوویانە بە پێشەوا و پەیڕەوی كراویان لە دنیادا، بە هەركام تەفسیر كراوەتەوە، هەرچۆنێ بەشێوەی گشتیش تەفسیر كراوەتەوە، ﴿فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ﴾ ئینجا هەركەسێك دەفتەری كردەوەكەی پێ بدرێ بە دەستی راستی یەوە،

فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي
ٱلْأٓخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا
غَيْرَهُۥۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾

---

**﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ﴾ ئەوانە نامەکەیان ئەخوێننەوە، واتە بە خۆشی و شادی یەوە ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ کەم و کوڕی یان لیٚ ناکریٚ لە ئەجرو پاداشت دا بە ئەندازەی پێستێکی بچووك و ناسك کە لەناو لەتی ناوکە خورمادایە کە ئەوە بەپیٚی باوی عەرەب وێنە و چیرۆکە بۆ کەمترین شت. واتە ئەوانە ئەجرو پاداشتی کردەوەکانیان بە تەواوی وەرئەگرن، بێگومان ئەوانەش کە نامەیان بەدەستی چەپ وەرئەگرن هەر ئەیخوێننەوە بەلاٚم لەبەر خەجاڵەتی و ترس و بیم لیٚ ی ورد نابنەوە، کەواتە خوێندنەوەکەیان وەك نەخوێندەوار وایە لەبەر ئەوە هەر باسی خوێندنەوەی دەستەی یەکەم دەکات و نەخشەی حاڵی دەستەی دووەم ئەکێشیٚ بە جۆریٚ کە هەر لە دنیادا سەرشۆڕ و ریسوایان ئەکات و ئەفەرمویٚ: ﴿وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ﴾ هەرکەسێك لەم دنیادا کوێر بووبێت و ڕێگەی ڕاست و ڕزگاری نەبینیبیٚ ﴿فَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دا کوێرە و ڕیٚ دەرناکات بۆ هۆی ڕزگاربوونی و گومڕا ترە لە کوێر و هەڵە و ون بوونی لە ڕێگە بەتیٚ ترە لەو ڕۆژەدا. چونکە لەو ڕۆژەدا ئامادەیی نامێنیٚ بۆ نەمانی گومڕاییو هەڵەکەی و گەڕانەوەی بۆ ڕیٚی ڕاست. خوا بە میهرەبانی خۆی پەنامان بدات.**

**لەسەرەتا و لە پێشەوە گوتمان مەبەستی سەرەکی ئەم سورەتە و ئەوەی کە ئەم سورەتە ئەخولێتەوە بەدەوری دا بریتی یە لە پێغەمبەری ئازیز و هەڵوێستی گەلەکەی بەرامبەر ئەو و ئەو قورئانەی کە ئەو هێنای، جا ئەوا لەم ئایەتانی داهاتووەدا کە کۆتایی سورەتەکەی پیٚ ئەهێنیٚ هەر بە دەوری ئەو مەبەستەدا ئەخولێتەوە. لە یەکەم جارەوە ئاماژە ئەکات بۆ هەوڵ**

و تەقەلای بت پەرستەکان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لادان و وازهێنانی لە هێندێ لەوەی بۆی هات لای خواوە. ئەو هەوڵ و تەقەلایەیان لەو بارەیەوە بە چەند جۆر و شێوەیەك بوو، یەکێ لەوانە ئەمەبوو کە ئەوان ساڵێ خواکەی ئەم بپەرستن و ئەویش ساڵێ بتەکانی ئەوان بپەرستێ، یان ئەوان خوا بپەرستن و ئەمیش وازبێنێ لە پووچەڵ کردنی بتەکانی ئەوان، یەکێ تر لە داوای ئەوان ئەمەبوو سەرۆکەکان ئەیان ویست کە کۆڕ و مەجلیسی تایبەتی و جیاوازیان بۆ دابنێ بەبێ تێکەڵی هەژار و بێ نەواکان. یەکێ تر ئەمە بوو کە هێندێ لە بت پەرستەکان داوایان ئەکرد کە خاکەکەی ئەوان بکات بە حەرەم وەك بەیت کراوە بە حەرەم. هەروەها هەوڵ و تەقەلایان ئەدا وەك لە چەند ریوایەتێك دا هاتووە، بەڵام خوا پێغەمبەرەکەی پاراست لەوەی لە رێگە و بەرنامە راستەکەی خۆی لابدات هەرچەند هەوڵەکەی ئەوان زۆر بەهێز بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر سوور بوو لەسەر بانگ کردن و راکێشانیان بۆ باوەڕهێنان و زۆر غەمبار بوو لە یاخی بوونەکەیان، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ﴾ بەڕاستی ئەوانە نزیك بوون لەوەی لات دەن کە وەحیمان بۆ کردی بۆ ئەوەی درۆ و دەست هەڵبەست بکەیت بە دەم ئێمە و شتێکی تر جیاواز لەوەی کە بۆمان ناردی و وەحیمان کرد بۆت ﴿وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾ ئەگەر ئەوەت بکردایە ئەو کاتە ئەییان گێڕایت و وەریان ئەگرتی بە دۆست و خۆشەویست بۆ خۆیان ﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾ ئەگەر ئێمە تۆمان دانەمەزراندایە لەسەر بار و رێگە راستەکەی خۆت، بەڕاستی نزیك بوویت لەوەی بەشێکی کەم لە کەمترین مەیلی دڵت بکردایە بۆ لایان، واتە بەهۆی دامەزراندنەکەی ئێمە تۆ نزیك نەبووی لەوە چ جای ئەوەی کەمترین مەیلت ببوایە، قورئان بەو جۆرە پاکی و بێگەردی پێغەمبەر(ﷺ) نیشان ئەدات، کەواتە گوێ ناگیرێ بۆ هێندێ ریوایەت کە هاتووە و ناڕێکە لەگەڵ قورئانەکەدا.

إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾

**﴿ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ﴾ ئەگەر تۆ نزیك بوویتایە لەو كەمترین مەیلە بۆ ئەوان بێگومان پێمان ئەچەشتی دوو چەندانەی سزای ژیان و دوو چەندانەی سزای مردن، ئیتر مەبەست بە ژیان ژیانی دنیا بێت یان ژیانی رۆژی دوایی وەك بە هەردوو تەفسیر كراوەتەوە ﴿ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾ ئینجا لەپاش ئەوە دەستت ناكەوێ بۆ خۆت یارمەتی دەرێك بەرامبەر ئێمە كە بەرگری ئەو سزایەت لێ بكات. ئەو هەڕەشە سامناكە و ئەو توندی و تیژیی یە كە بەكاری هێنا لەسەر لە نزیك بوونەوە لە بەشێكی كەم لە كەمترین مەیل، لەبەر پایە بەرزی و زۆر نزیكی پێغەمبەرە(ﷺ) لە خواوە، چونكە بەندە تا نزیك تر بێ هەڵە و گوناهی سەخت تر و بەتین ترە، چونكە هەڵەكەی ئەبێ بەهۆی چاو لێ كردنی كەسانی تر و بیم نەكردن لە گوناه. وێنەی ئەو هەوڵ و تەقەلای كە ئەو نەفامانە بەكاریان هێنا لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزدا(ﷺ) بە درێژایی مێژووی ئیسلام ستەمكاران بەكاریان هێناوە و ئەیهێنن لەگەڵ ئەو موسڵمانەی كە شوێنی پێغەمبەر كەوتوون لە بڵاوكردنەوەی بانگ و بانگەوازەكەی ئەودا. هەوڵ و تەقەللا دراوە و ئەدرێ بۆ لادانیان لە رێگە راستەكەیان. هەرچەند لادانێكی كەمیش بێت... رازی ئەبن بەیەك كەوتن لە ناوەڕاستی رێگەدا و لە رێوە داوای ئەوە ناكەن كە بە تەواوی واز بێنن لەبانگ و بانگەوازەكەیان، بەو جۆرە خەریك ئەبن لەگەڵیان تا بەرە بەرە هەڵیان خەڵەتێنن، لەناو هەڵگرانی بانگەوازەكەدا زۆر كەس بووە و هەیە كە هەڵ ئەخەڵەتێ. بەڵام لادان لەو رێگە راستەی خۆیان هەرچەند كەم بێت لە یەكەم جارەوە لەدوا رۆژدا سەرئەكێشێ بۆ لادانی تەواو، بێجگە لەوەش لادان لەهەر بەش و بەند و پارچەیەك لادانە لە هەموو ئیسلام، چونكە ئیسلام دەست نادات بۆ بەش بەش كردن.**

هەر کەس واز بێنێ لەهەر بەشێکی نیشانەیە لەوەی کە ئەو لادەرە باوەڕی تەواوی نی یە بە بانگ و بانگەوازەکەی. زۆردار و ستەمکارەکان بەرە بەرە خاوەن بانگەکان رائەکێشن جا هەرکاتێ چوون بەدەم ئەو زۆر دارانەوە لەهەر شتێك دا هەرچەند کەم و بچووك بێت نرخ و رێزی خاوەن بانگەکە ناهێڵێ و زۆر دارەکان ئەخاتە ئومێد بۆ کۆتایی نەهێنانیان تا بە تەواوی مەبەستی بەدی خۆیانیان لێ بەدی ئەهێنن. جا لەبەر ئەوە خوا منەتی نا بەسەر پێغەمبەرەکەی دا(ﷺ) بەمەی دامەزراوی کرد و پاراستی لەوەی کەمترین مەیل بکات بۆ ئەو نەفامانە. ئینجا کاتێ نەفامەکان نەیان توانی بەهیچ جۆر مەیلی پێغەمبەر(ﷺ) راکێشن بۆلای خۆیان و دەستە پاچەبوون لەوە ئینجا ویستیان بێ ئارام و ناچاری بکەن لە دانیشتنی مەککە، ئەوەشیان بۆ نەکرا، بەڵکو خوا فەرمانی داوە کە خۆی بەخۆی کۆچ بکات، چونکە ئەگەر ئەوان دەریان بکردایە بە دەست و بە زۆری خۆیان ئەبوو، خوا – بەپێی باوی خۆی – ئەوانەی لە ریشە بهێنایە و خوایش ئەوەی بڕیار نەدابوو وەك باسمان کرد. ئەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا﴾ بەڕاستی ئەوانە نزیك بوون لەوەی بە دوژمنایەتی و بە پیلان بێ ئارام و نارەحەتت بکەن لە خاکی مەککە بۆ ئەوەی دەرت بکەن لێ ی و بۆیان بەجێ بێڵی ﴿وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ئەو کاتە ئەوانە نەئەمانەوە لەپاش تۆ مەگەر کاتێکی کەم لەپاش دەر کردنەکەت ﴿ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا﴾ واتە باوی ئێمە بەو جۆرە هاتووە سەبارەت بە هەرکام لەو نێرراو و فروستادانەی کە رەوانەمان کردوون لەپێش تۆ، واتە هەر پێغەمبەرێکمان دەرکرابێ لەلایەن گەلەکەیەوە ئەو گەلەمان لەناو بردووە پاش دەرکردنەکەی، خوایش نەیویستووە قورەیش لەناو ببا و لە ریشەیان بێنێ لەبەر ئەوە بڕیاری ئەوەی نەدا قورەیش پێغەمبەری ئازیز دەرکەن(ﷺ)، بەڵکو فەرمانی پێدا کە خۆی کۆچ بکات و دەربچێ لە مەککە. ئەوەیە باوی ئێمە ﴿وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا﴾ دەستت ناکەوێ گۆڕاندن بۆ باو و رەوشتی ئێمە. ئینجا لەپاش ئەوە پەند و فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پەیوەندی و پەیوەستی خۆی بە خواوە و داوا کردنی کۆمەکی لەخوا، ئینجا رێگەکەی خۆی بداتە بەر، جاڕی سەرکەوتنی هەق و لەناوچوونی بەتاڵ بدات،

أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾
وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي
مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾

---

ئەفەرمویٚ: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ﴾ زانا و پێشەوایان دووبەرەکی یان هەیە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، دەستەیەك ئەفەرمون مەبەست بە ﴿دلوك﴾ ئاوا خۆرە و لادان و مەیلی بۆلای ئاوا بوون، مەبەست بە ﴿غسق﴾ هاتنی شەوە بە تاریکی تەواوە کە کاتی هاتنی عیشایە و فەرمانەکە هەر بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) دەستەیەکی تر ئەفەرمون: مەبەست بە ﴿دلوك﴾ لادانی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان کە کاتی نیوەڕۆیە، مەبەست بە ﴿غسق﴾ دەرکەوتنی تاریکی و هاتنی شەوەو فەرمانەکە بۆ گشتی یە. لەسەر رای یەکەم: واتە ئەی پێغەمبەر بە رێك و راستی نوێژ بەجێ بێنە لەکاتی ئاوا بوونی خۆرو لادانی بۆ ئاوا بوون هەتا هاتنی شەو بە تاریکی تەواوەوە کە کاتی عیشایە، لەسەر ئەم رایە ئەم فەرمانە تایبەتی یەی بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) جیاوازە لە پێنج فەرزەکە کە بۆ گشتی یە و کاتەکانیان دیاریی یە بە حەدیس و کردەوەی گشتی. لەسەر رای دووەم: نوێژ بەجێ بێنە بە رێك و راستی لەکاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانەوە هەتا هاتنی تاریکی شەو کە چوار فەرزی لێ وەردەگیرێ: نیوەڕۆ، عەسر، مەغریب، عیشا، فەرمانەکە لە یەکەم جارەوە بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) لەپاش ئەو بۆ هەمووانە ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ﴾ قورئانی فەجر بخوێنەوە لەسەر رای یەکەم. لەسەر رای دووەم بە رێکی بەجێی بێنە ﴿قرءان الفجر﴾ واتە نوێژی بەیانی بەوە ناوبراوە، چونکە قورئانی زۆری تێدا دەخوێنرێ ﴿إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ واتە بەڕاستی قورئانی فەجر یان نوێژی بەیانی هەمیشە کاتی ئامادە بوون و بەیەك گەیشتنی مەلائیکەی شەو و مەلائیکەی رۆژە وەك لە حەدیسێك دا هاتووە کە(ئیمامی ئەحمەد و نەسائی و ترمزی و ئیبنو ماجە) و کۆمەڵێك هێناویانە لە(ئەبو هورەیرە) ەوە هاتووە، مەبەست بەو مەلائیکەتانە نووسەرو

دەفتەر بە دەستی کردەوەی بەندەیانی خوان. ئەم رستەیە دەست نیشانە بۆ گەورەیی ئەم خوێندن و نوێژە و بۆ هۆی ئەو فەرمانە، بێجگە لەم دوو رایە دوو رای تریش هەیە بەلأم لای زانایان لاوازە، لەبەر ئەوە باسم نەکردن. لە نێوان ئەو دوو رایەدا رای دووەم لە دڵ دا بەهێزو جێگیرترە، چونکە حەدیسی سەحیح قوڵ گیری یەتی و زۆربەی زانایانی لەسەرە، لەسەر ئەم رایە ئایەتەکە دەست نیشان ئەکات بۆ کاتی هەر پێنج فەرزەکە، خوا باش ئەزانێ. ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ نوێژێکی تر بێجگە لەو نوێژانەی کە باس کران و پێ ی ئەگوترێ:(تهجد) واتە هەڵسانەوە لە شەودا بۆ نوێژ کردن لەپاش خەوتن، ئەم نوێژە بە تایبەتی فەرز کرا لەسەر پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) لە یەکەم جارەوە، لە پاشان پێویست کرا لەسەر موسڵمانانی تریش. ئینجا فەرزێتی لەسەر موسڵمانانی تر سڕرایەوە و هەر لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ﴾ بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوەو هەموو جۆرەکان هەر ئەم مەبەستە ئەگەیەنێ و ئەیگرنەوە: ئەی پێغەمبەر پێویستە لەسەرت هێندێ لە شەو، واتە هەڵسە و راست بەرەوە لە خەو لە هێندێ لە شەودا ﴿فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ﴾ واتە هەستە شەو نوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ﴿نَافِلَةٗ لَّكَ﴾ لەکاتێك دا ئەوە زیادە فەرزێکە بۆ تۆو هەر لەسەر تۆیە. ئینجا ئەو ئەرکی هەستانە سووك و ئاسان ئەکات لەسەر پێغەمبەر(ص) و دەست نیشان ئەکات بۆ هۆی پێویست کردنی ئەو ئەرکە، بەمەی کە ئەفەرموێ: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ چاوەڕوان و ئومێدەواربە پەروەردگارت بەهۆی ئەو نوێژ و قورئان و شەو نوێژو پەیوەندی یە هەمیشەیی یەت زیندووت کاتەوە لە رۆژی دوایی دا و داتمەزرێنێ لەجێ و رادە و پلەیەك دا کە سوپاس کراو بێت لە لایەن هەمووانەوەو لەلایەن پێشووەکان و دوایی یەکانەوە. واتە بێگومان ئەوەت پێ ئەبەخشێ چونکە بەڵێنی ئەو خستنە ئومێد و چاوەڕوانی لەلایەن خواوەیە و ئەبێ بەدی بێت. ئەو رادە و پلە بەرزە ئەگەر چی هەموو هۆی رێز و نرخ پێدان ئەگرێتەوە، بەلأم بەپێ ی حەدیس بەناوبانگە بە رادە و پلەی تکاکردن لای خوا بۆ دەست کردن بە محکمە و بڕینەوەی دووبەرەکی و ئاژاوەکانی دنیا.

﴿ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ ﴾ ئینجافەرمان ئەدات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە نزا بکات لای خوای خۆی. نزا بکات و داوا بکات کە داخلی بکات بە داخلْ کردنێکی راستەقینە کە جێگای رەزامەندی و شادمانی بێت، دەری بکات بە دەرکردنێکی راستەقینە کە هۆی رێز و خۆشی بێت. ئەو داخلْ کردن و دەرکردنە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە:

١- داخلْ کردن لە گۆڕ و دەرکردن لە گۆڕ لە رۆژی دوایی دا.

٢- داخلْ کردن لە مەدینە و دەرکردن لە مەککە.

٣- داخلْ کردنی لەو کارەی پێ‌ی سپێرراوە و دەرکردن لیْ ی بە هەستان پێ‌ی بە تێرو تەواوی.

٤- داخلْ کردنی لە گویْ رایەڵی و دەرکردن لە دنیا لە کاتێك دا هەڵسا بێت بە ئەرکی خۆی.

٥- داخلْ کردنی لەهەر شوێن و شتێك دا بە شێوەی گشتی و دەرکردنی لەهەر شوێن و شتێك دا بە شێوەی گشتی.

بەم شێوەی پێنجەمە باشتر لەدلْ دا جێگیرە، چونکە هەرکار و هەر شتیْ چەند بارێکی ببیْ لە کاتێك دا بگوتریْ و نەبەستریْ بە یەکێکیانەوە، بە شێوەی گشتی بگیریْ راست و رەوا ترە، بە تایبەت لێرەدا ئەم شێوە گشتی یە شایستە ترە لەگەلْ ئەو لوتف و میهرەبانی یە بیْ هاوتای کە خوا هەیەتی دەربارەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ﴿وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴾ ئەمەش بە چەند شتێك تەفسیر کراوەتەوە، لە نێو ئەوانەدا ئەمە بەهێزترە لە دلْ دا: بگێرە بۆم لەلایەن خۆتەوە، واتە نەك لەلایەن هیچ کەس و شتێکی ترەوە، دەسەلات و زۆر و نیشانە و بەڵگەیەك کە یارمەتی دەرم بێت و زاڵم بکات بەسەر هەر شتێك دا کە رێم لیْ بگریْ لە هەڵسانم بەم کارەی کە خراوەتە ئەستۆم،

وَقُل جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ
وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ

---

﴿ وَقُل جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ ﴾ بەڵێ ئیسلام و ئایینی ڕاست و دامەزراو هات، ئایینی ناهەق و بەتاڵ نەماو ڕۆیشت و گیانی دەرچوو. خوا فەرمانی دا کە بەو جۆرە بە بێ باك ئەم جارە بدات بە هەموو جیهان دا، چونکە خۆی لە پێشەوە فەرمانی پێدا ئەو نزایە بکات، کەواتە ئەبێ نزاکەی وەرگرتبێ و وەرگرتنی ئەو نزایەش ئەوە ئەگرێتەوە کە ئیسلام سەرکەوێ و پێچەوانەی ئیسلام بڕوا. بێجگە لەوەش هەق هەر بووە و ڕیشەی داکوتاوە لەناو بوونەوەردا و بەتاڵ لە دوایی دا پەیدا بووە و بێ ڕیشەیە، کەواتە بوون و دوا ڕۆژ هەر بۆ هەقە و بەتاڵ ئەبێ هەر بڕوا و نەمێنێ، وەك ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا﴾ بەڕاستی شتی بەتاڵ هەمیشە لە کوێ بووبێ ئەبێ هەر نەبێ و دامەزراو و جێگیر نەبووە و نابێ و بە چەسپانی ئەڕوا. بەتاڵ وەك کەف و چڵك و چەپەڵی لافاو دێت بە ڕووکەش بە بەرز و سەرکەوتوو ئەبینرێ، بەڵام بە زوویی ئەڕوا و نامێنێ.

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ لەم خوێنراوەیە کە قورئانە ئەمێنینە خوارەوە ئەی ئەوەی کە شیفا و ڕەحمەت و میهرەبانی یە بۆ باوەڕداران، واتە ئەم قورئانە شیفا و ڕەحمەتە بۆ باوەڕداران، بەڵێ لەم قورئانەدا شیفا و دەرمان و چارەسەر هەیە، لەم قورئانەدا ڕەحمەت و بەزەیی هەیە بۆ هەرکەسێك کە ڕووناکی و شیرینی باوەڕ تێکەڵی دڵی بووبێ، بەهۆی ئەوەوە شوعلە و ڕووناکی دابێتەوە و دەرگای دڵی کرابێتەوە بۆ وەرگرتنی نەسیم و ئارامی و ئاشتی. قورئان دەرمان و شیفایە بۆ وەسوەسە و بێ ئارامی دڵ و سەرگەردانی. چونکە دڵ پەیوەست ئەکات بە خواوە بەهۆی ئەوەوە بە ئارام و دامەزراوە و هەست ئەکات بە پەناو پارێزگاری خوا، ڕەزامەندە بە جۆرێ ڕازی یە لە خواو لە ژیان، بێگومان هەرکام لە بێ ئارامی و سەرگەردانی و وەسوەسە نەخۆشی و ماندوویەتی یە، جا لەبەر ئەوە قورئان میهرەبانی و ڕەحمەتە بۆ بڕواداران. لە قورئان دا دەرمان و چارەسەر هەیە بۆ ئارەزووی بەدی نەفس و چەپەڵی و حەسادەت و تەماع، دیارە ئەوانەش دەرد و ئافاتی دڵن و دووچاری نەخۆشی و لاوازی و ماندوویەتی ئەکەن، بەرە و ڕووخان و نەمان ئەیبەن، جا

لەبەر ئەوە قورئان ڕەحمەت و میهرەبانی یە بە باوەڕ داران، لە قورئان دا شیفا و چارەسەر هەیە بۆ هەست و بۆچوون و بیرو باوەڕی ناڕەوا و بەد و خراپ.

بەم جۆرە ژیریی ئەپارێزێ لە لادان و پەڕاگەندەیی، ئازادی و سەربەستی پێ ئەدات لە کارو کردەوەی بەسوود و بەرهەم دار، جڵەوگیریی و بەرگری ئەکات لە بەخت کردنی هێز و وزەکەی لە شتی بێ سوودا، لەسەر بەرنامەیەکی ڕێك و ڕاست کارو کردەوەی ئەبا بەڕێوە. تێکۆشان و بزووتنەوەکەی بەرهەم دار ئەکات و ئەیپارێزێ لە هەڵە و پەڕاگەندەیی، هەروەها لەبارەی لەشەوە هێزو وزەکانی بەکار ئەهێنێ بە میانەیی و بە بێ زیادە ڕەوی و کەم و کوڕی، کەواتە نە پەنگ و پیشی پێ ئەخواتەوە، نە بەرەڵاشی ئەکات بە بێ جڵەو گرتنەوە. کەواتە ئەم قورئانە ڕەحمەت و میهرەبانی یە بۆ باوەڕداران، لە قورئان دا شیفا و چارەسەر هەیە بۆ هەموو دەردەکانی کۆمەڵایەتی کە کۆشکی گەل و کۆمەڵ تێك ئەدەن و ئارامی و ئاشتی یەکەی نامێڵن. کەواتە گەل و کۆمەڵ ژیان بەسەر ئەبەن بە داد پەروەریی ئارامی و ئاشتی. جا کەواتە ئەم قورئانە ڕەحمەت و میهرەبانی یە بۆ باوەڕداران، بەڵام ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ ستەمکارە بێ باوەڕەکان زیاد ناکات بێجگە لە زیان و خەسارەت مەندی. کەواتە ئەوانە سوود وەرناگرن و بەهرەمەند نابن بە شیفا و ڕەحمەتەکەی، ئەوانە هەمیشە ژیان بەسەر ئەبەن بە خەشم و ڕق و داخەوە بەهۆی بەرزی و سەرکەوتنی باوەڕدارانەوە، بەهۆی لاری و سەرکێشی یەکەیانەوە هەمیشە زیادە ڕەوی ئەکەن لە ستەم و تاوان دا، ئەوانە لە دنیادا بەو جۆرە دەژین، لە ڕۆژی دواییش دا سزا ئەدرێن بەهۆی بێ باوەڕی و تاوان و زیادە ڕەوی یان لە عیناد و سەرکێشی یەکەیان دا...

هەرکەسێك بەشدار بێت لە شیفا و ڕەحمەتی ئەم قورئانەدا ئەو کەسە بەهرەمەندە و لە هەموو کار و ڕووداو و بەسەرهاتێك دا ڕێك و ڕاست و دامەزراوە، بەڵام هەرکەسێك بێبەش بێت لەو شیفا و ڕەحمەتە، ئەو کەسە لە هەموو کار و بەسەرهاتێك دا ناڕاست و ناڕێکە و نە بەرگەی خۆشی ئەگرێ و نە ناخۆشی. بەم جۆرە ئەبێت کە ئەم ئایەتە دەست نیشانی بۆ ئەکات ﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾ کاتێ چاکە و بەهرەی خۆمان بڕێژین بەسەر ئادەمی دا، ڕوو وەرئەگێڕێ لە باس و یادی ئێمە و لە خۆی ئەگۆڕێ و دوور ئەکەوێتەوە و تەنیشت و لارە ملمان تێ دەکات،

وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾
وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئْنَا
لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ

﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا﴾ کاتێ ناخۆشی و شەڕ و زیانی لێ بکەوێ و دووچاری ببێ زۆر نائومێد ئەبێت و هەمیشە غەمبارە. جا لێرەدا نرخ و پیرۆزی باوەڕ دەرئەکەوێ کە خاوەنەکەی ئەپارێزێ لە خۆگۆڕان و نائومێدیی، بەڵکو لەکاتی خۆشی دا گوێ رایەڵ و کل کەچ تر ئەبێ و لەکاتی ناخۆشی دا دنیای لێ نایەتە یەك و نائومێد نابێ. خوا بە میهرەبانی خۆی دڵ و دەروونمان پڕ بکات لەو باوەڕە، ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ﴾ ئینجا ئاگادارمان ئەکات و بۆمان روون ئەکاتەوە کە هەرکەس کردەوەی بە پێی رێگە و رێباز و بۆچوونێکە کە سروشتی دامەزراوە لەسەری و بە گوێرەی حاڵ و باری خۆیەتی. ئەوەش بەس خوا خۆی ئەزانێ وەك ئەفەرموێ: ﴿فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا﴾ کەواتە پەروەردگارتان زاناترە و زانینی تەواوی هەیە بە هەرکەسێك کە روون تر و چاکترە لەبارەی رێگە و رێباز و مەزهەبەوە، لەبارەی پەیڕەوی کردنی بۆ هەق و راستی.

ئینجا دێتە سەر باسی پرسیارێك کە ئاراستەی پێغەمبەر کرا(ﷺ) ئیتر ئەم پرسیارە لە لایەن قورەیشەوە بووبێ لەسەر قسەی جوولەکەکانی مەدینە یان لە رێوە لەلایەن جوولەکەوە بووبێت لە مەدینەدا ئاراستەیان کردبێ، ئەمەش لەسەر ئەم رایە کە ئەم ئایەتە و حەوت ئایەتی تر بەدوای ئەم دا مەدینەیی بێ، ئەم رایەش بەهێزە لای زانایان، ئەم پرسیارەش لە رۆحە کە چی یە؟ چەند رایەك هەیە لێرەدا کە مەبەست بە رۆح چی یە؟ بەهێزترین را کە کۆمەڵ و جەماوەریشی لەسەرە مەبەست ئەمەیە کە لە لەشی ئادەمیدایە و بەهۆی ئەوەوە زیندوو زانایە و کارو کردەوە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەوانە پرسیارت لێ ئەکەن لەبارەی رۆحەوە کە چی یە؟ ﴿قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى﴾ لە وەڵام دا بڵێ: رۆح لە کارو پیشەی پەروەردگارمە و زانینی تایبەتی یە بەوەوە و لەو شتانەیە کە زانینەکەی بە هیچ کەس نەداوە، لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە – خوا لێ یان رازی بێت – کە قورەیش(نضری کوڕی حرث و عوقبەی کوڕی ئەبو معیط) یان نارد بۆ لای

زاناکانی جووله‌که‌ی مه‌دینه و گوتیان: ئه‌وانه زانان و پرسیاری محمدیان لێ بکه‌ن، ئه‌وانیش هاتن و ئه‌و پرسیاره‌یان کرد، جووله‌که‌کانیش پێ یان گوتن پرسیاری سێ شتی لێ بکه‌ن: اصحاب الکهف، ذی القرنین، رۆح، ئه‌گه‌ر وه‌ڵامی هیچ کامی نه‌دایه‌وه، یان وه‌ڵامی هه‌رسێکی دایه‌وه ئه‌وه پێغه‌مبه‌ر نی یه، ئه‌گه‌ر وه‌ڵامی هێندێکی دایه‌وه‌و بێ ده‌نگ بوو له هێندێ تر ئه‌وه راسته پێغه‌مبه‌ره، ئینجا ئه‌و پرسیاره‌یان لێ کرد و ئه‌ویش وه‌ڵامی دووانه پێشووه‌که‌ی دایه‌وه و بێ ده‌نگ بوو له سێ یه‌م وه‌ك له ته‌وراتیش دا وه‌ڵام نه‌دراوه‌ته‌وه. دیاره قورئان شتی بێ سوود ناکات، که‌واته وه‌ڵامی شتێ نه‌داته‌وه که پێویست بێت و له سنووری توانینی خه‌ڵکی دا بێت، ئه‌وه نابێ به ده‌م به‌ستن و ده‌ست به‌سه‌را گرتنی ژیریی و له‌کار خستنی به‌ڵکو ئه‌وه ته‌مێ و ئامۆژگاری یه که ژیریی کاری بێ هوده نه‌کات و له سنووری زانینی خۆی تێنه‌په‌ڕێ. جا له‌به‌ر ئه‌وه که پرسیاری رۆحیان لێ کرد خوا فه‌رمانی دا که وه‌ڵام بداته‌وه به‌وه‌ی رۆح له‌و شتانه‌یه تایبه‌تین به خواوه و زانینی هه‌ر لای ئه‌وه، زانینی ئاده‌می سنووری تایبه‌تی خۆی هه‌یه و به ئه‌ندازه‌ی پێویستی به‌کاروباری جێنشینی یه‌که‌ی زانینی پێ به‌خشراوه که به‌شێکی که‌مه له زانینه بێ سنووره‌که‌ی خوا، وه‌ك ئه‌فه‌رموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ هه‌ر به‌شێکی که‌م له زانینتان پێ به‌خشراوه. به‌ڵێ ئه‌و زانینه که به‌خشراوه به هه‌موو ئاده‌می له یه‌که‌م که‌سه‌وه تا دواترین که‌س هه‌ر چاو نادات له‌چاو زانینه بێ سنووره‌که‌ی خوا که هه‌رگیز کۆتایی نایه‌ت، ﴿وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ سوێند به‌خوا ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ و مه‌یلمان ببێ ئه‌وه‌ی که وه‌حیمان کردووه بۆلات نایهێڵین و به ته‌واوی مه‌خفی ئه‌که‌ینه‌وه به جۆرێ هیچ نیشانه و دروشمێکی نه‌مێنێ. واته هه‌رچۆنێ زانینی رۆحمان لێ قه‌ده‌غه کردووی، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ئه‌و قورئانه‌ش که وه‌حیمان بۆ کردووی و ئه‌یزانی، ئه‌گه‌ر مه‌یلمان ببێ ئه‌و قورئانه‌ش ناهێڵین و مه‌خفی ئه‌که‌ینه‌وه و بێ ئاگا ئه‌بێ لێ ی وه‌ك پێش هاتنی بێ ئاگا بووی لێ ی، ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا﴾ ئینجا له‌پاش ئه‌و نه‌هێشتن و مه‌خف کردنه‌وه ده‌ستت ناکه‌وێ بۆ خۆت هیچ وه‌کیلێك به‌سه‌ر ئێمه‌وه که ئه‌وه‌ی مه‌خفمان کردووه‌ته‌وه بیگێڕێته‌وه بۆت. ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ واته هیچ هۆیه‌کت نابێ و ده‌ستت ناکه‌وێ بۆ گێڕانه‌وه‌ی مه‌گه‌ر میهره‌بانی یه‌ك له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارته‌وه و ئه‌و میهره‌بانیت پێ بکات بۆ گێڕانه‌وه‌ی. به چه‌ند جۆرێکی تریش ته‌فسیر کراوه‌ته‌وه، به‌ڵام ئه‌مه‌ی که گوتمان به‌لامه‌وه به‌هێزتره.

إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرٗا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا
ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا
ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ﴿٨٩﴾ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا
مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا
﴿٩١﴾ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾

---

**﴿إِنَّ فَضۡلَهُۥ كَانَ عَلَيۡكَ كَبِيرٗا﴾ بەڕاستی فەزڵ و چاکەی ئەو بەسەرتەوە گەورەیە. هەرچۆنێ ڕۆح لەو شتە نهێنی یانەیە کە تایبەتی یە بە خواوە، هەروەها قورئانیش لەو شتە گرنگانەیە کە هیچ کەس ناتوانێ وێنەی بلێ و لاسایی بکاتەوە، ئەم دووانە نموونەی شتە تایبەتی یەکانن بەخواوە، ڕۆح نموونەی نهێنی یەکانە و قورئان نموونەی ئاشکراکانە، ئەفەرموێ: ﴿قُل تَكُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ و جاڕ بدە لەناو هەمووان دا بەمەی ﴿لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و جین یەك بگرن و هەموو پێکەوە هەوڵ بدەن و بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ﴿لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ﴾ وێنەی ناهێنن و ناتوانن و دەستە پاچەن لەوەی وێنەی بێنن تەنانەت ﴿وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾ با لە کاتێك دا هێندێکیان کۆمەك بن بۆ هێندێکی تریان و یەکتر کۆمەکی یەکتر بن، واتە بە هیچ کلۆجێ ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ئەو جاڕە درا و ئەو بەر لێ بڕینەوە کرا و هیچ کەسیش نەیتوانی و هەرگیز ناتوانێ، ئەم قورئانە تەنها وشە و وتەیەکی ڕووت نی یە کە خەڵکی بتوانن لاسایی بکەنەوە، هەرچەند پێك هاتووە لە وێنەی پیت و وشەو وتەکانیان، بەڵکو وەك هەموو دەست کردەکانی تری خوا وایە و لاسایی ناکرێتەوە، بۆ وێنە ئەم خاکە خەڵکی خشت و کاشی و پەیکەر و ئامێرو شتەکانی تری لێ دروست ئەکەن، بەڵام خوا ئادەمی لێ دروست ئەکات کە بەهۆی گیانەکەیەوە هەموو کەس داماو و دەستە پاچیە لە ئاستی. ئینجا ئەم قورئانە بەرنامەیەکی تێرو تەواو و ڕاست و ڕەوای ژیانە لە هەموو بار و ڕوویەکەوە کە چارەسەرە بۆ هەموو گیرو گرفتی گەل و ئەندامی گەل، یاساکانی ڕێك و گونجاون لەگەڵ سروشت دا: بەرنامەکەی بە جۆرێکە کە دەست نادات بۆ بژارە و دەست تێ**

خستن و گۆڕانکاری، تاقانە موعجیزەیەکە کە لە هەموو کات و چەرخێك دا ڕاست و ڕەوایی ئەم ئایین و پەیامە ڕوون ئەکاتەوە، تا دنیا دنیایە شتە نهێنی یەکانی بەرە بەرە دەرئەکەون. لە چەرخی یەکەم و پێشوودا بەری بڕی یەوە لەهەموو عەرەب کە بتوانن وێنەی کەمترین سورەتی بێنن لەگەڵ ئەوەدا بە زمانی خۆیان هاتبوو، هەوڵ و تەقەلای تەواویان دا و لە سەرەنجام دا کە هیچیان بۆ نەکرا ناچار بوون کە بڵێن ئەمە سیحر و جادووە. بە کورتی ئەوا قورئان بەری بڕی یەوە لە هەموو ئادەمی و جین دەی هەرکەس ئازایە بێتە مەیدان و بێگومان هیچ کەس ناتوانێ، کەواتە هەموو ناچار ئەبن کە بێنە ژێر سایە و پەنای و دان بنێن بەوەی قورئان هەقە!! خوای میهرەبان لەم قورئانە بێ وێنەدا ئەوەی کە هۆی ڕێنموونی یە بۆ بەندەکانی و هەست و دەروونیان ڕاکێشێ بۆ وەرگرتنی هەق باسی فەرمووە بە چەند جۆر و شێوەیەك، لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی خەڵکی هەر سپڵەیی و بێ باوەڕییان دایە بەر، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ سوێند بەخوا چەند جار و چەند بارمان کردووەتەوە بۆ خەڵکی لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە مەبەستێکی نایاب کە لە شیرینی و نایابی دا وەك پەند و چیرۆك وان. ئەوەمان کرد بۆ ئەوەی ئەوانە باوەڕ بێنن و گوێ ڕایەڵ بن ﴿فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ کەچی زۆربەی خەڵکی سەرپێچی کرد لەمل کەچی و باوەڕ هێنان، هەر سپڵەیی و بێ باوەڕی گرتەبەر و دایە بەر، ئەو کۆمەڵە سەرکێش و یاخی یە ئەم پەڵپ و بیانووە جۆر بەجۆرەیان ئەگرت بۆ باوەڕ هێنانیان کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا﴾ ئەوانە ئەیان گوت: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا﴾ هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین هەتا چەشمەیەك و ڕووبارێك هەڵنەقوڵێنی بۆمان لە زەوی یەکەدا، واتە زەوی مەککە کە بێ ئاو بووە و ئاوی زۆر کەم بوو، ﴿أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ﴾ یان بە تایبەتی باغ و بێستانێك ببێ لە خورما و ترێ. ﴿فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا﴾ ئینجا چەند جۆگە و ڕووبارێك شەق بکەیت بە نێوان و ناو بەناوی دا بە زۆری ﴿أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا﴾ یان ئاسمان بە پارچە پارچەیی بڕوخێنی و بیخەیت بەسەرمان دا هەرچۆنێ لافت لێداوە و ئێمەت ترساندووە بەوە – مەبەستیان ئەو ئایەتەیە کە ئەفەرموێ: ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾، ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا﴾ یان خوا مەلائیکە بێنێ بەکەفیل وشایەت لەسەر ڕاستی قسەت یان بیان هێنێ و ڕوو بەڕوو بیان بینین،

أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا
نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ
ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ
مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ﴿٩٥﴾

---

**﴿أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ﴾ یان کۆشك وماڵێکت ببێ لە ئاڵتوون رازاوە بە نەخش و نیگار، ﴿أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ یان بەرز بیتەوە بەرەو ئاسمان و بۆ ئاسمان ﴿وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥ﴾ هەرگیز باوەڕ ناهێنین لەبەر بەرز بوونەوەکەت هەتا نامەیەك نەهێنیتە خوارەوە بەسەرمان دا کە بیخوێنینەوە، واتە نامەیەك لە لایەن خواوە کە فەرمانمان پێ بدا بە باوەڕ هێنان. ئەو نەفامانە تێگەیشتن و بۆچوونیان لاواز و کەم و کورت بوو لەوەی چاو هەڵخەن بۆ ئەو هەموو موعجیزە جۆر بەجۆرانەی کە قورئان خستنی یە بەرچاویان، بەهۆی ئەوەوە داوای ئەو شتانەیان ئەکرد لە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بەو شێوە منداڵانە وڕك و بیانوویان ئەگرت بۆ باوەڕ هێنانیان، سەرنجی ئەو موعجیزە ئاشکرایان نەئەدا کە قورئان بەری ئەبڕی یەوە لێ یان پێ ی و داماو و دەستە پاچە بوون لە ئاستی خوا خۆی ئەزانێ و بە دەست خوایە هێنانی موعجیزە، بە پێ ی زانین و کاردروستی خۆی ئەیهێنێ. بە دەست پێغەمبەر نی یە و کاری ئەو نی یە تەنانەت داوا کردنیشی هەرکاری ئەو نی یە و ئەبێ ئەو بە مل کەچی یەوە بوەستێ بە دیاری کار و بڕیاری خواوە، جا لەبەر ئەوە بەرامبەر ئەو داوا و پەڵپی ئەوانە فەرموی: ﴿قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارم و پەروەردگارم پاك و بێگەردە، مەبەست بەم فەرمودەیە دەربڕینی سەرسوڕمانە لە نەفامی و نەزانی ئەوانە کە نازانن ئەو جۆرە شتانە تەنها بە دەست خوایە.**

**یان نەفامی و نەزانی و بێ شەرمی یان لە هێندێ لە داواکانیان کە ئەوپەڕی بێ ئەدەبی و بێ شەرمی تێدایە وەك داوای هێنانی خوا! یان مەبەست بەرپەرچ دانەوە و دەم کوت کردنی ئەوانەیە لەسەر ئەو بۆچوون و نەزانی ئەوانە، یان بۆ گەیاندنی هەردوو مەبەستەکەیە کە ئەم فەرمودەی بەدوای دا دێت رێك و گونجاوە بۆ هەرکام بۆ هەردوو ﴿هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا﴾ ئایا من هیچ کەسێکم بێجگە لە ئادەمی یەکی فروستادە و نێرراو؟ واتە لە سنووری ئادەمێتی خۆم دام و ناتوانم تێپەڕ بکەم لێ ی، بەپێ ی پەیامەکەی خۆم کار و کردەوە ئەکەم،**

پێغەمبەرانی پێش منیش هەر ئادەمی بوون و هاتوون بۆ سەر گەلەکانیان بە موعجیزەیەك كە خوا دیاریی کردبوو رەوانەی کردبوو پێی، کاری موعجیزە و هێنانی بەدەست ئەوان نەبووە، کەواتە منیش هەروەك ئەوان وام، بە جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتەوە بەلاّم هەر ئەمە ئەگرێتەوە. نەفامەکانی پێش و ئەمانیش زۆر بە دوور و ناڕاستیان دائەنا کە پێغەمبەر ئادەمی بێت، بەڵکو ئەبێ مەلائیکە بێت، جا لەبەر ئەوە یەکێ لەو شتانەی کە بەرگری ئەکردن لە بڕوا هێنان ئەوە بوو کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ئادەمی بوو، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴾ هیچ شتێ بەرگری خەڵکی نەکرد لەوەی خەڵکی باوەڕ بێنن کاتێ کە ڕێنموونی و ئایینی هەقیان بۆ هات، بێجگە لەوەی ئەیانگوت: ئایا خوا ئادەمی رەوانە ئەکات بە فروستادە و نێرراوی خۆی، واتە نەخێر کاری وا ناڕاستە و هەرگیز خوا ئادەمی ناکات بە فروستادەی خۆی، واتە هیچ بڕ و بیانوویەکی تریان بە دەستەوە نەما بێجگە لەوەی کە چۆن پێغەمبەر ئادەمی ئەبێ؟ ئەو نەفامانە نەیان ئەزانی پێغەمبەر ئەبێ لە جۆر و تیرەی ئەو گەلە بێت کە بۆی رەوانە کراوە، نابێ جیاواز بن وەك لە چەند شوێنێك دا بە درێژیی ئەوەمان روون کردەوە، کەواتە کاتێ مەلائیکە ئەکرێ بە فروستادە و پێغەمبەر کە گەلەکەی هەموو مەلائیکەن وەك دەست نیشان ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر لە زەوی دا مەلائیکە ببونایە بە جۆرێ بگەڕانایە بە دامەزراوی و نیشتەجێی بە وێنەی ئادەمی. بێگومان ئەمان هێنایە سەریان لە ئاسمانەوە فریشتەیەکی فروستادە، یان فریشتە بە فروستادە بۆ سەریان، کەواتە ماتووڵ ئەوانە ئادەمین و فریشتە نین نابێ فروستادە و پێغەمبەرەکەیان فریشتە بێت، بەڵکو ئەبێ ئادەمی بێت وەك خۆیان تا بتوانن پەیڕەوی بکەن و فەرمانی خوای لێ وەرگرن. بەڵێ بەهۆی جیاوازی سروشتی ئادەمی و مەلائیکە ناگونجێ مەلائیکە ببێ بە پێغەمبەر و فروستادە بۆ سەر گشتی، بەڵکو بەس ئەبن بە فروستادە بۆ سەر پێغەمبەران، چونکە ئەمان خوا نەفسێکی پاك و پاڵفتەی پێ بەخشیون و بە جۆرێکی دروست کردوون دوو سیفەت و باریان هەیە: بارو سیفەتی فریشتەیی، بارو سیفەتی ئادەمی، بە بارو سیفەتی یەکەم شت وەرئەگرن لە مەلائیکە و بە سیفەت و باری دووەم ئەوەی وەری ئەگرن رای دەگەیەنن بە ئادەمی. ماتوڵ باوی خوا بەو جۆرە هاتووە: ئەوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە دەمەقاڵێ و دەمە دەمێ یان لەگەڵ ئەکات، کاروباری خۆی و ئەوان حەواڵەی خوا بکات، خوا بکات بە شایەت لەسەریان، ئەوچۆنیان لەگەڵ بیکات. لە کاتێك دا با خەبەر و بینایە بە شایەت بە بەندەکانی،

قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ
فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا
وَبُكْمًا وَصُمًّاۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾

ئەفەرموێ: ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْۚ﴾ بڵێ پێ یان بەسە خوا بە شایەت لە بەینی من و بەینی ئێوەدا ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ بەڕاستی خوا هەمیشە ئاگا و بە خەبەر و بینایە بە بەندەکانی... دیارە ئەم فەرمودەیە بۆنی هەڕەشە و ترساندنی لێ دێ، سەرەنجام و دوا ڕۆژەکەیشی ئەخشە ئەکێشێ لە شێوەیەکی سەخت و ترسێنەر لە ڕووداو و بەسەرهاتە سامناکەکانی ڕۆژی دوایی دا، ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ﴾ هەرکەس خوا ڕێنموونی بکات و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست هەر ئەو کەسە ڕێنموونی وەرگرە و کەوتووەتە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿وَمَن يُضْلِلْ﴾ هەرکەسیش خوا گومڕای بکات ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦۖ﴾ هەرگیز دەستت ناکەوێ بۆیان بێجگە لەو دۆست و یارمەتی دەران و کۆمەك کە بیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ﴾ زیندوویان ئەکەینەوە و حەشریان ئەکەین لە ڕۆژی دوایی دا بەسەر ڕوو و دەم و چاویان دا بەم ڕەنگە لە باتی قاچ و پێ یان بە ڕوو دەم و چاویان ئەگەڕێن و ئەچن بەڕێوە وەك لە حەدیسی سەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە. یان بەسەر ڕووا ڕائەکێشرێن بەناو دۆزەخ دا وەك لە حەدیسی(ئیمامی ئەحمەد و نەسائی) دا هاتووە، هیچ دژایەتیش نابێ لە نێوان ئەم دوو حەدیسەدا بەمەی یەکەم ببڕین بەسەر ئەوەدا کە کاتێ لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ئەگەڕێن بەسەر ڕوودا. دووەم ببڕین بەسەر ئەوەدا ئەخرێنە ناو دۆزەخ و ڕائەکێشرێن بەسەر ڕوودا، خوا بە میهرەبانی خۆت پەنامان بدە لەوە و بمانپارێزە لە ئاگر – آمین – ﴿عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّاۖ﴾ واتە زیندوویان ئەکەینەوە بەسەر ڕووەکانیان دا لە کاتێك دا کوێرن و لاڵن و کەڕن، چونکە لە دنیادا خۆیان کوێر کرد لە دیتنی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە ڕوونانە، خۆیان لاڵ کرد لە گوتنی هەق، خۆیان کەڕ کرد لە بیستنی هەق ﴿مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ﴾ قەرارگا و شوێنی نیشتەجێ یان دۆزەخە ﴿كُلَّمَا خَبَتْ﴾ هەرجارێ بڵێسەی ئەنیشێتەوە بە نەمان و توانەوەی پێست و گۆشتەکانیان، هەرجارێ بڵێسەکەی دامرێتەوە ﴿زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا﴾ زیادیان ئەکەین لەبارەی بڵێسەی ئاگرەکەوە، بەم ڕەنگە ئەو پێست و گۆشتە خوراوانە وەك خۆیان لێ دەکەینەوە.

ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا وَرُفَـٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا
﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ
أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّـٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا
لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾

---

**﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم﴾ ئـەوەی کـە بـاس کـرا تۆڵـەی ئەوانەیـە ﴿بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ بـەهۆی ئـەوەی باوەڕیـان نـەهێنا بـە ئایەتـەکانی ئێمـە: ئایەتـە قورئـانی یـەکان و ئایەتـە بوونـەوەری یـەکان ﴿وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا وَرُفَـٰتًا﴾ ئەیان گوت: ئایا ئەگەر ئێمە ببین بە ئێسك و پـارە پارەی رزیـو ﴿أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ ئایا ئێمە زیندوو کراوە ئەبین بە دروست کردنێکی تازە؟ واتە نەخێر شـتی وا نـەگونجاوە و هـەرگیز نـابێ. هـەر بـە قورئـان ئەکـەوێ شـت بـاس بکـات و بیخاتـە بەرچاو، ئەوەتا قسەکەی ئەو نەفامانە وا نیشان ئەدات وەك ئێستا رۆژی دوایـی بێـت و دنیا و قسە و باسەکەی ئەوان ئەما بێت و ئێستا بۆمان باس ئەکات ﴿بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا وَ قَالُوا﴾ وێنەی ئـەوە زۆرە لـە قورئـان دا، بەڕاسـتی بـەکار و کاریگـەرە لـە دەروون دا کـاتێ کـە بـیری لـێ ئەکرێتەوە، قورئان لە چەند ئایەتێك دا مەسەلەی زیندوو بوونەوە بە ئاسانی روون ئەکاتـەوە بە جۆرێ هەرکەسێك فامدار بێت و هێزی ژیریی لەکار نەکەوتبێ هیچ گومـانی نـامێنێ وەك لێرەدا ئەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى﴾ ئایـا ئەوانـە نـەیان زانیـوە بـە زانینێکـی تـەواو وەك بەچاو ببینرێ ئەو خوایەی کە ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئاسمانـەکان و زەوی دروست کـردووە ﴿قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ﴾ دەسـەڵات دارو توانایـە بەسـەر ئـەوەی کە وێنـەی ئەوانـە دروسـت بکات. بەڵێ بەڕاستی هەرکەسێك توانا بێت بەسـەر دروسـت کردنـی ئـەم بوونـەوەرە گـەورە و گرنگـەدا کـە ئەمانـەی تێـدا دروسـت کـردووە، بێگومـان ئـەو کەسـە توانایـە بەسـەر دووبـارە کردنـەوەیان، بەڵکو ئـەبوو بـە ئاسـان تریان بزانیایـە، بەڵام کەچاوی دڵ و ژیریـی نابینـابوو هیچی لەگەڵ ناکرێ. ئەو نەفامانە کە یەکەم جار ئەم قورئانەیان چوو بە گوێچکەدا بە وێنـەی بێ باوەڕەکانی ئەمڕۆ بە تەواوی کوێر نەبوون، ئەیان زانی کە خوا داهێنـەر و دروسـت کـەری ئـەم بوونـەوەرەیە کەچـی لـەم بارەیـەوە بـە کوێری تـەواو بـوون و باوەڕیـان نـەبوو بـە زینـدوو**

کردنەوەو دووبارە کردنەوە! بێ باوەڕەکانی ئەمڕۆ هەموو کات و چەرخێك چاریان ناچارە و ئەبێ دان بنێن بەوەی داهێنەری ئەم بوونەوەرە تەنها خوایە، چونکە ئایا خۆی خۆی دروست کرد؟ ئایا لە خۆیەوە و بە رێکەوت پەیدا بوو؟ دیارە هیچ کەس ئەبێ لە رووی نەیەت خۆی بکات بە خاوەنی هیچ کام لەم دوو بارە، کەواتە هەر باری سێ یەم ماوەتەوە کە کەسێکی تر دروستی کردووە کە ئەو کەسەش هەر خوای تاك و تەنیا و بێ وێنەیە، والحمد لله رب العالمین.کەواتە با هیچ کەسێك خۆی شێت نەکات و هەموو بەجارێ بڵێین: پەروەردگار و داهێنەر تەنها خوایە کە مردووەکان زیندوو ئەکاتەوە ﴿وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾ گێڕاویەتی و دیاریی کردووە بۆیان کات و ماوەیەك کە گومانی تێدا نی یە و شایستە نی یە بۆ گومان تێدا بوون، کات و ماوەی ژیانیان، یان کات و ماوەیەك بۆ زیندوو کردنەوەو دووبارە کردنەوەیان. ﴿فَأَبَى ٱلظَّـٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا﴾ ئینجا ئەو ستەم کارانە کە باوەڕیان نەهێنا بە ئایەتەکانمان و بە رۆژی دوایی لەگەڵ روون و ئاشکرایی بەڵگە و هەق دا، ئەوانە سەرپێچی یان کرد و بێجگە لە سەر کێشی و عیناد و ئینکاری هیچی تریان نەکرد و نووسان بەو بارە لارو چەوتەوە.

ئەو سەرکێشە بێ باوەڕانە کە ئەو پەڵپ و بەهانە ناڕەوایانەیان ئەگرت لە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) و داوای کۆشکی ئاڵتوون و چەشمە و کانیاو رووبار و باخاتیان ئەکرد لێ ی خۆیانَ ئەوپەڕی رادە رژد و چرووك و چنگ قوچراو بوون تا ئەو رادەی ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ﴾ بڵێ بەوانە: ئەگەر ئێوە خاوەنی غەزنەکانی چاکە و نیعمەتەکانی پەروەردگارم بن کە بە لێشاو هەموو بوونەوەری داگیر کردووە، ئەگەر ئێوە خاوەنی ئەوانە بن ﴿إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ﴾ ئەو کاتە دەست پێوە ئەگرن و راگیری ئەکەن لەبەر مەترسی نەبوونی و نەمان و تەواو بوون لە کاتێك دا کە غەزنەکانی خوا هەرگیز دوایی نایەت و کەم و کوڕی روویان تێ ناکات. بەڕاستی ئەوە ئەوپەڕی رادەیە لە چرووکی دا ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ قَتُورًا﴾ ئادەمی هەمیشە رژد و چرووکە و پیشە و سروشتی هەر وا هاتووە، ئینجا ئەمەی کە تیرەی ئادەمی بە سروشت ئاوا و بەو جۆرەیە دژی ئەوە نی یە زۆر لە ئەندامەکانی زۆر دەست گوشاوە و بە بێ دەست گرتنەوە بەخشایشی هەیە.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ
يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى
لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾

**ئینجا ئەچینەوە سەر پەلپ و بەهانەکانی نەفامەکان و ئەلێین: بەلگەو موعجیزەی زۆر باوەڕ پێك ناهێنێ لە دلی بێ باوەڕان دا، ئەوەتا موسا(علیه السلام) نۆ موعجیزەی گەورە و روونی پێ بەخشرا، کەچی کاری نەکرد لە فیرعەون و کۆمەلەکەی تا خوا لەناوی بردن وەك ئاماژە ئەکات بۆ ئەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ﴾ بەڕاستی بەخشیمان بە موسا نۆ موعجیزەی روون و ئاشکرا، رای بەهێز لەسەر ئەوەیە بریتین لە دار دەستەکەی و کولە و قوڕباق و خوێن و ئەسپێ و هەلْ قولینی ئاو لە بەرد و لەت بوونی دەریاکە تا دوازدە شەقامی لێ پەیدا بوو، هەلکەندن و بەرز کردنەوەی شاخەکە بەسەر ئیسرائیلی یەکانەوە و راگیر کردنی وەك لە سورەتی(الأعراف) دا باس کرا. هەروەها دوو رای تریش هەیە لە مەبەست بەو نۆ ئایەتە با سەرنجی کتێبەکانی تەفسیر بدرێ. ﴿فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ﴾ ئەم ئایەتە بە چەند جۆرێك تەفسیر کراوەتەوە:**

**١- واتە موسامان رەوانە کرد بۆ سەر ئیسرائیلی یەکان و ئینجا پێمان گوت کاتێ چوو بۆلایان: داوا بکە لە فیرعەون کە وازیان لێ بێنێ با بێن لەگەلْ تۆ و بکەونە شوێنت.**

**٢- موسامان رەوانە کرد بۆ سەر ئیسرائیلی یەکان و ئینجا پێمان گوت: کاتێ چوو بۆ لایان پرسیار بکات لێ یان لەبارەی باوەڕ و ئایینەکەیانەوە.**

**٣- نۆ موعجیزەمان بەخشی بە موسا کاتێ چوو بۆ سەر ئیسرائیلی یەکان، ئینجا ئەی محمد پرسیار بکە لە ئیسرائیلی یەکان لەوەی رووی دا لە نێوان موسا و فیرعەون دا کاتێ موسا چوو بۆلای ئیسرائیلی یەکان، یان پرسیار بکە لە ئیسرائیلی یەکان لەو نۆ موعجیزە و ئایەتانە تا دەرکەوێ بۆ بت پەرستەکان راستی تۆ و ئەوەی تۆ گوتت رێك بوو لەگەلْ تەورات دا، یان بۆ ئەوەی تۆ دلخۆش ببی، یان بۆ ئەوەی بزانی ئەگەر ئەوەی گورەیش داوایان کرد لە تۆ بەدی بهاتایە هەر باوەڕیان نە ئەهێنا و سوور ئەبوون لەسەر عیناد و سەرکێشی خۆیان. ئەمە لەسەر ئەم خوێندنەوە کە ئێستا باوە،**

لەسەر ئەو خوێندنەوەی کە ئێستا باو نی یە: واتە بەخشیمان بە موسا نۆ موعجیزەی روون ﴿فَسْـَٔلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ﴾ ئینجا موسا داوای لە ئیسرائیلی یەکانی کرد لە فیرعەون، یان پرسیاری کرد لێ یان لە بارەی باوەڕ و ئاییننیانەوە کاتێ چوو بۆ لایان، لەسەر هەر بار موسا چوو بەدەم فەرمانی خواوە.

﴿فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ﴾ ئینجا فیرعەون وتی: ﴿إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا﴾ بەڕاستی ئەی موسا من گومانت پێ ئەبەم و وا گومان ئەبەم تۆ جادو لێ کراوی و ژیرییت تێك چووە بەهۆی ئەوەوە ئەو لاف و قسە بێ جێ و ناڕاستانە ئەکەیت. بەڵێ باوی سەرکێش و ستەمکاران هەر بەو جۆرەیە، بەڵام موسای رەوانە کراوی خوا کە هێزی هەق و راستی پێ یە، دڵ ئارامە بە کۆمەك و یارمەتی خوا، بە بێ باك بەرپەرچی قسەکەی فیرعەونی دایەوە و بە درۆی خستەوە و ﴿قَالَ﴾ پێی فەرمو: ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ﴾ بێگومان تۆ زانیوتە کە هیچ کەس ئەو موعجیزانەی نەهێناوەتە خوارەوە بێجگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی لە کاتێك دا ئەو موعجیزانە شتێکی روون و ئاشکران و هۆی دیتن و بینایی دڵ و ژیرین، واتە تۆ لە رادەیەك دای کە ئەوە ئەزانی یان ئەوەندە روون و ئاشکرایە بێگومان ئەیزانی، بەڵام سەرکێشی بەکار ئەهێنی و ناتەوێ دان بنێی بەو شتە راستەدا. کەواتە من نە جادوو بازم و نە جادوم لێ کراوە تا سەرم لێ شێوا بێت. ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا﴾ بەڕاستی من گومان ئەبەم کە تۆ – ئەی فیرعەون – نەفرین لێ کراوی، وەك(ئیبن و عەباس) ئەفەرموێ. – خوا لێ یان رازی بێت – یان بە هیلاك دا چووی وەك(حسن و مجاهد) ئەفەرمون. یان لادراو لەخێر و دامەزراو لەسەر شەڕ و خراپە وەك(فراء) ئەفەرموێ. بێگومان موسا(علیه السلام) بە باشی و بە یەقین و روونی زانیوویەتی کە فیرعەون بەو جۆرەیە، بەڵام بە شێوەی گومان نیشانی دا ئەوەش بە پێی باوێکە لە باوەکانی رەوان بێژیی کە پێی ئەگوترێ:(مشاكلة) واتە هاو وێنەیی. هاو وێنەیی قسەکەی فیرعەون کە گوتی: ﴿إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا﴾. واتەی ﴿علمتَ﴾ بە ﴿علمتُ﴾ خوێنراوەتەوە واتە بەڕاستی من زانیومە. بەم جۆرەش هەر رێکە و هیچ تەئویلی ناوێ و بە پەرچ دانەوەکەش بەهێزترە، خوا خۆی باش ئەزانێ. ئینجا بەپێی باوی ستەمکار و سەرکێشان فیرعەون هاتە سەر ئەوە زۆر و هێز بەکار بێنێ.

فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟
ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا
﴿١٠٥﴾ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟

---

**﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ ئینجا فیرعەون نیازی کرد کە موسا و کۆمەڵەکەی دەرکات لە زەوی. واتە زەوی و وڵاتی میسر، یان لە وڵات بە شێوەی گشتی بەم ڕەنگە بیان کوژێ و لەناویان بەرێ، دیارە لەو کاتەدا باوی خوا دێتە پێشەوە کە ستەم کار لەناو بەرێ و زۆر لێ کراوان شاد بکات بەجێ و شوێنەکەی ئەوان، وەك ئەفەرموێ: ﴿ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴾ ئینجا ئێمەش فیرعەون و هەموو ئەوانەی لەگەڵی بوون لەناومان بردن پێکەوە ﴿ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ ﴾ گوتمان بە نەوەکانی ئیسرائیل لەپاش فیرعەون و لەناوبردنی: دامەزرێن و نیشتەجێ بن لەو زەوی یەی کە فیرعەون ویستی دەرتان بکات لێ ی، ئیتر خۆتان یان نەوەی پاش ئەو چینە، ئەگونجێ مەبەست زەوی خاکی شام بێت ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴾ ئینجا کاتێ بەڵێنی جاری دوایی هات، واتە ڕۆژی زیندوو بوونەوە، ئەو کاتە ئێوەیش و ئەوانیش ئەهێنین هەموو پێکەوە بە تێکەڵی و بۆ ئەوەی هەرکەس بگات بە بەرهەمی کارو کردەوەی خۆی و ئەو بار و حاڵەی شایستەیە بۆی، ئینجا ئەگەڕێتەوە سەر باسی قورئان کە چۆن هاتووە و بۆچی هاتووە، ئەفەرموێ: ﴿ وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ﴾ وتەی ﴿حق﴾ لە هەردو شوێنەکەدا بە چەند شتێ تەفسیر کراوەتەوە، هێندێکیان دوورە و هێندێ نزیك، لە نێوان نزیکەکان دا ئەوەی لە دڵ دا بەهێز و جێگیر ترە ئەمەیە: یەکەم بریتی یە لە حیکمەت و لێزانی و کاردروستی یە کە داخوازە بۆ هێنانی و هێنانە خوارەوەی قورئان. مەبەست بە دووەم ئەو بیرو باوەڕو بڕیارانەیە کە لەم قورئانەدا هاتووە. واتە قورئانمان هێناوەتە خوارەوە هەر بەو حیکمەت و لێزانی و کاردروستی یەی کە داخوازە بۆ هێنانە خوارەوەی. هەر بە شتی هەق و ڕاست و ڕەواوە هاتووەتە خوارەوە، واتە هەرچی لەم قورئانەدا هاتووە ڕاست و ڕێك و ڕەوایە، ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾ تۆمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بە موژدە دەر بە باوەڕ دار و ترسێنەری بێ باوەڕ. واتە کاری تۆ لە فروستادەیی یەکەت دا هەر ئەوەیە و ئیتر هیچی ترت بەدەست نی یە و لەسەر تۆ نی یە.**

بێگومان ئەم قورئانە هات بۆ ئەوەی ئوممەت و میللەتێك پێك بێنیٰ و پەروەردەی بکات، یاسا و شەریعەتێك داهێنیٰ و راگیر و دامەزراوی بکات، ئینجا ئەو ئوممەت و میللەتە رایگەیەنن بە هەموو دنیا بە پێی بەرنامەیەکی تێرو تەواو، جا لەبەر ئەوە ئەم قورئانە هات بە بەش بەش و بەرە بەرە بە پێی رووداو و پێویستی. پەروەردە و پێگەیاندن بە یەك جار نابیٰ، بەڵکو ماوەی دوور و درێژی ئەویٰ، ئەم قورئانە هات بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی کردەوەیی بێت. نەك هەر تێروانین و زانینی رووت بێت. کەواتە نەئەبوو بە یەك جار بهاتایە، وەك ئاماژە و دەست نیشان ئەکات، ئەفەرمویٰ: ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ﴾ قورئان و خوێنراوەیەکمان بەش بەش و پارە پارە کرد. واتە بەو شێوە هێنامانە خوارەوە بۆ سەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﴿لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ﴾ بۆ ئەوەی بە وەجبە وەجبە بە پێی رووداو و بەرژەوەندی. ﴿وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا﴾ لەباتی وتەی ﴿انزلناه﴾، ﴿نزلناه﴾ بەکار هێنراوە بۆ قورئان، رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە واتای ئەو دوو وتەیە جیاوازە، یەکەم هێنانە خوارەوە بە یەك جار و بە یەك وەجبە، دووەم بە چەند جار و وەجبە وەجبە. جا بۆ تەمێشتنی بوونی دژایەتی ئەڵێین: هەردوو بارەکە بەسەر قورئان دا هاتووە وەك لە چەند ریوایەتێك دا هاتووە لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوایان لیٰ رازی بێت – کە ئەفەرمویٰ: قورئان بە یەك جار و یەك وەجبە هاتە خوارەوە لەلایەن خواوە لە(لوح المحفوظ) ەوە بۆلای مەلائیکە نووسەرە بەرێزەکان لە ئاسمانی یەکەم، ئینجا ئەوانیش بەش بەشیان کرد بەسەر جوبرەئیل دا لە بیست شەودا، جوبرەئیلیش وەجبە وەجبەی کرد لە بیست ساڵ دا، لە ریوایەتێك دا لە بیست و سیٰ ساڵ دا.. هتد. لە ریوایەتێکی تردا لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لیٰ یان رازی بێت – قورئان بە یەك وەجبە هاتە خوارەوە لە شەوی(لیلة القدر) دا و دانرا لە(بیت العزة) دا لە ئاسمانی یەکەم، ئینجا بە وەجبە وەجبەیی هێنرایە خوارەوە... هتد. ئینجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کە روو بە رووی ئەوانە بوەستیٰ بەم وتە هەقە و لیٰ یان گەڕیٰ خۆیان کام رێگا ئەدەنە بەر، ئەفەرمویٰ: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر پیٰ یان بڵیٰ: ﴿ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟﴾ باوەڕ بێنن بەو قورئانە یان باوەڕ نەهێنن، واتە باوەڕ هێنان و باوەڕ نەهێنانتان یەکسانە بۆی و هیچ پێویستی بە ئێوە نی یە، نە باوەڕ هێنانتان رادە و پلەی ئەو بەرز ئەکاتەوە نە باوەڕ نەهێنانتان هیچ کەم و کوڕی ئەگەیەنیٰ پێی، ئێوە هیچ نرخێکتان نی یە، ئەوانەی کە رێز و نرخ دارن و زانان باوەڕیان پێی هەیە و کاتیٰ بخوێنرێتەوە بەسەریان دا سوژدە ئەبەن بۆ خوا بە گریانەوە، کەواتە باوەڕ هێنان و باوەڕ نەهێنانی ئێوە یەکسانە و هیچ نرخێکی نییە،

إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ
وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ

---

ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ﴾ بەڕاستی ئەوانەی کە زانینیان پێ بەخشراوە لە پێش هاتنی ئەم قورئانە، واتە ئەو زانایانەی کە نامە ئەکەنەوە لە یەکتر. ئەو زانایانە ﴿إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ کاتێ ئەم قورئانە ئەخوێنرێتەوە بەسەریان دا. ﴿يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا﴾ بە چەسپانی ئەکەون بە ڕووەکانیان دا وەك لە(ئیبن و عەباس) ەوە ڕیوایەت کراوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – بە سوژدە بردنەوە لەبەر بە گەورە گرتن و ڕێز دان بە فەرمانی خوا. یان لەبەر سوپاس و ستایشی خوا لەسەر بەدی هێنانی ئەو بەڵێنەی کە لەو نامانەدا هەبووی و موژدەی دابوو بە هاتنی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) و وەسف و نیشانەکانی باس کردبوو ﴿وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ﴾ ئەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان و پاکە لە هەموو عەیب و لەکەیەك کە یەکێ لەوانە خیلاف وەعد و بەڵێن و پەیمان شکاندنە ﴿إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾ بەڕاستی هەمیشە وەعد و بەڵێنی پەروەردگارمان پێك هێنراو و بەدی هێنراوە و هەر بەو جۆرە هاتووە. بێگومان سوژدە بریتی یە لە کەوتن بەسەر تەوێڵ و لوت دا، کەواتە لەبەرچی باسی چەناکە ئەکات و کەوتنەکە تایبەتی ئەکات بە چەناکەوە؟(زەمەخشەری) لە وەڵام دا ئەفەرموێ: لەکاتی کەوتن بەسەر ڕوودا نزیك ترین بەش لە ڕووی سوژدە بەر بۆ زەوی و جێگە سوژدەکە چەناکەیەتی، کەواتە کەوتن بەسەر ڕوودا تایبەتی یە بە چەناکەوە وەك لەبەر ئەو بێت. ئەم وەڵامە هەرچەند بەجێ یە، بەڵام وەڵامی خاوەنی(فەرائید) بەلامەوە پەسەند ترە کە ئەفەرموێ: باسی چەناکە بۆ زیادە ڕەوی یە لە خۆدان بەسەر تەوێڵ و لوت دا تا ڕادەیەك چەناکە ئەلکێنێ بە زەوی یەوە. ئینجا کاتێ پێویستیمان بەم وەڵامانە ئەگەر بەو شێوە تەفسیری نەکەینەوە کە باس کرا و ڕیوایەت کرا لە(ئیبن و عەباس) ەوە – خوا لێ یان ڕازی بێت – ئەگەر بەو جۆرە تەفسیر بکرێتەوە کە گوتمان ئەو کاتە هیچ گرێ یەك نی یە و وەڵامی ناوێ: ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ﴾ ئەکەون بەسەر ڕوودا لە کاتێك دا ئەگریەن، ئەم دووبارە کردنەوەیان لەبەر جیاوازی حاڵ و کاتە، یان لەبەر جیاوازی هۆکەیانە، بەم ڕەنگە هۆی یەکەم سوپاس و ستایشی خوایە لەسەر بەدی هێنانی بەڵێنی خوا کە لە نامە پێشووەکان دا پێ ی دان، هۆی دووەم کار کردنی ئامۆژگاری و پەندەکانی قورئانە کە هێنانیە گریان.

وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴿١١١﴾

---

**﴿وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ قورئان بە خوێندنەوە و بیستنەکەی ئەوانە زیاد ئەکات لەبارەی مل کەچی و سام و بیم لە خوا، هەرچۆنێ زانین و یەقین و باوەڕەکەیان زیاتر ئەکات. لە(ئیبن و عەباس) ەوە ریوایەت کراوە - خوایان لێ رازی بێت - کە رۆژێ پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) نوێژ ئەکات لە مەککە، ئینجا نزا و هاوار ئەکات لە خواو ئەفەرموێ: ﴿یا الله، یا رحمن﴾، ئینجا هاوبەش رەوا دەرەکان ئەڵێن: سەرنجی ئەمە بدەن، جڵەوگیریی ئێمە ئەکات لەوەی دوو خوا بپەرستین، کەچی خۆی دوو خوا ئەپەرستێ بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ﴾. هێندێ ئەفەرمون: نامەدارەکان گوتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) تۆ باسی ﴿رحمن﴾ کەم ئەکەیت و خوا لە تەورات دا باسی زۆر کردووە. بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. جا لەسەر رای یەکەم، واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانە: نزا و هاوار بکەن لە خوا بە وتەی ﴿یا الله﴾ یان بە وتەی ﴿رحمن﴾، بەهەرکام یەکسانە و هەردوو ناون بۆ خوای تاك و تەنیا، پەرستراوەکە هەر یەك پەرستراوە. لەسەر رای دووەم: بڵێ پێ یان: خوا بە وتەی(الله) ناو ببەن یان بە وتەی ﴿رحمن﴾ بە هەرکام لەو دووانە یەکسانە و ناوبردنی بەهەرکام جوان و شیرینە، وەك ئەفەرموێ: ﴿أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ بەهەرکام لەو دوو ناوە ناوی ببەن هەر بۆ خوا هەیە ناوە شیرینەکان کە پاك و بێگەردی و گەورەیی خوا ئەگەیەنن و نیشانی ئەدەن، واتە بەهەرکام لەو دوو ناوە خوا ناوبەرن جوان و شیرینە، چونکە هەموو ناوە جوانەکان هەر بۆ خوایە، ئەو دوو ناوەش لەو ناوە شیرینانەن، ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و ترمزی و نەسائی و دەستەیەکی تر لە(ئیبن و عەباس) ەوە ئەگێڕنەوە - خوا لێ یان رازی بێت - کە پێغەمبەر(ﷺ) لە مەکە خۆی داشارد بوو لە بێ باوەڕەکان، ئینجا کاتێ نوێژی دەکرد بە یارەکانی، بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا ئەخوێند، ئینجا کاتێ بێ باوەڕەکان گوێ یان لێ دەبوو وتەی پیس بە دەمیان دا دەهات دەربارەی خوا و قورئان و خۆی. بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ دەنگ بەرز**

مەكەرەوە بە نوێژەكەت، واتە بە خوێندنی قورئان لە نوێژەكەت دا تا ئەوان نەیبیستن ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ نهێنی مەكە پێی تا رادەیەك هاوەڵەكانت نەیبیستن ﴿وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ لەنێوان ئەو دوو بارەدا رێگایەكی میانە بدەرە بەر.

لەسەرەتاوە قاپی سورەتەكەی كردەوە بە سەناو ستایشی خوا لەسەر چاكە و بەهرەكانی بە تایبەتی چاكە و بەهرەی شەو رەوی پێ كردنەكەی كە بە هیچ بەندەیەكی تری نەداوە، ئینجا كۆتایی سورەتەكە ئەهێنێ بە فەرمان دان بە سوپاس و سەناو ستایش كردنی و دان نان و باوەڕ كردنی بە تاك و تەنیایی خوا بە بێ رۆڵە و هیچ هاوبەشێك، پاك و خاوێنی لە هیچ جۆرە پێویستی بە هیچ كەس و بە هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك، ئەفەرموێ: ﴿وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ: هەموو سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە كە ﴿ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ رەوا و بڕیاری نەداوە بۆ خۆی هیچ جۆرە رۆڵە و كوڕ و كچ ج جای ئەوە ببێ ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ﴾ نەبووە و نی یە بۆ هیچ هاوبەشێك لە خوایەتی و پادشایەتی دا ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ﴾ نەبووە و نی یە بۆ هیچ بەرگری كەرێك یان دۆست و یارمەتی دەرێك لەبەر زەلیلی و ناتەواوی ژێر دەستەیی یەك كە رووی تێ بكات، چونكە خوا پاك و بێگەردە لەهەر جۆرە لەكە و كەم و كوڕی، كەواتە دۆست و یارمەتی دەری هەیە، بەڵام ئەو دۆستایەتی و یارمەتی دانە لەبەر پێویستی خوا نی یە، بەڵكو ئەوە بەهرە و چاكەیەكە كە لە لایەن خواوە بۆ سەر دۆست و یارمەتی دەرەكە ﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا﴾ خوا بە گەورە بگرە بە گەورە گرتنێكی تێرو تەواو، وتەی ﴿تكبير﴾ لە زمانی عەرەب دا ئەوپەڕی رادە نیشان ئەدات لە بارەی رێز پێدان و بەرزو بڵندی دا. كە هیچ وتەیەكی تر نایگاتێ، بە وێنەی وتەی عیبادەت دا كە ئەو پەڕی رادە ئەگەیەنێ لە زەلیلی و ژێر دەستەیی دا و هیچ وتەیەكی تری پێ ناگات. خوا بە گەورە و بەرز و بڵند بگرە لە رەوا دانی ئەولاد و هاوبەش و زەلیلی و ناتەواوی و هەر شتێ كە شیاو و شایستە نی یە بۆ خوای تاك و تەنیا.

ئینجا لە كۆتایی دا ئەگەڕێمەوە سەر ئەو ناوە جوان و شیرینانەی كە لە ئایەتی پێشوودا دەست نیشانی بۆ كردن، ئەو ناوانەی كە(٩٩) ناوە و لە حەدیس دا ئەفەرموێ: هەركەسێك باسیان بكات و بیان ژمێرێ و باوەڕی پێ یان هەبێ ئەچێتە بەهەشت: ئەو ناوە شیرینانە زانایان تەفسیریان كردوونەتەوە لە چەند نامە و وتاری تایبەتی دا، ئەو ناوە پیرۆزانە لە حەدیسی ئیمامی ترمزی دا بەم جۆرە هاتووە: ﴿الله لا إله إلا هو الرحمن الرحيم الملك

القدوس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبار المتكبر الخالق البارىء المصور الغفار القهار الوهاب الرزاق الفتاح العليم القابض الباسط الخافض الرافع المعز المذل السميع البصير الحكم العدل اللطيف الخبير الحليم العظيم الغفور الشكور العلى الكبير الحفيظ المقيت الحسيب الكريم الرقيب المجيب الواسع الحكيم الودود المجيد الباعث الشهيد الحق الوكيل القوى المتين الولى الحميد المحصى المبدىء المعيد المحيى المميت الحى القيوم الواجد الماجد الواحد الأحد الصمد القادر المقتدر المقدم المؤخر الأول الآخر الظاهر الباطن الوالي المتعالى البر التواب المنتقم العفو الرؤوف الرحيم مالك الملك ذوالجلال والاكرام المقسط الجامع الغني المغني المانع الضار النافع النور الهادي البديع الباقي الوارث الرشيد الصبور﴾.

ئەی خوای پەروەردگار و میهرەبان بە شایەتی تۆ و هەموو مەلائیکەتەکانت و هەموو گیانی پاکی پێغەمبەرانت ئەوا من باوەڕی رێك و راستم هەیە بەم ناوە پیرۆزانەت و داواکارم کە لێم خۆش بیت لە هەموو گوناهەکانم کە بە تۆ قەسەم زۆرن و نایەنە ژمارە بۆم و سەرشۆڕ و خەجاڵەتم لە ئاستیان. داواکارم لێت بەو ناوە پیرۆزانە، هەروەها داواکارم کە ببوری لە گوناهی دایك و باوکم و برا و خوشك و هەموو کەس و کار و دۆستانم و هەموو ئەوانەی کە مافیان هەیە بەسەرمەوە، داواکارم کە ئەم تەفسیرەم لیٚ وەربگری و بیکەی بە مایەی روو سوری و پەنادانم لە سەرشۆڕی وداماوی و خەجاڵەتی رۆژی دوایی.

خوای گەورە یا مجیب السائلین یا غافر الذنوب ئەم داوایانەم وەرگرە و بۆ دەریای بیٚ سنووری لیٚ بوردن و میهرەبانیت هیچی تیٚ ناچیٚ یا رب العالمین یا من له الأسماء الحسنی.

## والحمد لله أولا و آخر و صلى و سلم على سيدنا و شفيعنا محمد و على آله و صحبه أجمعين.

لە رۆژی(جمعه) یازدە و دوازدەی مانگی(جمادی الأولی) ی ساڵی(١٤١٣) ی کۆچی لیٚ بوومەوە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز لە دێی بێتواتە. لە یەکەم جارەوە دەستم پیٚ کرد لە هەڵەبجە لە ئاخری ساڵی(١٩٧٦) ئینجا گیراین لەلایەن حکومەتی بەعسی ستەمکارەوە، ئینجا بۆ جاری دووەم هەر لەو ساڵەدا نقڵ کراین بۆ سجنی سلێمانی و لە پاشان نقڵ کراین بۆ شاری سەماوە. ئینجا نقڵ کراین بۆ رۆمیثە تا بەرەڵا کردنی گیراوەکان بە گشتی.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ

# سورەتی(الکهف)
# مەککەیی یەوە(١١٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

زۆربەی ئایەتەکانی ئەم سورەتە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی لەمەوپێش ئەگێڕێتەوە، و مەبەستیٚ کە هەموو سورەتەکە ئەگرێتەوە بۆی بریتی یە لە: راست کردنەوەو رێك و پێك کردنی عەقیدە و بەرنامەی تێڕوانین و بیرکردنەوە، دانانی نرخە بۆ شتێك نرخ دارە بە پیٚ ترازووی عەقیدە کە ئەوەیش بریتی یە لە ئیمان و کردەوەی چاك، لە یەکەمجارەوە عەقیدە روون ئەکاتەوە بە جۆریٚ هیچ تەم و مژی بەسەرەوە نامێنیٚ بەم جۆرە: خوا ئەم قورئانەی ناردووەتە خوارەوە و محمد(ﷺ) بەندەی خوایە، هەرچۆن ئەو خەڵکە بەندەی خوان، خوا هیچ هاوبەش و رۆڵەی نی یە، کتێبەکەی واتە قورئان لاریی تێدا نی یە، ئەفەرمویٚ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ واتە هەموو سوپاس و سەناو بەچاکە ناوبردن بۆ خوایە کە ناوی(الله) یە و شایانی کەسێکە کە ئەو کتێبە گەورەی هێناوەتە خوارەوە، واتە قورئان بۆ سەر بەندەی خۆی واتە محمد(ﷺ)، بێگومان هەموو سوپاس و سەنایە ئەگەڕێتەوە بۆ خوا و تەنها شایانی خوایە، چونکە خاوەنی هەموو نیعمەت و چاکەیەکە، خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانیٚ وەسف و سەنای خۆی بکات، بەخۆی ئەکەویٚ زیاتر لە هەموو کەس. جا بەو پیٚ یە لەم سورەتەدا قاپی ئەکاتەوە بەو سوپاس و سەنا شیرینە. لەناو ئەو هەموو نیعمەت و چاکەی بیٚ شومارەدا نیعمەتی هێنانە خوارەوەی قورئانی باس کرد کە قورئان گەورەترین نیعمەت و چاکەی خوایە بەسەر ئادەمی یەوە، چونکە قورئان ئادەمی لە هەموو جۆرە تاریکی یەکەوە دەرهێنا بۆ رووناکی. گەیاندی بە پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی، فێری بەرنامە و یاسایەکی کردن کە تەنیا بەو بەرنامە و یاسایە هەموو کاروباری هەردوو جیهانی رێك و پێك ئەبیٚ بیٚ هیچ کەم و کوڕی یەك، چونکە قورئانەکەی بە جۆرێکە بیٚ رەخنە و بیٚ لەکەیە لە هەموو بارو روویەکەوە،

وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ
يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ
قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ
أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾

وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ﴾ هیچ جۆرە لاری و چەوتی یەکی دانەناوە و رەوای نەداوە بۆ ئەو کتێبەی کە هێنایە خوارەوە بەم رەنگە وتارەکەی ناڕێك بێت، یان مانا و مەبەستەکانی دژ و پێچەوانەی یەکتر بن. یان شتێکی تێدا بێت کە ژیریی ساغ وەری نەگرێ. یان هەموو مەبەستەکانی نەگەڕێتەوە بۆلای خوا و بۆ خوا نەبێ. یان زیادە رەوی، یان کەم و کورتی تێدا بێت، یان هەر جۆرە لادان و لاری یەکی تر، بەڵکو رێك و پێك و راستە لەهەموو روویەکەوە، وەکو ئەفەرموێ: ﴿قَيِّمًا﴾ [1] واتە ئەو کتێبەی هێنایە خوارەوە رێك و راستە و لە هەموو شتێك دا ناوەڕاستی گرتووە بێ لادان بۆ هیچ لایەك و بۆ هیچ بارێ، مەبەست لە هێنانە خوارەوەی ئەم کتێبە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ﴾ واتە بۆ ئەمەی بترسێنێ ئەوانەی کە باوەڕی پێ ناهێنن بە عەزابێکی زۆر بەتین لە لایەن خۆیەوە کە هیچ ناتوانێ سزا بدات بە وێنەی سزای ئەو ﴿وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ ئەمەی موژدە بدات بە ئیماندارەکان ﴿ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە کردەوە چاکەکان بەجێ ئەهێنن، واتە بە کردەوەی چاك راستی ی ئیمانەکەیان روون ئەکاتەوە، موژدە بدات بەم ئیماندارانە ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا﴾ بەمەی کە پاداشتێکی شیرینیان بۆ هەیە لەلای خوا ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾ کە ئەمێننەوە لەو پاداشتەدا کە بەهەشتی هەتا هەتایی یە بە بێ بڕانەوەو کۆتایی هاتن ﴿وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾ واتە بۆ ئەمەی بترسێنێ کەسانێ کە وتویانە خوا رۆڵەی بڕیار

---

[1] بە دوو جۆری تریش تەفسیر کراوەتەوە: *خاوەنی هەموو بەرژەوەندی بەندەکانە و چاودێریی هەموو شتێکە بۆیان. *چاودێر و شایەتە لەسەر راستی هەموو کتێبەکانی خوا. ئەم دووبارەش هەر جوان و شیرینە.

داوە بۆ خۆی، واتە رۆڵەی هەیە، ئەوانەیش وەکو بت پەرستەکانی عەرەب کە ئەیان وت مەلائیکە کچی خوایە، هەروەها جوولەکە عوزەیر بە کوڕی خوا دائەنێن و هەروەها گاور ئەڵێن عیسا کوڕی خوایە. لە پێشەوە ترساندنی بە شێوەیەکی گشتی باسی کرد، چونکە قورئان بۆ ترساندنی هەمووان هاتووە، لێرەدا ترساندنەکەی دووبارە کردەوە بە تایبەتی بۆ ئەم کۆمەڵە بۆ ئەمەی دەرکەوێ کە کوفری ئەمانە ئێجگار گەورەیە و تاوانەکەیان زۆر زلە و باسی ئەو شتەی نەکرد کە ئەیانترسێنێ پێی، چونکە لە یەکەم جارەوە فەرموی، کەواتە پێویست ناکات بە دووبارە کردنەوە. ئینجا ناڕاستی ی و ناڕەوایی ئەم باوەڕەیان روون ئەکاتەوە ئەفەرموێ: ﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ﴾ واتە ئەوەی کە وتویانە، نە خۆیان زانا بوون پێ ی و نە ئەو باوك و باپیرەیان کە ئەم باوەڕەی ئەمانیان هەبووە، خۆ عەقیدە و باوەڕیش ئەبێ لە زانینەوە بێت، کەواتە وتراوەکەیان زۆر بێ جێ یە: ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً﴾ واتە ئای وشە و وتەکەیان لە ناشیرینی و ناڕەوایی دا زل و ناهەمووارە!! ﴿تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ کە وشەیە کە لە دەمیان دەرئەچێ بێ بیر لێ کردنەوە، واتە ئەوەندە ناڕەوایە شایانی ئەوە نی یە کەس باوەڕی پێ ی هەبێ و بیڵێ مەگەر یەکێك دەمی بترازێ و لە دەمی دەرچێ، چونکە هەرکەس تۆزێ زانا بێ و ژیریی هەبێ ئەزانێ کە ناگونجێ خوا رۆڵەی هەبێ، ئەبێ وێنە و هاوتیرەی هەبێ، ئەبێ پێویستی هەبێ، ئەبێ دەست بدات بۆ نەمان و رۆڵەکەی جێنشینی بێت، ئەمانیش بە هیچ جۆر ناگونجێ لەگەڵ خوایەتی دا، هەرکەس رۆڵە رەوا بدات بۆ خوا زۆر دوورە لە ژیریی، ئەوانە بە خۆیان و باو باپیریانەوە تێنەگەیشتوون لە مەبەست بە خوایەتی، کەواتە: ﴿إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾ لەو بارەیەوە جگە لە درۆ هیچ شتێ تر ناڵێن.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵ غەمگین ئەبوو لەمە کە گەلەکەی ئیمانیان نەئەهێنا و پشتیان ئەکردە ئەو ئایینە راستەی کە بۆی هێنا بوون، رێگایەکیان دابووە بەر، کە هۆی خەشم و قاری خوا بوو دەربارەیان، جا بەهۆی ئەوەوە چەند جارێ ئایەت هاتە خوارەوە بە شێوەی بێزاری دەربڕین دەربارەی ئەو هەموو داخ و دووەی کە ئەیچەشت لەسەر ئیمان نەهێنانی ئەو سەرکێشانە،

فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى
ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمۡ
حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾

---

یەكێ لەو ئایەتانە ئەمەیە كە ئەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ واتە تۆ خەریكی لە داخا خۆت بكوژی و گیانی خۆت دەركەیت بەدوای ئەوانەدا و، بەهۆی پشت تێ كردنیان، ئەگەر ئیمان نەهێنن بەم قورئانە، واتە بەو رادەیە داخ و مەراق مەخۆ، ئەوانە شایانی ئەوە نین تۆ ئەوەندە داخ و مەراقیان بۆ بخۆیت، لێ یان گەڕێ، چونكە ئەوەی وا بەسەر زەوی یەوە لەماڵ و ئەولاد و هەموو شتەكانی تر ئەوانەمان هەموو كردووە بە زینەت و جوانی بۆ زەوی بۆ ئەمەی خەڵكی تاقی بكەینەوە كە كێ یان كردەوەی چاك ئەكەن تا شایانی ئەو ناز و نیعمەتە بن وەكو ناز و نیعمەتەكەی رۆژی دوایی، ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا ﴾ واتە داخ و مەراق مەخۆ، چونكە بەڕاستی هەرچی وا بەسەر زەوی یەوە لە بێ گیان و گیانلەبەر ئێمە كردوومانە بە زینەت و هۆی ئارایش و جوانی بۆ زەوی ﴿ لِنَبۡلُوَهُمۡ ﴾ بۆ ئەمەی خەڵكی تاقی بكەینەوە لە بابەت ئەو زینەتەوە ﴿أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴾ ئایا كامیان كردەوەی شیرین ترە؟ بەم رەنگە پێی هەڵناخەڵەتێ و پشتی پێ نابەستێ، ئەوەی هەیەتی بەكاری ئەهێنێ لە شتی چاك و سوود بەخش دا. خوای گەورە هەموو شتێ ئەزانێ پێشی بوونی، كەواتە لە پێشەوە ئەزانێ و ئاگادارە بە هەمووان چ كردەوەی چاك و چ كردەوەی خراپ، بەڵام بە پێی زانینەكەی پاداشت و تۆڵە نادات، بەڵكو ئەبێ بەندە ئەوەی كە خوا زانیویەتی بەدی بێنێ بە كردەوەی خۆی و بە ئارەزو و خواهیشی خۆی. كەواتە مەبەست ئەوەیە تا دەركەوێ بۆ خەڵكی نەك بۆ خوا، باسی خراپەكاری نەكرد، چونكە لە وتارەكەوە بە روونی وەرئەگیرێ، واتە كامیان كردەوەی خراپە؟ ئینجا هەواڵ ئەدات بە نەمانی ئەوەی وا بەسەر زەوی یەوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا ﴾ واتە بەڕاستی ئەوەی وا بەسەر زەوی یەوە – كە كردبوومان بە زینەت بۆی – هەمووی ئەگێڕین بە تۆز و خۆڵ و تەختی زەوی ئەكەین و وشك و برین، چڵە گیا و سەوزی یەكەی تیادا نامێنێ، واتە دڵ گران مەبە ئەمانە تاقی ئەكرێنەوە لەم جیهانەدا و ئەم جیهانە نامێنێ و رۆژی دوایی دێت و تۆڵەیان لێ ئەسێنین بە گوێرەی كردەوەكەیان. ئینجا باسی ﴿اصحاب الكهف﴾ دێت كە نموونەیان پیشان ئەدات لە خاوەنی

ئیمانی راستەقینە کە لە تاقی کردنەوەدا دەرچوون، بەم جۆرە دڵ ئارام بوون بە ئاین و ئیمانەکەیان، هەڵنەخەڵەتان بە خۆشی و زینەتی دنیا، بەڵکو کاتێ زانی یان کە ناژین لەگەڵ خەڵك دا بەو ئیمانەوە و وڵاتیان بەجێ هێشت و پەنایان برد بە ئەشکەوت و غارێ، ئەم بەسەرهاتە هەرچۆنێ ئەو نموونەیان پیشان ئەدات، هەروەها پیشانی ئەدات کە خوا چۆن چاودێریی ئەو کۆمەڵەی کرد و پاراستنی لە سزاو ناخۆشی، رەحم و بەزەیی خۆی رشت بەسەریان دا، کەواتە دڵخۆش کردنە بۆ هەموو کەسێ وەکو ئەوان بێ لەم بەسەرهاتەدا چەند ریوایەتی زۆر و زەبەندەی جیاواز هاتووە، ئەو هەموو قسە و باس و ریوایەتانە بڵاو بوونەتەوە لە کتێبەکانی تەفسیردا بێ ئەمەی پاڵپشتیان هەبێ. یان لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێ کراوەوە هاتبن، بەڵکو سەرجەم ئەوانە لە شتی پڕو پووچ ئەچن، لەو ئیسرائیلی یاتانەن کە بڵاو بوونەتەوە، جا لەبەر ئەوە هیچمان لەوانە نەهێنا و بەس لە سنووری قورئانەکەدا وەستاین، بە تایبەتی قورئان ئەیەوێ ئەم سەرگوزەشتەیە تەنیا لە خۆی وەرگیرێ و پرسیار لە کەسی تر نەکرێ، بە بێ زانینی راستەقینە قسەی تێدا نەکرێ. گێڕانەوەی ئەم سەرگوزەشتەیە، بە شێوەیەکی نایابی گرنگە: لە پێشەوە بە کورتی پیشانی ئەدات، ئینجا بە درێژیی وەکو ئەبینین بە یارمەتی خوا. لە یەکەم جارەوە ئەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾ واتە: مەبەستی پێشوو بەجێ بهێڵە بۆ ئەم مەبەستەی تر، ئایا تۆ گومانت وا بردووە ئەوانەی پێ یان ئەگوترێ: (اصحاب الكهف و الرقيم) واتە ئەو کۆمەڵەی کە چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە لەو کێوە، یان ئەو شیوەی کە ناوی(رقيم) ە، گومانت وا بردووە کە ئەوانە مانەوەیان بە زیندوویی و خەوتوویی لەو هەموو ماوە دوورو درێژەدا شتێکی نایابی وایە سەری لێ بکرێتەوە؟ کە ئەوەش هێندێکە لەو هەموو شتە نایابانەی کە بەڵگە و نیشانەیەکی روونن لەسەر زانین و دەسەڵات و بەجێ یی هەموو ئیش و کارێکمان، واتە ئەو بەسەرهاتی ئەوانە هەرچەندە شتێکی نایابی سەر سوڕهێنەرە، بەڵام جێگای سەر سوڕمان نی یە بۆ ئێمە، نایابتر نی یە لە هەموو شتە نایابەکانی ترمان کە هێندێکی بریتی یە لەو هەموو شتەی کە دروستمان کردووە بەسەر زەوی یەوە و کردوومانە بەهۆی زینەت و ئارایشی زەوی، – وەك لە پێش ئەم سەرگوزەشتەوە باسمان کرد – واتە گومانی وا مەبە، سەر مەکەرەوە لە شتی وا، ئەم فەرمودەیە هەرچەند ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) کراوە بە دیمەن، بەڵام مەبەستی خەڵکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە شارەزا و زانا بووە بە دەسەڵاتی بێ سنووری خوا هیچ کات سەری نەکردووەتەوە لەو جۆرە شتانە. ئینجا بە کورتی باسی ئەو بەسەرهاتە ئەکات،

إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾
فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا
لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾

---

ئەفەرموێ: ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ﴾ واتە باسی ئەو کاتە بکە کە ئەو کۆمەڵە کوڕە گەنجە بەناوبانگە لەبەر مەترسی لە خۆیان و ئایینەکەیان هەڵهاتن لە قەومەکەیان و پەنایان برد بەو ئەشکەوتەی کە کردیان بە جێ و شوێن بۆ خۆیان. ﴿فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ واتە ئینجا کە چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە داوایان کرد لەخوای خۆیان و وتیان: ئەی پەروەردگارمان بە لوتفی خۆت لەلایەن خۆتەوە رەحمەتێکمان پێ بدە و بەزەیی یەکی تایبەتیمان دەربارە بکە کە ببێتە هۆی لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهمان، ببێتە هۆی رۆژی بێ باکی و ئاسایش و بێ ترسیمان لە دوژمن. ﴿وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ واتە فەراهەم بێنە بۆمان لەم کارەی کە واین تێیدا رێ بردن و کەوتنە سەر رێگایە، کە بمانگەیەنێ بە مەبەستی خۆمان. ئەو کۆمەڵە بەختیارە بەو جۆرە لالأنەوە لەخوای خۆیان و ئەوا داوایان لێ کرد. خوایش ئەفەرموێ: ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾ ئینجا ئێمەش پەردەمان دادا بەسەر گوێچکەیان دا لە ئەشکەوتەکەدا چەند ساڵێکی ژمێرراو، واتە خەواندنمان چەند ساڵێ لەو ئەشکەوتەدا بە خەواندنێکی قورس، کە دەنگ بێداریان نەکاتەوە و بە هیچ شتێ خەبەریان نەبێتەوە!! ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴾ [1] دوو تاقم لەبارەی ماوەی خەوەکەیانەوە، لەو دوو تاقمە کامیان زانایە بە ئەندازەی ماوەی مانەوەکەیان بە خەوتوویی لەو ئەشکەوتەدا. ژمارەی ماوەکەی کردووە، واتە لە خەو خەبەرمان کردنەوە بە وێنەی خەبەر کردنەوەی کەسێ کە بیەوێ تاقی یان بکاتەوە بۆ ئەمەی دەرکەوێ کە ماوەکە نازانن تا زانینەکەی حەواڵەی خوا بکەن، ئینجا بەسەر هاتی خۆیانیان بۆ دەرکەوێ و بەهۆی ئەوەوە باوەڕیان بەهێز تر ببێ بە زانین و دەسەلأت و توانای بێ سنووری خوا، زیندوو

---

[1] وشەی(أحصى) بە گوێرەی تەفسیرەکە فیعلی رابوردووە، هەندێ بە(اسم التفضيل) ی تەفسیر ئەکەنەوە، بەلأم باری یەکەم بەهێزترە و کۆڕی زانایانی لەسەرە، رێکیشە لەگەڵ رێزمانی عەرەبی دا بە پێچەوانەی باری دووەم. هەروەها خیلاف هەیە لە بابەت ئەو دوو کۆمەڵەوە: هەندێ ئەڵێن: هەردوو لە تاقمی خەوتووەکانن..

بوونەوە لە پێش چاویان... بە باشی روون ببێتەوە، بێگومان دەرکەوتنی بەسەرهاتی ئەو ئیماندارانە لوتفێکی گەورەیە بە ئیماندارانی ئەو چەرخە، بەڵگەیەکی زۆر بەهێز بوو بۆ دەم کوت کردنی بێ باوەڕەکانیان. بێگومان خوای گەورە هەموو شتێکی زانیوە لە پێش روودانی دا وەکو پاش روودانی، کەواتە پێویستە لێرەو لە هەموو وێنەی ئێرەدا کە زۆریشە لە قورئان دا، پێویستە لەم هەموو شوێنانەدا وشەی ﴿نعلم﴾ ە و وێنەی بە گوێرەی دیمەنەکەی راڤە نەکرێ، بەڵکو ئەبێ بە مەبەستێکی تر راڤە بکرێ کە بگونجێ، جا لەم رووەوە زانایان سێ مەبەستیان فەرمووە، لە هەر یەکێ لەم جۆرە شوێنانەدا هەرکام لەم مەبەستانە رێك تر و گونجاو تر بێت کراوە بە راڤە. بۆ وێنە لێرەدا ئەگەر مەبەست ئەو کۆمەڵە بێت لە تاقمی خەوتووەکان ئەو کاتە مەبەست لە وشەی ﴿نعلم﴾ تاقی کردنەوەیە، ئەویش بەو شێوەی کە لەکاتی تەفسیری ئایەتەکەدا روونمان کردەوە بەو وتارەی پاش وشەی: واتە... هتد. چونکە تاقی کردنەوەش بە مەعنا و دیمەنە راستەقینەکەی بەکار ناهێنرێ بۆ خوا. ئەگەر مەبەست لەو دوو کۆمەڵەیە یەکەم تاقمی خەوتووەکان بێت کە ماوە و مانەوەی خەوتنەکەیان بە کەم ئەزانی، دووەم دانیشتوانی ئەو شارە بێت کە لە چەرخی ئەوان دا خەوتووەکان خەبەریان بووەوە، مێژووی خەوتووەکانیان ئەزانی، بەڕاستی ئەیانزانی ماوەی مانەوەی خەوتنیان. ئەگەر ئەم دوو کۆمەڵە مەبەست بێت، ئەو کاتە ئەبێ لە تەفسیری ئایەتەکەدا بڵێین: لەخەو خەبەرمان کردنەوە بۆ ئەمەی روونی بکەینەوە و ئاشکرای بکەین کە کام لەو دوو کۆمەڵە زانایە و ژمارەی مانەوەی کردوون. واتە هەرچۆنێ خۆمان ئەمانزانی کە کام کۆمەڵ زانایە ویستمان ئەوە روون بکەینەوە ئاشکرای بکەین لە خەڵکی و ئاشکرایشی کرد کە دانیشتوانی شارەکە زانا بوون و قسەی ئەوان راست بوو کە ئەیان وت ماوەی خەوتنەکە زیاد لە(٣٠٠) ساڵە، جا بەهۆی ئەوەوە باوەڕی باوەڕداران بەهێز تر بوو، بێ باوەڕانیش دەم کوت کران، واتە بە گوێرەی ئەم رایە مەبەست لە وشەی ﴿نعلم﴾ دەرخستن و ئاشکرا کردنی زانراوەکەی خوایە، یان مەبەست ئەوەیە: ئەوەی کە لەمەوپێش زانیومانە پێش پەیدا بوون و بەدی هاتنی، با دووبارە بیزانینەوە بە پەیدا بوویی و بەدی هاتوییش تا ئەوەیش ببێ بەهۆی زانینی خەڵك و ئەو بەڵگە گەورەیە دەرکەوێ. تا ئێرە کورتەی ئەم بەسەرهات و سەرگوزەشتەیە بوو، ئینجا ئەوا دەست ئەکات بە درێژیی یەکەی، چونکە بە چەند جۆر ئەو هەواڵە بڵاو بووەوە،

نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ﴿١٣﴾ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ
قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا
شَطَطًا ﴿١٤﴾

---

له یه‌كه‌م جاره‌وه دڵنیای ئه‌كات له‌سه‌ر راستی یه‌كه‌ی ئه‌فه‌رمویٚ: ﴿ نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ ﴾ ئێمه هه‌واڵی گرنگی ئه‌وان ئه‌گێرینه‌وه بۆت به رێك و راستی كه جێگای گومان و دوو دڵی نی یه. ﴿إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ ﴾ به‌راستی ئه‌وانه كۆمه‌ڵه لاوێكی به‌هێز بوون كه باوه‌ڕیان هێنا بوو به په‌روه‌ردگاری خۆیان. ﴿وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى﴾ واته ئێمه‌ش رێنموونیمان زیاد كردن به‌م ره‌نگه خستمانه دڵیانه‌وه كه چۆن بكه‌ن و چی بكه‌ن؟ ﴿ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴾ دڵمان به‌هێز كردن، كه‌واته به ئارام و دامه‌زراو بوون له‌سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕو[1] عه‌قیده راسته‌ی كه بوویان، شانازی یان ئه‌كرد پیٚ یه‌وه دڵمان به‌هێز كردن. ﴿إِذۡ قَامُواْ﴾ له‌كاتێك دا راپه‌ڕین و به‌هێز و دڵنیایی یه‌وه بیٚ باك و بیٚ ترس له گه‌ل و پادشا جه‌ور و سته‌مكاره‌كه‌یان كه بت په‌رست بوون و داوای بت په‌رستیشیان ئه‌كرد له‌مان ﴿فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئینجا وتیان: په‌روه‌ردگاری ئێمه په‌روه‌ردگاری ئاسمانه‌كان و زه‌وی یه، واته خوای ئێمه ئه‌و كه‌سه‌یه ئه‌مانه‌ی دروست كردووه ﴿لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ﴾ هه‌رگیز ئێمه جگه له‌و په‌رستراوی تر ناپه‌رستین ﴿لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا﴾ سوێند به‌خوا ئه‌گه‌ر ئێمه دان بنێین به خوایه‌تی جگه له خوای ته‌نها ئه‌و ئه‌په‌رستین بێگومان ئه‌و كاته شتیٚ ئه‌ڵێین كه زۆر دووره له راستی یه‌وه، زیاده ره‌وی یه له ناهه‌قی و ناڕه‌وایی دا، له‌م فه‌رموده‌یه‌دا ده‌رئه‌كه‌ویٚ كه ئه‌و لاوانه بانگ كراون بۆ بت په‌رستی و ته‌شه‌ریان لیٚ دراوه له‌سه‌ر واز هێنانی، ئینجا ئه‌وانیش به‌و جۆره وه‌ڵامیان دانه‌وه دوای ئه‌وه به بێزاری یه‌وه باسی ئه‌و بیرو باوه‌ڕه‌یان كرد كه گه‌له‌كه‌یانی له‌سه‌ره، بێزاری یان ده‌ربڕی له‌و به‌رنامه‌ی كه هه‌یانه له پێك هێنانی عه‌قیده و باوه‌ڕه‌كان دا،

---

[1] به دوو جۆری تریش ته‌فسیر كراوه‌ته‌وه: أ– هه‌ڵسان به كۆبوونه‌وه‌یه‌ك كه كردیان به‌و بڕیاره‌وه كه بت په‌رستی نه‌كه‌ن و ته‌نیا خوا بپه‌رستن. ب– وه‌ستان له به‌رده‌می پاشاكه‌یان دا كه به‌ناوبانگه به(ده‌قیانوس) ئینجا بیٚ پێچ و په‌نا ئه‌و بڕیاره‌ی خۆیان ده‌ربڕی.

هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ

**وتیان: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا﴾ ئا ئەوانە کە گەلەکەی ئێمەن ﴿ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ﴾ جگە لەخوا چەند پەرستراوی تریان بۆ خۆیان بڕیار داوە، واتە کارێکی ناڕەوا و بێ جێ یان کردووە، چونکە کوێرانە و بە بێ بەڵگە کەوتوونەتە شوێن باوك و باپیریان و لاسایی ئەوان ئەکاتەوە، ﴿لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ﴾ دەی با بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرا بێننەوە لەسەریان کە شایانی پەرستنن، پەرستنەکەی ئەمان بەجێ یە، چونکە عەقیدەو باوەڕ ئەبێ وا بێ ئەگینا ئەبێتە بڕیاردانی شتی درۆ بۆ خوا. ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا﴾ دەی ئایا کێ ستەم کار ترە لەو کەسەی کە شتی درۆ هەڵبەستێ و بڕیاری بدات بۆ خوا و درۆ بکات بەدەم خواوە؟ ئەو کۆمەڵە لاوە دڵ بەهێزە ڕێگای ڕاستیان بۆ روون بووەوە، بە ڕاستی بڕیاریان دا کە تەنیا ئەو ڕێگە ڕاستە بدەنە بەر، بێگومان ئەو کاتە بە هیچ کلۆجێ یەك ناکەون لەگەڵ گەل و کۆمەڵە بت پەرستەکەیان، توانای ژیانیان نابێ لە نێویان دا، ئەوانە پێغەمبەر نەبوون و ڕەوانە کرابن بۆ سەر ئەو گەلە تا پێویست کرا بێ لەسەریان مانەوەیان و خۆ گرتنیان بەرامبەر هەموو سزاو ئازارو دەست درێژیی یەکیان، کەواتە ئەبێ چارەسەری خۆیان بکەن، جا لەبەر ئەوە کۆبوونەوە و بە پەنهانی گەلەکەیانەوە ئەم بڕیارەیان دا و وتیان بە یەکتر، ﴿وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ واتە کاتێ کە ئێوە بەدڵ دوور کەوتوونەتەوە و جیا بوونەتەوە لەم گەلە و لەهەر شتێ ئەوان ئەیپەرستن جگە لەخوا، دەی بە لەشیش جیا ببنەوە و دوورکەونەوە لێ یان، بڕۆن بۆ شوێنێ کە بتوانن خواپەرستی تێدا بکەن بێ ترس و بیم. ﴿فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ﴾ کەواتە لە نێوان ئەمانە دەرچن و پەنا ببەن بە ئەشکەوت و ئیتر ئەشکەوتێکی دیاریی بووبێ لای خۆیان، یان هەر ئەشکەوتێ بیکەن بە جێ و شوێن بۆ خۆتان ﴿يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ﴾ واتە ئەگەر ئێوە وا بکەن پەروەردگارتان دەروی خێرتان لێ ئەکاتەوە و لە خێرو ڕەحمەتی خۆی بەشدارتان ئەکات بە زۆری و فراوانی،**

وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ
وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ
ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴿١٧﴾ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا

**﴿وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا﴾ بە ئاسانی بۆتان فەراهەم ئەهێنێ لەم کارەی خۆتان دا هەر شتێ کە سوودی لێ وەرگرن و هۆی ژیان و گوزەرانتان بێت، بە هەموو دڵنیایی و پڕ بە دڵ ئەوەیان وت، چونکە ئیمانەکەیان زۆر تێرو تەواو بوو، بەڕاستی پشتیان بەخوای خۆیان بەست و چاوەڕوانی و ئومێدیان تەنها بە رەحم و بەزەیی ئەو بوو، دیارە ئەو کاتە خوایش بە گوێرەی نیاز و باوەڕیان لەگەڵیان ئەبێ ئەو کۆمەڵە لاوە ئیمان و باوەڕەکەی خۆیانیان هەڵگرت و هەڵهاتن لە گەلە ستەم کارەکەیان و دەستیان نا بە هەموو خۆشی و شادی یەکی ئەم جیهانەوە، لەبەر خوا و لە پێناوی ئایینەکەیان خۆیان داڕنیی لە هەموو شتێکی تر، خزم و کەس و کار و نیشتمان و جێ و شوێنی خۆش و کامەرانی خۆیانیان بەجێ هێشت و چوونە ئەشکەوتێ کە بڕیاریان دا، ئینجا خوای گەورە لەو ئەشکەوتەدا خەواندنی بەجۆرێ خەبەریان نەبێتەوە بە هیچ شتێ تا ئەو کاتەی خوا خەبەریان ئەکاتەوە. جا لێرەدا ئەوا خوای گەورە شێوەی ئەو کۆمەڵە بەختیارەمان ئەهێنێتە پێش چاو کە چۆن رەحمەتی فراوانی خۆی رشت بەسەریان دا بە جۆرێ ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە ژیاندنی بە خەوتوویی لەو ئەشکەوتەدا، ئەفەرموێ: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ﴾ [1] واتە ئەگەر ئەو کۆمەڵە ببینی لەو ئەشکەوتەدا بەم جۆرە دەیان بینی: کاتێ کە خۆر هەڵدێ خۆی لائەدات لە ئەشکەوتەکەیان بە دەستە راست دا و تیشکی ناکەوێ لێ یان، ﴿وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ کاتێ کە ئاوا ئەبێ لائەدات لێ یان بە دەستە چەپ دا و هەروەها تیشکی ناکەوێ لەو کۆمەڵە. ﴿وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُ﴾ لەکاتێك دا ئەوان وان لە ناوەڕاست لە شوێنێکی فراوان لە ئەشکەوتەکە، کەواتە هەوای فێنك و خۆش لێ یان ئەدات و غازی ئەشکەوتەکە و گەرمی خۆر سزای لەشیان نادات، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو خوای گەورە ڕێنموونی کردن**

---

[1] مەبەست بەو کەسەی کە ئەم فەرمودەی ئاراستە ئەکرێ پێغەمبەرە(ﷺ) یان هەرکەسێ کە بگونجێ ئەم قسەی لەگەڵ دا بکرێ، بەهەرکام باشە.

بۆ ئەشکەوتیٚ کە وای دروست کردبوو بەرە و لای سەرووی زەوی، دیارە ئەو کاتە تیشکی خۆی ناکەویٚ لە بۆشایی ناوەڕاستی ئەشکەوتەکە، نە لە کاتی هەڵهاتن دا و نە لە کاتی ئاوا بوون دا وەکو هەموو کاتەکانی تری ماوەی ڕۆژ بە درێژایی تیشکی ئەکەویٚ لە دەورو بەری قاپی ئەشکەوتەکە ئەوەیش پێویستە بۆ پاك و خاوێن کردنی هەوای ئەشکەوتەکە. بەڵام ئەگەر قاپی ئەشکەوتەکە روو بە ڕۆژهەڵات بووایە، ئەو کاتە دوانزە مانگە تیشکی خۆر ئەکەوتە ناو ئەشکەوتەکە لە کاتی هەڵهاتنی خۆردا، ئەگەر رو بە ڕۆژئاوا بوایە تیشکی خۆر لە ئێواران دا ئەکەوتە ناوی یەوە. ئەگەر روو بەلای خواروی زەوی بوایە، ئەو کاتە لە پایز و زستان دا خۆر ئەیدا لەناو ئەشکەوتەکە، ئا بەو جۆرە خوای گەورە ئەم ئەشکەوتە نایابەی فەراهەم هێنا بۆ ئەو کۆمەڵە لاوە ئیماندارە و ڕێگای خستن لێی، ﴿ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی کە باس کرا لەبارەی ئەو کۆمەڵە و ئەشکەوتەکەیانەوە و مانەوەیان لە خەوتوویی، هێندێکە لە بەڵگە و نیشانە گرنگەکانی خوا کە دەسەڵات و زانین و حیکمەتی ئەوی پیٚ روون ئەبێتەوە ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ﴾ هەرکەس خوا ڕێنموونی بکات و بیخاتە سەر ڕێگای راست تەنها ئەو کەسە لەسەر ڕێگای راستە و گەیشتووە بە ئامانج و بەشی فراوانی دەست کەوت بووە لە هەردوو جیهان دا ﴿وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾ هەرکەس - بەهۆی خراپی و لاری خۆیەوە - خوا گومڕای بکات، ئەوە دەست ناکەویٚ بۆ ئەو کەسە هیچ کۆمەکی کەرێکی ڕێگە پیشان دەر، کەواتە کاری لەکار ترازاوە بەهیچ کلۆجیٚ چارەسەر ناکریٚ، خوا پەنامان بدات، واتە ڕێنموونی وەرگرتن و گومڕایی یاسایەکی هەیە وەکو هەموو کاروباری ئەم بوونەوەرە، هەرکەس بیەویٚ ڕێنموونی وەرگریٚ بە نیشانە و بەڵگە روونەکانی خوا، هەوڵی بۆ ئەوە بێت بکەوێتە سەر ڕێگای راست ئەو کەسە خوا ئەیخاتە سەری و هەرکەس هۆی ڕێنموونی بەکار نەهێنیٚ و بەڵکو بە پێچەوانەی تەقالا بۆ باری گومڕایی بدات ئەوە گومڕا ئەبێت و بە گوێرەی خواهیش و تەقالای خۆی خوا قاری لیٚ ئەگریٚ و گومڕای ئەکات ئەو کاتە بەهیچ کلۆجیٚ چارەسەر ناکریٚ. بارو شێوەی ئەشکەوتەکەی پیشان دا، ئەم بارو شێوەی خۆیان پیشان ئەدات لەناو ئەو ئەشکەوتەدا، ئەفەرمویٚ: ﴿وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا﴾ واتە ئەگەر بیان بینی وا گومان ئەبەیت کە بە خەبەرن لەبەر ئەوە چاویان کراوەتەوە و نەنووقاوە، یان لەبەر ئەوەی ئەجوڵێن وَ ئەم دیو دیو زۆر ئەکەن یان لەبەر ئەوە خەوتوو بە تایبەتی لەخەوی قورس دا شێوەیەکی تایبەتی هەیە جیاواز لە شێوەی بە خەبەر، ئەوان ئەو شێوەی خەوتووی یانەیان نییە،

وَهُمْ رُقُودٌۚ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ
عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْۚ
قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍۚ

---

لەبەر ئەوە گومان ئەبرێ کە بە خەبەرن ﴿وَهُمْ رُقُودٌۚ﴾ لەکاتێك دا کە ئەوانە خەوتوون ﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ﴾ واتە لەو خەوە قورسەدا ئێمە ئەو خەوتووانە وەرئەگێڕین و ئەم دیو و ئەو دیویان پێ ئەکەین بەلای ڕاست و بەلای چەپ دا، ئەوەش لەبەر ئەوە هەوای پاك بکەوێ لە هەموو لەشیان و زەوی کاری لێ نەکات، هەرچەندە بۆ خوا ئاسانە بێ ئەم دیو و ئەو دیو کردن لەشیانی بپاراستایە، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی ئەزانێ بەو جۆرە لەشی پاراستن. لام وایە ئەو وەرگەڕانانە بەڵگە و نیشانەیەکی ڕوون تر بێ خوا پیشانی بدات ﴿وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِۚ﴾ سەگەکەیان – بە گوێرەی باوی سەگ – هەردوو دەستی بە درێژیی خستبوو بەسەر زەوی دا لە پەنای ئەشکەوتەکە و لە نزیکی قاپی یەکەوە بە شێوەی پاس کردن. ئەگێڕنەوە: ئەو کۆمەڵە لاوە کاتێ ڕۆیشتن بەرەو ئەشکەوتەکە ڕابوردن بەلای ئەو سەگەدا ئەویش کەوتە شوێنیان ئەوانیش چەند جارێ دەریان کرد هەر کەوتە شوێنیان، ئینجا هاتە زمان و وتی: ئێوە چیتان ئەوێ لەمن هیچ مەترسی مەکەن لەلایەن منەوە، من دۆستەکانی خوام خۆش ئەوێ، کەواتە ئێوە بخەون و منیش پاستان دەکەم، بێگومان ئەوە جێگای سەرسوڕمان نی یە، چونکە ئەو کۆمەڵە بە تەواوی ڕاستیان کرد لەگەڵ خوادا، کەواتە زۆر جێگای خۆیەتی کە خوایش شتی وایان پیشان بدات بۆ ڕێز و دڵخۆش کردنیان. بێگومان بوونی چەند زەلامێکی وا لەناو ئەشکەوتێکی چۆڵی دوور لە ئاوەدانی دا بە ڕاکشاوی وەکو خەوتوو لەگەڵ ئەوەدا چاویان نەنووقا بێت و ئەم دیو ئەو دیو بکەن.. شێوەی ئاوا زۆر سامناکە لەبەر ئەوە ئەفەرموێ: ﴿لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا﴾ ئەگەر ئاگادار ببوایەی بەسەریان دا و بەچاو بت بینیایە، بێگومان ڕووت وەرئەگێڕا بە ڕاکردن لێیان و دڵ و دەروونت پڕ ئەکرا لەسام و ترس و لەلایەنیانەوە و خۆت پێ نەئەگیرا، لەبەر ئەو شێوە و شوێنەیان کە باس کرا. یان هەر خوا هەیبەت و سامێکی پێدا بوون کەس نەی ئەتوانی نزیکیان بکەوێتەوە، لەبەر هەرکام لەم دوو هۆیە خوا کارێکی وای کرد کەس نەتوانێ دەستیان پێ بگەیەنێ و پارێزراو بن تا ئەو کاتەی خوا دیاریی کردبوو بۆ

هەڵسان و خەبەر بوونەوەیان. خوای گەورە ئەو کۆمەڵە لاوەی بەو جۆرە هێشتەوە لەو ئەشکەوتەدا ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە لەپاشان لەخەو خەبەری کردنەوە و خەڵکی ئاگادار کرد بەسەریان دا تا ببن بە بەڵگەو نیشانەیەکی روون لەسەر راستی زیندوو بوونەوەی رۆژی دوایی، وەك و لەم چەند ئایەتەدا روونی ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ ﴾ هەرچۆن ئەو کۆمەڵەمان خەواند بەو جۆرە کە باس کرا، هەروەها لە خەویش خەبەرمان کردنەوە ﴿لِيَتَسَآءَلُواْ بَيْنَهُمْ﴾ بۆ ئەوەی لە نێوان خۆیان دا هەندێکیان پرسیار بکەن لە هێندێکی تریان لە ئەندازەی ماوەی خەوەکەیان، لە پرسیار و وەڵام و لێکۆڵینەوەکەوە روون ئەبێتەوە کە هەستیان کردووە بە درێژیی خەوەکەیان تا رادەیەك، بەڵام نەك بەو ئەندازە راستەقینەی کە لە پاشان روون بووەوە، ئینجا کاتێ روون بووەوە کە ئەوانە سێ سەد و نۆ(٣٠٩) ساڵ خوا خەواندوونی بێ ئەمەی ئەو ماوە درێژە کار بکات لە لەش و پۆشاك و هیچ شتێکیان، کاتێ ئەو کارە کەس نەدیوە دەرکەوت، بێگومان ئەو کۆمەڵە باوەڕیان زۆر پتەوتر بوو بە بێ سنووری دەسەڵات و توانای خوا، بەڕاستی زیندوو بوونەوە، هەروەها باشتر دڵنیا و دڵ ئارام بوون بەو ئایینە راستە و بەو بارەی کە لەسەری بوون، زیاتر چاو لەبەری چاکە و لوتفی خوا بوون دەربارەیان، کە بەو جۆرە کەس نەدیوە رێزی گرتن و رزگاری کردن و پاراستنی لە دوژمنی خۆیان و ئایینەکەیان، هەروەها ئەو بەسەرهاتەیان بوو بەهۆی پتەو بوونی باوەڕی ئیماندارانی ئەو چەرخەی کە ئەمان لەخەوەکەیان دا هەڵسان لەو کاتەدا بوو بەهۆی بە درۆ خستنەوە و دەم کوت کردنی بێ باوەڕەکانی ئەو چەرخە، ئینجا با گوێ بگرین لە قورئان ئەو پرسیار و وەڵامەی نێوان ئەو کۆمەڵەمان بۆ باس ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ﴾ واتە کە لە خەو هەڵسان یەکێ لە خۆیان رووی کردە ئەوانی تر و وتی: ﴿كَمْ لَبِثْتُمْ﴾ ئایا چەندە مانەوە لەم خەوەتان دا؟ ﴿قَالُواْ﴾ واتە هێندێکیان وەڵامیان دایەوە، وتیان: ﴿يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ رۆژێکی تەواو یان کەمتر ماینەوە، واتە وا گومان ئەبەین ماوەی خەوەکەمان هەر ئەوەندە بێت. زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەفەرمون: ئەو کاتەی چوونە ئەشکەوتەکە لای بەیانی بوو، ئەو رۆژەی خەبەریان بوویەوە لای ئێوارە بوو جا لەبەر ئەوە دوو دڵ بوون، ئایا نیو رۆژە یان رۆژێکە بە تەواوی؟ ئینجا بە گوێرەی باوی ئیمان داری راستەقینە کە خۆیان بە شتی بێ سوودەوە خەریك ناکەن و هەر شتێکیان نەزانی و لە سنووری زانینییان دا نەبوو خۆیان پێوە خەریك ناکەن و زانینەکەی ئەگێڕنەوە بۆلای خوا،

قَالُواْ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ
طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُواْ
عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾

---

به گوێرەی ئەو باوە پاکە ﴿قَالُواْ﴾ وتیان: ﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ﴾ خوای ئێوە زانایە بە ئەندازەی مانەوەتان واتە بە شتی وا بێ سوودەوە خۆتان خەریك مەکەن، بەڵکو شتێ بکەن کە پێویستمان پێی هەیە، ئەوەش ئەمەیە: ئێمە برسیمانە و پارەمان پێ یە ﴿فَٱبْعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ﴾ واتە یەکێکتان بەم پارە زیوەتانەوە بنێرن بۆ شار ﴿فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا﴾ کە گەیشتە شار ئینجا با ورد بێتەوە کام لە دانیشتوانی شارەکە خۆراکی پاك و خاوێن وحەڵاڵ تره لەوە بیکڕێ ﴿فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ﴾ ئینجا لەو خۆراکە ڕۆزی یەکتان بۆ بێنێ، ئەو کۆمەڵە لاوە نەیان ئەزانی ئەم چەرخە چەرخێ تره و لایان وابوو هەرکات و چەرخی پادشا و گەلە بت پەرستەکەی خۆیان و ئەوسایە، لەبەر ئەوە وتیان ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ﴾ ئەو کەسەی کە ئەینێرن بۆ شار با وریا بێت لە چوون و هاتنەوە و کاتی کڕینی خۆراکەکەدا، بە جۆرێ بجووڵێتەوە هەستی پێ نەکرێ و نەناسرێ ﴿وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا﴾ کەس ئاگادار نەکا بە ئێوە، واتە کارێکی وا نەکات پێتان بزانرێ. ﴿إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ﴾ چونکە ئەگەر ئەو گەلە بت پەرستە ئاگادار ببن بەسەرتان دا بەرد بارانتان ئەکەن و ئەتانکوژن ﴿أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ﴾ یان ئەتان گێڕنەوە بۆ ناو ئایینەکەی خۆیان ﴿وَلَن تُفْلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدًا﴾ واتە ئەگەر ئێوە بچنەوە سەر ئایینەکەیان و بەڕاستی بتانگێڕنەوە بۆی با بە زۆریش بێت، ئەو کاتە هەرگیز تووشی خێر نابن و ناگەن بە ئامانجی خۆتان، با لێرەدا چاوی دڵ هەڵ خەین بۆ ئەو کۆمەڵە لاوە کە خەبەریان بووەتەوە و لەناو خۆیان دا چرپو چپیانە و مەترسی ئەوە ئەکەن کە پێ یان بزانرێ، چونکە لایان وایە ئەو کات و چەرخی

پاشا ستەمکارەکە و گەلە بت پەرستەکەیە کە ئەمان هەڵهاتن لە ترسیان و نەیان زانی ئەوە چەرخێ بوو، تێپەڕی و چەند چەرخ و چینی تر بە دوایان دا هاتووە و ئەمە چەرخێ ترە، دەنگ و باسی بەسەرهاتی ئەمان بە دەماو دەم هاتووە و گەڕاوەتەوە لەناو گەل و چەرخەکان دا و خەڵکی ئەم چەرخە دوایی یە چەند رایەکیان هەیە لە بابەت ئەو کۆمەڵە و بیرو باوەڕو بەسەرهات و کات و چەرخەیان دا، جا لێرەدا قورئان ئەو شێوەیانە واز لێ ئەهێنێ وەکو پەردەی بەسەرا بهێنێ بۆ ئەمەی شێوەیەکی تریان پیشان بدات، لەپاشان پیشانی بدات، لە پیشاندانی ئەم شێوەدا روون ئەبێتەوە کە زۆربەی دانیشتوانی ئەوشارە لەم چەرخی دوایی یەدا زۆربەیان ئیمان دار بوون و زۆر بە سۆز و پەرۆش بوون بۆ ئەم کۆمەڵە لاوە کە لەمەوپێش دەنگ و باسیان بووە لە نێوانیان دا و ئێستا پێ یان زانین بەهۆی ئەو یەکەوە کە هاتە شارەکە بۆ کڕینی خواردەمەنی، لەدوای هێندێ بیر کردنەوە تێ ئەگەین لە گرنگی ئەو رووداوە کەس نەدیوە، سەرسامی لە ئاستی، چ لەلایەن خەڵکی یەوە، چ لەلایەن کۆمەڵەکەوە؟!! وەرە بیر بکەرەوە لەو کۆمەڵە لە پڕێك دا بکەونە جیهانێکی تایبەتی نە کەس ئەناسن و نە کەس ئەیانناسێ، نە هیچ پەیوەندی یەکیان هەیە بە هیچ کەسێکەوە، نە بە خزمایەتی و نە بە باو و رەوشت و نە بە ناسراوی، شتەکە زۆر زۆر سەر سوڕهێنەرە، چەند گەنجێ زاییندەی سێ سەد(٣٠٠) ساڵ لەمەوپێش لە پڕێك دا بکەونە ناو گەل و جیهانێکی نەناسراوی ئاوا بێگومان ناژین بە ئارامەوە، ژیانێکی خۆش بەسەر نابەن، کەواتە خوا بە رەحم و بەزەیی خۆی ئەیانمرێنێ، قورئان باسی ئەمانەی نەفەرمو، بەڵکو باسی بەرهەم و سوودی خەبەر کردنەوە و ئاگادار کردنی خەڵکی بەسەریان دا ئەکات، لەگەڵ باسی جیاوازی راو و باوەڕی خەڵکی ئەو چەرخە لەو کۆمەڵەدا و دواترین بڕیاری یاد و بیرەوەری بۆ ئەو لاوانە لەپاش مردنیان.

وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ

ئەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾ هەرچۆنێ خەواندنمان ئەو ماوە دوور و درێژە و خەبەرمان کردنەوە، هەروەها خەڵکیمان ئاگادار کرد بەسەریان دا بۆ ئەمەی بزانن کە بێگومان بەڵێنی خوا بە زیندوو بوونەوە راستە ﴿وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ﴾ رۆژی دوایی شایانی ئەوە نی یە گومانی تێدا بێت، بەڵکو روون ئەبێتەوە لە بەسەرهاتی ئەو کۆمەڵە لاوە کە شتێکی گونجاوە، چونکە هەر خاوەن هۆشێ بیر بکاتەوە لە حاڵی ئەو کۆمەڵە کە زیاتر لە(٣٠٠) ساڵ لەو ئەشکەوتەدا مانەوە بەجۆرێ هەموو هەست و هێز و وزەیان لە ئیش خرابێ، ئینجا لەپاش ئەو ماوە دوور و درێژە وەکو خۆیان لێ ببێتەوە: وت و وریا و ئاگادار بەسەر هەموو کاروبار و فرمانێکی خۆیان دا، ئەوەی لەوەو پێش زانیبێتیان لە یادیان مابێ بێ کەم و کوڕی، هیچ هەست نەکەن بەو هەموو ماوە دوور و درێژە کە بەسەریان دا تێپەڕی بێ، ئەو لەشە تەڕو تازە گەنجەیان هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبێ لە هیچ بارو روویەکەوە، هەرکەسێ خاوەن فام و هۆش بێت، بەو جۆرە بیر بکاتەوە بێگومان هیچ گومان و دوو دڵی یەکی نامێنێ لە گونجاوی و رێك و راستی زیندوو بوونەوەدا. ﴿إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ﴾ واتە خەڵکیمان ئاگادار کرد بەسەریان دا، لە کاتێك دا کە ئەو خەڵکە ئاژاوە و نیزاعیان لە نێوان خۆیان دا هەبو لە زیندوو بوونەوەو کاروباری ئایینی خۆیان دا، بەم رەنگە هێندێ باوەڕی هەبوو بە زیندوو بوونەوەو پرسیار و تۆڵە، هێندێ تر ئەو باوەڕەی نەبوو، ئینجا خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەی لە خەو خەبەر کردەوە و ئەو خەڵکەیشی ئاگادار کرد بەسەریان دا تا روون ببێتەوە کە زیندوو بوونەوە شتێکی گونجاو و راستە، ئەگێڕنەوە کە پادشای ئەو چەرخە موسڵمان بووە، بەڵام هێندێ لە گەلەکەی و دانیشتوانی وڵاتەکەی بێ باوەڕ بوون، پادشا زۆر لەوە دڵ گران بوو بەهۆی ئەوەوە جارێ لەماڵ دەرچوو و پۆشاکێکی دەروێشانەی پۆشا و لە خۆڵ و خۆڵەمێش دانیشت بۆ ئەمەی گەردن کەچی خۆی دەربڕێ بۆ خوا، ئینجا پاڕەوڵاڵەی کردە لای خوا کە بەڵگە ونیشانەیەکی روون پیشان بدات تا بێ باوەڕەکان باوەڕ بهێنن. خوا بە بەزەیی نزاکەی وەرگرت، ئەو کۆمەڵەی لە

ئەشکەوتەکەدا خەبەر کردەوە ئەوانیش یەکێکیان نارد بۆ شار بۆ کڕینی خۆراك بە پارەیەکی زیوەوە کە کاتی خۆی پێ یان بوو، سکەی ئەو پادشا کافرە بوو کە ناو ئەبرێ بە دەقیانوس، ئەو کەسەیش کە هاتە بازاڕ تەماشای کرد هیچ کەس ناناسێ لە دانیشتوانی شارەکە، بەڵام ڕێگا و بانەکەی ئەناسی یەوە، بۆی دەرکەوت کە ئەم دانیشتوانە بە ئیمان و باوەڕدارن، ئینجا چوو بۆلای پیاوێ خۆراکی لێ بکڕێ، کاتێ پارەکەی پێدا سەرسام ما و، سکەکەی نەئەناسی یەوە، لەبەر ئەوە گومانی وابرد کە ئەم پیاوە غەزنەی دۆزیوەتەوە. پێ ی وت: یا ئەبێ ڕاستی ئەم پارەم پێ بڵێیت، یان ئەتبەم بۆ لای پادشا، ئەویش وتی: بابە ئەمە سکەی پادشایە و ئایا پاشا فلان نی یە؟ ئەویش وتی نەخێر پادشا فلانی ترە، ئینجا خەڵکی لێ کۆبوویەوە و بردیان بۆلای پادشا، پادشایش پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەواڵی خۆیانی بۆ گێڕایەوە. ئەو پاشایەش لەوەو پێش بیستبووی کە کۆمەڵە گەنجێ لە چەرخی دەقیانووس دا هەڵهاتوون، بەهۆی ئەوەوە زانا و پیاو ماقوڵی شارەکەی کۆکردەوە، لەناو ئەوانەدا پیاوێك ناونیشانی ئەو کۆمەڵەی لابوو کاتێ ناوەکانی برد بۆ کوڕە گەنجە نێرراوەکە وتی: ڕاستە ئەوانە ئێمەین، ئینجا پادشا فەرموی: خەڵکینە ئەمە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە خوا پیشانتان ئەدات، ئینجا پادشا خۆی و دانیشتوانی شارەکە لەگەڵ ئەو لاوەی کە ناردبوویان بۆ شار هەموو ڕۆیشتن بۆلای ئەشکەوتەکە، ئینجا کاتێ پادشا تەماشای کردن هەموو دانیشتبوون و دەم و چاویان ئەدرەوشێتەوە و جل و بەرگەکانیان ساغ و نەگۆڕاوە دەستی کردە ملیان و زۆر کەیف خۆش بوو پێ یان، ئەوانیش کەوتنە قسە و باس لەگەڵ پادشادا و بەسەرهاتی خۆیانیان بۆ گێڕایەوە کە چی یان توش بوو لەلایەن دەقیانووسی کافرەوە، ئینجا وتیان بە پادشا لە ئەمانەتی خوادا بیت و سەلام و ڕەحمەتی خوات لێ بێ. خوا خۆت پاشایی یەکەت بپارێزێ، خوا پەنات بدات لە شەڕ و خراپەی ئادەمی و جن. بەو جۆرە خوا حافیزیان کرد لە پاشا و گەڕانەوە جێگاکەی خۆیان و ڕاکشان و وەفاتیان کرد. ئینجا هەڵسا و بە جل و بەرگی خۆی دایپۆشین. فرمانی دا کە هەر یەکە بخرێنە تابوتێکی ئاڵتوون، ئینجا لەو شەوەدا هاتنە خەوی و وتیان شتی وا نەکەن، لێمان گەڕێ با لە شوێنەکەی خۆمان دا بین، ئێمە لە خاك دروست کراوین، ئەبینەوە بە خاك، ئینجا پادشا لە شوێنەکەی خۆیان دا هەریەکەی خستنە تابوتێکی دارین و لەسەر قاپی ئەشکەوتەکە مزگەوتێکی دروست کرد،

فَقَالُواْ ٱبْنُواْ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾
سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِٱلْغَيْبِ

**ئیتر با گویٚ بگرین له قورئان به کورتی باسی رای ئەو گەلەمان بۆ ئەکات دەربارەی ئەو کۆمەڵە ﴿فَقَالُواْ ٱبْنُواْ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا﴾ ئنیجا ئەو گەلە بوون بە دوو بەش: بەشێکیان وتیان: چەند خانوویەکیان بەسەرەوە دروست بکەن، یان دەرگای ئەشکەوتەکەیان لەسەر بگرن و لەسەریان داخەین و لیٚ یان گەڕێین وەك خۆیان. ﴿رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ﴾ [1] خوای خۆیان ئاگادار ترە پیٚ یان و بە ئاین و باوەڕیان، ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ﴾ ئەوانەی کە دەسەڵات دار بوون زاڵ بوون بەسەر کاروباری ئەو کۆمەڵە لاوەدا وتیان: ﴿لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾ بێگومان مزگەوتێکیان بە سەرەوە دروست ئەکەین – واتە شوێنی خواپەرستی – ئەوەیش بە گوێرەی باوی جوولەکە و نەسرانی یەکان کاتیٚ لایان دا لە ڕێگای ڕاستی ئاین و پێغەمبەرەکان و پیاو چاکەکانیان مزگەوت و شوێنی خوا پەرستی یان دروست ئەکرد کە ئەویش لە پاشا سەری لە بت پەرستی یەوە دەرئەچیٚ، لەبەر ئەوە چەند حەدیسیٚ لەو بارەوە هاتووە دژی ئەو باوە یەکیٚ لەو حەدیسانە ئەمەیە(ابن كثير) لە تەفسیرەکەی دا ئەیهێنیٚ لە(بوخاری و موسلیم) ەوە: ﴿لعن الله اليهود والنصارى، اتخذوا قبور انبيائهم و صالحيهم مساجد﴾ لەعنەتی خوا لە جوولەکە و گاورەکان، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان و پیاو چاکەکانیان کرد بە جێگای نوێژ، واتە بە دەوریان دا نوێژ و خواپەرستی یان ئەکرد، بەڵام بەداخەوە ئەو باوە نارەوا سەرڕوازی کرد بۆ ناو موسڵمانەکانی ئەم ئوممەتە: ئەوەتە ئەبینی ئەو هەموو خانوو و کۆشکە گرنگانە دروست ئەکریٚ بەسەر گۆڕی پیاوە گەورەکانەوە، ئینجا خەڵکی نوێژیشی تیا ئەکەن، بەڵکو زۆر لە نەفام و نەشارەزا هەیە بە تایبەتی هەوڵ ئەدات بۆ نوێژ کردن لەناو ئەو مەرقەدانەدا، بە پیرۆز تری ئەزانیٚ لە مزگەوتەکان، لەگەڵ ئەوەدا با بزانریٚ کە نوێژ کردن لەو مەرقەدانەدا گوناهە و حەرامە بە پیٚی بڕیاری هەموو پێشەواکان و زاناکانی ئیسلام شێخی ابن الحجر لە پەڕاوی(زەواجر) دا ئەفەرمویٚ: یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، چونکە**

[1] هێندیٚ ئەفەرمون: ئەم رستەیە وتەی ئەو تاقمە نی یە، بەڵکو لەلایەن خواوەیە و تێهەڵکێش کراوە، هەردوو هەر ئەگونجیٚ.

چەند حەدیسی سەحیح هەیە کە بە توندی بەرگری ئەکات لەو کردەوەیە، هەروەها چەند باوی تر هەیە لەناو موسڵمانە نەشارەزاکان دا کە بەکار ئەهێنرێ لەکاتی زیارەتی گۆڕی پیاو چاکەکان دا وەکو ماچ کردنی ئەو دارو بەردە و خۆسوین لیّ یانەوە، نارەوا تر لە هەموو شتیّ ئەوەیە کە روو ئەکەنە ئەو گۆڕانە و دەست بەرز ئەکرێنەوە بۆ نزا و لالأنەوە لەو پیاوە گەورانە. ئەمە بە راستی بت پەرستی یەکی تێرو تەواوە و بە هیچ کلۆجیّ پینە و پەڕۆ ناکریّ. پێویستە لەسەر زانایانی ئیسلام کە خەڵکی بەرگری بکەن لە شتی وا و شارەزایان بکەن لە بارو شێوەی شەرعی زیارەت کردن، چونکە بێگومان زیارەتی گۆڕستان بە تایبەتی پیاو چاکان شتێکی رەوا و شەرعی یە، بەلأم بە شێوە شەرعی یەکەی، بەو شێوە شەرعی یە وەکو رەوایە سوودیشی هەیە، چونکە رۆژی دوایی بیر ئەخاتەوە، بە تایبەتی گۆڕی پیاو چاکان پیت و فەڕیشی هەیە وەك زیارەت کردنیان لە کاتی زیندووی دا، بە کورتی ئەبێت لە ناوەڕاست دا بین نە بت پەرستی و شتی پڕو پووچ و نارەوای تێکەڵ بکەین، نەوەکو هێندیّ کەس نرخ و بایەخ نەدەین بە زیارەت کردنی گۆڕ و گۆڕستان، یان بەرگری بکەین لە نوێژ کردن لەو مزگەوتانەی کە مەرقەد و گۆڕی پیاو چاکان لە نزیك و پاڵیایەتی، ئەم دوو بارە هەردوو نارەوایە، ئەو ناوەڕاستەی کە باسمان کرد تەنها ئەوە رەوایە، ئایینی پاکی ئیسلام لە هەموو شتێك دا ناوەڕاستی گرتووە و بۆ هەر بارێکی تر بترازیّ نارەوایە و ترازووەکە خوار و لارە سەنگ ئەبیّ، خوا بە بەزەیی خۆی لە ناوەڕاستی رێگا راستەکەی دا راگیر و دامەزراومان بکات — آمین — ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە خەڵکی لە چەرخی پێغەمبەردا(ﷺ) سیّ رای جیاوازیان هەبووە لە بابەت ژمارەی ئەو کۆمەڵە لاوەوە، باس کردنەکەی بە جۆرێکە پیشانی ئەدات کە رای سیّ یەم راستە، چونکە دەربارەی یەکەم و دووەم ئەفەرمویّ: لە خۆیانەوە دەم ئەکوتن لە شتێك دا کە نادیاریی و نەزانراوە، بەلأم دەربارەی رای سیّ یەم هیچ شتیّ نافەرمویّ کە ناراستی پیشان بدات، ئەوەش بە گوێرەی باوی خەڵکی کە لە گێڕانەوەی دەنگ و باس و بەسەرهات دا نیزاع و ناکۆکی تێدا ئەکەن بە لیّ زیاد کردن و لیّ کەم کردن، ئەفەرمویّ: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَـٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هێندیّ ئەڵێن کە ئەو لاوانە سیّ کەسن و چوارەمیان سەگەکەیانە، ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هێندیّ تر ئەڵێن ئەوانە پێنج کەسن و شەشەمیان سەگەکەیانە، ﴿رَجْمًا بِالْغَيْبِ﴾ واتە ئەم دوو تاقمە هەوالیّ ئەدەن کە نهێنی و غەیبی یە لیّ یانەوە، لە خۆیانەوە قسەیەك تور ئەدەن کە بیّ ئاگان لیّ ی و بە وێنەی کەسێك لەخۆیەوە کوێرانە شتیّ بهاوێژیّ،

وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا

---

﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ واتە هێندێ تر ئەڵێن: ئەوانە حەوت کەسن و هەشتەمەکەیان سەگەکەیانە، خوای گەورە تەمێمان ئەکات بۆ ئەم جۆرە شتانە، ڕێگا ڕاستەکەمان بۆ دیاریی ئەکات کە زانینی حەواڵەی خوا بکەین، خۆمان خەریك نەکەین بەم جۆرە شتانەوە، ئەفەرموێ: ﴿قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ: پەروەردگارم زاناتر و ئاگادار ترە بە ژمارەیان. ﴿مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ کەمێ لە خەڵکی نەبێ ژمارەیان نازانێ، ئەو کەمەیش ئەوانەن کە لە کاتی خۆیدا شتەکەیان دیوە، هەروەها ئەوانەی کە لە سەرچاوەو ڕێگایەکی ڕاستەوە ئەو هەواڵەیان پێ گەیشتبێ. بێگومان ژمارەیان و زانینی ژمارەیان گرنگ نی یە و هیچ نرخ و بایەخێ نادا بە مەبەستەکە، هەرچەند بووبن بەڵگە و موعجیزەیەکی زۆر روون و گەورە بوو خوا پیشانی دا، کەواتە هیچ پێویست نی یە ئاژاوە و نیزاع و دەمە دەمێ لەبارەی ژمارەیانەوە، لەبەر ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا﴾ ئەی پێغەمبەر ماتوڵ شتەکە روون نابێتەوە بۆ هەموو، ئەوانەی کە ئەدوێن لەم کۆمەڵە و ژمارەیان، هەموویان ڕێ یان پێ نەبردووە و بێگومان زانینی ژمارەی ئەوانە گرنگ نی یە. ماتوڵ شتەکە وایە تۆیش خۆت خەریك مەکە بە شتی وا کەم سوودەوە، موجادەلە مەکە و قسە بە شەڕ مەدە لەبارەی ئەو کۆمەڵە و ژمارەیانەوە بە شێوەیەکی سووك و ئاسان نەبێ، بێ ئەمەی کەس بە درۆ بخەیتەوە، یان بە نەزانی دەرکەیت، واتە قوڵ بۆی دامەچۆ، بەڵکو ئەوەی کە لە قورئان دا بۆت هاتووە هەر ئەوە بڵێ و بەسەریان دا بخوێنەرەوە، ئەوەش بە گوێرەی بەرنامەی ئیسلام کە ئەبێ مەردوم هێزی ژیریی خۆیان بەخت و ماندوو نەکەن لە شتی بێ سوودا و شوێنی شتێ نەکەون کە نەیزانن بەڕاستی،

وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن
يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُواْ فِي
كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾

---

**﴿وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا﴾** لەبارەی ئەم کۆمەڵە لاوەوە پرسیار مەکە لە هیچ کەسێ لە ئەهلی کیتاب کە خۆیان بە زانا ئەزانن و بە قوڵی ئەدوێن لەو کۆمەڵە، پرسیاریان لێ مەکە بە نیازی ئەوەی زانین وەرگری لێ یانەوە، چونکە ئەوەی قورئان پێ ی هاتووە بەسە، بێجگە لەوەش ئەوانە زانا نین بە شتەکە، هەروەها پرسیاریان لێ مەکە بە نیازی ئابڕوو بردن و خستنەوە بە درۆوە، چونکە ئەوە پێچەوانەی خو و رەوشتی شیرینی تۆیە، حەدیسێکی بەناوبانگ هەیە و پەڕاوەکانی تەفسیر باسی ئەکەن کە قورەیش – بە فەرمانی جولەکە – پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لە سێ شت: رۆح و أصحاب الكهف و ذی القرنین. ئەویش فەرموی: بەیانی وەڵامتان ئەدەمەوە، نەیفەرمو: إن شا ءالله، لەپاشان وەحی بۆ نەهات تا ماوەی(١٥) رۆژ یان کەمتر بەهۆی ئەوەوە وەڵامی نەدانەوە، ئینجا کافرەکان کەوتنە فاك و فیك و لاقرتی کردن، پێغەمبەر(ﷺ) دڵگران بوو، ئینجا خوا ئەم دوو ئایەتەی نارده خوارەوە بۆ تەمێ و ئامۆژگاری کردنی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەموو کات بۆ ئەو جۆرە شتانە رستەی إن شا ءالله بڵێت، فەرموی: **﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا * إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾** واتە بۆ هیچ شتێ کە بڕیار لەسەر کردنی بدەی نەڵێیت من ئەو شتە ئەکەم سبەینێ یان لەمەو پاش، هیچ کات ئەوە نەڵێیت کاتێ نەبێ کە لە گەڵی دا بڵێیت: إن شا ءالله، واتە ئەگەر خوا بیەوێ. ئەمە ئەدەبێکی زۆر شیرینە خوای گەورە رێنموونی پێغەمبەری بۆ کرد(ﷺ)، هەروەها رێنموونی یە بۆ هەموو کەسێکی تریش، زۆر پێویستە پەیڕەوی ئەم ئەدەبە، چونکە:

١- زۆر لەو شتانەی بڕیاری لەسەر ئەدرێ بەدی نایەت، کەواتە ئەو بڕیار دەرە کاتێ هەواڵی دا بە بڕیارەکەی و نەیوت إن شا ءالله هەواڵەکەی بە درۆ ئەچێ، بێگومان پێویستە خۆپاراستن لە درۆ، کەواتە ئەو وشە بە فەڕە پێویستە وتنی لە هەموو ئەو جۆرە هەواڵانەدا.

٢- هەموو کردەوە و هەموو رووداوێ بەڵکو هەموو هەناسەیەك لە هەناسەکانی هەموو زیندوویەك بەستراوە بە مەیل و خواهیشی خواوە، بە بێ خواهیشی ئەو هیچ شتێ

نابیٚ، کەواتە پێویستە لەسەرمان ئێمەش هەموو شتیٚ بە باوەڕ و بە زمان ببەستینەوە بەو مەیل و خواهیشە بیٚ سنوورەوە.

٣- هەموو رووداوێکی لەمەو پاش شتێکی غەیبی یە، کەواتە با لە خۆوە بیٚ زانین دەم نەکوتین لە شتی غەیبی و نەزانراو و کاتیٚ وتمان: إن شا ءالله دووچاری ئەو ناڕەوایی یە نابین.

٤- پەیڕەوی کردنی ئەبێتە هۆی پەیوەندی دلّ لەگەلّ خوادا، جێگیر بوونی یادی خوا لەدلّ دا، ئەو کاتە لە هیچ کارو فرمانێك دا دلّ هەست بە تەنیایی ناکات، لەکاتی سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانج دا کەشخە و تەکەبوور دلّی داگیر ناکات، هەرچۆنیٚ داماو و نائومێد و دەستە پاچە نابێت لەکاتی بێبەشی و نەگەیشتنی بە ئاوات و ئامانج، بەلّکو لە هەموو بار و حالّێك دا دلّ بەهێزە و پشت بە خوا ئەبەستیٚ و رازی یە بە هەموو بڕیاری خوا، نە لە پەت بەرەلاّ ئەبیٚ، نە نائومێدیش ئەبیٚ، ئەم ئایەتە هەرچەند شێوەیەکی گشتی هەیە، بەلاّم ئەو حەدیسە بەناوبانگە روونی ئەکاتەوە پەیوەندی بەهێزی بەم سورەتەوە، بە تایبەتی بۆ ئەم شوێنی خۆیە گونجاو و رێك ترە، چونکە لە ئایەتی پێشوودا بەرگری پێغەمبەری کرد(ﷺ) لەوەی موجادەلە بکات لە شتی غەیبی رابوردوودا، ئینجا بەو بۆنەیەوە لێرەیش دا بەرگری کرد لەمەی هەر بڕیاریٚ بدات لە شتی غەیبی و لەمەوپاش و داهاتوو، چونکە مەردوم ئاگادار نی یە بەسەر ئەوەی لەمەوپاش پەیدا ئەبیٚ و روو ئەدات، کەواتە با هەموو بڕیارەکان ببەستینەوە بە مەیلی خواوە، ئینجا ئەفەرمویٚ: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ کاتیٚ لە بیرت نەبوو وشەی إن شا ءالله بلّێیت لە پاشان بیرت کەوتەوە هەر بیلّیٚ لەباتی ئەو کاتەی لەبیرت چووە، بۆ بەسەر گرتنەوەی ئەو وشە بەفەڕەی کە لە بیرت چووە ﴿وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا﴾ بلّیٚ ئومێد و چاوەڕوانیم وایە کە پەروەردگارم رێنموونیم بکات بۆ شتیٚ کە بەلّگە و نیشانەیەکی روون و ئاشکرا تر بێت لە سەر پێغەمبەرێتیم، روون و ئاشکرا تر و نزیك تر بێت لەدلّ و دەروونەوە، لە هەوالّی ئەم کۆمەلّە لاوە کە بەلّگە و نیشانەیەکی روونە، موعجیزەیەکی گەورەیشە، بێگومان ئەمە بەلّگە و نیشانەیەکی روونە، چونکە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) نەبوایە و خوا ئەم هەوالّەی پیٚ نەدایە، ئایا کەسێکی نەخوێندەوار لەناو گەل و کۆمەلّێکی دوور لە زانین و خوێندەواری ئایا ئەم هەوالّە غەیبی یە نەزانراوەی لە کویٚ هێنا و بیخوێنێتەوە بەسەر

هـەموو زانايـانی ئـەهلی کیتـاب و هـەموو دنیـادا بـێ ئەمـەی هـیچ کـەس تـوانیبێتی ڕەخنەیەکی لێ بدۆزێتەوە، بەڵکو ئەم و ئەو و هەموو زانایانی ئەهلی کیتاب بخاتەوە بە درۆوە؟!! خوای گەورە وەکو ئاگاداری کرد بە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکراتر هەروەها بۆیشی بەدی هێنا زۆر زۆر بەتێرو تەسەلی، وەکو ئەو هـەموو هـەواڵ و دەنگ و باس و بەسەرهاتی ئەو هەموو پێغەمبەرانە و ئەو هەموو گەل و ئوممەتە ڕابوردووانە کە چەرخ و زەمانیان زۆر زۆر دوور تر بووە، هەروەها ئەو هەموو هەواڵە غەیبی یانە لـە چەرخی خۆی دا و لەپاشی خۆی تا ڕۆژی دوایی کە یەك لە دوای یەك بەدی هاتن و بەرە بـەرە یـەن تـا ڕۆژی دوایـی، بەڕاستی لـە هـەموو شت سـەیر تـر ئـەو شـەریعەت و بەرنامە گەورەی ژیانەیە، کە بۆ هەموو چین و چەرخ و گەل و ناوچەیەك گونجاو و ڕێك و ڕاستە و دەست نـادات بـۆ بژارە و دەست تـێ خستن، بە تـەنیا ئـەوەی ئـەو هێنـای دوورە لـە هـەموو هەڵەیەك، چارەسـەری هـەموو گرێ و گۆتـاڵی ژیـانی کـردووە، هـەموو پێویستی یەکی خەڵکی جێ بەجێ کردووە، نەخشەی جێ بەجێ کردنی کێشا بۆ پاش خۆی تا دنیا دنیایە، لەخوا بەزیاد بێت و هەموو سوپاس و منەتێ بۆ خوا لە پێشەوە فەرموی: ئەو کۆمەڵە لاوەمان خەواند چەند ساڵێ بێ ئەمەی ژمارەی دیاریی بکات ئەوا لێـرەدا مـاوەی خەوتنەکـەیان ڕوون ئەکاتـەوە، ئەفـەرموێ: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ﴾ ئەو کۆمەڵە لاوە مانەوە لـە ئەشکەوتەکەیان دا بە خـەوتوویی(٣٠٠) سـاڵ بە پێی ساڵی خۆری کە باوی ئەهلی کیتاب بوو بە ساڵ و مانگی خۆری ژمارەیان ئەکرد، ئەوان هانی قورەیشیان دا کە ئەم پرسیارە بکەن لە پێغەمبـەر(ﷺ) ﴿وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا﴾ نۆ ساڵیان زیاتر کرد لـە سێ سەد، واتـە مانەوە(٣٠٩) سـاڵ بە پـێی سـاڵی مـانگی کە حیسابی قورەیشی لەسەر بوو، سێ سەد ساڵی خۆری ئەکاتـە سێ سەد و نۆ ساڵی مـانگی، حەفتا و سێ ڕۆژ و، نۆ سەعات و چل و هەشت دەقیقە، بەڵام ئەم زیادەیە گوێی پـێ نادرێ بە گوێرەی بـاو و عورف، چونکە ئەو ئەندازە لـە وەرزیش کەمترە. بێگومان ئەم باسە بەم جۆرە موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، چونکە ئەگەر خوا ئەمەی پیشان نەدایە، ئەم لە کوێ ئەمەی ئەزانی؟ [1] ئینجا دڵنیـایی ئـەکات لەسـەر ئەو ماوەیە،

---

[1] هێندێ ئەفەرمون: مەبەست جیاوازی ساڵی خۆری و مانگی نییە، بەڵکو ئەو شێوەیە بۆ دڵنیا کردنە بەسەر ئەوەی کە

ئەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ﴾ بڵێ خوا زاناترە لە هەموو کەسێ بە ماوەی مانەوەیان دەی ئەوا هەواڵی دا کە(٣٠٠) ساڵە لەبارێکەوە، و(٣٠٩) ساڵە لەبارێکی ترەوە، کەواتە شتەکە بە جێگای گومان و دوو دڵی نامێنێتەوە ﴿لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ تەنها بۆ خوایە زانینی هەموو شتە غەیبی یەکانی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو شتێ کە شاراوە بێت لە خەڵکی. جا ئیتر هێندێ لەوانەی پێشانی هێندێ لە بەندەکانی داوە ئەوی تری تەنیا خۆی ئەیانناسێ و ئەیانزانێ ﴿أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ﴾ ئای چ عەجەب خوا بینایە و بیسەرە!، واتە بینین و بیستنی خوا ئەوەندە گەورە و گرنگە و تێرو تەواوە جێگای سەرسوڕمان و سەرسامی نی یە، ژیریی و تێگەیشتنی خەڵکی بە هیچ کلۆجێ پەییان پێ نابەن، بینین و بیستنی خوا تایبەتی نین بە هێندێ شتەوە، بەڵکو بۆ هەموو شتە، هیچ شتێ بەرگری یان ناکات.

لێرەدا دوایی هات باسی ئەو کۆمەڵە و ئەوەی پێویست بێت و نرخی هەیە لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەیان باسی فەرمو، ئەو خاڵانەی هۆی ئامۆژگاری و تەمێ و عیبرەت بن روونی کردنەوە، زیاد لەمە ئەگەر پێویست بوایە خوا باسی ئەفەرمو، کەواتە پێویست نی یە بزانین ئەو کۆمەڵە لە چ تیرەیەکن؟ یان لە چ چەرخێك دا بوون؟ یان شوێن و جێگایان لە کوێ بووە، ئەو ئەشکەوتە لە چ وڵاتێکە؟ لەم بارانەوە چەند رایەك هەیە لە پەڕاوەکانی تەفسیردا نووسراون، بەڵام هیچ رایەك لەوانە بە دڵنیایی یەوە پشتی پێ نابەسترێ، کەواتە هەر چاك وایە باس نەکرێن. ئینجا لە کۆتایی ئەم سەر گوزەشتەیەدا جارێ تاك و تەنیایی خوا ئەدا کە بەرهەمێکی ئاشکرای هەبوو لە هەموو کاروباری ئەم بەسەرهاتەدا، هەروەها ئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات بە خوێندنی ئەوەی خوا سروشی کردووەتە لای و بە روو کردن بۆلای خوا و پەنا بردن تەنیا بۆلای ئەو کە هیچ پەنایەکی تر نی یە جگە لە پەنای ئەو،

---

ماوەکە(٣٠٩) ساڵە بێ کەم و زیاد، ئەمەیش بە وێنەی ئەو فەرمودەیە: ﴿ فلبثت فيهم ألف سنة إلا خمسين عاما﴾ هێندێ ئەفەرمون: ئەوانە سەرە مڕ(٣٠٠) ساڵ خەوتن لە پاشان کەمێ بە خەبەر هاتن ئینجا(٩) ساڵی تر خەوتنەوە، کۆمەڵێ تر لەسەر ئەوەن کە دیاریی کردنی ماوەی خەوتنەکەیان بە(٣٠٠) ساڵ یا بە زیادەی(٩) ساڵە، ئەمەش رای ئەهلی کیتابە، لەسەر ئەم رایە رستەی ﴿ قل ربي﴾ بۆ بەرپەرچ دانەوەیە، زانینی تەولو لای خوایە.

مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٦﴾ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ
رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ
رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ

---

**ئەفەرموێ: ﴿مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ نی یە بۆ دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی جگە لە خوا، هیچ کەس ناکات بە هاوبەشی خۆی لە هیچ بڕیارێکی دا ﴿وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ﴾ واتە بخوێنە ئەوەی کە سروش کراوە بۆلای تۆ لە کتێبی خوای تۆ کە قورئانە و ڕەفتاری پێ بکە و شوێنی ئەوە بکەوە، گوێ مەگرە لەوانە کە ئەڵێن: قورئانی ترمان بۆ بێنە جگە لەم قورئانەی هێناوتە، یان بیگۆڕە. ﴿لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ هیچ کەس نی یە بتوانێ فەرمودە و بڕیارەکانی خوا بگۆڕێ جگە لەخوا خۆی ﴿وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا﴾ هەرگیز دەستت ناکەوێ هیچ جێگا و شوێنێ پەنای پێ بەری لەکاتی تەنگانە و بەسەرهاتی خراپ دا جگە لەلایەن خواوە. لەپاش باسی ئەو کۆمەڵە لاوە کە ڕاستیان کرد لەگەڵ خوای خۆیان دا و خوایش بەو جۆرە ڕێزی لێ گرتن کە باسی کرا، ئینجا ئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ) ئەکات کە ئەمیش هاوڕێ یەتی ئەو کۆمەڵە ئیماندارانە بکات کە لێ بڕاون بۆ خواپەرستی و لەگەڵ ئەوانەدا و بژی و هەڵسێ و دانیشێ و گوێ نەدات بە بێ باوەڕان بۆ خواپەرستی و لەگەڵ ئەوانەدا و بژی و هەڵسێ و دانیشێ و گوێ نەدات بە بێ باوەڕان و هیچ نرخێکیان بۆ دانەنێ، ئەفەرموێ: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾ خۆت ڕاگیرکە و دامەزراو بە لەگەڵ ئەوانەی کە پەروەردگاری خۆیان ئەپەرستن هەمیشە، ئەپاڕێنەوە و داوای لێ ئەکەن بەیانی و ئێوارە کە مەبەستیشیان تەنیا ڕەزامەندی خوایە، بێ هیچ نیازێکی تری دنیایی، هاوڕێ یەتی ئەوانە بکە و لەگەڵیان هەڵسە و دانیشە و خەریک بە لەگەڵ ئەوانەدا و ئەوانە فێر بکە، چونکە پیت و خێر لەوانەدایە، ئایینی خوا بانگەوازەکانی خوا لەسەر شانی وێنەی ئەوانە ڕاگیرە کە خۆیان داڕنیوە لەهەموو شتێ بۆ خوا و هیچ مەبەستێکیان نی یە گوێ ڕایەڵی و ڕەزامەندی خوا نەبێ، ئایین و بانگەوازی خوا بڵاو نابێتەوە و ڕاگیر نابێ بە کەسانێ کە مەبەستی تریان هەبێ،**

وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ
وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا
لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ

---

﴿وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ﴾ با چاوەكانت تێنەپەڕێ لە تەماشا كردنی ئەو ئیماندارانە، واتە ئەو ئیمانداره هەژارانـه بـه گـرنگ بگـره و چـاویان تـێ بـبڕه و بەسـەر ئـەوان دا تـێ مەپـەڕه بـۆ دەسـەڵات دارەكـان و ڕۆڵـەكانی دنیـا ﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ بـەجۆرێ بتـەوێ و مەبەسـتت جوانی و زینەتی ژیانی ئەم جیهانە بێت، واتە بتەوێ لەگەڵ ئەوانەدا هەڵسی و دانیشی كه دەسەڵات دار و خاوەن سامانن بە نیاز و ئومێدی ئەوەی ئیمان بێنن، جا بـەهۆی ئـەوەوە واز بێنی لە هاوڕێ یەتی ئیمانداره هەژارەكان كە راستن لەگەڵ خوای خۆیـان دا، ئەگێڕنـەوه كـه هێندێ لە پیاو ماقوڵـەكان و سـەرۆكەكانی قورەیش وتیان بە پێغەمبـەر(ﷺ) ئەگـەر ئەتـەوێ ئێمە ئیمان بێنین دەی ئەو هەژار و لات و بێ نەوایانە دەربكە لە مەجلیست یان مەجلیسێكی تایبـەتی بـۆ ئێمـە دابنـێ جگـە لـە مەجلیسی ئـەوان، هـەروەها ئەگێڕنـەوه كـه پێغەمبـەر(ﷺ) بەدڵی دا هات كە بە گوێ یـان بكات بە ئومێدی ئـەوه ئـەو سـەرۆكانه ئیمـان بێـنن، ئـەو كاتـه قوڕت و گرێ لەبەر پـێ ی ئیسلام دا نـامێنێ، ئینجا خـوایش ئـەم ئایەتانـەی نـاردە خـوارەوه، بـەرگری پێغەمبـەری(ﷺ) كـرد لـه بـەدی هێنـانی ئـەو مەبەسـته، ئـەو بـەرگری یـەی بـەتین و بەهێزتر كرد بەم فەرمودەیە: ﴿وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا﴾ به گوێ ی كـەسێ نەكەیت كە ئێمـه دڵیمان بێ ئاگا كرد كاتێ كە ڕووی كردە خـۆی و مـاڵ و سامانەكەی و ڕۆڵـە و كـەس و كـارو خۆشی و رابواردنی نـاڕەوای ئـەم جیهانـەی، كەواتـە لـە دڵـی دا شـوێن نەماوەتـەوه بـۆ یـادی خوا، هەر دڵێ كە ئاوا خۆی خـەریك بكـات، خـۆی ببەسـتێ بـە ئامـانج و مەبەسـتێكی تـره و جگە لە خوا بێگومان ئەو دڵە بێ ئاگا ئەبێ لە خوا، خوایش قاری لێ ئەگرێ زیاتر بێ ئاگـای ئەكات، مۆڵەتیشی ئەدات و بە ئارەزووی خۆی بۆی ڕێك ئەخات لـەم جیهانـەدا ئـەو كاتـه وای لـێ دێـت كـه ئەفـەرموێ: ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ ئـەو كەسـه شـوێنی ئـارەزوو و هـەوای نەفسی خـۆی كەوتووه، هـەموو كـار و فرمـانی تـرازاوه لـه سنوور و دژ و پێچەوانـەی هـەق و راستی یه، بێگومان ئەو كاته ناگەڕێتەوه بۆ سەر ڕێگای راست و ئەم هەلەی ژیانی لە دەست دەرئەچێ و شایانی ئەو ئاگره بەتینە ئەبێ كە خوا ئامادەی كردووه بۆی پەنا بەخوا، ئەو بێ

ئاگایانـە – وەکـو بـاس کـرا – داوایـان کـرد لـە پێغەمبـەر(ﷺ) کـە ئـەو ئیمانـدارە هەژارانـە دەربکـات، یـان مەجلیسـێکیان بۆ جیـا بکاتـەوە، لەسـەر ئـەوە بـەڵێنی ئیمـان هێنانیـان دا، خوایش بەو جۆرە بەرگری کرد و فەرموی: بە گوێ یان نەکەیت! ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ بڵێ پێ یان: تەنیا ئەم قورئانە و ئایینە هەق و راستە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾[1] واتە ماتوڵ هەق و راستە پێویستە شوێن کەوتنی، کەواتە هەرکەسێ ویستی دەی با باوەڕ بهێنێ، چونکە هیچ بەهانەیـەکی نـی یـە بـە دەسـتەوە، هەرکەسـیش ویستی بـاوەڕ نـەهێنێ، دەی بـا بـاوەڕ نـەهێنێت و کـافر بێـت، واتـە ئـەو کەسـەی کـە هـەق و راستی نـاوێ دەی بـا بڕوا و هـیچ پێویسـتی نـی یـە پـێ ی، هەرکەسـێ خـۆی بـەزل ئـەزانێ لـە ئاستی ئیمانداران، سەری بەندەیی شۆڕ ناکات لە بەردەم گەورەیی بێ سنووری خـوادا، ئـەو کەسە چاوەڕوانی هـیچ خێرو چاکەیەکی لـێ نـاکرێ بۆ ئیسلام و موسڵمانان، ئیسلام هیچ نرخێ نادات بەو کەسە و منەتی نەبێ بڕوا خۆی بێبەش و نائومێد و بەد بەخت بکات، ئینجا خۆی ئەبینێ کە چی بەسەر دێت. ئینجا ئەوا شێوەیەك لە سزا و تۆڵـەی سـەخت و سـامناکی رۆژی دوایـی پیشان ئـەدات دەربـارەی ئـەو سـیا چـارانەی کـە روو وەرئـەگێڕن لـەو ئایینـە راسـتەی کـە لەلایـەن خـواوە هـاتووە، ئەفـەرموێ: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾[2] بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ئەوانەی زوڵمیان کرد لە خۆیان، بـەم رەنگە گـەردن کـەچ نـەبوون و باوەڕیـان نـەهێنا بـەو ئایینە راسـتەی کـە لەلایـەن خـواوە بۆیـان هـات. ئامادەمـان کـردووە بـۆ ئەوانـە ئاگرێـك کـە بڵێسـەی چـوار دەوریـان ئـەدا وەکـو خێـوەتێ هەڵـدرابێ بەسەریانەوە، کەواتە ماوە نی یە بۆ راکردن و دەرباز بوون، ئومێدی رزگار بوون نی یە، کون و کەلەبـەرێ نـی یـە هەناسـە وەرگـیرێ لـێ یـەوە، خـوا پـەنامان بـدات. بێگومـان لـەم کاتـە ناهەموارەدا ئاو لە هـەموو شت خۆش تر و پێویست تـرە، ﴿ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟﴾ ئەگەر ئەوانـە لـە گەرما و سوتان و تینوێتیدا هاوار بکەن بۆ ئاو،

---

[1] بەگوێرەی تەفسیرەکە ئەم دوو رستەیەش لەو وتارەیە کە فـەرمان درا بـە وتـنی لەلایـەن پێغەمبـەرەوە(ﷺ) هێنـدێ ئەڵێن لەو نی یە و بەڵکو تەعلیقـە لەلایـەن خـواوە. لەسـەر هـەردووبار مەبەست ئـەوە نـی یـە فرمـان بـدرێ بـە کـوفرو رەوادانی کوفر، بەڵکو مەبەست هەڕەشەیە و پیشاندانی بێ نرخی بێ باوەڕەکانە.

[2] وشەی(سرادق) بە چەند جۆرێ تریش تەفسیر کراوەتـەوە: هۆدەیـە بـە دەوری خێـوەت دا، دووکـەڵی رەش، دیوار و پەرژینی ئاگر، دەریاکانی ئەم جیهانە کە لەو جیهان ئەبن بە ئاگر و دەوریان ئەدەن وەکو لە حەدیس دا ئەفەرموێ.

يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ

---

﴿يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى﴾ واتە ئاوێكیان بۆ ئەهێنرێ لە رەنگا وەك چڵك و چەپەڵی رۆن زەیت وایە، كە پاك و خاوێنەكەی وەرگیرابێ، چونكە ئەو ئاوە تێكەڵە لە كیم و زوخی دۆزەخی یەكان، لە گەرمی دا لە رادەیەك دایە كە نزیك خرایەوە لە دەمەوە ﴿يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ﴾ روو و دەم و چاوەكان ئەبرژێنێ ﴿بِئْسَ ٱلشَّرَابُ﴾ ئای ئەو ئاوە چ خوراوەیەكی پیس و خراپە!! ﴿وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا﴾ [1] ئای ئەو ئاگر و خێوەتی ئاگرە چ شوێن و جێگای پشوودان و پاڵ دانەوەیەكی بەد و خراپە!! لەپاش هەڕەشە و ترساندنی بێ باوەڕەكان و پیشاندانی هێندێ لە شێوەی ناز و رێزی پیاو چاكان، ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا﴾ بەڕاستی كەسانێ كە ئیمان و باوەڕیان هێنا بەو ئایینە راستەی كە بۆیان هاتووە لای خواوە و كردەوە چاكەكانیان بەجێ هێنا، بێگومان هەركەسێ لەوان كردەوەی چاكیان بە رێك و راستی بەجێ هێنا بێ بە گوێرەی رەزامەندی خوا ئێمە پاداشتی ئەو كەسە زایە ناكەین. پاداشتی ئەو خوا پێداوانە تەنیا خوا خۆی ئەزانێ بە تەواوی بەڵام لە قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەردا(ﷺ) چەند وێنە و شێوەیەكی باس كراوە، هێندێ لەوانە ئەمەیە كە لەم چەند ئایەتەدا ئەیفەرموێ:

١- ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە ئەوانە كە ناو نیشانیان لە ئایەتی پێشوودا باس كرا بۆ ئەوانە هەیە بەهەشتەهای نیشتەجێ كە رووبارەكان دێن و ئەچن لە ژێر كۆشكەكانیان دا.

٢- ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾ واتە ئەرازێنرێنەوە و خشڵ دار ئەكرێن لەو بەهەشتانەدا لە چەندەها بازنگ لە ئاڵتوون كە جوانی و شیرینی یەكەی باس ناكرێ بە گوێرەی ئایەتێ تر بازن و بەندی زیویان هەیە، لە ئایەتێ تر وەرئەگیرێ كە هێنی لۆلۆیان هەیە، كەواتە وادەرئەكەوێ كەهەریەكەسێ جۆربازن و باز وبەندیان هەیە، لە لوتفی خوا بەزیاد بێت.

---

[1] وشەی(یغاثوا)،(مرتفق) كە لە بنەڕەت دا بۆ خۆشی و چاكە بەكار ئەهێنرێن لێرەدا مەبەست لاقرتی پێ كردنە بۆ سزادانی دەروونی ئەو دۆزەخی یانە، وێنەی ئەمانە زۆر لە قورئان دا.

وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾
۞ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا
﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ
لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾

---

٣- ﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ ئەپۆشن پۆشاکێکی سەوز لە ئاوریشمی تەنك و ئەستوور.

٤- ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ [1] واتە دائەنیشن بە جۆرێ پاڵ ئەدەنەوە لەو بەهەشتانەدا بەسەر کورسی ئەسکەملەوە. ﴿نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا﴾ واتە: بەهـ بەهـ زۆر چاکە ئەو پاداشتەی کە بەڵێن دراوە بەو کۆمەڵە بەختیارە، و بەهەشت یان ئەو کورسیانە جێ و شوێنێکی شیرینن بۆ ئیسراحەت و پاڵ دانەوە و رابواردن، ئەوە بوو چەند شێوەیە لە سزا و تۆڵەی سەخت و سامناکی تاوان باران و چەند شێوەیەك لە ناز و رێزی چاکان و پاکان، جا کەواتە هیچ کەس منەتی نەبێ کام پاشەرۆژ بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ هەڵی بژێرێ؟ هەرکەس پشت ئەکاتە ئایینی خوا منەتی نەبێ بیکات و سبەینێ رابوێرێ لە خێوەتەکانی دۆزەخ دا و نۆشی بێت ئەو ئاوە پیسە بۆگەنە ئاگرینە کە تێکەڵی کیم و زووخی دۆزەخی یەکانە!! بە بۆنەی باسی ئەو کۆمەڵە کافرە کە سامان دار بوون و خۆیان بە زل سەیر ئەکرد و بەلایانەوە شورەیی بوو لە مەجلیسی ئیمان دارە هەژارەکان دا دابنیشن بەو بۆنەوە بەسەرهات و سەرگوزەشتەیەك ئەهێنێ لەلایەن دوو پیاوەوە کە نموونەن بۆ دوو تاقم لە ئادەمیزاد: یەکێکیان ناز و کەشخە ئەکات بە خۆشی ژیانی ئەم جیهانەوە، چاوی بڕیوەتە تەنها ئەوە، کەواتە خوای خۆی لە بیر بردووەتەوە و هیچ باکی نی یە لە پرسیار و تۆڵەی رۆژی دوایی، ئەوی تریان کەشخە و شانازی تەنیا بە ئایینی خواوە ئەکات و ئیمان و باوەڕەکەی، کەواتە هەمیشە لە یادی خوای خۆی دا ئەژی، چاوی بڕیوەتە تەنیا رەزامەندی خوا و پاشەرۆژی رۆژی

---

[1] ﴿ أرائك﴾ کۆیە و تاکەکەی ﴿ أریکە﴾ یە ئەریکە لەم جیهانەدا ناوە بۆ کورسی و ئەسکەملێ کە رازابێتەوە لەناو مۆدەیەك دا کە رازابێتەوە بۆ بووك و زاوا، ئەبێ ئەوەی بەهەشت چۆن بێت، پەنا بە خوا لەو شادی و خۆشی یە!!

دوایی، لەم سەر گوزەشتەیەدا روون ئەبێتەوە کە پاشە رۆژی بەد بەختی و روو رەشی بۆ کەسانێکە کە پشت ئەکەنە خوا، پاشە رۆژی کامەرانی و بەختیاری بۆ کەسانێکە کە بە گوێرەی فەرمان و رەزامەندی خوا ئەجوڵێنەوە.

ئەفەرموێ: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا﴾ واتە ئەی پێغەمبەر بەسەرهاتێکی نایاب باس بکە بۆ ئەو بت پەرستانە کە خۆیان بە زل ئەزانن و وێنەیەکی سەیریان بۆ بهێنەرەوە ﴿رَّجُلَيۡنِ﴾ سەر گوزەشتە و بەسەرهاتی دوو پیاو کە یەکێکیان کافرو بێ باوەڕ بوو، خۆی بە زل سەیر ئەکردو کەشخە و شانازی بەماڵ و سامانەکەیەوە ئەکرد، ئەوی تریان ئیماندار و هەژارو بێ نەوا بوو، ﴿جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ﴾ فەراهەممان هێنا بوو بۆ یەکێکیان - کە کافرەکەیان بوو - دوو باخ بە چەند جۆرێ لە ترێ. ﴿وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ﴾ بە درەختی دار خورما چوار دەوری ئەو دوو باغەمان دابوو وەکو پەرژین ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا﴾ لە ناوەڕاست و نێوانی ئەو دوو باغەدا کشت و کاڵمان فەراهەم هێنابوو، کەواتە ئەو دوو باغە هەرچۆنێ شێوەیەکی شیرین و دڵبەریان هەبوو، هەروەها هۆی ژیانیشیان تێدا بوو لە قوت و خۆراك و میوەی چاك و خۆش ﴿كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا﴾ هەردوو باغەکە بەرو میوەی خۆیانیانی هێنا بوو بە تێرو تەسەلی ﴿وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗا﴾ واتە هیچ کەم و کوڕی یەکیان نەکرد بوو لەو بەرو بومەیان دا، واتە بە وێنەی باغی تر نەبوون کە کەم و کوڕی یان هەیە، ساڵێ چاکە و ساڵێ خراپە و نایهێنێ ﴿وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا﴾ واتە کانیاو و رووبارمان هەڵقوڵاند بوو بۆ هەموو باغەکان و هەمیشە تێر ئاو بن و رەونەق و شیرینی یان زیاد بکات و بەرو بومیان تێرو تەواو بێت ﴿وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ﴾ چەند جۆرێ ماڵ و سامان هەبوو لە ئاڵتون و زیو و ماڵات و شتی تر بۆ ئەو خاوەن باخانە. ئەو کابرا سامان دارەش بەهۆی ئەوەوە دڵی لای خوای خۆی نەبوو لە خۆی گۆڕاو بافیشی ئەکردو کەشخەی ئەکرد بە ملی خەڵکدا ﴿فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ﴾ بەهۆی ئەوەوە وتی بە هاوڕێ ئیمانداره هەژارەکەی ﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾ لە کاتێکدا کە قسە و هاتوچۆی ئەکرد لەگەڵێ دا، لەگەڵی ئەکۆڵی یەوەو ئەدوا لە بابەت بێ باوەڕی و بت پەرستی یەوە، ئیتر کابرای کافر ئەکۆڵی یەوە لەگەڵ هاوڕێ ئیمان دارەکەی و کافرێتی خۆی دەرئەبڕی یان ئیماندارەکە لەگەڵ ئەوو و ئەیویست ئامۆژگاری بکات هەردوو بار هەر ئەگونجێ. لەسەر هەر بار کابرای کافر بە کەشخەوە وتی: ﴿أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا﴾ من ماڵ و سامانم لە تۆ زۆرترە و من بەهێز و دەسەڵات دار ترم لە تۆ لە بابەت رۆڵە و کەس و کارو ژێر دەستە و خزمەتکارەوە، ئەو کابرا هەر بەوەوە نەوەستا،

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ
قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ
أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ
بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ
مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾

---

بەڵكو بەم جۆرەی کرد کە ئەفەرموێ: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ﴾ واتە چووە ناو باغ و بەهەشتەکەیەوە لەگەڵ هاوڕێ ئیماندارەکەی بۆ ئەمەی بیگێڕێ بە ناویا و ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی پیشان بدات بۆ زیادە کەشخە و شانازی بە ملی دا، ﴿وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ لەکاتێك دا کە ستەمکار بوو لە خۆی و زیانی بە خۆی ئەگەیاند بەهۆی کوفر و لەخۆ گوڕانەکەیەوە ﴿قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾ وتی: من گومان نابەم کە هەرگیز ئەم بەهەشتە نەمێنێ و بەرباد بێ ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾ گومان نابەم کە ڕۆژی دوایی بێت و بەدی بێت ﴿وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾ سوێند بەخوا ئەگەر پاش مردن من زیندوو بکرێمەوە و بمگێڕنەوە بۆلای پەروەردگارم، بێگومان ئەو کاتە باشتر لەم باغ و بەهەشتەی ئێستام دەست ئەکەوێ و پاشەڕۆژ و بەشی ئەوێم چاکتر ئەبێ، واتە ئەمەی کە لەم جیهانەدا هەمە مافی خۆمە و خۆم شایانی ئەوەم، کەواتە ئەگەر زیندوو بوونەوەش ڕاست بێت - وەکو تۆ ئەڵێیت - ئەو کاتەش وەکو ئێستا ماف و بەشی خۆمم پێ ئەدرێ و دیارە ئەو کاتە بەشی ئەوێم چاکترە، چونکە دوایی نەهاتووە، ئەو کابرا بەو جۆرە ئەو سوێندە ناڕەوای خوارد، چونکە لای وا بوو ماڵ و سامان بە هەموو جۆر نیشانەیە لەسەر ڕێزی خاوەنەکەی بەلای خواوە، ئەی ماتوڵ خاوەن ڕێز بێت لەهەر لایەك بێت ئەبێ لێ بگیرێ، بێ ئاگا بوو لەوەی کە ماڵ و سامان زۆر

جار نیشانەیە لەسەر بەد بەختی و خەشم و قاری خوا لە خاوەنەکەی. ئەو کابرا بێ باوەڕە خەڵەتاوە – وەکو هەموو خەڵەتاو و نەفامێ تر – ئەوە قسەی بوو، بەڵام هاوڕێ بە ئیمان و باوەڕدارەکەی کە بێ نەوا و بێ سامان بوو تەنیا شانازی بە عەقیدە و باوەڕەکەیەوە ئەکرد، شانازی تەنیا بە خواوە ئەکرد کە هەموو شت مل کەچ و سەر شۆڕە لە ئاستی ئەو، لەبەر ئەوە لە رووی کابرای سامان داردا راوەستا، بێزاری دەربڕی لە قسە و باوەڕەکەی و تەمێی کرد و بیری خستەوە کە لە شتێکی بێ نرخی قیزەون پەیدا بووە، کەواتە بۆ ئەبێ خۆی نەناسێ و ئاوا خۆی لێ بگۆڕێ و کەشخە بکات، ئەفەرموێ: ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ﴾ هاوڕێ ئیمان دارەکەی پێی وت: ﴿وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ﴾ لەکاتێك دا کە ئەکۆڵی یەوە لەگەڵی، قسەی هاورد و برد ئەکرد لەگەڵی، پێی وت: ﴿أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ﴾ ئایا تۆ بێ باوەڕیت بە کەسێ کە تۆی دروست کردووە لە خۆڵ؟ ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ لە پاشان دروستی کردووی لە دڵۆپە ئاوێك کە قیزەونە و پێی ئەوترێ نوتفە ﴿ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا﴾ ئینجا رێك و پێکی کردی و کردیتی بە پیاوێکی تەواو، واتە باوەڕ نەبوون بە زندوو بوونەوە زۆر ناڕەوا و نەفامی یە و جێگای سەرسوڕمانە، چونکە هەموو کەسێ ئەزانێ کە ئەم ئادەمی یە رێك و پێکە لە بنەڕەتەوە لە خۆڵە، چ بە گوێرەی یەکەم کەسێ کە ئادەمە و یەکسەر لە خۆڵ دروست کرا، چ بە گوێرەی رۆڵە و نەوەکانی، چونکە ئەمانیش ئەگەڕێنەوە سەر ئەو خۆڵە، لەباری تریشەوە لەم خۆڵە خوا خۆراك فەراهەم ئەهێنێ، لە خۆراکەکەشی ئەو ئاوە پەیدا ئەبێ و لەو ئاوەیش ئەم ئادەمی یە پەیدا ئەبێ، کەواتە بە ئاشکرا ئەزانین کە بنەڕەتی ئادەمی لە خۆڵە و لە خاك فەراهەم هێنراوە، کەواتە هەر کەسێ رێزی ژیریی خۆی بگرێ هەرگیز زیندوو بوونەوە بە درۆ و نەگونجاو دانانێ، بەڵکو بە هیچ جۆر سەری لێ ناکاتەوە و ئەزانێ ئەو دەسەڵاتەی لە یەکەم جارەوە دروستی کرد، هەروەها بە ئاسانی بێ ئەرك و زەحمەت دووبارەشی ئەکاتەوە،

هەرکەس وا نەزانێ بێگومان ئەو کەسە ناتەواوە و ژیریی نەخۆشە، پیاوە لە خۆ گۆڕاوەکە هەرچەندە باوەڕی بە بوونی خوا هەبوو، وەکو لە قسەی خۆیەوە روون ئەبێتەوە، بەڵام باوەڕەکەی بە بێ باوەڕی و کوفر دائەنرێ، چونکە باوەڕی بە زیندوو بوونەوە نەبوو، باوەڕ نەبوون بە زیندوو بوونەوە باوەڕ نەکردنە بە دەسەڵات و توانای خوا، ئەوەیش باوەڕ نەکردنە بەخوا، هەروەها باوەڕ نەبوون بە هەر بەندێ لە ئایینی خوا ئەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ نەبوون بە خوا، ئەم هاوڕێ ئیمان و باوەڕ دارە بەو جۆرە بێزاری دەربڕی، تەمێی ئەو کابرای کرد، ئینجا باوەڕی رێك و راستی خۆی دەرئەبڕێ، ئەفەرموێ: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾ واتە تۆ کافری و باوەڕت نی یە بە خوا، بەڵام من باوەڕم هەیە و ئەڵێم: خوایە کە ناوی(الله) یە پەروەردگاری منە، من هیچ کەس ناکەم بە هاوبەش و وێنە بۆ پەروەردگاری خۆم، ئینجا زیاتر تەمێی کرد و پێی وت: ﴿ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ با کاتێ چوویتە ناو باغەکەتەوە بت گوتایە: هەرچی خوا ویستبێتی هەر ئەوە ئەبێ و ئیش ئەوەیە کە خوا کردوویەتی ﴿لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ هیچ هێزو توانایەك نی یە بۆ هیچ کەس بەهۆی خواوە نەبێ، واتە تۆ لەسەر بارێکی ناڕەوای، ئەبوایە کاتێ ناز و نیعمەتی خوات بینی سەری بەندایەتیت بۆ خوا داخستایە و لە خۆت نەگۆڕایەی و دانت بنایە بە دەستە پاچەیی خۆت دا، و هەموو دەسەڵات و توانات بۆ خوا دانایە، چونکە ئەوەی کە هەتە هەمووی خوا پێی داوی، بە یارمەتی خوا دەستت کەوتووە، ﴿إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا﴾ واتە ئەگەر تۆ من ئەبینی کەمترم لە تۆ لە بابەت ماڵ و دارایی و ئەولادەوە، من بەوە دڵ گران و نائومێد نابم و تۆیش هیچ بەوە مەنازە و لەخۆت مەگۆڕێ،

فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا
﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ
أَنفَقَ فِيهَا

---

**﴿فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ﴾ چونکە چاوەڕوانی و ئومێدم وایە کە پەروەردگارم شتی باشتر لە باغەکەی تۆم پێ بدات ﴿وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ سزاو تریشقە و بەسەرهاتێکی ناهەمواریش لەلایەن ئاسمانەوە بدات بەسەر باغەکەی تۆدا ﴿فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا﴾ بەهۆی ئەوەوە باغەکەت بەرباد ببێ و بگەڕێ بە زەوی یەکی ساف و تەخت کە پێی لێ هەڵخلیسکێ ﴿أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا﴾ یان ئاوی باغەکەت بڕوا بە ناخی زەوی دا ﴿فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا﴾ بەهۆی ئەوەوە هەرگیز ناتوانی بگەڕێی بە شوێنی دا و دەست خۆتی بخەیتەوە، واتە چاوەڕوانی ئەکەم باغەکەت بەرباد ببێ بە دەردێکی ئاسمانی یان دەردێك کە لە زەوی یەوە رووی تێ بکات. ئینجا کوت و پڕی شێوەی جوان و شیرینی باغەکە لائەبا و شێوەی بەرباد بوونمان پیشان ئەدات، هەروەها شێوەی کەشخە و شانازی خاوەنەکەی لائەبات و شێوەی پەشیمانی و داخ و خەفەت و گەڕانەوە و تۆبەیمان ئەخاتە پێش چاو، چونکە ئەوەی هاوڕێ ئیمان دارەکەی چاوەڕێی کرد خوا بەدی هێنا، ئەفەرموێ: ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾ سامان و بەرهەم و بەرو بوومەکەی بە شتێ کە هۆی وێران کردن بوو چوار دەور درا، واتە وێران و بەرباد کرا وەك و هاوڕێ ئیمان دارەکەی چاوەڕوانی کرد و ترساندی. ﴿فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ﴾ واتە بەهۆی ئەوەوە کابرا حاڵی گۆڕا بە جۆرێ لە داخ دا هەردوو لەپی دەستی وەرئەگێڕا و ئەم دیو دیوی پێ ئەکرد، وەك و باوە لەناو ئەو کەسانەی کە دووچاری زیانی سەخت بەسەرهاتی خراپ دێن، واتە داخ و پەشیمانی و مەراق داگیری کرد. ﴿عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا﴾ لەسەر ئەو ماڵ و پوڵ و پارەی کە بەختی کردبوو لە خزمەت کردن و بەرهەم هێنانی باغەکانی دا،**

وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ
وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا

---

﴿وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ له كاتێك دا كه بینی ئەو هەموو مێو و ترێ چەن و مل کەوتوون بەسەر کەپر و هەرزاڵەکانیان دا، بەم جۆرە ئەمان رووخان و لە بێخ هاتوون، ترێ و مێوەکانیش کەوتوون بە ملیان دا و ترشاون بەسەر یەك دا، ئەو باغەی کە کاتی خۆی ئەیگوت: گومانم نی یە هەرگیز ئەمە نەمێنێ و بفەوتێ ﴿وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّيٓ أَحَدًا﴾ لە بابەت بیرو باوەڕیشەوە گۆڕا بە جۆرێ ئەیوت: ئای کاشکێ هیچ کەسم نەکردایە بە شەریك و هاوبەشی پەروەردگارم، واتە تەنیا خوام بپەرستایە و ڕێبازی ئایینی ئەوم بدایەتە بەر، ئەو کابرا نەفامە کاتی خۆی کەشخەی ئەکرد بە مل هاوڕێکەی دا و ئەیوت: من کەس و کار و ئەولادم زۆر ترە لە تۆ خوایش بەو جۆرە ماڵ وێرانی کرد و ئینجا بە شێوەی تەشەر لێدان و لاقرتی پێ کردن ئەفەرموێ: ﴿ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتە ئەوەی بەسەرهات و هیچ کۆمەڵێکیش نەبوو بێجگە لە خوا کە بتوانێ بەرگری ئەو زیان و وێران بوونەی لێ بکات ﴿وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا﴾ خۆیشی بە هێز و توانانی خۆی توانای سەرپێچی نەبوو لەو تۆڵە و سزای کە خوا لێ ی سەند. ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ﴾ واتە لەو کات و شوێنانەدا یارمەتی دان تەنیا بۆ خوایەکە ناوی(الله) یە و هیچ کەسێکی تر دەسەڵاتی نی یە بەسەری دا، تەنیا ئەو خوایەکی هەقە، بێگومان خوایش تەنیا یارمەتی دۆستەکانی خۆی ئەدات، ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ واتە خوا باشترە لە هەموو کەسێ لە بابەت پاداشت دانەوە بۆ دۆستەکانی و ئەو باشترە بۆ پاشەڕۆژ پێدانیان، ئینجا بە دوا بەدوای ئەم باسەدا وێنە ئەهێنێتەوە بۆ ژیانی ئەم جیهانە بە شێوەی گشتی، روونی ئەکاتەوە کە هەموو ژیانی ئەم جیهانە شتێکی دانەمەزراوە و هەموو کڕ و فڕێکە شایانی ئەوە نی یە پشتی پێ ببەسترێ و هەرکەسێ پشتی پێ ببەستێ خەڵەتاوە وەك و خاوەنی ئەو دوو باغە کە باسی کرا. ئەفەرموێ: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە ئەی پێغەمبەر باس بکەبۆخەڵکی و شتێ وێنەبهێنەرەوە کەوەکوژیانی ئەم جیهانە جوان و شیرین و دڵگیر و دڵبەر بێت و بە زوویی و چەسپانی بێت و بڕوا و تێپەڕی و نەمێنێتەوە،

كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾
وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا

---

ئـەو وێنەیـەش ئەمەیـە: ﴿كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ﴾[1] واتە شێوەی ژیانی ئەم جیهانە وەکو شێوەی بارانێ وایە کە ئێمە لای ژوورەوە هێناومانەتە خوارەوە، ئینجا ئەو هەموو رواوی زەوی یەی پێ ئەڕوێ و ئەچێت بەناو یەک دا، ئینجا بە زوویی ئەو هەموو رواوە تەڕوو تازە ناسکە شیرینە ئەگۆڕێ بە پوش و پەڵاشێکی وشکی داڕزاو کە با پرژو بڵاوی ئەکاتەوە، بەڕاستی وێنەیەکی ئێجگار رێک و راستە، تەنیا بە قورئان ئەکەوێ ئەو جۆرە شتانە و روون کردنەوەی هەموو مەبەستێ کە دووابێ لێ ی، بە رستەیەکی کورت شیرینی ژیانی ئەم جیهانەی پیشان دا و تێ ی پەڕاند!! ئینجا پیتی ﴿ف﴾ بەدوا هاتن ئەگەیەنێ بێ تەفرە و وەستان ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾ خوا هەمیشە توانا و دەسەڵات دارە بەسەر هەموو فەراهەم هێنان و بەرباد کردنێک دا کە بیەوێ، ئینجا روونی ئەکاتەوە ئەو شتەی کە ئامانجی راستەقینەیە و شایانی ئەوەیە کە بە گرنگ بگیرێ، ئەفەرموێ: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە ماڵ و کوڕ، زینەت و شەوکەتی ژیانی ئەم جیهانەیە کە باس کرا و وێنەی بۆ هێنرایەوە، کەواتە ماڧ ئەوەیان نی یە بکرێن بە ئامانجی راستەقینە و پشتیان پێ ببەسترێ، هەرچەندە پێویستن، ئیسلام بەرگری ناکات لە ویستن و خۆش گەرەک بوونیان لە سنووری راست و رەوادا، بەڵام شتێ بەردەوام نەبێ، بەڵکو بەزوویی تێپەڕێ... بێ نرخە ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ کردەوە چاکەکان کە پاداشت و بەرهەمیان ئەمێنێتەوە بێ بڕانەوە، ئەوانە باشن لای خواو لە رۆژی دوایی دا ئەجرو پاداشتیان هەیە و ئەوانە باشن و جێگای ئومێدن بۆ خاوەنەکانیان، چونکە ئەوەی چاوەڕوانی یان کردووە لێ یان لەم جیهانەدا دەستیان ئەکەوێ لە رۆژی دوایی دا بەڵام ماڵ و کوڕ و ئەولاد وانین و بەو جۆرە نین. لەپاش باسی کردەوە چاکەکان کە بەرهەم و

---

[1] ئەم وێنەیە بە پێ ی زانیاری رەوانبێژیی پێ ی ئەوترێ: ﴿تشبیه المرکب﴾، چونکە شێوەی شیرین و دڵگیری ئەم جیهانە و بە خێرایی تیا چوونی،، وەک و شێوەی شیرینی ئەو هەموو گوڵزار و گیا و سەوزەواتە وایە کە لە باران پەیدا ئەبێت و بەرە بەرە زیاد ئەکات و ئەمجار بە زوویی وشک ئەبێت و ئەبێ بە پووش و بڵاو ئەبێتەوە.

پاداشتیان لە رۆژی دوایی دا وەرئەگیرێ، ئینجا شێوەیەك لە شێوە گرنگەكانی ئەو رۆژە باس ئەكات و هێندێ لە رووداوە سامناكەكانی ئەخاتە پێش چاو، ئەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی رۆژێ بكە كە هەمووشاخ و چیاكان لە شوێنی خۆیان هەڵئەكەنین و بەرزیان ئەكەینەوە، وەكو هەور بەلای سەری زەوی دا ئەیانگێڕین ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ بَارِزَةً﴾[1] ئەبینی رووی زەوی لە هەموو لاو گۆشەیەكی یەوە بە دەركەوتوویی بێ ئەمەی هیچ شتێ دایشارێ، چونكە نە شاخ و چیاو نە خانوو و نە دارو درەخت و نە هیچ شتێكی تر نامێنێ بەسەر زەوی یەوە ﴿وَحَشَرْنَاهُمْ﴾ بێگومان خەڵكی هەموو كۆ ئەكەینەوە بە زیندوویی ﴿فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ واتە هەموو كۆئەكەینەوە، كەواتە هیچ كەس لەوان بەجێ نامێڵین و وازی لێ ناهێنین ﴿وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا﴾ واتە هەموو بە یەك ریز یان بە ریز ریز كراوی ئامادە و حازر ئەكرێن لە بەردەم دادگای خوای تۆدا بۆ ئەوەی فەرمان و بڕیار دەركات دەربارەیان، بەڕاستی شێوەیەكی ئێجگار سامناكە، تا بیری لێ بكرێتەوە سامناكی یەكەی روون تر ئەبێتەوە، پەنا بەخوا ئەو هەموو چیاو كۆسارە گەورە گەورانە هەموو بە یەك جار لە جێگای خۆیان هەڵكەنرێن و بكەونە جومبش و گەڕان. دەی ئەبێ دڵی خەڵكی چی بەسەر بێت، هەموو رووی زەوی دەركەوێ بە رووت و قوتی، نە چاڵ و چۆڵی و نە دۆڵ و نە شیو و نە دار و درەخت و نە چیاو نە بەرزی و نزمی. هەروەها دڵەكانیش هەموو دەرئەكەون و هەرچی شاراوەكانیان هەیە هەمووی ئاشكرا ئەبێ لەم رۆژەدا، ئینجا ئەو هەموو خەڵكە كە خوا نەبێ كەس ژمارەیان نازانێ، لە یەكەمجارەوە پەیدا بوون تا كۆتایی ژیانی ئەم جیهانە، ئەو هەمووە بە یەك جار سەرجەم كۆ بكرێنەوە و ریز بكرێن بەسەر زەوی یەكەوە كە ساف و تەخت كراوە و جێگای خۆداشاردنی تێدا نەماوە، بەڕاستی بە بیر لێ كردنەوەی ئەو بەسەرهاتە سامناكە هەق وایە هەر لە ئێستاوە دڵ بكەوێتە لەرزە و تەپە تەپ لەو رۆژو كاتە سامناكە، ئینجا بۆ سزادانی دەروونی بێ باوەڕەكان، ئەوانەی كە لەم جیهانەدا دەم درێژی یان ئەكرد و هاتنی ئەو رۆژە سەختەیان بە درۆ ئەزانی، لاقرتی یان پێ ئەكرد،

---

[1] چەند ئایەتێ تر باسی بەسەرهاتی چیاكان ئەكات، هێندێ لەوانە وا پیشان ئەدەن كە هەموو چیاكان ئەكرێن بە تۆز و پرژ و بلاو ئەكرێنەوە، جا ئیتر هەر لە شوێن خۆیان ئەكرێن بە تۆز وەكو هەڵم بەرز ئەبنەوە ئینجا وەكو هەور بەلای سەری زەوی دا ئەگەڕێن ئینجا پرژ و بلاو ئەبنەوە، یان هەر لە یەكەم جارەوە بەرز ئەكرێنەوە و ئەخرێنە گەردش، ئینجا ئەدرێن بە مل یەك دا و بەسەر زەوی دا تا پارە پارە ئەبن لە پاشان ئەكرێن بە تۆز و پرژ و بلاو ئەبنەوە، بە هەردوو بارەكە وترلوە و ئەگونجێ.

لَقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا

---

لەو کاتە ناهەموارەدا و لەناو ئەو کۆمەڵەدا بە تەشەرەوە ئەوتریٰ: ﴿لَقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ واتە بێگومان ئەوا هاتنەوە بۆلامان بە زیندوویی و دروستمان کردنەوە هەرچۆنیٚ یەکەم جار دروستمان کردن لە دنیادا هاتنەوە بە رووت و قوتی و بیٚ ماڵ و سامان و رۆڵە و کەس و کار، بیٚ ئەو شتانەی کە لە دنیادا کەشخە و شانازیتان پێوە ئەکردن، بە ملی خەڵك دا ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا﴾ واتە ئێوە لاتان وابوو لە دنیادا کە ئێمە هەرگیز کاتیٚ فەراهەم ناهێنین و رۆژیٚ ناهێنین بۆ بەدی هێنانی ئەو هەموو بەڵێن و هەڕەشانەی کە لە دنیادا پێمان راگەیاندن بەهۆی پێغەمبەرانەوە، لاتان وابوو کە پێغەمبەرەکان درۆتان لەگەڵ ئەکەن کەچی ئەوەتا راستیان کرد. پەنا بەخوا لەو روو رەشی و خەجاڵەتی یە و لەو هەموو سام و ترس و لەرزەی کە ئەو کۆمەڵە بەد بەختە داگیر ئەکات لەو کاتەدا کە تانە و تەشەریان لیٚ ئەدریٚ و بەو شێوە رسوایی یە ئەخرێنەوە بە درۆوە، خوا پەنامان بدات لە قارو خەشمی خۆی. بەڕاستی هەر بە قورئان ئەکەویٚ فەرمایش بکات: تەماشا کەین کوت و پڕ رووی فەرمودە ئەکاتە ئەو تاوان بارە بیٚ باوەڕانە بە تەشەرەوە وەکو ئێستا ئەو رۆژە بێت، شێوەی سامناکی ئەو کاتە ئەخاتە پێش چاو، وەکو ئێستا ئەو کاتە بێت و بەچاو ئەیبینین و بە گویٚ ئەیبیستین ئەو گفتوگۆیەی کە لەویٚ ئەکریٚ، لەوانەیە خەریکی بین بەچاو تەماشای شێوەی ئەو کۆمەڵە بکەین: شێوەی روو رەشی و ریسوایی و داماوی و شەرمەزاری یان لەکاتی ئەو تانە و تەشەرەدا، ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ﴾ واتە دەفتەر و نامەی کردەوەکانتان ئەخرێنە دەستی راستی چاکان و دەستی چەپی ناپاك و تاوانباران ﴿فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ﴾ ئینجا ئەبینی تاوانبارەکان بە ترس و سامەوە لەو هەموو تاوان و خراپەی کە نووسراوە لە دەفتەر و نامەکەیان دا ﴿وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا﴾ ئەڵێن: ئای مەرگ بێت بۆمان ﴿مَالِ هَذَا الْكِتَابِ﴾ ئەوە چی یە بۆ ئەم دەفتەرو نامەیە؟ ﴿لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا﴾ کە هیچ گوناهیٚ بچووك و گەورە نی یە هەڵی نەژماردبیٚ و تیای دا نەنووسرابیٚ، هەرچۆنیٚ ئەوان وا ئەڵێن، ئەوا خوایش دڵنیایی لەسەر ئەکات کە بەشێوەی گشتی هەموو کردەوەیەکیان تیای دا نوسراوە،

وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ
إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ

---

ئەفەرموێ: ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًاۗ﴾ واتە هەر کردەوەیەکیان کردبێ لە دنیادا لە چاك و لە خراپ، گەورە و بچووك، هەموویان دەست ئەکەوێ بە نووسراوی لەو نامەی کردەوەیان دا، هەموو حازر و بزر کراوە لەبەر دەستیان دا، ﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ خوای تۆیش جەور و ستەم ناکات لەهیچ کەس، واتە تۆڵە لە هیچ کەس ناسێنێ تا تاوانی نەکردبێ، بە ئەندازەی تاوانەکەشی تۆڵە ئەسێنێ، کەم و کوڕیش ناکات لە پاداشت و ئەجری هیچ کردەوەیەکی چاك دا، بەڵکو چاکە بە چەند چەندانە پاداشت ئەداتەوە لای خوارووی بە دەقات لە لوتف و بەزەیی یە بێ سنوورەکەی بەزیاد بێت، بێگومان شەیتان دوژمنێکی نەکەوتووە و هۆیەکی بەهێزە بۆ لادانی ئادەمی لە ڕێگای ڕاست و دووچار بوونی سزا و سیاچارەیی ڕۆژی دوایی کە باس کرا، جا لەبەر ئەوە خوای گەورە لە چەند شوێن دا ئاگادارمان ئەکاتەوە بە دوژمنایەتی شەیتان، بەڵکو ئێمەش بفامین و شوێنی ئەو دوژمنی خۆمانە نەکەوین یەکێ لەو شوێنانە ئەمەیە کە لێرەدا ئەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە فرمانمان دا بە مەلائیکە و پێمان وتن سوژدە بەرن بۆ ئادەم، واتە سوژدەی ڕێزو قەدر گرتن، نەك سوژدەی پەرستن ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ ئینجا ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگەلە شەیتان، هۆی سەرپێچی یەکەشی ئەمە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ﴾ شەیتان لە تیرەی(جن) بوو نەك مەلائیکە. ﴿فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ﴾ بەهۆی ئەوەوە لە فرمانی خوای خۆی دەرچوو و گوێ رایەڵی نەکرد و رازی نەبوو بەو بڕیارە، ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي﴾ دەی ئایا ئەی ئادەمیزادەکان ئێوە شەیتان و ڕۆڵەکانی و شوێن کەوتووەکانی ئەکەن بە خۆشەویست و خاوەن خۆتان بە جۆرێ بەسەر من دا تێ ئەپەڕن و لەباتی من گوێ رایەڵی بۆ ئەوان ئەکەن؟! واتە ئەوە کارێکی زۆر خراپ و ناڕەوایە و هۆی سەرسوڕمانە کە ئێوە گوێ رایەڵی ئەو شەیتانە تاوان بارە دوژمنە بکەن لەباتی خوای خۆتان کە دروستی کردوون و ئەو هەموو نیعمەتەی ڕشتووە بەسەرتان دا ﴿وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ﴾ لە کاتێك دا کە ئەوان دوژمنن بۆ ئێوە،

بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ
مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ وَيَوۡمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ
وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُم مَّوۡبِقٗا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾

---

**﴿بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا﴾ واتە ئای چەندە شتێکی پیس و خراپە گوێ ڕایەڵی ئەو ئادەمی یە زاڵمانە بۆ شەیتان و نەوە و شوێن کەوتووەکانی لەباتی گوێ ڕایەڵی یان بۆ خوا و شەیتان ئەوانە بریتی یەکی پیس و خراپن بۆ ئەو ئادەمی یە ستەمکارانە!! کە لەباتی خوا بڕیاری ئەدەن بۆ خۆیان. ئینجا زیاتر ڕوونی ئەکاتەوە کە شەیتان و شوێن کەوتووەکانی شایانی ئەو پەرستن و گوێ ڕایەڵی یە نین ئەفەرموێ: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ﴾ شەیتان و ڕۆڵە و نەوەکانیم حازری دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی نەکردووە، هەروەها هێندێ لە خۆیانم حازری دروستی کردنی هێندێ تریانم نەکردووە، تا ئاگادار بن بەسەر شتێك دا کە خەڵکی تر ئاگای لێ ی نی یە، یان حازرم نەکردوون بۆ ئەمەی کۆمەکیم بکەن، واتە کەسێ شایانی پەرستن و گوێ ڕایەڵی بۆ کردنە کە زانینێکی جیاوازی هەبێ، وەکو خوا یان بەشدار بێت لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی خەڵکی دا و یارمەتی خوای دابێت ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا﴾ ئەو کەسانەی کە گومڕاکەری مەردومن – واتە شەیتان و ڕۆڵەو نەوەکانی – من نەم گێڕاون و نەم کردوون بە کۆمەکی کەر بۆ خۆم، کەواتە بە هیچ کلۆجێ شەیتان و شوێن کەوتووەکانی شایانی پەرستن نین و نابێ گوێ ڕایەڵی بکرێن. بێگومان خوا پێویستی بە هیچ کەس و بە هیچ شتێ نی یە، هەرچۆنێ شەیتان و شوێن کەوتووەکانی ناکات بە یارمەتی دەر و کۆمەك بۆ خۆی، هەروەها هیچ کەسی تریش ناکات بەلأم لێرەدا مەبەست لەکەدار کردن و تانە وتەشەر دانە لە کافرەکان و شوێن کەوتووەکانی شەیتان، و لاقرتی کردنە پێ یان و ڕوون کردنەوەی نەفامی یانە، کە ئەوەندە نەفامن شتی وا ئاشکرا نازانن و ڕێی پێ نابەن، هەروەها مەبەست لێکۆڵینەوەیە لەگەڵ ئەو تاقمە لە بت پەرستەکان کە شەیتانیان ئەپەرست و ئەیان کرد بەهاوبەش بۆ خوا لە پەرستن دا، چونکە لایان وابوو کە شەیتان زانینێکی تایبەتی هەیە، جا لێرەدا قورئان بەگوێرەی فام و تێگەیشتنی خۆیان**

لەگەڵیان ئەکۆڵێتەوە و بەرپەرچیان ئەداتەوە و ئەیانخاتەوە بە درۆوە، واتە خوا قار و خەشمی هەیە دەربارەی گومڕا کەران کەواتە ئەگەر لە فەرزێك دا کۆمەکی کەری بۆ خۆی ڕەوا بدایە لە گرۆی شەیتانی ڕەوا نەئەدا. ئینجا شێوەیەکی تر پیشان ئەدات لە شێوە ناهەموارەکانی ڕۆژی دوایی و پاشەڕۆژی تاوان بارەکان و پەرستراوەکانیان ڕوون ئەکاتەوە، ئەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ ﴾ واتە باسی ڕۆژێ بکە کە خوا بە تەشەر و توانجەوە ئەفەرموێ بە بت پەرستەکان: بانگ بکەنە ئەو بتانەی کە ئێوە لە دنیادا کردوو بوونتان بە هاوبەشی من و ئەتان پەرستن بە ئومێدی ئەوەی تکاتان بۆ بکەن لای من، بانگ و هاوار بکەنە ئەوانە کە لاتان وابوو و ئەتان وت: هاوبەشن بۆ من بابێن بە هاوارتانەوە و ڕزگارتان بکەن، ئینجا ئەوانە لە بیم و ترس دا هۆشیان نامێنێ کە ئەوە ڕۆژی دوایی یە ﴿فَدَعَوْهُمْ﴾ بەهۆی ئەوەوە هاواریان لێ ئەکەن، بەڵام ئاشکرایە کە ئەوانە هیچیان بەدەست نی یە ﴿فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾ کەواتە وەڵامیان نادەنەوە و نایەن بە هاواریانەوە ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا﴾ واتە شوێن و سزای سەخت و بە هیلاك دا چوون بڕیار ئەدەین لە نێوان بت و بت پەرستەکان دا کە هەموو بەشدار بن تیای دا کە ئەو شوێنەش بریتی یە لە دۆزەخ، خوا پەنامان بدات لێی، ﴿وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ﴾ واتە تاوانبارەکان ئاگری دۆزەخ ئەبینن پێش ئەوەی بخرێنە ناوی، چونکە لە پێشەوە هەموو ڕاگیر ئەکرێن بە دەوری دۆزەخ دا بۆ ئەمەی دوا و بەریان یەك بگرێ ﴿فَظَنُّوٓا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا﴾ ئینجا هەموو ئەزانن کە تێکەڵی ئەو ئاگرە ئەبن و ئەچنە ناوی یەوە ﴿وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفًا﴾ دەستیان ناکەوێ شوێنی لادان لەو ئاگرە و بە هیچ کلۆج لادان نی یە لێ ی، خوا پەنامان بدات، با بیرێ بکەینەوە لەو کاتە سەختە کە ئێستا یان تاوێ تر بخرێنە ناوی یەو، بەڕاستی ترس و لەرزی ئەوە ئێجگار بە تین و بەهێزە لەوانەیە بڵێن ئێشی ئەوە سەخت ترە لە ئاگرەکە وەکو پەندی فارسی ئەڵێ(در بلا بودن براز بیم بلاء) خوا بە بەزەیی خۆی بمان پارێزێ، بێگومان ئەم بێ باوەڕانە پەناو جێگای خۆلادانیان لەم جیهانەدا بە ئاسانی ئەکەوێ، ئەگەر ئارەزوو بکەن بەم جۆرە پەنا بێنن بەم قورئانە و بێنە ژێر سایەی، ئەم قورئانە هەموو پەڵپ و بەهانەیەکی ڕەوای بڕیون، ئەوەها هەموو شتێکی پێویستی بۆ ڕوون کردوونەتەوە، بۆ هەموو شتێکی پێویست لە چەند شوێن دا وێنە و مەتەڵی بۆ هێناونەتەوە،

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا
مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ
ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ
لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ ۖ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَمَآ أُنذِرُوا۟ هُزُوًا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا
وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ

---

بەڵام ئەمانە پەنا ناهێنن و چەنەبازی و دەم بازی ئەکەن لە شتی راست دا وەکو ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ بەڕاستی بە چەند جۆر و شێوەیەك چەند جار وێنە و مەتەڵمان هێناوەتەوە بۆ هەردوو جیهان بۆ ئەمەی هەموو پێویستی یەکیان بۆ روون ببێتەوە، بەڵکو تەمێ وەرگرن و رێگای راست بدەنە بەر و کۆتایی بێنن لە تاوان و خراپەکاری، بەڵام ئەوانەی کە سەرکەشن تەمێ وەرناگرن و کۆتایی ناهێنن و ئەیانەوێ دەم بازی بکەن. ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا﴾ ئادەمی لە هەموو شتێ دەم بازی و موجادەلەی زۆرترە بۆ شتی ناڕەوا و بەتاڵ، واتە ئادەمی هەر بە سروشت وایە، بەهۆی ئەوەوە کە بەشی حەیوانی ی تێدا هەیە مل پێچی ئەکات و سەر بۆ حەق و راست داناخات. ئەیەوێ هەر قسەی خۆی سەرخات بە ناهەق و ناڕەوا. مەبەست بەم ئادەمی یە یەکێکی تایبەتی نی یە، هەروەها هەموویش مەبەست نی یە، بەڵکو ئەو ئادەمی یانە مەبەستن کە واز ئەهێنن لە بەشە فریشتەیی یەکەیان و تەنیا سەر ئەکەنە بەشە ئاژەڵی یەکەیان، ئینجا هۆی سەرکەشی و ئیمان نەهێنانی ئەو بێ باوەڕانە باس ئەفەرموێ، و پەڵپ و بەهانەیان روون ئەکاتەوە، ئەو پەڵپەی کە بە درێژایی چەرخەکان بێ باوەڕەکان هەر گرتوویانە لە پێغەمبەرەکانیان. لەناو هەموو ئەو ئوممەتانەدا کۆمەڵی سەرکەشان پەڵپیان گرتووە لە پێغەمبەرەکانیان – دروودی خوایان لەسەر بێت – کە ئەگەر راست ئەکەن دەی عەزاب و سزایەکیان بێننە سەر،

ئەفـــەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُواْ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴾ واتە هیچ شتێ بەرگری ئەو خەڵكە بێ باوەڕەی نەكردووە لەمەی ئیمان و باوەڕ بهێنن و داوای لێ بوردن بكەن لە پەروەردگاریان لەكاتێك دا كە ڕێنموونی یان بۆ هات و ڕێگە پیشان دەرێكی وەكو قورئان، یان پێغەمبەریان(ﷺ) بۆهات، هیچ بەرگری نەكردوون جگە لە داوای وێنەی ئەو سزا و عەزابەی كە بەپێی باوی خوا هاتووە بۆ گەلە بێ باوەڕەكانی پێشوو كە لەم جیهانەدا خوا بەربادی كردوون و لە ریشەی هێناون، یان داوای ئەمە كە سزای ڕۆژی دوایی یان بۆ بێت ڕوو بە ڕوو كە بەچاو ببینن ئیتر لەو كاتەدا باوەڕ ئەهێنن. واتە بەهۆی سەركەشی و نالەباری خۆیانەوە هەرچەند ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون كراوەتەوە باوەڕ ناهێنن و پەڵپ ئەگرن بە هاتنی یەكێ لەو دوو سزایە خۆ دیارە ئەو جۆرە شتانەش لە دەسەڵاتی پێغەمبەران دا نی یە – دروودی خوایان لەسەر بێت – و ئیشی ئەوان بریتی یە لە ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا بە ڕوونی، موژدە دان و ترساندن، وەكو ڕوونیش ئەبێتەوە لەم فەرمودەوە: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾ ئێمە پێغەمبەرەكان ڕەوانە ناكەین بۆ ئەمە نەبێ كە موژدە دەر بن بە ئیمان داران و ترسێنەر بن بۆ بێ باوەڕان، واتە كاری ئەوان ڕاگەیاندن و موژدە دان و ترساندنە ئیتر هیچی تریان بە دەست نی یە، بەدی هێنانی پەڵپ و بەهانەی كافران بەوان ناكرێ و كارو فرمانی ئەوان نی یە. ﴿وَيُجَـٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلْبَـٰطِلِ﴾ ئەوانەی كە كافرن بە ناهەق و ناڕەوا موجادەلە و دەم بازی ئەكەن بە شتی پڕوپووچ و بەتاڵ ﴿لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّ﴾ بۆ ئەمەی ئەو ئایینە ڕاستەی كە هاتووە بۆیان لە جێگای خۆی بیترازێنن و بەتاڵی بكەنەوە ﴿وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَـٰتِى وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوًا﴾ ئەو بێ باوەڕانە ئایەتەكانی من كە قورئانە و ترساندنیان بە سزاو تۆڵەی من و ئەو شتانەی پێی ترسێنراون، ئەمانەیان كردووە بە گاڵتە و لاقرتی، واتە لاقرتی یان دێت پێ یان و بە درۆ و دەلەسەیان تێ ئەگەن.

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ واته هيچ كەس زاڵم و ستەمكار تر نى يە لە كەسىٚ كە ئامۆژگارى بكرىٚ بە ئايەتەكانى پەروەردگارى خۆى. ئينجا ئەو كەسەيش پشتى تىٚ بكات و رووى لىٚ وەرگێرِىٚ، لەبيرى چووبێتەوە ئەو هەموو كوفرو گوناهو تاوانە خراپانەى كە كردوويەتى، واتە هيچ گوىٚى نەبىٚ لىٚ يان و بيريان لىٚ نەكاتەوە و باكى نەبىٚ لەدوا رۆژى خراپيان، كەواتە ناگەڕێتەوە لىٚ يان و هەرگيز پەشيمان بوونەوەى نابىٚ لىٚ يان، ئينجا هۆى ئەو پشت تىٚ كردن و لەبيرچوون و بير لىٚ نەكردنەوەش ئەمەيە كە ئەفەرموىٚ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ﴾ واتە ئەو پشت تىٚ كردن و بىٚ باكى و بير لىٚ نەكردنەوە بەهۆى ئەوەيە كە بەراستى ئێمە چەند پەردەيەكى ئەستوورمان هێناوە بەسەر دڵەكانيان دا بەرگرى يان ئەكات لەمەى تىٚ بگەن لە قورئان و بچێتە دڵيانەوە ﴿وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ قورسى و كەڕيمان خستووەتە گوێچكەكانيانەوە، كەواتە نايبيسن و ماوە نى يە بۆ هيچ شتێكى خێر كە پىٚ يان بكات. خواى گەورە كە بەزەيى بىٚ سنوورىى هەيە هەموو بەهانەيەكى بەندەكانى خۆى بڕيوە، ئەوەى كە هۆى ڕێنموونى بێت بۆى فەراهەم هێناون و هەموو شتى پێويستى بۆ روون كردوونەتەوە و خوايش هێزو تواناى داونەتىٚ كە بتوانن هەر ڕێگايە بدەنە بەر. جا هەر كات هەر بەندەيە سەرى كردە كوفر و تاوان و بە ئارەزووى خۆى و پشتى كردە تەمىٚ و ئامۆژگارى خوا ئەو كاتە قار و خەشمى لىٚ ئەگرىٚ، چاوى كوێر ئەكات لە بينينى ڕێگاى راست و گوێچكەى كەڕ ئەكات لە بيستنى شتى راست، دڵى مۆر ئەكات و بىٚ هۆش و بىٚ فامى ئەكات لە وەرگرتن و تێگەيشتنى هەموو هەق و راستێك. كەواتە هيچ زۆر پىٚ هێنان نى يە و هەموو تاوان و سوچىٚ ئەگەڕێتەوە بۆ بەندە بەد بەختەكە كە بە ئارەزووى خۆى، خۆى دووچار ئەكات. ئەو كاتە بە هيچ كلۆج چارەسەر ناكرىٚ، تەنانەت بە پێغەمبەريش(ﷺ) چارەسەر ناكرىٚ وەكو لێرەدا ئەفەرموىٚ پىٚ ى،

وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا
كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ﴿٥٨﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ
أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا ﴿٥٩﴾

﴿وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا﴾ ئەوانەی کە بەهۆی خراپی خۆیانەوە خوا پەردە ئەهێنێ بەسەر دڵیان دا و گوێچکەیان کەڕ ئەکات، ئەی پێغەمبەر ئەگەر تۆ هەرچەند ئەوانە بانگ بکەیت بۆ سەر ڕێگای ڕاست و ئایینی خوا، ئەوانە هەرگیز ڕێنموونی وەرناگرن و گوێ ڕایەڵی ناکەن. ﴿وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ﴾ پەروەردگارت زۆر لێ بووردوو خاوەن بەزەیی یە ئەگەر لە مەرجێك دا قاریان لێ بگرێ و تۆڵەیان لێ سێنێ بەهۆی کردەوەی خراپیانەوە و بەپێی ئەو هەموو تاوانە کە کردوویانە لەگەڵیان ڕەفتار بکات ﴿لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ﴾ بێگومان ئەو کاتە پەلەی ئەکرد بە سزا بۆیان و پشتی ئەخست لەم جیهانەدا، بەڵام بەهۆی بەزەیی یەکەیەوە مۆڵەتیان ئەدات و ئەو سزای کە خۆیان بە لاقرتی یەوە پەلەی پێ ئەنێنەوە، ئەم پەلەی لێ ناکات، بەڵام وەنەبێ وازیان لێ بێنێ و بەسەریان دا تێپەڕی ﴿بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ﴾ بەڵکو بۆ ئەو تاوان بارانە هەیە کاتی بەدی هاتنی ئەو هەڕەشەی لێ یان کراوە، کاتی سزادانیان هەیە لەم جیهانەدا، لە ڕۆژی دوایی دا ﴿لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا﴾ هەرگیز دەستیان ناکەوێ جێگا و شوێنی پەنا و ڕزگاری یان لەو سزا کاتێ دێت، و تێناپەڕێ لێی، ئینجا باسی شتێ ئەکات کە بەڵگە و نیشانەیە لەسەر ئەوەی باس کرا ئەفەرموێ: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا﴾ ئەو هەموو وڵات و شارانەمان بەرباد کرد واتە عاد و سەمود و ئەوانەی تر کاتێ کە دانیشتوانیان جەور و ستەمیان کرد، باوەڕیان نەهێنا بە ئایین و پێغەمبەرەکانمان، کاتێکی تایبەتی زانراومان دانابوو بۆ سزادان و بەرباد کردنیان و دیارییمان کردبوو بێ دواکەوتن و پێشکەوتن، کەواتە با ئەو بێ باوەڕانەی کە ئەم قورئانەیان هاتە سەر و پشتیان تێ کرد، با ئەوانە تەمێ خوار بن لە گەلە پێشووەکانیانەوە، با هەڵ نەخەڵەتێن بە مۆڵەت دان و دوا کەوتنی سزایان، چونکە ئەوانیش مۆڵەت دران تا کاتی تایبەتی خۆی هات، بزانن کە ئەمانیش کاتی تایبەتی یان بۆ دیاریی کراوە کە پێی گەیشتن بێ دوا و بەر دووچاری سزای سامناکی خۆیان ئەبن.

لە سەرەتای سورەتەکەوە وتمان کە زۆربەی ئایەتەکانی ئەم سورەتە بریتی یە لە گێڕانەوەی چەند بەسەرهات و سەرگوزەشتەیەك، جا تا ئێرە سێ سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی بۆ باس کردین، ئەوا دەست ئەکات بە چوارەم لەبابەت بەشێ لە بەسەرهاتی موسا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بەندەیەك لە بەندە ساڵحەکانی خوا، هێندێ لە زانایان و مێژوو نووسان ئەڵێن: لێرەدا موسای بەناوبانگ نی یە کە کوڕی عمرانە، ئەوەی تەوراتی بۆ هات، بەڵکو مەبەست موسای کوڕی میشای کوڕی یوسفە کە لە پێش موسای بەناوبانگەوە بووە، ئەمە رای ئەهلی کیتابە و لەوانەوە هاتووە، بۆ پاڵپشتی ئەم رایە چەند بەڵگە و نیشانەیەکی عەقلی و ژیریی یان باس کردووە، بەلاَم هیچیان بەهێز نین و بەرپەرچ دانەوەیان زۆر ئاسانە، زۆربەی زانایان و پێشەوایان ئەفەرمون: مەبەست بەمە موسای بەناوبانگە، بەڵگەی بەهێزیشیان هەیە و پێویست نی یە باس کردنی ئەم زنجیرەیە لە بەسەرهاتی ئەم پێغەمبەرە تەنها لێرەدا قورئان باسی فەرمووە، ئیتر دیاریی نەکردووە کە ئەم رووداوە لە چ کاتێکی ژیانی دا بووە؟ ئایا پێش دەرچوونیان لە میسر یان لەپاش ئەوە بووە؟ لەپاش دەرچوون ئایا لە کاتێك دا بووە کە لە بیابان دا ژیاون، یان پێش ئەوە بووە؟ هەرچۆن بووبێ هیچ زیادە نرخێ نادا بە مەبەستەکە، کەواتە پێویست نی یە لەسەر رۆیشتنی، بەڵکو بێ زیاد و کەم شوێنی قورئانەکە بکەوین چاکە، چونکە ئەگەر زیاد یان کەم باشتر بووایە قورئان وای ئەکرد، بەلاَم بۆ روون کردنەوە با باشتر تێ بگەین لە سەرگوزەشتەکە حەدیسێ هەیە لە سەحیحی بوخاری دا بە جوانی ئەزانم هێنانی، بوخاری ئەفەرموێ: ئوبەی کوڕی کەعب – خوای لێ رازی بێت – فەرموی: لە پێغەمبەرم بیست(ﷺ) فەرموی: موسا پێغەمبەر(ﷺ) جارێ خوتبەی ئەدا بۆ بەنی ئیسرائیلی یەکان، پرسیاری لێ کرا زاناترین ئادەمی ئەمڕۆ کێ یە؟ لە وەلاَم دا فەرموی: من، ئینجا خوا عیتابی لێ گرت، چونکە لە وەلاَم دا نەیفەرموو: خوا ئەزانێ. ئینجا خوا سروشی کردە لای کە بەندەیەکم هەیە لە شوێنێك دایە کە دوو دەریا یەکانگیر ئەبن ئەو بەندەیەم لە تۆ زاناترە، ئینجا موسایش عەرزی کرد چۆن ئەو بەندەیەم دەست کەوێ؟ خوا پێ ی فەرمو: ماسی یەکی برژاو بخەرە ناو زەمیلەیەکەوە لەهەر شوێنێ لێت داکەوت ئەو بەندەیە لەوێ یە، ئینجا ئەمیش بەو شێوەی کرد و لەگەڵ خزمەت چی یەکەی دا رۆیشتن هەتا بەهۆی ئەو نیشانەوە کە خوا فەرموی رێ یان کەوت لەو بەندەیە، ئیتر با بە باشی گوێ بگرین لە قورئان ئەو بەسەرهاتەمان بۆ باس بفەرموێ،

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا
بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا
غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ
وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ

---

خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ﴾ باسی ئەو کاتە بکە کە موسا وتی بەو کوڕە گەنجەی خزمەت چی و بەردەستی ﴿لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا﴾ [1] واتە کۆتایی ناهێنم هەر ئەڕۆم هەتا ئەگەمە شوێنێ کە دوو دەریاکە ئەگەن بە یەك و یەکانگیر ئەبن، یان ماوەیەکی دوور و درێژ ئەڕۆم، واتە یان ئەبێ بگەمە ئەو شوێنە، یان ئەبێ ماوە و چەرخێکی دوور و درێژ بە ڕۆیشتن ببڕم بە شوێنی دا، ئینجا ڕێگایان دایە بەرو ڕۆیشتن بە شوێنی مەبەستی خۆیان دا ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا﴾ ئینجا کاتێ گەیشتنە شوێنی تێکەڵ بوون و یەك گرتنی دوو دەریاکە کە شوێنی گەیشتن بوو بەو بەندە ساڵحە کە بە دوای دا ئەگەڕان.. کاتێ گەیشتنە ئەو شوێنە وەکو لە حەدیسی بوخاری و موسلیم دا ئەفەرموێ: لەژێر بەردێکی گەورەدا دانیشتن، حەزرەتی موسا خەوت لەو کاتەدا ماسی یەکە خوا زیندووی کردەوە، خۆی فڕێ دایە ناو دەریاکە، ئینجا کە لە خەو هەڵسا ڕۆیشتن و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت و ﴿نَسِيَا حُوتَهُمَا﴾ ماسی یەکەیانیان لە بیرچوو، حەزرەتی موسا لەبیری چوو بپرسێتەوە لێ ی، حەزرەتی یوشعی کوڕی نونیش کە خزمەتچی موسا بوو لە بیری چوو بەسەرهاتی ماسی یەکەی بۆ باس بکات.

﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا﴾ ئینجا ماسی یەکەش گەڕانی خۆی لە دەریاکەدا هێشتەوە بە شێوەیەکی دیاریی بەم ڕەنگە کە بەهۆی بەدوا گەڕانی یەوە ئاوەکە لەت ئەبوو، ئیتر نەنووسایەوە بە یەکەوە، بەڵکو هەروەکو خۆی مایەوە، وەکو تاق و کونێکی درێژ. نابێ هیچ ئیمان دارێ، بەڵکو هیچ خاوەن ژیری یەك سەر بکاتەوە لەو جۆرە شتانە و بڵێ ماسی مردووی برژاو چۆن زیندوو ئەبێتەوە؟ یان ئاو کە لەت بوو چۆن دەست بەجێ نانووسێتەوە

---

[1] چەند رایەك هەیە لە دیاریی کردنی مەبەست بەم دوو دەریایە و شوێنی گەیشتنیان بە یەك بەهێز ترینی هەموان ئەمەیە، زانین لای خوایە مەبەست دەریای سوور و دەریای سپی یە و شوێنی تێکەڵ بوونیان دەریا بچکۆلەی تیمساحە و ناوچەی دەریا بچووکەکانی.

پێکەوە؟ چونکە ئەو خوایەی کە توانایە و دەسەلاتی بێ سنووری هەیە، هەموو ئەم شتانەی لە یەکەم جارەوە دروست کردووە لەسەر بار و باوێکی تایبەتی: ئەو خوایە ئەگەر هەر بار و باوێ بگۆڕێ ئایا چی بەرگری ئەکات؟ ﴿فَلَمَّا جَاوَزَا﴾ ئینجا کاتێ کە تێپەڕین لەو شوێنە و ماوەیە ڕۆیشتن و ماندوو برسی بوون ﴿قَالَ لِفَتَىٰهُ﴾ موسا فەرموی بە بەردەستەکەی ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا﴾ خۆراکی نیوەڕۆژەکەمان بێنە با بیخۆین ﴿لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ بەڕاستی لەم سەفەرەمان دا دووچاری ماندوویی و زەحمەت بووین، ئیتر ئەو خۆراکە بریتی بووبێ لەو ماسی یەی کە لە بیریان چوو، یان لەهەر شتێ تر بە هەرشتێ تر بەهەر جۆرێ بێ لەو کاتەدا بەردەستەکە بیری بەسەرهاتی ماسی یەکەی کەوتەوە ﴿قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ﴾ وتی بە حەزرەتی موسا ئەزانی ئاگاداربە: چیم بەسەرهات؟ کاتێ کە لامان دایە لای بەردەکە ﴿فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ﴾ بەڕاستی من ماسی یەکەم لەبیرچوو، واتە لەبیرم چوو بەسەرهاتەکەی باس بکەم بۆت. ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾ هیچ شتێ لەبیری نەبردمەوە باسی بکەم بۆت جگە لە شەیتان. بێگومان هەموو شت بەدەست خوایە و خوا ئەیکات، بەلام هەرشتێ ناڕێك بێت بەهۆی شەیتانەوە فەراهەم دێت، جا لەبەر ئەوە باو وایە هەموو کارێکی ناڕەوا و ناڕێك بە کردەوەی شەیتان دائەنرێ و نیسبەت لە شەیتان ئەدرێ. لەبارێ تریشەوە هەر شتێ بە دیمەن ناڕەوا بێت ئەبێ شەرم بکرێ لەوەی بە کردەوەی خوا ناو ببرێ، بێگومان ئەو لەبیرچوونە بە دیمەن ناڕێك و ناڕەوا بوو، چونکە بوو بەهۆی هیلاکی و ماندوویی حەزرەتی موسا ئەوەبوو لە خۆڕایی و بێ هودە تێپەڕی لەو شوێنە کە مەبەست بوو، گەڕانێکی زۆری کرد، ئینجا گەڕایەوە، بۆی، هەروەها ئەو لەبیرچوونە پێچەوانەی داوا و فەرمانی حەزرەتی موسا بوو، چونکە کاتی خۆی فەرموی بەو بەردەستە گەنجەی: هەرکات ئەو ماسی یەت لە دەست چوو هەواڵم بدەرێ، تەنانەت فەرموی من هیچم ناوێ لە تۆ ئەوە نەبێ، کەواتە لەبەر ئەوە وتی شەیتان لەبیری بردمەوە، ئینجا ئایا بۆچی لەبیری بردەوە؟ بێگومان ئەوە پرسیارێکی ڕاست نی یە، چونکە پرسیار لە ئیش و کاری خوا ناکرێ. بەڵێ ئەگەر تێفکران ببێ گەلێ لە حیکمەت و هۆی کارەکانی روون ئەبێتەوە بۆ وێنە: لێرەدا گومان ئەبرێ کە ئەو لەبیر بردنەوە خوا کردبێتی بە تەمێ و عیتاب بۆ حەزرەتی موسا و بەردەستەکەی، دڵنیا بوو لێ ی کە هەواڵی ئەداتێ. هاوڕێ بەردەستەکەش لەبەر ئەوە کاتی خۆی کە موسا پێ ی فەرمو: هەواڵم بدەرێ، ئەمیش نەیفەرمو: پشت بەخوا، یان إن شاء الله، بەڵکو فەرموی: ئەوە ئاسانە و داوای شتێکی قورست نەکردووە.

وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِۚ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾

---

﴿وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا﴾ واتە لەبیرم چوو باسی ماسی یەکەت بۆ بکەم کە زیندوو بووەوە و کەوتە جوڵان و خۆی فڕێ دایە ناو دەریاکە، شوێنی گەڕانەکەی لە دەریاکەدا کرد بە شتێکی نایاب کە سەر سوڕ بمێنێ لیێ ی وەکو باس کرا، ﴿قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِۚ﴾ موسا فەرموی بە لاوەکەی ئەوەی کە باست کرد لە بابەت ماسی یەکەوە، ئەوە شتێکە کە ئێمە ویستوومانە و بە شوێنی دا گەڕاین، چونکە نیشانەیە لەسەر ئەوە کە بەندە ساڵحەکە لەوێدا چنگ ئەکەوێ ﴿فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا﴾ ئینجا بەهۆی ئەوەوە گەڕانەوە بەو ڕێگای کە پیای دا هاتن و کەوتنە سەر شوێن و جێگای پێی خۆیان تا گەیشتە لای بەردە گەورەکە کە لەو سەرەوە لایاندایە لای ﴿فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ﴾ ئینجا لەوێدا بەندەیە لە بەندە تایبەتی یەکانی ئێمەیان دەست کەوت کە ﴿ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا﴾ لەلایەن خۆمانەوە ڕەحمەتێکمان پێ دابوو، واتە سروش و پێغەمبەرێتی ﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا﴾ زانامان کردبوو و فێری زانینێکمان کردبوو لەلایەن خۆمانەوە لەو زانینەی کە تایبەتی یە بە ئێمەوە، هیچ کەس بە ئارەزوو و تێکۆشانی فێری نابێ، واتە ئەوەی پێی ئەوترێ، عیلمی غەیب، لە بوخاری دا ئەفەرموێ: گەڕانەوە بۆلای بەردەکە و ئەزانن پیاوێك ڕاکشاوە و داپۆشراوە بە شتێ بەشێکی خستووەتە ژێر هەردوو پێی و بەشێکی خستووەتە ژێر سەری. ئەم بەندەیە لای کۆڕی زانایان بریتی یە لەوەی کە بەناوبانگە بە حەزرەتی(خضر) ناوە ڕاستەقینەکەی لە پەڕاوەکانی تەفسیردا ئەفەرموێ:(بەلیای کوڕی مەلکانە) ئەو بەندە بەفەرە هێندێ ئەفەرمون: فروستادە بووە، زۆربە و کۆڕ لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەر بووە، بەڵگە و نیشانە لەسەر ئەم ڕایە زۆرە و بەهێز و هەرچی بوو بێ بێگومان حەزرەتی موسا گەورەتر بووە لەو، زانین و ئاگادار بوونی بەسەر هێندێ شت دا کە حەزرەتی موسا نەیزانیوە و ئاگادار نەکراوە پێی هیچ زیانێك نادا و نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە(خضر) گەورەتر بووبێ هەرچۆنێ زانایی و مامۆستایی

جوبرەئیل زیان نادات لە گەورەیی پێغەمبەرمان(ﷺ) گەورەترە لە جوبرەئیل و هەموو دروست کراوەکانی خوا. هەروەها جیاوازی هەیە ئایا(خضر)(علیه السلام) ئێستاش ماوە، یان نەماوە؟ هێندێ لەسەر ئەوەن کە ئێستاش زیندووە و ئەمێنێ تا نزیکی ئەو کاتە ئەم جیهانە وێران ئەبێ، هێندێ لەسەر ئەوەن کە مردووە و نەماوە و هەردوو کۆمەڵ چەند بەڵگەیەك ئەمێننەوە لەسەر رای خۆیان و هیچ پێویست نی یە بە درێژە پێدان بەو هەموو قسە و باسە کە کراوە لەم بابەتەوە، بەڵام بەڵگە لەسەر مردنی زۆر زۆر ترو بەهێز ترە و حەدیسی سەحیح و بەڵگەی ژیریی زۆر یارمەتی ئەم رایە ئەدات و هیچ پاڵدەری نی یە بۆ لادان لە دیمەنی ئەم هەموو بەڵگەیانە، هەرکەس ئەیەوێ بە درێژیی ئەو باسە بزانێ با تەماشای کتێبەکانی تەفسیر بکات بە تایبەتی تەفسیر(روح المعانی) هەروەها جیاوازی(خیلاف) هەیە ئایا(خضر) کەی هاتووەتە دنیا و لەدایك بووە؟ بەڕاستی لەم بارەوە هیچ حەدیسێ نی یە بەڵکو هیچ ئەسەرێکی باوەڕ پێ کراویش نی یە، کەواتە دەم گرتنەوە و قسە نەکردن، لەم جۆرە شتانە زۆر چاکە و قسە لێ کردنی رەوا نی یە و دەم کوتانە لە شتێ کە نهێنی و غەیبی یە، بەبێ ئەمەی بەڵگەیەکی شەرعی بەدەستەوە بێ، ئەوەش شتێکە کە موسڵمانانی لێ بەرگری کراوە لەلایەن شەرعەوە، بێجگە لەوەش زانینی ئەم جۆرە شتانە ئەگەر پێویست بوایە، یان زیادە بایەخ و نرخێکی بدایە بە مەبەست لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکان دا، بێگومان خوا باسی ئەفەرمون، کەواتە با ئێمەیش لێ یان بێ دەنگ بین.

ئەوەی کە گرنگە لێرەدا ئەمەیە: موسا(علیه السلام) بەهۆی ئەو نیشانەی کە خوا دایدابوو رێی کەوت لەو بەندە ساڵحە کە لە هێندێ شت دا زاناتر بوو لە موسا، وا دەرئەکەوێ کە مەبەست لەو سەفەر و گەڕانەوە شتێکی نهێنی بوو بێ لە نێوان خوا و موسا، لاوەکەی موسا بەو مەبەستەی نەزانیبێ و موسا ئەوی ئاگادار نەکردبێ بەسەری دا، ئەوەتە لەمە بەدواوە قسە وباس ئەکەوێتە نێوان موسا و بەندە ساڵحەکەو ئیتر هیچ باس و ناوی لاوەکە نامێنێ وەکو ئەبیسین،

قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا
﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ
أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا

---

**ئەفەرموێ: ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ﴾ موسا وتی بەو بەندە ساڵحە: ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ ئایا هاوڕێ یەتیت بکەم و شوێنت بکەوم لەسەر ئەمەی فێری زانینێکم بکەیت کە راستە و گەیشتن و رێ بردنە بە فەڕ و چاکە، ئاشنا و زانام بکەیت بە زانینێکی راست لەوەی کە تۆ زانا و ئاشنا کراوی پێ ی؟ واتە با هاوڕێیت بکەم بۆ ئەو مەبەستە. با بیر بکەینەوە لەو ئەدەب و شەرمە شیرینە و لەو خۆ نزم کردنەوە لەلایەن ئەو پێغەمبەرە گەورەیەوە:**

**١- بە شێوەی پرس داوای لێ ئەکات:(هل).**

**٢- خۆی بە نەزان ئەداتە قەڵەم.**

**٣- داوای لێ ئەکات کە رێنموونی بکات و رێگای بخات لە خێرو راستی، چاکەی خۆی بڕژێنێ بەسەری دا بە فێر کردنی هێندێ لەوەی کەخوا فێری کردووە.**

**بەڵام ئەو جۆرە زانینەی کە خضر فێر کرابوو و موسا داوای ئەکرد لە بابەت ئایین و شەریعەتەوە نەبوو، چونکە نەك تەنیا موسا(علیە السلام) بەڵکو هەر پێغەمبەرێ تریش رەوانە کرابێ بە شەریعەتەوە ئەبێ لەو بابەتەوە هیچ کەم و کوڕی و ناتەواوی نەبووبێ، ئەبێ لەو رووەوە زاناتر بووبن لە هەموو کەسێ لە چەرخی خۆی دا، بەڵکو ئەو زانینە داوا کراوە بەشێك بوو لەو جۆرە زانینەی کە ناو ئەبرێ بە(عیلمی لەدونی) و غەیبی و دوور لە فام و تێگەیشتنی خەڵکی یەوە، ئاشکرا ناکرێ لە هەمووان، خوای گەورە ئەو بەندە ساڵحەی زانا و تێگەیشتووە کردبوو بە هێندێ لەو جۆرە زانینە لەبەر هەر هۆیەك کە خۆی ئەزانێ. جا گەلێ شت و گەلێ رووداو هەیە دیمەنی دژ و پێچەوانەی ژیریی ئێمەیە، بەڵام بە پێ ی ئەو زانینە رێك و راستە و بەجێ یە. لەبەر ئەوە ئەو بەندە ساڵحە مەترسی کرد کە موسا هاوڕێ**

یەتی پێ نەکرێ، چونکە ئەو جۆرە شتانە ئەبینێ و خۆی پێ ناگیرێ، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ بەندە ساڵحەکە وتی بە موسا: ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت بگری و بە ئارام بیت. ئینجا هۆی خۆنەگرتنەکەشی روون کردەوە بەم فەرمودەیە: ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا﴾ ئایا تۆ چۆن خۆت ئەگری و بێ دەنگ ئەبی لە شتێك کە بە دیمەن ناڕەوا و خراپە و تۆیش نەگەیشتووی لە ناوەڕۆکی و نەتزانیوە کە لە دیوی ناوەوە ڕەوایە و کارێکی چاکە؟ واتە من هێندێ کردەوەم هەیە دووباری هەیە: بەدیمەن و بارە ئاشکراکەی خراپ و بێ شەرعی یە و لەباری ترەوە کە شاراوەیە لە تۆ ڕەوا و شەرعی یە، تۆ ئاگات تەنیا لەبارە بێ شەرعی و خراپەکەی هەیە، چونکە پێغەمبەریت نابێ بە هیچ کلۆج بێ دەنگ بیت لە هیچ شتێك کە بەلاتەوە خراپە، کەواتە ناتوانی بێ دەنگ بیت لەو جۆرە کردەوانەی من و هاوڕێ یەتی منت پێ ناکرێ. حەزرەتی موسا لە دڵی خۆیەوە بڕیاری دا لەسەر خۆگرتن و گوێ ڕایەڵی، لەبەر ئەوە ﴿قَالَ﴾ موسا فەرموی بەو بەندە چاکە: ﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا﴾ ئەگەر خوا مەیلی ببێ و بیەوێ منت دەست ئەکەوێ و ئەم بینی بە کەسێکی بە ئارام، خۆگر ﴿وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا﴾ سەرپێچیت لێ ناکەم لەهیچ فرمانێکت دا. ئینجا زیاتر شتەکەی روون کردەوە، لەپێش ڕۆیشتن دا مەرجی هاوڕێ یەتی یەکەی باس و دیاریی کرد، ﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا ﴿فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا﴾ کەواتە ئەگەر تۆ هاوڕێ یەتی من ئەکەیت و شوێنم ئەکەوی پرسیاری هیچ شتێکم لێ نەکەیت هەتا من خۆم لەلایەن خۆمەوە بۆت باس ئەکەم و رووني ئەکەمەوە، واتە من هێندێ کردەوە ئەکەم کە تۆ بە خراپ و ناڕەوای ئەزانی کاتێ ئەوانەت بینی لە خۆتەوە ڕەخنە مەگرە و مەپرسە و خۆت بگرە هەتا خۆم شتەکەت بۆ روون ئەکەمەوە، حەزرەتی موسایش بە قسە و مەرجەکەی ڕازی بوو، ﴿فَٱنطَلَقَا﴾ ئینجا پێکەوە ڕێکەوتن و ڕۆیشتن بە قەراغی دەریاکەدا و کەشتی یەکیان ئەویست و دەستیان کەوت و لەبەر ئەوەی(خضر) یان ناسی بە بێ کرێ سواریان کردن، ئینجا کاتێ چوونە ناو کەشتی یەکەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو خضر پاچی گرت بە دەستی یەوە و کونی کردە کەشتی یەکە،

حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ٧١ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ
إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ٧٢ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ٧٣
فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ٧٤

---

وەك و ئەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ﴾ واتە ڕۆیشتن هەتا کاتێ کە سوار بوون لەناو ئەو کەشتی یەی کە ڕابورد بەلایان دا، ئینجا کە سوار بوون هەر ئەوەنەت زانی خضر کەشتی یەکەی کون کرد بەم جۆرە تەختەیە یان دوو تەختەی لێ هەڵکەند، بێگومان ئەمە بە دیمەن کردەوەیەکی ئێجگار ناڕەوایە، وەرە تەماشاکە کەشتی یەکە بە خۆڕایی سواری کردبن، خۆیان و چەند کەسی تری تێدا بێ و لە خەتەر و مەترسی یە گەورەیە!! ئینجا حەزرەتی موسا(علیه السلام) هەرچەند لە پێشەوە ئاگادار کرا بە ڕوودانی ئەم جۆرە کردەوانە، بەڵێنی دا کە خۆگر بێت و ڕەخنە نەگرێ، هەرچەند ئەوەبوو بێزاری یەوە ﴿قَالَ﴾ وتی بە خضر ﴿أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا﴾ ئایا کەشتی یەکەت کون تێ کرد بۆ ئەمەی ئەوان وان لەناوی نوقم بکەیت لەناو دەریاکەدا بیانخنکێنی؟ ﴿لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا﴾ بەڕاستی کارێکی زۆر گەورەت کرد و تاوانێکی زۆر زل بوو! ئەو بەندە چاکە لەسەر خۆ و بە لوتفەوە ﴿قَالَ﴾ وتی بە موسا(علیه السلام) ﴿أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ ئایا من پێم نەوتی کە هەرگیز تۆ ناتوانی خۆبگری لەگەڵ من دا، ناتوانی بێ دەنگ بیت لە جۆرە کردەوەیەك کە من ئەیکەم؟ ئینجا موسا(علیه السلام) ئەو قسە و باسەی هاتەوە بیر و عوزری بۆ هێنایەوە کە لەبیری نەبوو ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ﴾ وتی: لێم مەگرە بەهۆی لە بیرچوونمەوە. واتە قسەکەی تۆ و بەڵێنەکەی خۆمم لە بیرنەبوو، لەبەر ئەوە ڕەخنەم گرت و نەوەستام تا خۆت شتەکەم بۆ ڕوون ئەکەیتەوە ﴿وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا﴾ لەم هاوڕێ یەتی و شوێن کەوتنمەوەدا شتی گران و زەحمەت مەدە بەسەرم دا و داگیرم مەکە بە تەنگەتاو کردن و چاوپۆشی نەکردن لە کارێك کە لە بیرم چووبێ، حەزرەتی خضر قسە و عوزرەکەی وەرگرت ﴿فَٱنطَلَقَا﴾ ئینجا پێکەوە ڕۆیشتن ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا﴾ هەتا کاتێ گەیشتن بە کوڕێکی گەنج هەندێ ئەڵێن لە تەمەنی بیستساڵی

دا بوو، یان منداڵێ بوو کە هێشتا باڵغ نەبوو ئەوەش بە پێی رای کۆری زانایان،﴿فَقَتَلَهُۥ﴾ ئینجا دەست بەجێ خضر ئەو کورەی کوشت بێ سەر لێ کردنەوە. پەنا بەخوا ئەگەر جاری پێشوو کونێ بوو کردی یە کەشتی یە کە ئەگونجێ زیانی گیانی تێدا نەبێ، خۆ ئەم جارە کوشتنێکی تەواوەو بە دەستی قەستە، تاوانەکە بە دیمەن زۆر زلە، لەبەر ئەوە حەزرەتی موسا کە ئەوەی دی هیچ خۆی پێ نەگیرا ﴿قَالَ﴾ فەرمووی بە خضر: ﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾ ئایا نەفسێکی پاکی بێ گوناهت هەروا کوشت بەبێ ئەمەی کەسێکی کوشتبێ، واتە بێزاری دەربەبڕم لە کردەوەکەت ﴿لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا﴾ بەڕاستی شتێکت کرد کە زۆر خراپ و ناڕەوایە و هەموو ژیری یەك بە ناڕەوای دائەنێ و دڵ و دەروون بێزی لێ ئەکاتەوە. لەم جارەدا موسا بێ ئاگا نەبوو، بڕیارەکەی خۆی لەبیر نەچووبوو، بەڵکو شتەکە ئەوەندە گەورەبوو لە پێش چاوی هیچ خۆی بۆ نەگیرا، چونکە کوشتن بە بێ هۆیەکی شەرعی ئێجگار ناڕەوا و خراپە، کوژراوەکەیش بێ تاوان بوو، لەبەر ئەوەی منداڵ بوو وەکو زۆربە و کۆری زانایان ئەفەرمون، یان بە دیمەن پاك و بێ تاوانە و ئەم هیچی لێ نەدیبوو.

ئا بەم جۆرە لێ بووینەوە لە جزمی پانزەیەم ،ئەوا دەست ئەکەین بە تەفسیری جزمی شانزەیەم بە یارمەتی خوای میهرەبان، داواکارم لە خوا ئەم تەفسیرەم پێ تەواو بکات و لێم وەرگرێ و بیکات بە مایەی رێنموونی موسڵمانان و بەندەکانی خۆی.